كۆماری عیراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕوشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرە ژمارە (١٦٥)

# شاری سلێمانی

(٢٠٠) ساڵ

بەرگی دووەم

نووسین و کۆکردنەوەی
ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە

پێداچوونەوە و پێشەکی
دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



شێخ مەحموودی نەمر
١٨٨١- ٩/ ١٠/ ١٩٥٦

دوو ووته:

پێش بەرگی دووەم بەرگی یەکەمتان خوێندەوە کە بریتی‌بوو لە ٨٨ باس ئەم بەرگەش بریتی‌یە لە ٥٩ باس، واتە بە هەردووکی ١٤٧ باسە، کە ئەمە رەنجی هەشت ساڵە بە کۆکردنەوەو هاتوچۆکردن و سەرپەرشتی ئەم بەرهەمە کە من بە ئەرکێکی سەرشانی خۆم زانیوە. لەگەڵ هەر کەم وکووری‌یەکدا هیوام وایە جێگای رەزامەنـدیی هەمـوو کوردێکی دڵسـۆز بەگشتی‌و بەتـایبەتی خەڵکی شارە خۆشەویستەکەمان بێت. منیش داوا ئەکەم لە هەموو کوردێکی دڵسۆز بۆ خاکەکەیان لە هەرچ شوێنێك بن لە کوردستان داو بەتایبەتی خەڵکی شاری سلێمانی لە نووسەرو بێجگە لە نووسەران و هەرچ کارو پیشەیەکیان هەیە وەکو من کە نووسـەر نەبـووم ئەتـوانن ئەم لایـەنـە کە دەربارەی ژیانی مێژووی کۆمـەڵایەتی‌و ئابووری‌و رۆشنبیری تۆمار بکەن کە هەمووی کۆبکەنەوە ئەبێتە مێژووی شارەکەیان و قەزاو ناحیەو دێهاتەکانیان کە تا زووە هەلێکەو لە دەست خۆیـانی نەدەن تا خەڵکی شارەزای بەتـەمـەن ماون چونکە چەند ساڵێکی‌تر ئەوانیشمان لەدەست ئەچن، لەبەرئەوەی ئێمە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکی‌ترمان نی‌یەو تائێستاکە کاتی خۆی نووسەرانمان گوێیان نەداوەتە ئەم لایەنایان و بە خەیـاڵیـاندا نەهاتووە بۆئەوەی ببێتە یادگارێك بۆخۆمان و ببێتە مێژوویەك بۆ ئەوەی داهاتومان کە ئەوانیش وەك ئێمە گلەیی لە پێشینان ئەکەین، ئەوانیش گلەییمان لێ نەکەن و ببێتە جێگای شانازی بۆیان هەروەها داوا لە خەڵکی شارە خۆشەویستەکەمان ئەکەم لە خاڵی ٢٩ بیست ونۆی ئەم بەرگەدا باسی (پیاوی گاڵتـەچی‌و قسـەخـۆش) کە ناوی ئەو پیـاوە قوشمـەچی‌یـانـە هاتووەو هەرچ کەسێکی‌ترمان بیرچووبێ هەرچ کردەوەو روداوێك و نوکتەیەکیان هەبووە بۆمان

بنـووسنەوە بە خەتێکی خۆش و بۆمان بنێرن بۆ چاپخانەکەی مامۆستا کاکەی فەللاح نیازمان هەیە بیکەین بە کتێبێك وەك (رشتەی مرواری) بەڵام ئەمە سەر بە شاری سلێمانی‌یە کە ببێتە یادگاریّ بۆخۆمان و بۆ نەوەی داهاتوومان کە بزانن باوو باپیرانیان چۆن کاتیان بردۆتەسەر. ئەمەش بەیارمەتی ئێوەی بەڕێز دێتـە بەرهـەم تکام وایە کە نەیخەنە پشت گوێ بۆئەوەی نەوەی داهاتوو کە لەخۆتانە گلەییمان لێ‌نەکەن وەك پێشینان ئەڵێن (چەپڵە بە یەك دەست لێ‌نادرێ).

دووا ووتـە زۆر سوپاسی خەڵکی شارەکەمان ئەکەم بەگشتی وە بەتایبەتی ئەوانـەی کە یارمـەتیـان دام و ناوم هێنـاون لەم کتێبـەدا کە زوربەی بوونە سەرچاوەی زوربەی باسەکان، داوای تەمەن درێژیی‌یان ئەکەم و هەر نموونەیان لە زیـاد بوونـا بێت هەروەهـا زۆر سوپـاسی بەرێـوەبـەری دەزگـای گشتیی رۆشنبیری‌و بڵاوکرنەوەی کوردی

لەگەڵ سڵاوو رێزمدا بۆهەموولایەك.

**ئەکرەم مەحموود صالح رەشە**



● ئەکرەم مەحموود سالح رەشە،

سلێمانی، گەرەکی مەڵکەندی. ١٩٣٦/١/٢٥

ئەم وێنەیە لە ١٩٥٣/٢/٢٢ گیراوە

## (سابوون و سابوونچیەکان)

دروستکردنی سابوون کە بەزۆری لە گەڕەکی سابوونکەران دروست ئەکراو ئ‌و کەرەسانەی سابوونیان پێ دروست ئەکرا ئەمانەبوون:

١ ـ قسڵ: ئەم کەرەسەیە هەروەك گەچ وایە و تۆپەڵ تۆپەڵە.

٢ ـ قلی: ئەم کەرەسەیە ڕەنگێکی ڕەشی هەیە وەك کوڵوی ئاسن وایە بەزۆری لە موسڵ دەست ئەکەوت.

٣ ـ چەوریی ئاژەڵ وەکو بەزو پیو.

٤ ـ خوێ.

## (چۆنیەتی درووستکردنی سابوون)

یەك بەش قســڵ، لەگەڵ دوو بەش قلی تێکەڵ ئەکراو کەم کەم ئاوی ئەکرا بەسەراو دائەنرا تا بەیانی ئەوسا جوان پێکەوە ئەنووسان، لەدواییا ئەکرایە ناو کووپەیەکی گەورەوە کە بنەکەی کونێکی تیابوو، دووبارە تا سێ جار ئاوی ئەکرا بەسەراو وردە وردە ئەتوایەوەو ئەو ئاوەی کە لێی زیادبووایە لەژێرەوە لە کوونی کووپەکەوە ئەڕۆیشتەخوارێو ئەو ئاوەی ئەگیرا.

ئاوی یەکەم جارو دووەم جار کە بریتی بوو لە ئاوی قلیو قسڵەکە ئەکرایە ناو بەرمیلێکەوەو ئاوی سێیەم جاریش ئەکرایە ناو مەنجەڵێکی گەورەوەو ئەخرایە سەر ئاگر تا ئەهاتەکوڵ. دوای ئەوە چەوری تێئەکراو بەیەکەوە ئەکوڵان، ئینجا لەبــەرەوە ئاوی یەکــەم جارو دووەم جاری ناو بەرمیلەکــەی تێئەکراو دووبارە لەســەر ئاگرێکی کەم ئەکوڵێنران تا بەتەواوی خەست ئەبووەوە، ئەمەش ماوەی (٢٤ تا ٣٦) سەعاتی ئەخایاند، دوایی بەگوێرەی پێویست خوێی تێ ئەکراتا کەڤ ئەکــرد، دوای ئەمە کەفەکەی ئەگیراو ئەخرایە ناو قاپی بچووك بچووکی تایبــەتیــەوە کە بۆ ئەم مەبــەستــە درووستە کرابــوون، وە ئەمــە پێیان ئەوت

سابــوونی سەرکــەف، پاشــان ئەویتر ئەکرایە ناو تەشتەوەو دائەنرا تا خۆی

## «سابوون و سابوونچیەکان»

چەند بەدوای مێژووی پەیدابوونی سابوونا بگەڕێین مێژووی کۆنترمان یەتە بەردەم، یا ڕووەك و کەرەســـەی ترمــان یەتــە بەردەم کە بۆ خۆشتن و کەلو پەلشتن بەکارهێنراوە.

بە هەمــوو چەشنێك دروستکردنی سابوون و تەرخان کردنی گەڕەکێك بۆ سابوون دروستکردن لە شاری تازە دروست بووی سلێمانیدا بەڵگەو نیشانەی چەند شتێکە:

یەکەم: سابوون کەنیشانەیەکی پاك و تەمیزیو دیمەنێکی شارستانێتییە، بەخۆیو دروستکردن و بەکارهێنانەوە لەگەڵ دامەزراندنی شاردا پێویست بووەو کۆڵەکەی داکوتاوە.

دووەم: سابــوون دروستکــردن بەم بڵاویو فراوانییەی، دیمەنی بەستنی بازاری شاری تازە بووە بە دێهــاتی دەوروپشتــەوەو لە ڕێگــەی کەرەسەیەکی خاوێنیو شارستانێتی بەخشینی وەك سابوونەوە.

سێیەم: هەر ماڵێك لە سابوونکەران، بەچەشنێك لە (مانیفاکتۆرە) ئەژمێرێ کە لە دامەزرانی کومەڵی بۆرژوازی ئەوروپا یەکەم شانەی پەیدابوونی کۆمەڵی پیشەسازیو سەرمایەدارییە.

باسی گەڕەکی سابــوونکــەران و چەشنی سابوون دروستکردن لەسلێمانیش لاپەڕەیەکیتری تەجرەبەی ئەم چەشنە سنعەتە ئەگێڕێتەوە، کە ڕەنگە بۆ ئەوانەی دەربەستی ز ا نستی ئەم چەشنە سنعەتەن سوودی تیابێو لایەنێکی تایبەتی سەر بە سلێمانی خۆیی بۆ ئەم مێژووە تیابێ کە ئەمەش هەر کەرەسەی باس و لێکۆڵینەوەیە بۆ پسپۆڕان.

ع.م

ئەگرت و ڕەق ئەبوو، دوایی بە چەقۆ بە شێوەیەکی ڕێك وپێك لەت لەت ئەکراو ئەم جۆرەش پێیان ئەوت سابوونی (بەزی) بەڵام سەرە مقەستەکانی پێی‌ئەوترا (لاپاروو)و هەرزان تریش ئەفرۆشرا لەبازارا، هەروەها سابوونە (سەرکەف)ەکە لە بەزی‌و لاپـاروەکە گرانتر ئەفرۆشرا چونکە ژنان بەتایبەتی بۆ دەم وچاو شتن بەکاریان ئەهێنا.

دروستکردنی ئەم سابوونە تا ساڵانی پەنجاکان لە هەندێ ماڵا بەردەوام بوو.

(هەندێ لەو ماڵانەی کەسابوونیان دروست ئەکرد):

١ ـ ماڵی حاجی سەعی میرزا

٢ ـ ماڵی میرزا عەبدوڵڵا

٣ ـ ماڵی حەمەی حەکیم

٤ ـ ماڵی چاومار

٥ ـ ماڵی سەعی خەجەخانی

٦ ـ ماڵی مەلا تایەری خاڵەلە

٧ ـ ماڵی حاجی ساڵحی چزڵێك

٨ ـ ماڵی حاجی کەریمی حاتەم

٩ ـ ماڵی حەمەی ڕەسووڵ

١٠ ـ ماڵی مامە ڕەشە

ئەمـەش ناوی هەنـدێ لەو ئافرەتانەی سابوونیان ئەکوڵاند بۆ ئەو ماڵانەو پێیان ئەوتن (سابوون کوڵێن):

١ ـ ئامەی حەمەشەریف

٢ ـ ڕەحە سەر چیلکە

٣ ـ ڕەعنای دایکی شەفیق

٤ ـ پوورە گوڵچیتن

٥ ـ دایە فاتە

**سەرچاوە:**

---

**ماڵی مەلا تایەری خاڵەلە.**

**تێبینی:**

زۆر ماڵ نەیان ئەتوانی سابوون بکڕن، لەبەر دەست کورتی، (ئەسپۆن)یان بەکارئەهێنا بۆ سەرو جل شتن.

• (ئەسپۆن) شتێك بوو لە ڕەگی داری دەوەن ئەچوو، بەزۆری لە شاخەکانا هەبوو، پێی ئەوترا (گەون)، ڕەگەکەی لە دارەکە گەورەتر بوو، ئەژنۆیەك لەناو زەویایە. هەڵیان ئەکێشاو وشکیان ئەکردو ئەیان شکاندو توێکڵەکەیان فڕیئەداو ناوەکەیان وردئەکرد ئەمە ڕەنگی سپی بوو کە جل وبەرگیان پێئەشت ئەیان هێنا لە گوێکانی ئەیان کرد بە جل و بەرگەکەوەو ئاویان پیائەکردو کەف ئەکرد بە گەلاکوتك لێیان ئەداو ئەم دیوو ئەودیویان ئەکرد تا پاك ئەبوەوەو لە ئاویان هەڵ ئەکێشاو هەڵیان ئەخست، بەم جۆرە جل و بەرگیان بە (ئەسپۆن) ئەشت، هەندێ جار سەریشیان پێئەشت، ئەم ئەسپۆنە بەزۆری لە دێهاتەکانا بەکار ئەهێنرا.

## بـەفری گۆیژەو چاڵە بەفرەکان»

مەڵکـەنی بنـاغـەی شارە، پاشـای بابـان گونـدی مەڵکـەنی دیو لەوێوە دەستی‌دایە بناغە دانان و فراوانکردنی شار.

ئەم گونـدی مەڵکەنی‌یە یەکسەر لەگەڵ جموجوڵ و گوزەرانی شاری تازەدا تێکەڵ بوو. ڕاستە تا سەردەمێکی درەنگیش هەندێ دیمەنی لادێ بەم گوندی مەڵکەنی‌یەوە مابوو. کە ناوی یەکەم گەڕەکی شار، واتە گەڕەکی مەڵکەنی لێنرا، وەك ماڵداریو ئاژەڵ بەخێـوکـردن و کشتوکاڵ کردن، بەڵام ئەم دوو دیمەنەی لێرەدا ئەگـێڕێنـەوە ـ بەفـرپـاراستن و بەفرهێنان و فرۆشتنی لەگەڵ بەرد لە کانـەبەرد دەرهێنان و هێنانی بۆ شار ـ دوو دیمەنی گەورەن کە لە سەرەتاوە گەڕەکی مەڵکەنیو بەستن بە شاری سلێمانیو شارستانێتی‌یەوە. هەرچی دیمەنی لادێ تا درەنگ مانەوەشە، ئەوە خۆی لەخۆیا سروشتی بناغەییو کۆنی‌یە، چونکە گەڕەکەکانی تری شار هەر لە سەرەتاوە کەوتوونە ژیانی شارستانێتی‌یەوە، بەڵام مەڵکەنی بناغەو بنەچەی ئەسڵی شاروتا ماوەیەك ژیانی شارو لادێی کۆئەکردەوە.

ع.م

## (بەفری گۆیژەو چاڵە بەفرەکان)

ئەم چاڵە بەفرانە چۆنی دائەپۆشن لە زستاناو لەدوایی بەهارو هاوینا چۆن دەری دێنن و ئەیهێنن بۆ شار؟

بەفرهێنەرەکانی مەڵکەنی لە کۆتایی پایزا خۆیان ئامادە ئەکەن و ئەچن بۆ چاڵە بەفـرەکان لە گۆیژە. دوای ئەوەی سەرما دەست پێئەکات و پێش باران بارین خاوەنی چاڵە بەفرەکان چاڵەکانیان پاك ئەکەنەوە لە کای کۆنی پارو ئەو شتـە زیادانەی لە چاڵەکانان و ئەگەر بەفری کۆنیشی تیامابێ دەریئەهێنن و خویـان ئامـادەی بەفـربـارینی زستان ئەکەن، هەر کە بینییان گۆیژە خۆی رازانودتەوە بە بەرگی سپی، کۆمەڵ کۆمەڵ ئەچن بۆسەر چاڵەکانیان بە کەلوپەلی کارەکەیانەوە وەك مشارو گوریس و خاکەنازو کاوە. ئەمەش کاتێك ئەکرێت کە بەفـرێکیوا باریبێت پێی بوتـرێ ئەژنـۆیـە بەفر باریوە. جا «با» ساردەکەی سەرگـۆیـژە بەفـرەکـە رەق ئەکا ئینجا پێنج کەس [چین، تان] دائەمەزرێنن، یەکی بە مشـارێکی گەورە لە چوارلاوە بەفــرەکــە ئەبـرێت، ئەم جۆرە بەفـر برینـە پێی ئەڵێن (هـۆلێر)، دوو کەسیش بە گوریس بەفـرەکـە رائەکێشنە ناو چاڵەکەوە، دوانی تریشیان بە خاکەناز ژێری بەفرەکە ئەکرێنن و ئەیگۆرن بۆئەوەی قوراوی نەبێو بەرێکی لە چاڵەکـەدا دایئەنێن. لە لایەکی تریشەوە هەر چاڵە بەپێی گەورەو بچـوکی لە ٢٠ کەســەوە تا ٥٠ کەس ئەو بەفرەی خراوەتە چاڵەکانەوە جوان ئەیشێلن و ئەیپـەستنـەوە تا وای لێـیـە وەکو گردێك لە دەمی چاڵەکە بەرزتر ئەبێتـەوەو پاڵی ئەدرێ بە شاخـەکەوەو بەرێك وپێکی ئاگاداری پاك و تەمیزی ئەکـەن و دوایی نزیکەی ئەژنۆیە کای ئەکەن بەسەراو دایئەپۆشن وە کاکەی ساڵی رابوردوویشی ئەکەنە سەرو وای لێئەکەن کە باو باران هیچی لێنەکات و بەجێیئەهێڵن.

لەدواییـا جار جار سەرییـەدەن و ئەگـەر کونێ کەلەبەرێکی تیابێ چاکی ئەکەن. ئینجا لە کۆتایی بەهارو هاتنی هاوینا واتە کاتێ کە بەفر بەکاردێ خۆیان ئامـادە ئەکـەن بۆ هێنـانی بەفـر، شەوەکی بەکـۆمـەڵ دوای ئەوەی هەمـوو

پێویستی‌یەك لەگەڵ خۆیان و وڵاخەكانیان ئەبەن وەك گونیەو مشارو خوێو جاجم و بەرە.

بەم جۆرەبەرەو چاڵە بەفرەكان ئەڕۆن وپێش هەتاوكەوتن ئەگەنە ئەوێ لەوێ بەگوێرەی پێویستی چاڵەكان هەڵ ئەدەنەوەو چەند كەسێك (چین، تان)دا ئەمەزرێنن‌و دەست ئەكەن بە بەفربرین‌و ئەی‌خەنە سەر باری درێژی‌و لە گونیەكانی هەڵئەكێشن و لە ئێسترەكانی بارئەكەن و جاجمە كۆن ئەدەن بەسەر بارەكاناو بەرەو شار ئەكەونەڕێ‌و سەرلەبەیانی ئەگەنەوە شارو دابەشی ئەكەن بەسەر بەفر فرۆشەكانا، بەم جۆرە بەگوێرەی پێویستی ڕۆژی ٢ تا ٣ كاروان ئەكرا. جگە لەوەی كە هەموو جارێك بەرێك وپێكی چاڵەكانیان دائەپۆشییەوەو قایم ئەكردو ڕۆژی دوایی دووبارە هەڵیان ئەدایەوەو بەم جۆرە تا پایزو كاتی بەسەرچوونی بەفر.

بەفرفرۆشەكان بەزۆری لە مەیدانی خوار بەلەدیەكەوە بوون. بەفرفرۆش و شەربەت فرۆشەكان گونیەیان ئەدا بەسەر بەفرەكەدا جگە لەوەی خوێیان ئەكرد بۆئەوەی زوو نەتوێتەوە، لەكاتی فرۆشتنیا بە مشار بەفرەكەیان پارچە پارچەی وەكویەك ئەكردو هاواریان ئەكرد (كوڵۆی بە پووڵێ بەفر)، هەروەها بەفرفرۆشی دەستگێریش هەبوو بەفریان لەسەر سەبەتە ئەبردە ناو گەڕەكەكانەوەو ئەیان فرۆشت.

خەڵكی كە بەفریان لەناو بازاڕ بكڕیایە ئەیان خستە ناو فەقیانەكانیانەوە یان ناو دەسەسرێك و ئەیان بردەوە ماڵەوە، لەماڵیشەوە بەفرەكە ئەخرایە ناو سەرهەویرێكەوەو ئەیانخستە ناو سەبەتەیەكی بچووكەوە، جارجاریش هەندێ میوەیان ئەخستە سەر بەفری ناوسەبەتەكە بۆ ساردبوون، ئەوسا كە بی‌یان‌ویستایە بەفراوێ یان دۆیەكی سارد یان ماستاوێكی سارد بكەن لە بەفرەكەیان ئەشكاندو ئەیانكردە ناو ئاوەكە یا ماستاوەكەوەو دەست بەجێ ساردئەبوو چونكە زوو ئەتوایەوە.

ئەم جۆورە بەفرە تا ساڵەكانی ١٩٦٠ بەكارئەهات.

چاڵە بەفرەكانیش دووبەر بوو، ئەو چاڵانەی كەوتبوونە ئەودیو گۆیژەوە پێیان ئەوتن (چاڵەكانی ئەودیو). ئەو چاڵانەیش كە كەوتبوونە دیوی ئەم دیوی

شاخی گوێژە واتە ڕووەو سلێمانی پێیان ئەوتن (چاڵەکانی ئەم دیو).

تێکرا چاڵە بەفرەکانیش بەم جۆرە ناونرابوون:

(أ) چاڵەکانی ئەودیو:

١ ـ چاڵی خەیاڵ

٢ ـ چاڵی نۆکەن

٣ ـ چاڵی چاڵە قوراوی

٤ ـ چاڵی مام حاجی

٥ ـ چاڵی تریل

٦ ـ چاڵی چوالان

٧ ـ چاڵی چاڵەسوتاو.

(ب:) چاڵەکانی ئەم دیو:

١ ـ چاڵی شیخ وسوو

٢ ـ چاڵی خلەکۆیی

٣ ـ چاڵی دارگۆیژ

٤ ـ چاڵی بەرزان

٥ ـ چاڵی بەرووەکە

٦ ـ چاڵی ساڵحی مەحموو

٧ ـ چاڵی نۆکەنی ئەم دیو

٨ ـ چاڵی کۆنەقەلی سەروو

٩ ـ چاڵی کۆنەقەلی خواروو.

تێبینی:ـ

---

بێجگە لە بەفری گۆیژە لەکاتی هاویناندا هەموو ساڵێک سەهۆڵی پیرەمەگرون لەلایەن خەڵکی ئەو ناوچەیەوە ئەکرایە ناوجەواڵەوەو ئەخرایەسەر وڵاخ و ئەهێنرا بۆ شار، هەرلایەك لەو جەواڵە پارچەیەکی گەورەی تێئەکرا بەقەدەر گەورەیی جەواڵەکە. ئەم سەهۆڵە، ئەفرۆشرا بە بەفر فرۆشەکان و ئەوانیش بە تەور پارچە

پارچەیان ئەکردو ئەیان فرۆشت بە شەربەت و ماستاوفروشەکان.

بەڵام ئەم سەهۆڵە هەر مانگێك ئەبینرا لەبازاردا چونکە نەئەماو ئەتوایەوە.

ئەمەش بەردەوام بو هەتا کارگەی سەهۆل هاتە شارەکەمانەوە.

* * *

# بەردی مەڵكەنی‌و بەردكێشەكان

زۆر لەكۆنەوە بەردی مەڵكەنی بەكاریەت بەتایبەتی بۆ دیوارو پێشی خانوو بەتایبەتی ئەو خانووانەی كە بە خشتی كاڵ و قوڕ درووست ئەكران پێش ئەوەی بەردی سپی بەكاربێت، ئەم جۆرە بەردە بەردكێشەكانی مەڵكەنی لە گردە گرۆێ (گردە سووتاو) كە ئەكەوێتە دامێنی شاخی گۆیژەوەو لە سلێمانی‌یەوە ئەبینرێت گردێكی پڕ چاڵ وچۆڵە، ئەیان هێنا.

گواستنـەوەی ئەم بەردە بۆ ناوشـار یا بەهـۆی گوێدرێـژەوە یان بەهۆی ئێسترەوە هاتوە، لەسەر پشتی وڵاخەكە دووتایان دائەنا كە لە تەختە یان دار درووست كرابـوو ئینجـا بەردەكـەیـان لەسەر بار ئەكراو لەدواییشدا كرا بە عەربـانـە، وپێش ئەمەش یەكێك لە بەردكیشە بەناوبانگەكان كەناوی ئەحمەد توفیق بووەو بە (ئەحە بەراز) بە ناوبانگ بوە لە تەختەو ئاسن خۆی درووستی كردوە لەشێوەی عەرەبانەدا و تایەی خستوەتە ژێرو خۆی ڕای‌كێشاوە، ئەوەی گرنـگ بێ ئەوەبوو ئەم پیاوە ئەوەندە بەهێز بووە جاری زیاد لە (٥٠٠) كیلۆ بەردی باركردووەو خۆی ڕای‌كێشاوە بۆ ناوشارو لە ڕۆژێكا زیاد لە كاروانێكی كردووەو لە دواییا وای‌لی‌هات كە ئەسپی لێ ببەستێ‌و بەم جۆرە بەردكێشان بوو بە عەرەبانەی یەك ئەسپی.

ئەو كانانە هەریەكە جۆرە بەردێكی تیابووەو ڕەنگێكی تایبەتی هەبوو، ئەمەش جۆری بەردەكانە:

١ ـ سووورباو

٢ ـ بۆر

٣ ـ شینكی

٤ ـ زەردباو

هەندێ لەم بەردانەش نەخشدار بوون.

بەردکێشان هەروەکو بەفرکێشان لە هەمان ساڵا باوی نەماو وازلێهێنانی بەزۆری بەهۆی پەیابوونی تەنگ و چەڵەمەوە بوو لە ناوچەکەداو وایلێهات خەڵکی نەیئەوێرا ئەم ئیشە بکات.

ئەوانەی بەفرو بەردیان ئەکێشا لە مەڵکەنی ئەمانە بوون:

| | |
|---|---|
| ١ ـ ئەمینی مام کەریم | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢ ـ قادری مام کەریم | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٣ ـ ئەحمەدی مام ئەولا | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٤ ـ سەعەی مام ئەولا | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٥ ـ ئەحمەدی حاجی کەریم | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٦ ـ مەحمودی حاجی کەریم | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٧ ـ مستەفای حەمەی عەزیز | بەفرو بەرد[illegible] |
| ٨ ـ مام ئەحلان | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٩ ـ کەریمە دۆمە | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٠ ـ ساڵحی مەحمود | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١١ ـ مینە ترێ | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٢ ـ حسەینی مەحمووی هۆمەر | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٣ ـ عەزیزی مەحمووی هۆمەر | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٤ ـ ئەحمەدی مەحمووی هۆمەر | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٥ قادری کاکەبرا | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٦ ـ حەسەنی کاکەبرا | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٧ ـ رەشیدی کاکەبرا | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٨ ـ حسەینی تۆفیقی حەمە خێل | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ١٩ ـ تۆفیقی حاجی حسەین | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٠ ـ فەتاحی حاجی بارام | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢١ ـ عارفی حاجی بارام | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٢ ـ عوسمانی حسەینی تۆفیقی حەمەخێل | بەفرو بەردی ئەکێشا |

| | |
|---|---|
| ٢٢ ـ عوومەری حسەینی تۆفیقی حەمەخێل | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٤ ـ تۆفیقی مام ئەحلان | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٥ ـ عەبدوڵلای مام ئەحلان | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٦ ـ عەبەی قاله قۆڕ | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٧ ـ ئەورەحمانی مامه عەبە | بەفرو بەردی ئەگێشا |
| ٢٨ ـ قالەی مامه عەبە | بەفرو بەردی ئەکێشا |
| ٢٩ ـ قادری خاتوون | بەفر بەردی ئەکێشا |
| ٣٠ ـ غەفووری حەمه ڕەش | بەفر بەردی ئەکێشا |
| ٣١ ـ فەرەجی حاجی حسەین | بەفر بەردی ئەکێشا |
| ٣٢ ـ ئەحە کەچەڵ | بەفر بەردی ئەکێشا |
| ٣٣ ـ عەبەی بابەگەورە | بەفر بەردی ئەکێشا |
| ٣٤ ـ عەبدوڵلای پیرۆز | بەفر بەردی ئەکێشا |
| ٣٥ ـ تالیب مەجید (تەلی) | بەفر بەردی ئەکێشا |

(ئەوانەی بەفریان ئەکێشا لە مەڵکەنی ئەمانە بوون)

١ ـ مەلا عەزیز

٢ ـ مەلا قادری مەلا کەریم

٣ ـ حاجی حەسەن

٤ ـ عەبە کەڵەك

٥ ـ عەلی حاجی حەسەن

٦ ـ ساڵحی نەریمان

(ئەوانەی بەردکێش بوون لە مەڵکەنی ئەمانەبوون)

١ ـ کەریمی مەجروم

٢ ـ حەمە چرچ

٣ ـ حەمەی خەجێ

٤ ـ حەمە لۆتی

٥ ـ برایی گۆڕەدێمی
٦ ـ حەمە فەرەج
٧ ـ سەعە ڕەش
٨ ـ ئەحمەد تۆفیق (ئەحە بەراز)
٩ ـ قالە پێزرۆح
١٠ ـ قادری کەریمی مەجرووم
١١ ـ عوومەری کەریمی مەجرووم
١٢ ـ غەریبی مەلا فەرەج

هەندێ خەڵکی تریش هەبوون کە خەڵکی مەلکەنی نەبوون بەڵام بەشیان هەبوو لەگەڵ بەردکێش و بەفرکێشەکانا، ئەمانە بوون:

| | | |
|---|---|---|
| ١ ـ حاجی غەفووری شەربەتچی | بەفر | گەڕەکی چوارباخ |
| ٢ ـ ئەحمەدی حاجییلە | بەفر | گەڕەکی کانێسکان |
| ٢ ـ حەمە نیزام | بەفر | گەڕەکی سەرشەقام |
| ٤ ـ مەلا فەرەج | بەرد | گەڕەکی سابوونکەران |
| ٥ ـ غەرییبی مەلا فەرەج | بەرد | گەڕەکی سابوونکەران |
| ٦ ـ جەلالی مەلا فەرەج | بەرد | گەڕەکی سابوونکەران |

سەرچاوە: عارف حاجی بارام.

❊ ❊ ❊



● وینەیەکی سالی ١٩٤٧، کومەلی پیاوی مەلکەندی چالە بەفریکیان هەلداوەتەوە لە شاخی گویژە.



● حسەینی توفیقی حەمە خیل، مەلکەندی ١٨٩٤ - ٢٦ - ٣ / ١٩٨١



● فەتاحی حاجی بارام - ١٩٢٥



● عارفی حاجی بارام - ١٩٢٨



● ئەحمەد توفیق «ئەحە بەراز» - ١٩١٢



● حاجی بارام، مەلکەندی، ١٨٨٠ - ٦٥

## جەراحەکان (حەکیم)(١)

کاتی خۆی پزیشك و ئیشی پزیشکی بەم شیوەیەی ئیستا نەبوو، (جەڕاح و حەکیم) هەبوون، ئەمانەش لە باوو باپیرانیانەوە هەندێ داوودەرمانیان زانیوەو هەندێکیتریشان شارەزاییان بوە لە شکان و لەجێچوونی ئێسقانا، ئەوانەش ئەمانەبوون:

| | |
|---|---|
| ١ ـ تۆفیق عەنتەر | لە برینا شارەزایی بوە |
| ٢ ـ حەمە نادر | برین و ئێسقان |
| ٣ ـ عەزەی حەکیم برایم | برین، باوکی شەلەمۆ جوولەکە بوو |
| ٤ ـ فەرحە خێزانی عەزەی حەکیم برایم | برین،جوولەکە بوو |
| ٥ ـ ڕەشەی خەجێ لاو | برین |
| ٦ ـ ساڵح بانەیی | ئێسقان |
| ٧ ـ عەباسی کەریم مشکە | ئێسقان |
| ٨ ـ حسەین قازاوی | ئێسقان و برین |
| ٩ ـ خەجێ شەل (ئافرەت بوو) | برین |
| ١٠ ـ بەکری میسری | برین و ئێسقان |
| ١١ ـ کەریم بەگی جەڕاح | ئێسقان |
| ١٢ ـ مەحمووبەگی جەڕاح | جەڕاح ئێسقان |
| ١٣ ـ قالە کوردەاە | ئێسقان و برین |
| ١٤ ـ ئەحەی کاڵەنێر | ئێسقان |

١٥ ـ فەرەج داروٚغایی ئێسقان
١٦ ـ سەعە جوقڵی ئێسقان
١٧ ـ مستەفاغای دەرمان ئێسقان و برین
١٨ ـ سلێمانی جەڕاح ئێسقان
١٩ ـ ئەحمەد ئاغای چاوبڕ چاوی تیمار ئەکرد
٢٠ ـ ڕەشیاغای ئەحماغای چاوبڕ چاوی تیمار ئەکرد
٢١ ـ وەستاعەلی عارفی دەلاك برینی تیمار ئەکرد

بەڵگەنامەیەك

دیارە ئەو پزیشکانەی[1] کاریان کردووە لە ز
لە خۆیانەوە نەچوونەتە ناو کارەکانیانەوە. بەڵکو
بە شێوەی ڕەسمی ڕێیان پێدراوە. ئەوەتا کە سەید
نادری جەڕاح ـ باوکی کاك عوسمان و باپیری دوکتۆر
بەکر ـ کە لە سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیزدا ڕێی
پێدراوە بە شایەتی پیاوە ناسراوەکانی
جەڕاحی نێگرادە
ئەو سەردەمە داوا ئەوکات ڕێگەی ئەو پیشەیەی
باوو باپیری پێدرابێ، کە لە سەردەمی عوسمانیدا
هەر بە ڕێگە پێدان خەریکی بوون. دووا ئیجرای
بەڵگەنامەکەش ئیجرای پێیە ڕسۆنەکە ڕێی داوە
ئەم سێ لاپەرەیە گەڵێك لایەنی مێژووی شار
دەردەخات،

(١) پزیشکی تازە بابەت نەبوو، بەڵام ئەمانە چەشنە پزیشکێ بوون کە پشتاو پشت زانستیو تەجرەبەیان بۆ مابۆوەو ئەمەش لە کوردستانا وەك زۆر وڵاتی ترمیژووی تایبەتی خۆی هەیە.
ع.م

# ڕاوو ڕاوچی‌یەکان

لەکاتی خۆیدا ڕاوکردن کارێکی باو بووەو گەلێك کەس خەریکی ڕاوکردن بوون جا چ ڕاوی ئاژەڵ بووبێت یا باڵندە، بۆ ئەم مەبەسەش گەلێك جۆری چەك بەکارهاتوە، کە ئەمانە بون :

١ ـ خەنجەر ٢ ـ تیروکەوان ٣ ـ قۆچەقانی ٤ ـ ساچمەزەن ٥ ـ تاپر.

جگە لەمانەش گەلێك گەلێك کەلوپەل بەکارهاتووە کە ئەمانە بوون تەڵە، فاقە، ئەمانە بۆ مشك و ڕێوی‌و کەروێشك و درندەکان، وە داو‌و کوولەکەی بارووت .

ڕەتە : دەرگایەکی بچووکە لە تەختە دروست ئەکرێ‌و لەناو پەرژینا دائەنرێ، ژێر ئەم دەرگایەش چاڵێکە، لەکاتی بەفربارینا دائەنرێ‌و ئەسرێ کە باڵندەو بەتایبەتی کەو هات چونکە وشکە لەسەری ئەنیشێنەوەو ئەکەوێتە ناو چاڵەکەوە. بەم جۆرە ئەو چەشنە ڕاوە کراوە.

شەوارە : بە شەو چەند کەسێك بە چرایەکەوە یان بە چراوکێکەوە ئەچن بۆ شوێنی باڵندەو بەهۆی ئەو ڕووناکی‌یەوە بەشەوارەیان ئەخەنِ و ئەیان گرن ـ ئەمیش بەهۆی دارێکی دوو پەلەوەکە تۆڕێکی پێوەیە .

تەپگە : بریتی‌یە لە چاڵێك تەختەیەك یا بەردێکی لەسەر دائەنرێ بەشێوەیە وەکو سەرقاپی چاڵەکە هەڵدرابێتەوە.

ئەمەش بەهۆی چیلکەیەکەوە وەستێنراوە کە باڵندەکە یەتە ئەوێ ئەو دانەی تیا دانراوە بیخوا کاتێك بەر چیلکەکە ئەکەوێت بەردەکە یا تەختەکە ئەکەوێت و سەری چاڵەکە دائەپۆشێ‌و باڵندەکە تیا ئەمێنێتەوە ئەمەش جۆرێکە وەکو (ڕەتە) وایە.

دێوجامە : پارچە قوماشێکی سادەیە، پارچە قوماشی تری ڕەنگاورەنگی پێوە ئەنرێ لە شێوەی پەڵەدا بەدارێکی ڕاست و چەپا دائەکوترێ ڕاوکەر ئەیگرێ بەدەستیەوە وەکو قەڵغان ئەگەرێ بەدووی کەوا تا ئەیگاتێ‌و ڕاوی ئەکا.

(چەشنی ڕاوەکان) :

١ ـ ڕاوە کەروێشك و ڕێوی: ئەمە بە تانجی ئەکرێ.
٢ ـ ڕاوە بەراز: لەپێشا بەهۆی سەگەوە ئەکرا، بەلاّم ئێستا سەگەکە لەناو چڕەدا دەری ئەپەڕێنێ بەسواری‌و بە تفەنگ ئەنیشنە سەری‌و ئەیکوژن.
٣ ـ ڕاوەکەڵ: لە شوێنی تایبەتی کەڵەکانەوە لە شاخ ڕاوکەر بە تفەنگەوە خۆی مات ئەدا تا بە بەردەمیا یەن، تەقەیان لێ‌ئەکات،بەم جۆرە ڕاوەکەڵ ئەکەن لە ولاّتی ئێمە.
٤ ـ ڕاوکەو: ئەم ڕاوە چەند جۆریکی هەیە:
أ: شەرەبەق (بنە): ڕاوکەر لە بەیانی زوودا بەشاخەوە لە (بنە)دا خۆی ئەشارێتەوەو ئەو کەوە نێرە ڕاوی‌یەی پێ‌یەتی ئەی‌نێتەوە بە درەختێکەوە کە دنیا ڕوناك بووەو کەوەکەی دەست ئەکاتە خویندن و کەوی‌تر بەدەنگیەوە یەن و ئەمیش تەقەیان لێ‌ئەکات و چەند پێوەبوو کۆی‌ئەکاتەوە، ئەم جۆرە ڕاوە بەتایبەتی لە بەهارو پایزا ئەکرێ.
ب: ڕاوەکـەو: ئەم ڕاوەش وەك ڕاوی شەرەبـەق (بنـە) ئەکرێ بەلاّم ئەو کەوەی ڕاوچی‌یە کە ئەیبا بۆ ڕاو لەسەر درەختێ دای‌ئەنێ ماکەوە.
حـ: ڕاوە سەرکانی: ڕاوکەر حەشارێك لەنزیك کانی‌یەکەوە دروست ئەکاو خۆی تیا حەشارئەدا، لە بەیانیدا کە دنیا ڕوون ئەبێتەوە کەوی ئەو ناوچەیە یەن بۆ ئاوخواردنەوە ڕاوکەر تەقەیان لێ‌ئەکات و ئەیانکوژێ.
د: بۆگار: لە بەهارا کەو بەرێچکە بە شوێنێکی تایبەتیا تێ‌ئەپەڕن ڕاوکەر لەوەپێش لەحەشارا دائەنیشێ، کە کەوەکان نزیکی‌ئەبنەوە تەقەیان لێ‌ئەکا، ئەم جۆرە ڕاوە ماوەی دوو هەفتە ئەکرێ ئەویش لە دەمەدەمی نەورۆزا.
هـ: کوبوز (ڕەشەڕاو): ڕاوکەر بەشوێن کەوا ئەگەڕێ‌و کە تووشی هات تەقەی لێ‌ئەکا.
هەروەهـا ڕاوی گەلێ شتی‌تـریش بەم جۆرە ئەکـرێ، وەك ڕاوەپـۆڕو سمـۆرەو سوێسکەو مراوی‌و ڕیشۆڵەو کۆترو چێرگ و پڵنگ و ورچ.. هتد. ئەم ڕاوە بەتایبەتی لە پایزا ئەکرێ.

لە سالاّنی پێشـووا کە ئەچـوون بۆ ڕاو دوای خۆئـامادەکردن و هەڵگرتنی کەل وپـەلی ڕاو هەنـدێ‌کـەس بە سواری وڵاخ ئەچـوون و چەنـد توولەو

تانجی‌یەکیان لەگەڵ خۆیان ئەبردو هەندێ کەسیش هەر بە پێو توولەو تانجی خۆی ئەبرد. لە ساڵانی دواییا کە ئۆتومبیلی (جیب) داهات خاوەن جیبەکان بە جیب ئەچوون بۆ ڕاو، چەکی ڕاوی ئەوکاتەش بریتی‌بوو لە تفەنگی (ساچمەزەن و) (تاپر)ە هەردوو جۆرەکە یەك لوولەو دوولوولەیان هەبوو.

شوێن ڕاوەکان: هەر ناوچەیە بە جۆرە ڕاوێك بەناوبانگ بوو. ناوچەی قەرەداغ بۆ ڕاوی ئاسك و بەرانەکێوی‌و گەلێ ئاژەڵی تر، دەشتی شارەزوور بە ڕاوە پۆڕو چیرگ و مراوی‌و گەلێك باڵندەی‌ترو ناوچەی سورداش بە ڕاوی حەیوانە کێوی‌و بەزمرو شارباژێر بە ڕاوی کەو بەناوبانگ بوون و ڕاوە ماسیش بەزۆری لە چەمی تانجەرۆ و ئاوی زەڵم و ئاوی قەڵاچوالانا ئەکران.

(ناوی ئەو ڕاوچی‌یانەی دەستمان کەوتوون)

| | |
|---|---|
| ١ ـ بەڕێز شێخ مەحموودی حەفید | |
| ٢ ـ بەڕێز حاجی مەلا سەعید | مەلاك بوو |
| ٣ ـ بەڕێز مەجی ئەفەندی کانیسکان | مەلاك بوو |
| ٤ ـ بەڕێز ئەورەحمان ئاغای ئەحمەدپاشا | مەللاك |
| ٥ ـ بەڕێز شێخ جەلالی شێخ ئەحمەدی حەفید | مەللاك |
| ٦ ـ بەڕێز شێخ محەمەدی حاجی سەی‌حەسەن | مەللاك |
| ٧ ـ بەڕێز حەمەی شێخەلی | مەللاك |
| ٨ ـ بەڕێز مەجی قالەی حەمامچی | توتنچی |
| ٩ ـ بەڕێز مەجی بەگی قادر پاشا | مەللاك |
| ١٠ ـ بەڕێز شێخ باباعەلی حەفید | مەللاك |
| ١١ ـ بەڕێز شێخ ڕەوف حەفید | مەللاك |
| ١٢ ـ بەڕێز شێخ لەتیفی حەفید | مەللاك |
| ١٣ ـ بەڕێز قادر ئاغای حاجی مەلا سەعی | مەللاك |
| ١٤ ـ بەڕێز غەفور ئاغای حاجی مەلا سەعی | مەللاك |
| ١٥ ـ بەڕێز حەمەڕەشی مەڵکەنی | جوتیار |
| ١٦ ـ بەڕێز مەلاقادری مەلاکەریم ی مەڵکەنی | کاسب |

| | |
|---|---|
| ١٧ ـ بەڕێز غەفووری مەلاعەلی مەڵکەنی | بەڕێوەبەری قوتابخانە |
| ١٨ ـ بەڕێز مەحموەفەندی ڕەسام | وینەگر |
| ١٩ ـ بەڕێز یەحیا فەندی ڕەسام | وینەگر |
| ٢٠ ـ بەڕێز ڕەشەی سورکە | مەللاك |
| ٢١ ـ بەڕێز عارفی هەلو | چاوەشی بەلەدیە |
| ٢٢ ـ بەڕێز فەرج وێلەکەیی | پیاوی شێخان |
| ٢٣ ـ بەڕێز ڕەشەی خاتوون | نانەوا |
| ٢٤ ـ بەڕێز وەستا فەرەجی ناڵبەند | ناڵ بەن |
| ٢٥ ـ بەڕێز ساڵحی عەلی قوباد | خاوەنی باخی کانێسکان |
| ٢٦ ـ بەڕێز حەمەی محەی گوڵنام | بەنا |
| ٢٧ ـ حەمە عەلی وەستا حەبیب | بەنا |
| ٢٨ ـ بەڕێز شێخ جەلالی شێخ ڕەشید | مەللاك |
| ٢٩ ـ بەڕێز کەریمی حاجی | چایچی |
| ٣٠ ـ بەڕێز فەرەج چاوشیین | پولیسی سوارە (برای ئەحلا چاوشین) |
| ٣١ ـ بەڕێز شێخ ساڵحی حەمە قزلەری | پولیسی سوارە |
| ٣٢ ـ بەڕێز شێخ لەتیفی دانساز | دانساز |
| ٣٣ ـ بەڕێز جەلال ئەفەندی فەتاح ئەفەندی | مووچەخۆر |
| ٣٤ ـ بەڕێز عەلی شەوقی (عەلی ئاگا) | مامۆستا |
| ٣٥ ـ بەڕێز ئەحمەد مەلا قادر | پیاوی بەڕێزشیخ قادری حەفید |
| ٣٦ ـ بەڕێز شێخ جەلال بەرزنجی | مامۆستا |
| ٣٧ ـ بەڕێز شیخ مستەفا بەرزنجی | مامۆستا |
| ٣٨ ـ بەڕێز سابیری مسگەر (سابیرە کەچەڵ) | مسگەر |
| ٣٩ ـ بەڕێز حەمەی حاجی فەرەج ئەفەندی | خاوەن گەراج |
| ٤٠ ـ بەڕێز جەمیلی سەعی بەگ (بابان) | کاسب |
| ٤١ ـ بەڕێز ڕەزابەگی حەمەد بەگ | کاسب |
| ٤٢ ـ بەڕێز حەمەد بەگی هەورامی | کڵاش فرۆش |
| ٤٣ ـ بەڕێز نامیق ئاغای مستەفاغا | مەللاك |

| | |
|---|---|
| ٤٤ ـ بەڕێز عومەر عبدورەحیم کۆڵەبی | ماموٚستا |
| ٤٥ ـ بەڕێز عەبدوڵلای حاجی حەسەن | چەخماخ ساز |
| ٤٦ ـ بەڕێز شێخ جەمیل | فەڕاشی قوتابخانە |
| ٤٧ ـ بەڕێز حەماغای چەخماخ ساز | جەخماخ ساز |
| ٤٨ ـ بەڕێز عەبدولقادری حاجیکورە | خاوەنی کورەی خشت لە قلیاسان |
| ٤٩ ـ بەڕێز حەمە سدیقی حاجیکورە | خاوەنی کورەی خشت لە قلیاسان |
| ٥٠ ـ بەڕێز حەمەپاشای عەبدول رەحمان ئاغا | مووچەخۆر |
| ٥١ ـ بەڕێز توٚفیقی کەریماغا | بازرگان |
| ٥٢ ـ بەڕێز ئەحمەدی حەمەی ئەولێ | مووچەخۆر |
| ٥٣ ـ بەڕێز عوسمانی عەلیبەگ | زەڕەنگەر |
| ٥٤ ـ بەڕێز ئەمینی حەمەی خدراغا | بازرگان |
| ٥٥ ـ بەڕێز رەوفی سەعیبەگ | مووچەخۆر |
| ٥٦ ـ بەڕێز ئەحمەد یووسف | ماموٚستا |
| ٥٧ ـ بەڕێز عەلی حەمەکەریم | سەرڕاج |
| ٥٨ ـ بەڕێز سەعە ئینزیبات | فەڕاشی قوتابخانە |
| ٥٩ ـ بەڕێزشێخ عەبدوڵلای شیخ لەتیفی دانساز | مووچەخۆر |
| ٦٠ ـ بەڕێز باباعەلی شیخ لەتیفی دانساز | ماموٚستا |
| ٦١ ـ بەڕێز شێخ ساڵحی توولەو تانجی | کاسب |
| ٦٢ ـ بەڕێز شیخ رەوفی شیخ ساڵح | ماموٚستا |
| ٦٣ ـ بەڕێز شیخ سدیقی شیخ ساڵح | پۆلیس |
| ٦٤ ـ بەڕێز مەحمودی شیخ ساڵح | پۆلیس |
| ٦٥ ـ بەڕێز مەجی زێوەر | مووچەخۆر |
| ٦٦ ـ بەڕێز عەلی سادق | معاونی پۆلیس |
| ٦٧ ـ بەڕێز عوسمان سادق | ئوتومبیل چی |
| ٦٨ ـ بەڕێز شێخ ئەحمەدی بەرزنجی | پۆلیس |
| ٦٩ ـ بەڕێز کەمال مەولو | کاسب |
| ٧٠ ـ بەڕێز ئەحەی عارفی هەلو | چاوەشی بەلەدیە |

| | |
|---|---|
| ٧١ ـ بەڕێز سابیری وەستاعەلی | بەنا |
| ٧٢ ـ بەڕێز فایەق ڕەشید کەریم | مووچەخۆر |
| ٧٣ ـ بەڕێزشیخ سەلاح شیخ محەمەدی حاجی حەسەن | دکتۆر لە زانکۆ |
| ٧٤ ـ بەڕێز شیخ سالارمحەمەدیحاجیسەیحەسەن | پارێزەر |
| ٧٥ ـ بەڕێز شیخ فارووقمحەمەدیحاجیسەیحەسەن | موچەخۆر |
| ٧٦ ـ بەڕێز شیخ باباتایەری شیخ جەلالی حەفید | پارێزەر |
| ٧٧ ـ بەڕێز عومەری غەفووری حەمەگول | ماسیفرۆش |
| ٧٨ ـ بەڕێز عەول مەری | ماسیفرۆش |
| ٧٩ ـ بەڕێز مەلائەو ڕەحمانی دەرمان کوت | باورووتی دروست ئەکرد |
| ٨٠ ـ بەڕێزحاجی فەرەجی سوسێ | مەللاك |
| ٨١ ـ بەڕێزعەبدوللای حاجی فەرەجی سوسێ | کاسب |

سەرچاوە:

١ ـ سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی ماموٚستایان.

٢ ـ بەڕێز ماموٚستا غەفووری مەلا عەلی مەڵکەنی.

٣ ـ بەڕێز ماموٚستا شێخ مستەفا بەرزنجی.

***

## سوارچاكەكان

گەلێ سوارچاكی ڕێك وپێك بووە لەم شارەداو هەریەكەیان ئەسپی خۆی بۆەو بە پاك و تەمیزی خزمەتی ئەسپەكانیان كردوە، دەمەدەمی عەسر خۆیان ئەگۆڕیو ئەسپەكانیان زین ئەكردو لە دەشتكانی دەوروپشتی شار ئەگەڕان و خۆیان ئەنواند، جارجارەش ئەبو بە غارغارێن و ڕمبازی، هەروەها پۆلیسە سوارەكانیش هەر بەشداری‌یان ئەكردو خەڵكی دەستە دەستە ئەچوون بۆ سەیر، ئەمە بەتایبەتی لە وەرزی بەهارو كاتی سەیران و ڕۆژانی هەینی‌یا باوبوو.

ئەگێرنەوە ئەڵێن كابرایەك بووە ناوی (چەچەی حەمەزەرد بووە)، ئەمە زۆر بە سوارچاكی مەشهور بووە، خۆی ئەسڵی هەمەوەند بوەو جامبازی وڵاخ بووە لە سلێمانی، خەڵكیشی فێری سوارچاكی كردوە، جا لەناو خەڵكی‌دا وا باو بوە هەركەسێ كە ئەسپی تاوبدایەو غاری بەڕێك وپێكی بكردایە خەڵكی پییان ئەوت لە مەدح كردنیا (ئەڵێی چەچەی حەمەزەردە) و ئەوانەی بە سوارچاك مەشهور بوون ئەمانە بوون:ـ

| | |
|---|---|
| ١ ـ بەڕێز شیخ مەحمووی حەفید | |
| ٢ ـ بەڕێز خوولەی حەسەناغا | خاوەن قەتاری وڵاخ بوە |
| ٣ ـ بەڕێز حاجی تۆفیقی پیرەمێرد | شاعیرو رۆژنامەنووس |
| ٤ ـ بەڕێز ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی ساحێب قران | (حەمدی شاعر) |
| ٥ ـ بەڕێز حەمە ی ئەورەحماناغا | مەللاك |
| ٦ ـ بەڕێز شیخ قادری حەفید | مەللاك |
| ٧ ـ بەڕێز شێخ محەمەدی حاجی سەی‌حەسەن | مەللاك |
| ٨ ـ بەڕێز شیخ محەمەدی سەی بچکولە | مەللاك |
| ٩ ـ بەڕێز مەجی قالەی حەمامچی | توتنچی |
| ١٠ ـ بەڕێز حەمەد بەگ (میران) | چاوەشی بەلەدییە |
| ١١ ـ بەڕێز شێخ جەلالی شێخ ئەحمەدی حەفید | مەللاك |
| ١٢ ـ بەڕێز حەمەی شێخەلی | مەللاك |
| ١٣ ـ بەڕێز کەریمی کاکەزاڵ | ژەندرمەی سوارەی عوسمانلی |
| ١٤ ـ بەڕێز مەحموی قالەی غەزال | ژەندرمەی سوارەی عوسمانی |
| ١٥ ـ بەڕێز عەلی قالەی غەزال | ژەندرمەی سوارەی عوسمانلی |
| ١٦ ـ بەڕێز ئەحەی سەرایلی | ژەندرمەی سوارەی عوسمانلی |
| ١٧ ـ بەڕێز مەلا عەبدول رەزاق | مەللاك |
| ١٨ ـ بەڕێز شیخ مستەفای شێخ عەزیز | مەللاك |
| ١٩ ـ بەڕێز شیخ محەمەدی شیخ عەزیز | مەللاك لەموسڵ شەهید کرا لەگەڵ شیخ سەعید |
| ٢٠ ـ بەڕێز شیخ نووری شێخ عەزیز | پولیسی سوارە (هەرسیکیان برابوون) |
| ٢١ ـ بەڕێز عەلی‌وەیسی ئەفەندی | پیاوی شێخ بووە |
| ٢٢ ـ بەڕێز حەسەن ئاغای باوکی حەمە ئاغا | جامبازی وڵاخ |
| ٢٣ ـ بەڕێز عەبدوڵڵا ئاغای باوکی حەمەسەعی **ئاغا** | عەبدوڵڵا ئاغا مەللاك |
| ٢٤ ـ بەڕێز شوێلان ئاغا | جامبازی وڵاخ |
| ٢٥ ـ بەڕێز سەعە دزکوش | قوڵچی |
| ٢٦ ـ بەڕێز عارف هەڵۆ | قوڵچی مالیە<br>چاوەشی بە لەدیە |

| | |
|---|---|
| ٢٧ ـ بەڕێز وەستا ئەحمەدی ناڵبەند | ناڵبەند |
| ٢٨ ـ بەڕێز وەستا فەرەجی ناڵبەند | **ناڵبەند** |
| ٢٩ ـ بەڕێز مەجیبەگی قادر پاشا | **مەللاك** |
| ٣٠ ـ بەڕێز مەحموبەگی جەڕاح | **مەللاك وحەكیم** |
| ٣١ ـ بەڕێز حەمەدەمینی ئایشەخان | **قەساب** |
| ٣٢ ـ بەڕێز تۆفیقی هۆمەر | قەساب |
| ٣٣ ـ بەڕێز عەلی برزووی قەساب | قەساب |
| ٣٤ ـ بەڕێز حەمەی حاجی ئایشێ | **عەلاف** |
| ٣٥ ـ بەڕێز حاجی ئەمینی مەڵكەنی | **مەللاك** |
| ٣٦ ـ بەڕێز حەمەڕەشی مەڵكەنی | مەللاك |
| ٣٧ ـ بەڕێز حاجیڕەشی مەلاقادر | مەللاك |
| ٣٨ ـ بەڕێز تایەری ئەورەحمان قەفتان | **قەڵەمچی** |
| ٣٩ ـ بەڕێز حەمەڕەشی خاتوون | نانەوا |
| ٤٠ ـ بەڕێز عومەرە سوور | عەرەبانچی |
| ٤١ ـ بەڕێز حەمەی برازا | كاسبی سەرپێیی |
| ٤٢ ـ بەڕێز مەحمود میرزا | قوڵچی مالیە |
| ٤٣ ـ بەڕێز تۆفیقە سوور (باوكی ڕەفیق چالاك) | قۆڵچی مالیە |
| ٤٤ ـ بەڕێز خوولەی قاورمەسووتاو | قۆڵچی مالیە |
| ٤٥ ـ بەڕێز تایەر سوور | قۆڵچی مالیە |
| ٤٦ ـ بەڕێز حەمەفەرەجی عەبە نەوتە | قۆڵچی مالیە |
| ٤٧ ـ بەڕێزساڵح ماین ڕەش | جامبازی وڵاخ |
| ٤٨ ـ بەڕێز عەبەی قالەی مارفەشەل | چاوەشی ئەشغال |
| ٤٩ ـ بەڕێز حەمەی ماین فرێن | (پیاوی شێخ محمەدی حاجی سەی حەسەن) |
| ٥٠ ـ بەڕێز حەمە عەلی (پیاوی سەی برایمی حەفید) | |
| ٥١ ـ بەڕێز عارف ئامێ | (پیاوی شێخ جەلالی شێخ ئەحمەدی حەفید) |

| | |
|---|---|
| ٥٢ - بەڕێز ئەحمەدی مەلاقادر | (بپاوی شێخ قادری حەفید) پۆلیسی سوارە |
| ٥٣ - بەڕێز عیزەت وەلی | پۆلیسی سوارە |
| ٥٤ - بەڕێز شێخ ساڵح قزلەڕی | پۆلیسی سوارە |
| ٥٥ - بەڕێز حەمە عەلی کابی هەمردیی | پۆلیسی سوارە |
| ٥٦ - بەڕێز فەرەج چاوشین (برای کەریم و ئەحلان چاوشینی عەلاف) | پۆلیسی سوارە |
| ٥٧ - بەڕێز حەمەسووری مەلا محەمەدی دەنگ گەورە | پۆلیسی سوارە |
| ٥٨ - بەڕێز حسەین ئەسعەد | پۆلیسی سوارە |
| ٥٩ - بەڕێز میرزا حەبیب | پۆلیسی سوارە |
| ٦٠ - بەڕێز عەبەی شەمام | پۆلیسی سوارە |
| ٦١ - بەڕێز بابا شێخی قەرەداخی | پۆلیسی سوارە |
| ٦٢ - بەڕێز حەمەڕەشی یالان قوزی | پۆلیسی سوارە |
| ٦٣ - بەڕێز ڕەئوفی عەلی فایز | عەرەبانچی |



چەند کەویك



● شیخ محەمەدی حاجی
سەید حەسەن ١٩٠٥ - ١٩٦٧/١/٧



● عارف هەلو

● راو لە داری زەردی قوپی قەرەداغ - ١٩٥٧





●دیوجامە بۆ ڕاوە کەو



● ڕاوکردن لە سویلەمیشی تانجەرۆ - ۱۹۵۲

● شەرەکەو لە مەیدانی برنجەکە





● شێخ جەلالی حەفیدو حەمەی شێخەلی لە ڕاودا لە گەڕە دێ - ١٩٥٧

● ڕاوکردنی زستان لە دێی پوشێن لە ناوچەی سرۆچك



## حیکایەت و حیکایەتخوان

لە سلیمانیش وەك زۆر وولاتی‌تر، حیکایەت خوێندنەوە بابەتی ڕابواردنی شەو بوو، لەمەوبەر لەم بارەیەوە نووسیبووم:

«... ڕەنگە زۆر لە خوێنەران ئەوەیان لەبیربێت کە لە سالانی کۆندا، بەتایبەتی شەوانی ڕەمەزان، لە (قاوەخانە) گەورەکانی شارانی کوردەواریدا حیکایەت خوان، چیرۆکی ڕۆستەمی زاڵ و زۆراب و قارەمانانی تری بۆ خەڵك ئەخوێندەوەو لەدەورێکی کۆنتردا خەڵکەکە هەموو هۆش و گۆشیان ئەدایە کارەسات و ڕووداوی حیکایەتەکە. بەڵکو بەجۆرێك لەگەڵیا تێکەڵ ئەبوون کە هەرکەسە قارەمانێکی لەو حیکایەتە بۆ خۆی هەڵئەبژاردو لە زنجیرەی ئەو حیکایەتەدا کە هەموو شەوانی ڕەمەزانی ئەخایاند، هەمیشە هیوای سەرکەوتنی قارەمانەکەی خۆی بوو. تەنانەت لەکاتی حیکایەت خوێندنەوەدا دەستەی هەر قارەمانە لە کونجێکی قاوەخانەکەدا لای یەکەوە دائەنیشتن و وەك ئاگاداری شەڕی ڕاستەقینەی نێوان ئەو قارەمانانە بن، بە دەست و بە دەم پشتی قارەمانی خۆیان ئەگرت و لەگەڵ ژێرکەوتنیا ماتەم دای‌ئەگرتن.

بڕوانــه [د. عیــزەدین مستــەفــا ڕەسووڵ. لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی. چ ٢. سلێمــانی، ١٩٧٩، ل ٤٤،٤٥]. هەر لە پەراوێــزی ل ٤٥ دا نووسیبووم: (وائەزانم ئەم باسە سەرەتایەکی باشە بۆ باسی شانۆی کوردی) - ئینجا هەر لەسەر ئەوباسە نووسرابوو:

(.. ئەو حیکایەتانە لەڕووی دارشتن و قۆرمەوە هەروەك ئەو بەیتی کوردی‌یە وابوون کە ئێستا لەکایەدان. واتە حیکایەت خوان بە قسە - یا بڵێین بە نووسینی پەخشان - ڕووداوی ناو چیرۆکەکەی ئەگێڕایەوەو لە هەندێ شوێندا بەئاوازەوە دەنگی لێ هەڵئەبــڕی‌و دواندنەکەی بە شیعرو گۆرانی‌یەوە ئەگێڕایەوە). (ئەو سەرچاوەیە، ل ٤٥) بۆ درێژەی باس سەیری ئەو سەرچاوەیە بکە، هەرچی ئەم **باســەی نووسـەریشـە، ئەوە لاپـەڕەیـەکی گرنگی ئەم چەشنـە نووسین و فولکلۆرو** ڕابواردنەی شاری سلێمانی ئەگێڕێتەوە..

(ع.م.ر)

## حیکایەت و حیکایەت خوێنەکان

ئەو حیکایەتانەی بەزۆری ئەخوێنرانەوە ئەمانە بوون:

١ - ڕوستەمی زاڵ ٢ - ئەمیر ئەرسەلان ٣ - شیرین و فەرهاد ٤ - ڕوستەم و زۆراب ٥ - مەم وزین ٦ - خورشیدو خاوەرو گەلێ حیکایەتی‌تر.

دەستــوور وابــوو پێش گێڕانــەوەی چیرۆك پێشــەکی‌یــەکی ئەوت و دوایی دەستی‌ئەکرد بە گێرانەوەی چیرۆکەکە ئەمە وەکوو خۆ ئامادەکردنێك وابوو، ئەمەش نموونەیەکە لەو پێشەکیانە؛

«پێشەکی چیرۆک»

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، کەس لە بەندەی خراپ رووڕەش تر نەبـوو، کۆسـە مرد کفنی نەبوو، هەڵیان گرت جێگەی نەبوو، دایان نا ڕێگەی نەبوو، خستیانە تاق چاوی چوو بە زاق، خستیانە بن میچ دانی چووە ریچ، خستیانە کەڵەك کەڵەك رووخا، وتیان کەڵەك بۆ ڕووخایت؟ وتی ئەی بۆچی گیا لەبنم سەوز ئەبێ؟ وتیـان گیـا بۆ لەبنی سەوز ئەبی؟ وتی ئەی بۆچی بزن سەرقـرتم ئەکا؟ وتیان بزن بۆ سەرقرتی ئەکەی؟ وتی ئەی بوچی گورگ چاوم لێزەق ئەکاتەوە .

وتیان کورگ بۆ چاوی لێ زەق ئەکەیتەوە؟ وتی بۆچی شوان حەلەلم لێئەکا؟ وتیان شوان بۆ حەلەلی لێئەکەی؟ وتی ئەی بۆچی داپیرە نایەلێ شیر بدۆشم؟ وتیان داپـیرە بۆچی نایـەلێ شیـر بدوشێ؟ وتی ئەی بۆچی مشـك سەردوڵم ئەخوا؟ وتیان مشك بۆ سەردۆڵی ئەخۆی؟ وتی ئەی بۆچی پشیلە چاوم لێ زەق ئەکاتەوە؟ وتیان پشیلە بۆ چاوی لێ زەق ئەکەیتەوە؟

وتی: گوەکەی ئەلە بە ڕیشم ئەگەر لێرە بنیشم
ئەچمە شاری تاران جگەرەی قوت قوت ئەکێشم

دوایی کە چیرۆکەکە کۆتایی ئەهات حیکایەت خوانەکە ئەیوت (منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێو) ئەوترا:

چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز مەرگی ئێوە نەبینم هەرگیز.

ناوی هەندێ لە حیکایەت خوانەکان

| | |
|---|---|
| ١ ـ بەڕێز عوسمانی قالە رەش | حیکایەت خوان |
| ٢ ـ بەڕێز ئەورەحمانی حەسەن لەلە | حیکایەت خوانی ماڵی شێخان |
| ٣ ـ بەڕێز سەعەی کوێخا ئەلیاس | خەیات |
| ٤ ـ بەڕێز سەعەی دەولەت | قەڵەمچی |
| ٥ ـ بەڕێز مەلا عەلی مەلا یوونس | قەڵەمچی |
| ٦ ـ بەڕێز حسە کەر | چایچی |
| ٧ ـ بەڕێز مەلا عەبدوڵلا کەچەڵ | چاو کزێ بوو هاتوچۆی ماڵانی ئەکردو خەڵکی یارمەتیان ئەدا |

| | |
|---|---|
| ٨ ـ بەرێز حەمەی عەزیز بەگ | حەمامچی |
| ٩ ـ بەرێز حەمەی ئەمین مەلێ | قەبرهەڵکەن |
| ١٠ ـ بەرێز حەمەسالحی عەزەی مەمەند | دەباخچی |
| ١١ ـ بەرێز مەلا مستەفا | حیکایەت خوان |
| ١٢ ـ بەرێز مەلا سمایل | ئەرزو حاڵچی |
| ١٣ ـ بەرێز مەلا عەبدوڵلای سابلاخی | حیکات خوان |
| ١٤ ـ بەرێز میرزا حەسەنی سەعاتچی | سەعاتچی |
| ١٥ ـ بەرێز رەحە کانێسکانی | ئافرەت بوو حیکایەت خوانی شێخ مەحمووی حەفید بو |
| ١٦ ـ بەرێز وەستا محێدینی جوڵا | |
| ١٧ ـ بەرێز شێخ حەمەغەریبی قنچك | |

تێبینی:

ئەوسا باو بوو پیاوو ژن حیکایەتیان بۆ منداڵەکانیان ئەگێرایەوە بە شەو بەتایبەتی لە زستاناو لەگوێ ئاگردان، چونکە شتی ئەوتۆی وەکو ئیستا نەبوو کە خۆیانی پێوە مەشغوول بکەن وەکو رادیۆو تەلەفیزیۆن.. هەروەها لە هەندێ چایخانە حیکات خوان هەبوو خەڵکی ئەچوون گوێیان لێ ئەگرت.

سەرچاوە:


١ ـ سەرنجێ لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە (لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان).
٢ ـ عومەری نەعمان.
٣ ـ عەلی دەدە.

## دیوەخانەکان

لە هەندێ لە ماڵە دەوڵەمەندو پیاوماقوڵانی سلێمانیا (دیوەخان) هەبوو، ئەمەش بریتیبوو لە ژوورێکی گەورە لە ماڵەکەدا وە ئەرازێنرایەوە بە فەرشی نایاب و بەدەوری ژوورەکەدا دۆشەك و سەرین دائەنراو چا بەجیا قاوە بەجیا ئەخرایە سەر مقەڵیو سەماوەر لە شوێنێکی تایبەتیا، لە بەیانیەوە تا شەو درەنگ چاو قاوە بەیناوبەین ئەدرا بەو میوانانەی لەوێن، هەروەها زوربەی ئێوارانیش نان ئەکراو خەڵکەکە لەوێ نانیان ئەخوارد. گەلێ لەو ماڵانە لە هاوینا دالانی گەورەیان هەبوو لەبەر فێنکی دالانەکە ئەرازایەوە، ئەم بەرو ئەوبەری دالانەکە بە بەردو قور سەکۆی بۆ ئەکرا دۆشەك و سەرینی لەسەر رائەخراو هەرچیش دائەنیشت باوەشێنێکیان ئەدایە دەست و زووزوویش دالانەکە ئاورشین ئەکرا بۆ فێنکی لە هەردو بەرەوە خەڵکی دائەنیشتن.

رۆژانی هەینی هەر لە بەیانییەوە لە دیوەخان دائەنیشتن بەلام رۆژانیتر لەدوای نیوەڕۆوە تا دەمەدەمی ئێوارەو گەلێجاریتریش تا شەو درەنگ.

ئەوەی شایانی باسە، هەر کەسێك کە لە بازارەوە ئەهاتەوە بۆ دیوەخان دەنگوباسێکی ئەهێناو هەر رووداویك لەو رۆژەدا رووی‌بدایە لە دیوەخانا باسی ئەکرا، هەروەها باسی دین و دنیاو تەنگ و چەڵەمەی خەڵکی شارو رێوشوێن بۆدانانی وە هەرکەسێك دەستی کورت بوایە یان لێی بقەومایە پەنای ئەبردە بەر دیوەخان یارمەتیئەدرا، هەروەها لە دیوەخانەکانا گەلێجار حکایەت خوان حیکایەتی تیا ئەکردو گەلێ قسەی خۆش و نوکتەی تیا ئەگێرایەوەو هەندێجاریش دەنگ خۆش گۆرانیو مەقامی تیا ئەوت و گەلێجاریش ئەبوو بە کۆڕێکی ئەدەبیو شیعری تیا ئەخوێنرایەوەو گەلێجاریش ئەبوە شەرەشیعر، بەم جۆرە کاتیان تیا ئەبردەسەر.

## ئەو ماڵانەی دیوەخانیان هەبوو ئەمانەن

| | |
|---|---|
| ١ ـ ماڵی بەڕێز شیخ مەحمودی حەفید | لەگەڕەکی کانێسکان جێگای ماڵی شێخ جەلالی حەفید. |
| ٢ ـ ماڵی شێخ قادری حەفید | گەڕەکی کانێسکان ـ مەللاك |
| ٣ ـ ماڵی شێخ حاجی سەیحەسەن مامی بەڕێز شێخ مەحموودی حەفید | گەڕەکی کانێسکان، مەللاك لە شەڕی دەربەندی بازیان ساڵی ١٩١٩م شەهیدکرا. |
| ٤ ـ ماڵی بەڕێز حاجی سەیعومەری برای حاجی سەیحەسەن | گەڕەکی کانێسکان، مەللاك |
| ٥ ـ ماڵی بەڕێز سەیئەحمەدی بابارەسوڵ | گەڕەکی مەڵکەنی، مەللاك |
| ٦ ـ ماڵی بەڕێز سەیئەحمەدی نەقیب | گەڕەکی مەڵکەنی، مەللاك |
| ٧ ـ ماڵی بەڕێز تۆفیق بەگی بایەمان (تابور ئاغاسی) بوو باوکی ئەحمەدبەگی موتەسەریف) | گەڕەکی کانێسکان |
| ٨ ـ ماڵی بەڕێز شێخ محەمەدی گوڵانی | گەڕەکی کانێسکان، مەللاك |
| ٩ ـ ماڵی بەڕێز مەجی ئەفەندی کانێسکان | گەڕەکی کانێسکان، مەللاك |
| ١٠ ـ ماڵی بەڕێز برایم ئاغای خوبیله (برایم ئاغا) سەرۆکی کاکەییکان بوو | گەڕەکی سەرشەقام، مەللاك |
| ١١ ـ ماڵی بەڕێز عەزمی بەگ | گەڕەکی دەرگەزێن، مەللاك |
| ١٢ ـ ماڵی بەڕێز عیزەت بەگی وەسمان پاشا | گەڕەکی دەرگەزێن، مەللاك |
| ١٣ ـ ماڵی بەڕێز حاجی مەلاسەعی کەرکوکلیزادە | گەڕەکی گۆیژە، مەللاك |
| ١٤ ـ ماڵی بەڕێزە ئاغا فەتحوڵڵا | گەڕەکی دەرگەزێن، مەللاك |
| ١٥ ـ ماڵی بەڕێز حاجی سەعییاغا | گەڕەکی دەرگەزێن، مەللاك |
| ١٦ ـ ماڵی بەڕێز غەفورئاغای حاجیئەولا | گەڕەکی دەرگەزێن، مەللاك |
| ١٧ ـ ماڵی بەڕێز حاجی برایم ئاغا | گەڕەکی گۆیژە قەزازەکان، تاجر |
| ١٨ ـ ماڵی بەڕێز حەمەیئەورەحمان ئاغا | گەڕەکی مەڵکەنی، مەللاك |

١٩ ـ ماڵی بەرێز عەبدولفەتاح چەلەبی
باوکی غالباغا
٢٠ ـ ماڵی بەرێز یەکتایەگ
٢١ ـ ماڵی بەرێز حاجی ئەمینی کاکەحەمە
مامی فایەق بێکەس
٢٢ ـ ماڵی بەرێز حەمە ساڵح بەگ مامی ئەحمەد
بەگی موتەسەریف
٢٣ ـ ماڵی بەرێز حەپسەخانی نەقیب لە ماڵی
شێخ مارف نەقیب ی باوکیا
٢٤ ـ ماڵی بەرێز ئامەخانی نەقیب
٢٥ ـ ماڵی بەرێز کەریمی ئەلەکە
٢٦ ـ ماڵی بەرێز حەسەناغای تفەنگچی باشی
٢٧ ـ ماڵی بەرێز عەبدول رەحمان ئەحمەدپاشا
٢٨ ـ ماڵی بەرێز ئەحمەدرەشی حاجی ئەولا
٢٩ ـ ماڵی بەرێزان عەبدوڵلاغاو تۆفیق ئاغای
حەسەن ئاغا
٣٠ ـ ماڵی بەرێز حەمەدبەگ باوکی نووری‌بەگ
٣١ ـ ماڵی بەرێز یەحیابەگ باوکی تایەربەگ
٣٢ ـ ماڵی بەرێز تایەری حەمەدەفەنی کەریماغا
٣٣ ـ ماڵی بەرێز توفیق قەزاز
٣٤ ـ ماڵی بەرێز میرزا فەرەجی حاجی شەریف
٣٥ ـ ماڵی بەرێز ئەحمەدی حاجی کەریم خەزووری
بەرێز ماجد مستەفا
٣٦ ـ ماڵی بەرێز عەبدوڵلاغای حاجی حەمەسەعی
٣٧ ـ ماڵی بەرێز شێخ عەزیزی خەلیفە
٣٨ ـ ماڵی بەرێز حاجی فەرەجی حاجی حامید
٣٩ ـ ماڵی بەرێز حاجی سەی‌مستەفا
٤٠ ـ ماڵی بەرێز حاجی ئەحمەدی پیرۆز
٤١ ـ ماڵی بەرێز میریی مووشێ
٤٢ ـ ماڵی بەرێز عەزەی حەکیم برایم

دەرگەزین، مەللاك
گەرەکی سابون کەران، مەللاك
گەرەکی گۆیژە، تاجر
گەرەکی کانێسکان، نائیب
گەرەکی کانێسکان، خاوەن ملك
سەرشەقام، خاوەن ملك
گەرەکی گوێژە، گاوران، بازرگان
سابون کەران، بازرگان
گەرەکی گوێژە ، مەللاك
گەرەکی دەرگەزێن، مەلاك و تاجیر
گەرەکی پیرمەنسور، خاوەن کەمەن بوون
گەرەکی کانێسکان، مەللاك
گەرەکی کانێسکان، مەللاك
گەرەکی کانێسکان، مەللاك
گەرەکی مەڵکەنی، بازرگان و مەللاك
گەرەکی مەڵکەنی بازرگان و تاجر
گوێژە سەرچیمەن، بازرگان و تاجر
گەرەکی سەرشەقام، بازرگان و تاجر
گەرەکی سەرچاوەی کانێسکان، مەللاك
گەرەکی دەرگەزێن، بازرگان و تاجر
گەرەکی گوێژە قەزازەکان، بازرگان و تاجر
گەرەکی دەرگەزێن، بازرگان و تاجر
گەرەکی جولەکان، ئەندامی بەلەدیە، مەللاك و چیوار
گەرەکی جولەکان، حەکیم

٤٣ ـ مالی بەرێز ئیبراهیم باروٚخ | گەڕەکی جولەکان، بازرگان
٤٤ ـ ماڵی بەرێز قازی مەلا مەعرووف وەهبی | گەڕەکی گوێژە
٤٥ ـ ماڵی بەرێز موفتی | گەڕەکی دەرگەزێن
**٤٦ ـ حاجی فەتاحی قادر | تاجیر و مەللاك**
**گەڕەکی دەرگەزێن**

سەرچاوە:
١ ـ بەرێز عومەری نەعمان
٢ ـ بەرێز عەلی دەدە

پەراوێزەکان:
١ ـ حەپســەخانی نەقیب: خێزانی شێخ قادری حەفید بوو ئافرەتێکی تابلێی بەرچاو تێر بوو، یارمەتی خەڵکی زوٚر ئەدا.
٢ ـ ئامەخانی نەقیب: ئەگێڕنەوە کە ئەم ئافرەتە حوکمی کردوەو هەرچ شتێکی بەنارەوا زانیبێ بەرهەڵستی وەستاوەو ئافرەتێکی بەرچاو تێریش بوەو یارمەتی هەژارو لێقەوماوی زوٚر داوە بەتایبەتی لە ساڵە گرانیەکەدا.
٣ ـ کەریمی ئەلەکە: پیاوێکی تابلێی یارمەتیدەری خەلك بوەو خەلکێ زوٚر باسی پیـاوەتیو یارمــەتیئەکەن بەتایبەتی لە ساڵە گرانیەکەدا گەلێ کەسی لە چنگی مردنی برسێتی رزگار کردوە.
٤ ـ حەسەن ئاغای تفەنگچیباشی: مودیری پوٚلیسی زەمانی تورك بوە.
٥ ـ تایەری حەمەدە فەننی کەریماغا: لە شەری دەربەندی بازیانا ساڵی ١٩١٩ شەهیدکرا.

* * *

# دەنگ خۆشەکانمان

بێگومان لاپەڕەی هونەری گۆرانی لە شاری سلێمانیا، لاپەڕەیەکی زۆر کۆنترو زۆر فراوانتری لەمە هەیە کە لەم کتێبەدا تۆمار کراوە.

لە زۆرکەسم بیستوە کە هەر لە سەردەمی دامەزرانەوە تا دەوروبەری سەرەتای سەدەی بیستەم، دەستەی عەجەم ئۆغلۆو گۆرانیبێژو سازژەنی ئازربایجانی لەشارا ئاهەنگیان گێڕاوە.

تێکەلی مەقام و ئامێری مۆسیقای خۆمالیو بێگانە ئەرکێکی زەحمەتەو هەولی چەند پسپۆرێکی ئەوێ، بەستنی ئەم هونەرەش بە ناوی هونەرمەندانەوە کارێکی گرانەو بەدواداگەران و شارەزایی ئەوێ.

لێرەدا هەولی تۆمارکردنی هەندێ شتی بیستراو دراوە، ناوی گۆرانیبێژی پسپۆرو لەسەر گۆرانیوتن ژیاو، لەگەل کەسانی دەنگ خۆشا تێکەل کراوە.

بەگشتی ئەم تۆمارە لە سوود بەدەر نییە. بەلام فراوان کردن و وردی کاری کەسانێکی شارەزای ئەوێ.

ع.م

# «دەنگ خۆشەکانمان»

ئەمە ناوی هەندێ لەو دەنگ خۆشانەیە کە دەستمان کەوتوە لەگەڵ جۆری ئەو ئیشەی کە کردویانە لەپێناوی گوزەرانا:

| | |
|---|---|
| ١ ـ هونەرمەند ئەحەی ناسر | گۆرانیبێژ |
| ٢ ـ هونەرمەند حەمەی عەلۆ | گۆرانیبێژ |
| ٣ ـ هونەرمەند حەمەی شێخ ئەورەحیم | گۆرانیبێژ |
| ٤ ـ هونەرمەند حەمەی شێرە | کاسب |
| ٥ ـ هونەرمەند عەزیزی ئامینە | کاسب |
| ٦ ـ هونەرمەند حاجی مەلا فەرەجی بەقاڵ | بەقاڵی وشکە |
| ٧ ـ هونەرمەند حەمە مەعروف | |
| ٨ ـ هونەرمەند رەفیقی گلە | کەوش دروو |
| ٩ ـ هونەرمەند عارفی شێخ محەمەد | پۆلیس |
| ١٠ ـ هونەرمەند ئەحەرەشی حەسەنی دەروێش | شیێرگەر لەشەری بەردەرکی سەرادا شەهیدکرا. |
| ١١ ـ هونەرمەند محەی هەمزاغا | بەرگ دروو |
| ١٢ ـ هونەرمەند مەلا کەریم | ناتری حەمام |
| ١٣ ـ هونەرمەند مەلا ئەحمەدی دیلان | قەڵەمچی |
| ١٤ ـ هونەرمەند حەمدی ئەفەننی ئەمیناغا | چایچی، یەکەم کەس بووە کە ساڵی ١٩٢٦ دەنگی لەسەڤەوان تۆمار کرا. |
| ١٥ ـ هونەرمەند ئەحمەدی سەعی | عەریفی پۆلیس (کاتب) |
| ١٦ ـ هونەرمەند دەروێش عەبدوڵڵا | گەڕۆك |
| ١٧ ـ هونەرمەند حەمەسەعی مەولوزادە | سەڕاج |

| | |
|---|---|
| ١٨ ـ هونەرمەند یەحیای نالبەن | نالبەن |
| ١٩ ـ هونەرمەند شێخ نوری شێخ سالح | مودیری ناحیە (شاعیر) |
| ٢٠ ـ هونەرمەند حاجی ساڵحە شەلە | سابوونچی |
| ٢١ ـ هونەرمەند ئەحەرەشی تەنەکەچی | تەنەکەچی |
| ٢٢ ـ هونەرمەند تۆفیقی وەستا یونس | خەفاف |
| ٢٣ ـ هونەرمەند سابیری مسگەر | مسگەر |
| ٢٤ ـ هونەرمەند تالب مەجید (تەلە) | قەتارچی |
| ٢٥ ـ هونەرمەند حاجی سابیری حاجی عەبدوڵڵا | تاجر |
| ٢٦ ـ هونەرمەند مستەفای حاجی عەبدوڵڵا | چائچی |
| ٢٧ ـ هونەرمەند رەشید عەبدوڵڵا (کاك رەشی،رەشۆل) | بەڵێندەری یانەی فەرمانبەران |
| ٢٨ ـ هونەرمەند رەوفی حاجی عەبدوڵڵا | برنج فرۆش |
| ٢٩ ـ هونەرمەند ئەخۆل | مووچەخۆرو شاعیر |
| ٣٠ ـ هونەرمەند علاءالدین سجادی | ئەدیب وزاناو رۆژنامەنووسی گەورەی کورد |
| ٣١ ـ هونەرمەند عەباسی محەی هەمزاغا | کەوش دروو |
| ٣٢ ـ هونەرمەند شێخ تالبی شێخ حەمەغەریب | مەللاك |
| ٣٣ ـ هونەرمەند حەمەی بەکر | خاوەنی نەقلیاتی سلێمانی |
| ٣٤ ـ هونەرمەند قادری حاجی حسەین | نانەوا |
| ٣٥ ـ هونەرمەند قادر دیلان | مووچەخۆر |
| ٣٦ ـ هونەرمەند رەفیق چالاك | مووچەخۆر |
| ٣٧ ـ هونەرمەند مەحموی حەمەی لەیلێ | مووچەخۆر |
| ٣٨ ـ هونەرمەند شەماڵ سائیب | مووچەخۆر |
| ٣٩ ـ هونەرمەند عوسمان سابوونچی | مووچەخۆر |
| ٤٠ ـ هونەرمەند مەحموی تۆفیق شلك | مووچەخۆر |
| ٤١ ـ هونەرمەند عەلی توفیق شلك (عەلی فەوتاو) | کاسب |
| ٤٢ ـ هونەرمەند قالەی تۆفیق شلك | مووچەخۆر |
| ٤٣ ـ هونەرمەند عەباسی توفیق شلك | مامۆستا |
| ٤٤ ـ هونەرمەند کەریم کابان | موفەوەزی پۆلیس |

| | |
|---|---|
| ٤٥ ـ هونەرمەند قادر کابان | سەرتاش |
| ٤٦ ـ هونەرمەند ئیبراهیم محەمەد | بەرگ دروو |
| ٤٧ ـ هونەرمەند باقی عەلی محەمەد | کاسب |
| ٤٨ ـ هونەرمەند فایەقی میرزامحەمەد (فایەق سمێڵ) | بەرگ دروو |
| ٤٩ ـ هونەرمەند کەریم مەحموود (کەریمی کەبابچی) | کەبابچی |
| ٥٠ ـ هونەرمەند کەمالی میرزا غەفوور | مامۆستا |
| ٥١ ـ هونەرمەند شێخ رەوف شێخ عارف | بازرگان |
| ٥٢ ـ هونەرمەند قادری مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی | مووچەخۆر |
| ٥٣ ـ هونەرمەند ئەمین ئیبراهیم | کرێکار لە بەلەدیە |
| ٥٤ ـ هونەرمەند مەلاعەزیزی مەلاخالیدی مەحوی | کاسب |
| ٥٥ ـ هونەرمەند سەی ئەحمەد دەنگگەورە | خاوەنی وێنەگری جوان |
| ٥٦ ـ هونەرمەند ئەحەی خولە سنەیی (شەماڵ) | چایچی |
| ٥٧ ـ **خولە سنەیی** | **جگەرچی** |

لە ئافرەتاندا:

ــــــــــ:ـ بەهیجە ئیبراهیم یەعقوب (دایکی جەمال، نۆموسوڵمان بووە واتە لەپێشا جولەکە بوەو بووە بە موسوڵمان ١٩٠٨ ـ ١٩٧٩، وێنەیمان دەست نەکەوت، گۆرانییەکان لە کۆمپانیای بەیزافون و ئودیون لەسەر قەوان تەومار کراوە.

تێبینی:

ــــــــــ:ـ هەندێ لە دەنگ خۆشەکانی سەردەمی بابانەکان لە شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی صاحبقران (کوردی)دا ١٨٠٩ ـ ١٨٤٩ لە مێژووی ئەدەبی کوردی علاءالدین سجادی ل ٣٣٩ ـ ٣٤٠ ناویان هاتووە ئەڵێت: ١ ـ مستۆ ئیبراهیم و ئەورەحمان بەناوبانگ بوون لە نەواو مەتحی حەزیندا ٢ ـ مستەفا لە ناریو سێگادا ٣ ـ یونس لە دەشتیو حیجازدا ٤ ـ رەسوڵ لە (رەست)دا
٥ ـ صاڵح لە نیوەشەوێ ٦ ـ محیالدین لە چوارگا
٧ ـ قەرە دەنگی بڵند کات.

سەرچاوە: زوربەی ئەو ناوانەی تۆمارکراون لەگەڵ ناوی مەقامەکان لەبەرێز کاکەحەمەی بەکرمان وەرگرتووە کە خۆشی یەکێکە لەو دەنگ خۆشانە.

## بەسەرهاتێکی دەنگ خۆش (ئەحەی ناسر)

ئەحەی ناسر تابلێی دەنگ خۆش بووو زۆر بەناوبانگ بوو، جارێکیان لەگەڵ یەك دوو برادەری دەنگ خۆشیا کە یەکێکیان (عەزەی ئامینە) بوەو ئەوی‌تریان (حەمەی شێرە) ئەبێ، لە تاران ئەبن و پارەیان پێ‌نامێنێ، بە هەرسێکیان دوو قران و نیوی ئەوکاتەیان پێ ئەبێ ئەحەی ناسر ئەچێت بۆلای دەروێشێکی برادەری دەنگ خۆشی، دەستێ جلی لێ ئەخوازێو کەوڵ پۆس لەبەرئەکاو تەورزین ئەگرێ بەدەستی‌یەوەو کەشکۆڵ ئەکاتە ملی. دوو قران و نیوەکە ئەدا بە شەکری کەللەو لەسەر سینی‌یەك دای‌ئەنێو پارچە قوماشێکی ئەدا بەسەرداو لەگەڵ هاورێکانی دەست ئەکەن بە گەران. لەکاتێکدا کە بە بەردەمی کۆشکی (موزەفەرشای) کوری (ناسرەدین شادا) لە تاران تێ‌ئەپەرن، هەموو دەنگە خۆشە زولاڵەکەی ئەخاتەکارو دەست ئەکا بە شیعری (سەعدی) بە فارسی‌و بە گۆرانی‌یەوە.

دەنگەکەی لەوناوەدا بە سۆزێکی گەرمەوە دەنگ ئەداتەوە، هەر پاش تۆزێك چەند پاسەوانێکی لێ پەیدا ئەبێو لەگەڵ خۆیان ئەیانبەنە ژوورەوە بۆلای (موزەرفەرشا) ئەویش قسەیان لەگەڵ ئەکات و لێیان ئەپرسێت خەڵکی کوێن و زۆر رێزیان لێ ئەگرێو هەزار تمەنیان خەلات ئەکا.

سەرچاوەی ئەم بەسەرهاتە: مەلا محەمەدی کوردی کە وەختی خۆی ئەحەی ناسر لە مزگەوتی سەی‌حەسەن ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێراوەتەوە.

## (مەقامەکوردی‌یەکان)

١ ـ مەقامی قەتار
٢ ـ مەقامی خاوکەر
٣ ـ مەقامی خاوخۆش
٤ ـ مەقامی ئەڵلاوەیسی
٥ ـ مەقامی حەیران
٦ ـ مەقامی ئای‌ئای
٧ ـ مەقامی لاوك
٨ ـ مەقامی نیوەشەوی
٩ ـ مەقامی هیجرانی
١٠ ـ مەقامی سەفەر
**١١ ـ مەقامی سەحەر**
**١٢ ـ مەقامی خورشیدی**

تێبینی: جاران بە گۆرانی‌بێژ ئەوترا (گۆیندە).



● ڕەشۆل و ئەختەری خێزانی،
ڕەشۆل ١٩١٢ - ١٩٧٤



● حەمەی بەکر - ١٩٢٦



●تالیب مەجید «تەلی» ١٩١٥ - ١٩٧٨



●عەباسی محەی هەمزاغا ١٩١٢ - ٩٨٣



دەنگ خوش
احمد سعید . . ١٩ـ ١٩٣٥



● رەفیقی گلە، سالّی ١٩٥٦
کۆچی کردووە



● وەستا بەحیبای نالّبەن ١٨٨٥ ـ ١٩٦٠



● حەمدی ئەفەندی ئەمین ئاغا ١٨٨٧
ـ ١٩٤٩ «یەکەم کەسە دەنگی لەسەر قەوان
تۆمار کردووە»



● قادری حاجی حسەین

١٩٢١ - ١/٩/١٩٨٤



● دەرویش عەبدوللا «کەشکول»

١٨٧٤ - ١٩٧٠



● مەلا کەریم ئەحمەد ١٨٨٥ - ١٩٣٨

## «هەندێ لە شایەرەکان»

| | |
|---|---|
| ١ ـ هونەرمەند بەرێز کەریم شایەر | ئاسنگەر بوو |
| ٢ ـ هونەرمەند بەرێز غەفوور (گەڕگەڕ) | حەماڵ بوو، پشتی خەڵکیشی ئەشێلاو ناوکیشی ئەگرتەوە |
| ٣ ـ هونەرمەند بەرێز رەحیم (رەحیم گەڕگەڕ) | کاسب بوو |

ئەم سێ شایەرە زۆر بەناوبانگ بوون لە شایەرییا،

لە شایی‌و ئاهـەنگا بەشداری‌یان ئەکرد، بەتایبەتی لە شاییدا بە دووقۆڵی‌و سێقۆڵی گۆرانیان ئەوت و شاییەکەیان گەرم ئەکردو شاباشی خەڵکیان ئەکرد.

هەروەها دوو دەستە هەبوون بۆ شایی بانگ ئەکران و ئەمانەش بە دەهوڵ و زورناو پۆست و ئیدارە شایی‌یەکەیان گەرم ئەکردو ئەبرد بەڕێوە:

دەستەی یەکەم:

| | |
|---|---|
| ١ ـ هونەرمەندی بەرێز حەمەرەحیم (میرزا محەمەد) | دەهوڵ و زورنای لێئەدا |
| ٢ ـ هونەرمەندی بەرێز عەبەی سەیزادە | گۆرانی ئەوت و دەهوڵ و دومبەڵەکی لێئەدا |
| ٣ ـ هونەرمەندی بەرێز حەسەنی زورنا | زورناو باڵەبانی لێئەدا |
| ٤ ـ هونەرمەندی بەرێز وەلی عەبەی سەیزادە | گۆرانی ئەوت و دەهوڵ و دومبەڵەکی لێئەدا. |

دەستەی دووەم:

| | |
|---|---|
| ١ ـ هونەرمەندی بەرێز میرزا مەجی | دەهۆڵی لێئەدا |
| ٢ ـ هونەرمەندی بەرێز رەحیم لچ کەل | زورنای لێئەدا |
| ٣ ـ هونەرمەندی بەرێز عەلی موراد | دەهۆڵی لێئەدا |
| ٤ ـ هونەرمەندی بەرێز رەمەزان | دەهۆڵی لێئەدا |

سەرچاوەی ئەم بەشە لە هونەرمەند کەریم شایەر وەرمان گرت.



● عەبەی سەی زادە
١٨٨٩ - ١٩٧٤/٦/٢٢



● کەریم شابەر



●غەفور فەتاح «گەڕگەڕ» ١٩١٨ - ١٩٦٨



● میرزا محەمەد ١٩١٠ - ١٩٨٤



● حەسەنی نەی «زورنا» ١٩٠٠ - ١٩٧٣/٧/١٨ لەگەڵ وەلی عەبەی سەی زادە

# مەولوودو بەشدارانی

یادکردنەوەی رۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د) یەکەمجار لە دەوری موزەفەرەدینی فەرمانڕەوای هەولێردا لەو شارەدا پەیدابووە. دیارە ئاهەنگ گێران نووسینی مەولوودنامەشی بەدوودا هات. لە رووی ناوەرۆك و روخساری ئەدەبیی ئەو مەولوودنامانەوە گەلێك شت ئەنووسرێ بەڵام لێرەدا خاوەن کتێب لەسەر پێرەوی خۆی بایەخی بە ئاهەنگی مەولوودو خوێندنەوەو ئەو ئامێرانە داوە کە بەکارئەهاتن، لەگەڵ ناوی بەشدارانا، کە سێ چەشن بوون، یەکەم: مەلایەك کە بەخوێندنەوەیەکی رەوان یەکێ لەو مەولوودنامانەی ئەخوێندەوە کە لەناو کورددا باوبوون. دووەم: چەند حافزێك (کوێر) کە شیعرو ستایشی ئایینیان لەنێوان فەسڵەکانی مەولوودنامەکەدا ئەخوێندەوە. سێیەم: تاقمێ کە تەپڵ و دەفیان بەپێی ئاوازی ستایشەکە لێئەدا. تێکرا هەر سێ لایەنی ئەم باسە لێکۆڵینەوەی ئەوتۆ هەڵئەگرن کە سەر بە ئەدەبیات و مۆسیقاش بن.

(ع.م.ر)

## (ناوی هەندێ لەوانەی لە مەولودا بەشدارییان ئەکرد)

١ ـ بەڕێز مەلا ئەحمەدی حاجی مەلارەسوڵی دێلێژەیی/ ئیمام و مودەڕیسی مزگەوتی بن تەبەقی بچکولە (عیرفان).

٢ ـ بەڕێز سەعەی خوامراد، پینەچی بوو/ مەولوودنامەی دەخوێندەوەو دەفی لێئەدا.

٣ ـ بەڕێز رەشەی خوامراد، بەقاڵ بوو، کوێر بوو، شیعری ئایینیو قەسیدەی ئەخوێندەوە.

٤ ـ بەریز وەستا مارف، کەوش دروو بوو/ شیعری ئاینیو قەسیدەی ئەخوێندەوە.

٥ ـ بەرێز مەلا عەلی سەرکارێز، دۆعانووس بوو/ دەفیلێئەدا.

٦ ـ بەرێز خەلیفە پیرۆت، گونجی ئاوی رادەکێشا، کاتی خۆی پاڵەوانیش بوو/ تەپڵ و دەف لێئەدا.

٧ ـ بەرێز رەشی چاوەش، حەڵواچی بوو/ شیعری ئاینی ئەخوێندەوەو دەفیشی لێئەدا.

٨ ـ بەرێز وەستاعەلی عارف، دەلاك بوو/ مەولودنامەی ئەخوێندەوە.

٩ ـ جەلال کابان، چایچی بوو/ دەفیلێئەدا.

١٠ ـ بەرێز حاجی سابیرە خرە، قەزوان و دەنکەکوولەکەی سوێرئەکرد لەماڵەوە/ تەپڵیلێئەدا.

١١ ـ بەرێز عەلی خەلیفە، برنج فرۆش بوو/ تەپڵی لێئەدا.

١٢ ـ بەرێز فەرەجی حەمەمراد، چایچی بوو/ تەپڵی لێئەدا.

١٣ ـ بەرێز دەروێش ئەمین، کۆنەفرۆش بوو/ دەف لێئەدا.

١٤ ـ بەرێز مەلا محەمەدی دەروێش ئەمین، حەڵوافرۆش بوو/ تەپڵی لێئەدا.

١٥ ـ ـ بەرێـز حاجی سەیفوڵلا، بەقاڵ بوو/ دەف لێئەدا/ ئەم پیاوە خەڵکی رووسیا بوو، لە شەڕی جیهانی یەکەمدا (سەفەربەر) سەربازێکی رووسی ئەبێ، لێرە ئەمێنێتەوەو ئیسلام ئەبێو ژن دێنێو وەچەی لێ ئەبێتەوە، لە ئەسڵدا ناوی جۆرج بووە، لەپێشدا لە قەلادزێ ژیاوە.

١٦ ـ بەرێز خەلیفە سەعی، مزگەر بوو/ دەفیلێئەدا.

١٧ ـ بەرێز عوسمانی تەپڵ، جگەرچی بوو/ تەپڵی لێئەدا.

١٨ ـ بەرێـز ئەحەی محەی جگەر/خەیات بوو/ شیعری ئاینی ئەخوێندەوەو دەفیشی لێئەدا.

١٩ ـ بەرێز مەلا عومەری مەلا عەبدوڵلای بانەیی، یارمەتی باوکی ئەدا /تەپڵ و دەف لێئەدا.

٢٠ ـ بەرێز مەلا خدر، برای مەلا عومەر بوو، پینەچی بوو/ تەپڵ و دەف لێئەدا.

٢١ ـ بەرێز ئیبراهیم حەزین، کوتاڵ فرۆش بوو/ شیعری ئاینی ئەخوێندەوە.

٢٢ ـ بەڕێز ئەحەی سۆفی شاکە، بەقاڵ بوو/ شیعری ئاینی ئەخوێندەوە.
٢٣ ـ بەڕێز وەستا سابیری خەلیفە سەعی، مزگەر بوو/ تەپڵی لێئەدا.
٢٤ ـ بەڕێز مەلا فەرەج فەتاح بەنا، کوێر بوو، دەفی لێئەدا.

تێبینی: ـ ئەوانەی کە مەولودنامەیان ئەخوێندەوە هەموو دەنگیان خۆش بوو، هەروەها ئەوانەی بەشداریی مەولودیان ئەکرد بێجگە لە مەلا کوێرەکان بە بێپارە لەبەر عەشقی دین و خۆشی بۆ ماڵە ناسیاوی خۆیان بەشداری‌یان ئەکرد.

## (ناوی هەندێ لەو حافزانەی کە لە مەولوو تەعزێدا بەناوبانگ بوون)

١ ـ بەڕێز مەلا محەمەدی دەنگ گەورە/ لە مەولونامەو تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٢ ـ بەڕێز مەلا ئیبراهیم /لە مەولونامەی تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٣ ـ بەڕێز مەلا عەبدوڵڵای بانەیی/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٤ ـ بەڕێز مەلا فەرەجی حەماغا/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٥ ـ بەڕێز مەلا حامیدی مەلا حەمدون/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٦ ـ بەڕێز مەلا معروف فەتاح/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٧ ـ بەڕێز مەلا حسەینی سنەیی/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٨ ـ بەڕێز مەلا ئەورەحمانی کوردە/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
٩ ـ بەڕێز حەسەنی وەستا ڕەشی/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
١٠ ـ بەڕێز مەلا سەیحەکیم/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
١١ ـ بەڕێز مەلا حەسەنی فەتاح هەرمنی/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد
١٢ ـ بەڕێز مەلا ئەحمەدی ڕەحمە/ لە مەولونامە تەعزێدا بەشداری ئەکرد

## (هەندێ لەوانەی کە لە تەعزیەو مەولووی ژناندا بەشداری‌یان کردوە)

١ - بەڕێز مەلا گورون
٢ - بەڕێز مەلا ڕەحمە/ چاوساخ بوو
٣ - بەڕێز مەلا فاتم/ چاوساخ بوو
٤ - بەڕێز مەلا حەبیب/ کوێر بوو/ ئافرەت بوو، ژنی مەلا حەمدونە کوێری شاعیر بوو
٥ - بەڕێز مەلا حەبیب/ کوێر بوو،ئافرەت بوو
٦ - بەڕێز مەلا سەبیح/ کوێر بوو، ئافرەت بوو
٧ - بەڕێز مەلا فاتم/ کوێر بوو، ئافرەت بوو

## (ناوی هەندێ لەو حافزانەی لە خەتم و تەهلیلەی مالآنا بەشدارییان ئەکرد)

١ - بەڕێز مەلا محەمەدی مەلائەمین.
٢ - بەڕێز مەلاسەعی سەڵتە.
٣ - بەڕێز مەلا حسەینی هەولێری.
٤ - بەڕێز مەلا فەرەجی فەتاحی بەنا.
٥ - بەڕێز مەلا مەجی قادر.
٦ - بەڕێز مەلا ئەحمەدی قادر.
٧ - بەڕێز مەلا تۆفیقی حەمەگول.
٨ - بەڕێز مەلا ڕەحیمی بەرزنجی.
٩ - بەڕێز مەلا ڕەوف کەرکوکی.
١٠ - بەڕێز مەلا حاجی سەی‌شەریف.
١١ - بەڕێز مەلا سەی‌عەلی حافز.
١٢ - بەڕێز مەلا ئەحمەدی ڕەحمە.

سەرچاوە: مەلا حەسەنی فەتاح هەرمنی.

* * *




●مەولود لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی



● هاتنەوەی حاجی لە حەج، بەردەم شەخسەکەی پیرمەسوور



● مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا
ڕەسوولی دیلیژە ١٨٩٢ - ١٩٧٠



● مەلا حامیدی حەمدوون
١٨٩٦ - ١٩٧٦/١/٣



● عەلی خەلیفە - دەف لێدەر
١٩٠٠ - ١٩٧٠



● وەستا عەلی عارفی دەلاك
١٩٠٧ - ١٩٨٠



● حاجی سابیره خره



● مه‌لا حه‌سه‌ن هه‌رمنی - ١٩٢٧



● عوسمانی ته‌پڵ - ١٩٠٧



● جه‌لال کابان ١٩٠٤ - ١٩٧٩

## [ناوی ئەو گەڕۆکە ئینگلیزانەی کە بە کوردستانا گەڕاون و لە نوسراوەکانیانا باسی سلەیمانییان کردوە]

١ ـ ملازم وليام هيود:

کتێبی (رحلة بحرية الى شمال الخليج الفارسي ورحلة في البلاد التي تليها من الهند حتى انكلترا) ساڵی ١٨١٧ز.

من بغداد الى كفرى.. ابراهيم خانچی وبلغ السليمانية في ٩ آذار سنة ١٨١٧م.

٢ ـ سير روبرت كيربورتر ـ الرحالة والرسام.

کتێبی (رحلات في جورجيا وايران وأرمينيا وبابل القديمة)

لە لەندەن چاپکراوە ساڵی ١٨١٨ز

(من بغداد الى كفرى ـ كركوك ـ السليمانية) لە سلێمانی ماوەتەوە لە ١٢، ١٣ی کانونی یەکەما.

٣ ـ کلۆدیۆس جیمس ریچ موقیم بوە لە (شركة الهند الشرقية في بغداد)

کتێبی (قصة رحلة في ربوع كردستان) لە لەندەن ساڵی ١٨٣٦ز چاپکراوە. بەغای بەجێهێشت لە نیسانی ساڵی ١٨٢٠ز وە هاتۆتە سلەیمانی لە ١٠ی ئایاری ساڵی ١٨٢٠ز.

٤ ـ أ.ن. گروڤر: قەشەیەکی موبەشیر بوو.
کتێبی (تعليقات السيد انتونى گروڤر المبشر اثناء رحلة من لندن الى بغداد) له لەندەن ساڵی ١٨٣١ز ئەمه له دووتوێی کتێبێکا که ژنەکەی نووسیویه لەسەری لەژێر ناوی (مذكرات المرحوم انتونى نوريس كروڤر) چاپی دووەم له لەندەن ساڵی ١٨٥٧.
٥ ـ نەقیب کابتن ر. مینیان:
کتێبی (رحلة شتاء.. داخل كوردستان) له لەندەن ساڵی ١٨٣٩ز، هەروەها کتێبی (عن طريق بانه الى السليمانية) له ١٤ ی نیسانی ساڵی ١٨٣٠ز بەجێیهیشت.

٦ ـ جیمس بیلی فریزر:
کتیبی (رحلة في كردستان ومابين النهرين) له لەندەن ساڵی ١٨٤٠ز، تەورێزی له ١١ی تشرینی یەکەما بەجێهێشت له ساڵی ١٨٣٤ز. وەها هاتۆته سلەیمانی له ٣١ی تشرینی دووەما.
٧ ـ موقەدەم ج. شین:
کتێبی (ملاحظات عن رحلة من تبريز... الى السليمانية.. خلال كردستان) له ناوەند تەموزو ئابی سالی ١٨٣٦ز.
٨ ـ میجه ر هـ.س. راولسن:
کتێبی (تعليقات على مسيرة من زهاب.. الى خوزستان) ساڵی ١٨٣٦.
٩ ـ و.ڤ. انیزورث:
کتێبی (رواية شخصية لحملة استكشاف الفرات) له لەندەن ساڵی ١٨٨٨ز.
لەرێی کفریو کەرکوکەوە هاتۆته سلەیمانی له ١٤ی شوباتی ساڵی ١٨٣٧.
١٠ ـ کوماندەر فیلکس جونز:
کتێبی (وقائع رحلة الى حدود تركيا وايران خلال جزء من كردستان) له بۆمبای ساڵی ١٨٥٧ز.
وه له زەهاوەوە بۆ هەڵەبجەو سلەیمانی له ٢٥ ـ ٢٩ ئەیلولی ساڵی ١٨٤٤.
١١ ـ کابتن ف.د. ماونس:
وتارێ لەژێر ناوی (كردستان) له گۆڤاری (الجمعية الجغرافية الملكية) له جلدی

٣ سالی ١٨٩٤ز.

وه له گەشتی (له ئەرزڕوومەوه له ٢٦ی سالی ١٨٩٢ز بۆ بەغدا بەڕوباراو لەوێوه بەرێی قەسری شیرینا بۆ سلەیمانی)و له چەند گەرانێکی تریا بۆ دوکان و قەلادزێو ڕەواندزو هەولێرو کۆیه. هەروەها له هەندێ گەڕانی‌تریا له ١٨٨٨ز.

١٢ ـ نەقیب مارك سایکس:

له کتێبی (دار السلام) له لەندەن سالی ١٩٠٤ز هەروەها له سالی ١٩٠٢ز هەستاوه بەم گەڕانەی کتێبەکەی.

١٣ ـ نەقیب برترام دیکسن:

وتاری (رحلة فی کردستان) له گۆڤاری (الجغرافیة) له جلدی ٣٥ سالی ١٩١٠ز بلاوی کردوتەوه که وتارەکەی پالپشتی گەرانەکانیەتی که له سالی ١٩٠٩ز کردویەتی.

١٤ ـ ئی.ب. سون:

کتێبی (خلال میسوپوتامیاو کردستان ومابین النهرین متنكراً). لەندەن سالی ١٩١٢ز که له سالی ١٩٠٩ز دەستی پێکردوه.

١٥ ـ نەقیب.ت.س. .د. فاول:

کتێبی (رحلات في الشرق الأوسط) سالی ١٩١٦ز له لەندەن گەراوه له کفریەوه بۆ کەرکوك و لەوێشەوه بۆ سلەیمانی به ڕۆیشتن و گەرانەوەوه سالی ١٩١٠ز.

١٦ ـ گ.ئی. هویارد:

کتێبی (من الخلیج الی أرارات) سالی ١٩١٦ له ئەدنبەره.

١٧ ـ عەقید گ. هـ. د. رایدر:

وتاری (تعیین الحدود الترکیة ـ الایرانیة في ١٩١٣ ـ ١٩١٤) له گۆڤاری (الجغرافیة) جلدی ٦٥ سالی ١٩٢٥ز.

سەرچاوه: بەرێز مامۆستا عەبدوللا جەوهەر.

* * *

# (ئەو کتێبانەی باسی
# مێژووی سلەیمانییان کردوە)

١ ـ (کرد وترك وعرب) سیاسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق ـ ١٩١٩ ـ ١٩٢٥ز:
تألیف س. جی. ادموندز:
مستشار وزارة الداخلیة في العراق ١٩٣٥ ـ ١٩٤٥ز
لە چاپخانەی (التایمس ـ لە بەغا) ساڵی ١٩٧١ز چاپکراوە.

٢ ـ (رحلة متنکر الی بلاد مابین النهرین وکردستان):
نوسینی ـ ای. بی. سۆن. (میرزا غلام حسین شیرازی) لە چاپخانەی (الجمهوریة لە بەغا ساڵی ١٩٧٠ز چاپکراوە.

٣ ـ (الأكراد) دراسة جغرافیة واتنوغرافیة:
نوسینی: دکتور شاکر خەسباك. لە چاپخانەی (شفیق) ساڵی ١٩٧٢ز چاپکراوە.

٤ ـ (العراق الشمالی): دراسة لنواحیه الطبیعیة والبشریة:
نووسینی : دکتور شاکر خەسباك. لە چاپخانەی شفیق لە ساڵی ١٩٧٣ز لە بەغا چاپکراوە.

٥ ـ (تأریخ سلیمانیو ولاتی لەدوری زور قدیمەوە تا اولی احتلال ١٩١٨م):
نووسینی خوالێخوشبوو محمد امین زکی.
لە چاپخانەی (النجاح) لە ساڵی ١٩٣٩ز چاپکراوە.

سەرچاوە: بەرێز مامۆستا عەبدوڵلا جەوهەر.

* * *

## (ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی
## تا ساڵی ۱۹٦۰ز چاپکراون)

۱ - ڕۆژنـامەی (پێشکەوتن) سلەیمانی ساڵی ۱۹۲۰ز خاوەن و سەرنووسەری میرلیوا مستەفا پاشای یامولکی بووە.

لە ۲۹ی نیسانی ۱۹۲۰ز تا ۲۷ی تەموزی ۱۹۲۲ز.

۲ - ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) سلەیمانی - ۱۹۲۲ز خاوەن و سەرنووسەری میرلیوا مستەفا پاشای یامولکی بووە.

لە ۲ی ئەیلولی ۱۹۲۲ز تا ۲۷ی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۲ز.

۳ - ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) سلەیمانی ۱۹۲۲ز خاوەن و لێپرسراوی م. نوری.

لە ۱٥ی تشرینی دووەمی ۱۹۲۲ ز تا ۳ی مارتی ۱۹۲۳ز.

٤ - ڕۆژنامەی (بانگی حەق) سلەیمانی ۱۹۲۳ز

سێ ژمـارەی لێ دەرچووە. ژمارەی سێهەمی لە ۱۲ی نیسانی ۱۳۳۹ی ڕۆمی دەرچوە. زمانی حاڵی حکومەتی شێخ مەحمود بووە.

٥ - ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) سلەیمانی ۱۹۲۳ز

مودیرو سەرموحەریری ڕەفیق حیلمی بوە.

۲۰ی ئەیلوولی ۱۳۳۹ی ڕۆمی ژمـارەی یەکـەمی بڵاوکراوەتەوە، وە تەنیا ۲٥ ژمارەی لێ دەرچووە.

٦ - ڕۆژنامەی (ژیانەوە) سلەیمانی ۱۹۲٤ز

لەدوای ڕوخانی حکومەتی شیخ مەحمود، زمانی حاڵی حکومەتی ئەو سەردەمە بووە.

ژمارەی یەکەمی لە ١٨ی ئەیلوولی ١٩٢٤ز دەرچوە.
ساڵی یەکەم ٣٦ ژمارەی لێ دەرچوە.
٧ ـ رۆژنامەی (ژیان) سلەیمانی ـ ١٩٢٦ز
ژمارەی یەکەمی لە ٢١ی کانونی دوەمی ساڵی ١٩٢٦ز دەرچوە.
لە ژمارە (٤٠٦)وە پیرەمێرد بوو بە خاوەنی.
تا ساڵی ١٩٣٨ز ٥٥٣ ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.
٨ ـ گۆڤاری (زانستی) سلەیمانی ـ ١٩٣٨ز
خاوەن و لێپرسراوی ساڵح قەفتان بووە.
ژمارەی یەکەمی لە ٢٥ی شوباتی ١٩٣٨ز دەرچوە.
٩ ـ رۆژنامەی (زبان) سلەیمانی ـ ١٩٣٧ز
لەلایەن شارەوانی سلەیمانی‌یەوە دەرچوە.
ژمارەی یەکەمی لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٣٧ز دەرچوە.
(٧٠) ژمارەی لێ دەرچوە، دواژمارەی لە ٢٩ی نیسانی ١٩٣٩زدا دەرچوە.
١٠ ـ رۆژنامەی (ژین) سلەیمانی ١٩٣٩ز
بەرێوەبەرو پەرپرسیاری پیرەمێرد بووە.
ژمارەی یەکەمی لە ٢٦ی کانونی دوەمی ١٩٣٩زدا دەرچوە هەتا ٨ شوباتی ١٩٦٣ز بەردەوام بوە.
لەدوای پیرەمێرد، جەمیل سائب و نوری ئەمین مەحمودو گۆران و ئەحمەد زرنگ یەك لەدوای‌یەك بردویانەبەرێوە.
١١ ـ گۆڤاری (بلێسە) سلێمانی ١٩٥٩ز
نەقابەی مامۆستایان دەری‌کردوە.
ژمارەی یەکەمی لە مانگی ئابی ١٩٥٩ز دەرچوە.
ژمارەی (١٠)ی لە مایسی ١٩٦٠زدا دەرچوە.
١٢ ـ گۆڤاری (نەورۆز) سلەیمانی ١٩٥٩ز
خاوەن و لێپرسیاری کەمالی میرزا کەریم بوە.
ژمارەی یەکەمی لە نیسانی ١٩٥٩زدا دەرچوە؛
ژمارەی سێی لە حوزەیرانی ١٩٥٩زدا دەرچوە.
١٣ ـ گۆڤاری (هونەر) سلەیمانی ١٩٥٩ز
لەلایەن قوتابیانی هونەری ناوماڵەوە لە سلەیمانی دەرچوە

١٤ ـ گۆڤاری (نیشتمان) سلەیمانی ١٩٥٩ز
لەلایەن قوتابخانەی (دار المعلمین الابتدائیة)وە دەرچوە
١٥ ـ (هیوای کوردستان) سلەیمانی ١٩٥٩ز
لەلایـەن (یەکیەتی قوتابیانی گشتی لە سلەیمانی دەرچوە ژمارەی یەکەمی لە یەکی تشرینی دوەمی ١٩٥٩زدا دەرچوە ژمارە (١٢)ی لە ٧ی ئابی ١٩٦٠ز دەرچوە.
١٦ ـ گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
خاوەنیو لێپرسراوی جەمال شاڵی بووە؛
سکرتێری نوسین کامەران موکری بووە.
یەکەم ژمارەی لە مارتی ١٩٦٠زدا دەرچوە؛
١٨ ژمارەی لێ دەرچوە.
١٧ ـ ڕۆژنامەی (بڕوا) سلەیمانی ١٩٦٠ز
خاوەن و لێپرسراوی کەمالی میرزا کەریم بووە.
یەکەم ژمارەی لە ٢ی تەموزی ١٩٦٠زدا دەرچوە؛
دواژمارەی کە (٩٥) بووە لە ٢٥ کانونی دوەمی ١٩٦٣ز دەرچوە.
١٨ ـ گوڤاری (بەیان) سلەیمانی ١٩٥٩ز.
خاوەن و لێپرسراوی عەبدول قادر بەرزنجی بوە.
سەرەك نووسەرو بەڕێوەبەری گۆران بووە.

سەرچاوە:
لە کتێبی ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی جەمال خەزنەدارەوە.

*** 

## (ئەو کتێبانەی تا ساڵی
## ١٩٦٠ز لە سلەیمانی چاپکراوە)

١ ـ (قصص الانبیاء) ـ بەکوردی ـ ١٩٢٠ز
نووسینی مەلا عەبدوڵڵا زێوەر.
چاپخانەی بەلەدییە ـ سلەیمانی ـ ١٩٢٠ز.
٢ ـ (دیوانی مەحوی) ـ (محەمەدی مەلا وەسمانی باڵخی)
چاپخانەی حکومەت ـ سلەیمانی ـ ١٩٢٢ز.
٣ ـ (دەستووری مووچەخۆری)
چاپخانەی حکومەت ـ سلەیمانی ـ ١٩٢٢ز.
٤ ـ (قانونی هەڵبژاردنی مەبعوس)
چاپخانەی حکومەت ـ سلەیمانی ـ ١٩٢٥ز.
٥ ـ (گۆرانی کوردی)
چاپخانەی سلەیمانی ـ ١٩٢٥ز.
٦ ـ (خانووی تازە) نوسینی ـ شاکیر فەتاح
چاپخانەی ژیان ـ سلەیمانی ـ ١٩٣٣ز.
٧ ـ (تەفسیری جزمی عمّ) نوسینی شێخ محەمەدی خاڵ
چاپخانەی ژیان ـ سلەیمانی ـ ١٩٣٤ز.
٨ ـ (مەم وزین) نوسینی حاجی تۆفیقی (پیرەمێرد)
چاپخانەی ژین ـ سلەیمانی ١٩٣٤ز.
٩ ـ (هۆنراوەی کوردی) لەدوری (بوردی)
نوسینی مستەفای حاجی مەلا رەسوڵ
سلەیمانی ـ چاپخانەی ـ ژیان ـ ١٩٣٥ز.

١٠ - (ئەحمەدی) نوسینی مارف ی نۆدێ
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٥ز.
١١ - (دیوانی مەولەوی) گۆرینی بۆ شێوەی سۆرانی - پیرەمێرد، چاپخانەی ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٥ز.
١٢ - (دوانزە سوارەی مەریوان) نوسینی پیرەمێرد
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٥ز.
١٣ - (بەراوردێکی تەئریخی) نوسینی - سالح قەفتان
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٣٦ز.
١٤ - (دیوانی تایەربەگی جاف)
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٦ز.
١٥ - (مەولودنامەی نەوئەسەر) نوسینی شێخ محەمەدی خاڵ
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی ١٩٣٧ز.
١٦ - (فەرائزی کوردی)مەلا محەمەد سەعید
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٨ز.
١٧ - (فەلسەفەی ئاینی ئیسلام) نوسینی شێخ محەمەدی خاڵ
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٨ز.
١٨ - (هەنگاوێك بۆ سەرکەوتن) نوسینی - م.م. پژدەری
چاپخانەی - بەلەدییە - سلەیمانی - ١٩٣٨ز.
١٩ - (ئاوات) نوسینی عەبدوڵلا جەوهەر
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٨ز.
٢٠ - (مەناقیبی کاك ئەحمەد) نوسینی خواجە ئەفەندی
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٩ز.
٢١ (دەستە گوڵی لاوان ) عەبدوڵلا زێوەر
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٩ز.
٢٢ - (گوڵ دەستەی شوعەرای هاوعەسرم) نوسینی عەلی باپیراغا
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٣٩.
٢٣ - (روناکی رێوبان) لە بلاوکراوەکانی (دەنگی گێتی تازە)
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٠.
٢٤ - (دیوانی مەولەوی) بەرگی دوەم گۆرینی بۆ سۆرانی - پیرەمێرد.
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٠.

٢٥ - (پیرۆزی منال) نوسینی - ع.و. نوری
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٠.
٢٦ - (لە گەروی هێتلەرەوە) لە بڵاوکراوەکانی (دەنگی گیتی تازە)
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٠.
٢٧ - (ئاوەرەشەی روسی سور).
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٠.
٢٨ (کەمانچەژەن) - بەرگی یەك و دوو - کۆرینی - پیرەمێرد
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٢.
٢٩ - (دڵدارانی ڤینیسیا) - جەماڵی برایماغا
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٢.
٣٠ - (بەهەشتێکی ون بوو) - بەختیار زێوەر
چاپخانەی - بەلەدییە - سلەیمانی - ١٩٤٦.
٣١ - (گوڵاڵە) - مەحمود ئەحمەد
چاپخانەی - بەلەدییە - سلەیمانی - ١٩٤٧ز.
٣٢ - (گاڵتەوگەپ) - پیرەمێرد
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٤٧ز.
٣٣ - (کۆچی پێنج سەفەر، بۆ هەموو بەشەر) **مەلاحامید حەمدون زەکی**
چاپخانەی - ژیان - سلەیمانی - ١٩٥٢ز.
٣٤ - (پەیامی کورد)، گۆران
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٤ز.
٣٥ - (شەرو ئاشتی) - حەمەساڵح دیلان
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٤ز.
٣٦ - (کوندە پەپوی شەر) - حەمەساڵح دیلان
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٤ز.
٣٧ - (کچ و قوتابخانە) - فەتاح کەریم
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٦ز.
٣٨ - (ئاوو ئەلەکتریك لە سلەیمانی) ئیدارەی ناوخۆ
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٦.

٣٩ ـ (گەشتێك لە ئەوروپادا)، مەحمود فەهمی هەمەوەند
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٦ز.
٤٠ ـ (ناڵەی لێقەوماو) ـ نوری وەشتی
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٧ز.
٤١ ـ (سکاڵای دایکی نیشتمان) ـ مەلا حامید حەمدون زەکی
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٢ ـ (تێبینیەك لە ئابووری سیاسی) کەریم زەند
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٣ ـ (پشیلەو بەنگ کێش) ـ قادر برسی
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٤ ـ (شانازی) ـ کامەران
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٥ ـ (فرمێسك و یادگار) ماجید عەبدوڵڵا
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٦ ـ (ئاگرو ژیلە) ـ کامەران
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٧ ـ (گوڵزاری کوردستان) ـ عوسمان عوزەیری
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٨ ـ (ئامۆژگاری) ئەحمەد شوکری
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٤٩ ـ (هۆنراوەی نوری شێخ ساڵح) ـ نوری شێخ ساڵح
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥٠ ـ (زرەی زنجیر) ـ مستەفا ساڵح کەریم
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥١ ـ (گردی شەهیدان) محەررەم محەمەد ئەمین
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥٢ ـ (زۆرداری تاوانبار) ـ فوئاد عیزەت

چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥٣ ـ (ئەمرەکەی بەگم) ـ ئەمین میرزا کەریم
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥٤ ـ (زوبان چۆن پەیدا بوە؟) ـ سالار مستەفا قەرەداخی
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥٥ ـ (وەرگێران هونەرە) ـ جەمال نەبەز
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٨ز.
٥٦ ـ (ئاگاداری ئەمانەت) ـ شیخ محەمەدی خاڵ
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٥٧ ـ (بەکورتی جوگرافیای کوردستان) ـ کەریم زەند
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٥٨ ـ (نەتەوەی کورد تورکمان نیە) ـ ساڵح قەفتان
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٥٩ ـ (مێژووی جولانەوەی مامۆستایان) عوسمان عوزێری
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٦٠ ـ (مێژووی شەڕی ئەهلی سەلیب) ـ محەمەد جەمیل عوسمانی
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٦١ ـ (چواردەی تەموز) ـ ئەورەحمان
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٦٢ ـ (شۆڕشی بەرزان) ـ محەڕڕەم محەمەد ئەمین
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٦٣ ـ (دۆست و دوژمنمان کێن؟) ـ ئەمین میرزا کەریم
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٦٤ ـ (کونگرەی یەکەمی لاوان) ـ غەفور میرزا کەریم
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٦٥ ـ (ئاشتی) ـ نەقابەی مامۆستایانی سلەیمانی
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.

٦٦ - (یادی کوردستان) - عەبدول کەریم ڕەباتی
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز
٦٧ - (هۆنراوەی نوێ) - محەمەد سەعید ناکام.
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز
٦٨- (سروود بۆ قوتابیان) - بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی سلەیمانی:
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٩ز
٦٩ - (هەمیشە بەهار) چاپی‌دوەم - مەدهۆش
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٠ - (کسپەو سۆز) - جەمال شاربا ژێری
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧١ - (گوڵاڵە سورە) - کامەران
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٢ - (کۆمەڵە شیعرێك) - هۆگرگۆران
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٣ - (محەمەد قودسی نەمر) - کامەران
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٤ - (یادی بادینان) - م. رەسوڵ
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٥ - (دەرەبەگی)
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٦ - (مژدە) - ئەحمەد شوکری
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٧ - (گوڵ ئەستێرە) - کامەران
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٨- (شۆرشی گوێ بەندەرەکە) - جیهان عومەر
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.
٧٩ - (ئەم برسێتی‌یە بۆ؟) - کەمال محەمەد تاهر
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.

٨٠ ـ (ڕێگای ئازادی) ـ محەڕڕەم محەمەدئەمین
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٨١ ـ (لە کۆڕی خەباتا) ـ حسەین عارف
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٨٢ ـ (لەپێناوی دادپەروەرییا) ـ عوسمان عوزێری
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٨٣ ـ (مۆمیا) مستەفا بەرزنجی
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٨٤ ـ گیروگرفتی توتن) ـ عەلی ناجی عەتار
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٨٥ ـ (پێبکەنە) ـ ئەحمەد شوکری
چاپخانەی کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٥٩ز.
٨٦ ـ (ڕێگای ڕاستی حەج) ـ ڕەزا حاجی عەبدوڵڵا
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ١٩٦٠ز.
٨٧ ـ (سۆرانی یا کرمانجی؟) ـ س. هەژار
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٨٨ ـ (هەندێك زاراوەی زانستی) ـ جەمال نەبەز
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٨٩ ـ (زاراوەی زانستی کوردی) ـ نەقابەی مامۆستایانی ـ سلەیمانی
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٠ ـ (فەرهەنگی خاڵ) ـ شێخ محەمەدی خاڵ
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩١ ـ (ڕێزمانی کوردی) ـ نوری عەلی ئەمین
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٢ ـ (میـژووی کوردو کوردستـان) عەبـدوڵڵا شاڵی. چاپخـانەی کامەران ـ سلیمانی ١٩٦٠ز.
٩٣ ـ (شۆڕشی ئاگریداخ) ـ کاکەی ڕیبوار

چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٤ ـ (چارەکردنی ناکۆکیەکانی ناوگەل) نووسینی: ماوتسی‌تۆنگ، وەرگێڕانی: ـ محەمەدی مەلا کەریم.
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٥ ـ (ئومی‌یەت و نەتەوایەتی) ـ وەرگێڕانی گۆران
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٦ ـ (سەرنجێکی مارکسی لەنینی) ـ لە بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی ئازادی
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٧ ـ (لەبنچینەکانی لەنینیەت) ـ وەرگێڕانی: حسەین عارف
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٨ ـ (مەبدەئە بنەڕەتیەکانی فەلسەفە) ـ وەرگێڕانی: محەڕڕەم محەمەد ئەمین
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
٩٩ ـ (شۆڕشی هونەر) ـ فەتاح کەریم (کاوە)
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
١٠٠ ـ (سروود بۆ قوتابیان) ـ نوری عەلی ئەمین
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
١٠١ ـ (گردی شەهیدان) ـ محەڕڕەم محەمەد ئەمین
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
١٠٢ ـ (جوان) ـ مەحمود ئەحمەد
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
١٠٣ ـ (شەهیدانی قەڵای دمدم) ـ مستەفا ساڵح کەریم. چاپخانەی ژین ـ ١٩٦٠ز.
١٠٤ ـ (زێڕین) ـ ئەمین میرزا کەریم
چاپخانەی ـ کامەران ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
١٠٥ ـ (بیرەوەری) ـ ڕەشید کەریم
چاپخانەی ـ ژین ـ سلەیمانی ـ ١٩٦٠ز.
١٠٦ ـ (کۆنگرەی ناوخۆیی مامۆستایانی کورد) ـ نەقابەی مامۆستایان لە

سلەیمانی
چاپخانەی - کامەران - سلەیمانی - ١٩٦٠ز.
١٠٧ - (زیکرا موحارەبەی بەندەگان) - سالمی ساحێب قڕان
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٤١ز.
١٠٨ - (دوانزە سوارەی مەریوان) - پیرەمێرد. چاپی دووەم
چاپخانەی - ژین - سلەیمانی - ١٩٥٩ز.

سەرچاوە:

---

١ - کتێبی بیبلۆگرافیای کتێبی کوردی)
نوسینی: مستەفا نەریمان سالّی ١٩٧٧ز.

* * *

## (کتێبخانەکان و کتێبخانەی گشتی)

١ ـ کتێبخانەی (مەلا عەلی سەحاف)، یەکەم کتێبخانە بووە لە سلەیمانی لە ساڵی ١٩١٨ز دامەزراوەو ئێستا نەماوە. بەرامبەر دوکانی خەلفە فەرەجی وەستا تۆفیقی کەبابچی.

٢ ـ کتێبخانەی (قادراغای عەتار)، لە ساڵی ١٩٢٥ز دامەزراوە لە ناوبازاڕ بووە بەرامبەر حاجی عەلی ماستاو، دوایی گوێزایەوە بۆ شەقامی سابونکەران.

٣ ـ کتێبخانەی (ئازادی)، بە ناوی مەحمود ئەحمەد ڕەواندزیو محەمەد خدری شەریکی یەوە، لەساڵی ١٩٤٠ز دامەزراوە لە جێگای ئێستای وەستا عەلی سەعاتچی نزیکی دائرەی بەریدی کۆن لە شەقامی مەولەوی.

٤ ـ کتێبخانەی (بیری نوێ)، لە ساڵی ١٩٤٤ز دامەزراوە لە شەقامی مەولەوی خوار گەرماوی قشڵەو خاوەنەکەی (ئەحمەد غەفوور) بوو.

٥ ـ کتێبخانەی (ڕوناکی)، لە ساڵی ١٩٤٥ز دامەزراوە. لە شەقامی مەولەوی بوو لە بەردەمی گەرماوی قشڵەو خاوەنەکەی (جەمال عەبدوڵڵا) بوو.

٦ ـ کتێبخانەی (کوردستان)، لە ساڵی ١٩٤٦ز دامەزرا لە شەقامی مەولەوی لەسەر پردەکە، خاوەنەکەی (کەمالی میرزا کەریم)بوو.

٧ ـ کتێبخانەی (گەلاوێژ)، لە ساڵی ١٩٥٠ز دامەزرا لە شەقامی مەولەوی،

ئیستاش ماوە و خاوەنەکەی (ڕەئوف مەعروفە).
٨ ـ کتێبخـانـەی (زێـوەر)، لە ساڵی ١٩٥٦ز دامەزرا لە شەقامی مەولەوی، ئێستاش ماوەو خاوەنەکەی (محەمەد عارفە).
٩ ـ کتێبخانەی (ئازادی)، لە ساڵی ١٩٥٨ز دامەزرا لە ناوبازاڕ، خاوەنەکەی (محەمەد ڕەسووڵ هاوار) بوو.
١٠ ـ کتێبخـانـەی (خـەبـات)، لە ساڵی ١٩٥٨ز دامەزرا لە شەقامی کاوە، خاوەنەکەی (بەکر جاهید) بوو.
١١ ـ کتێبخـانـەی (بیری نوێ)، لە ساڵی ١٩٥٨ز دامەزرا لە شەقامی کاوە خاوەنەکەی (نەوزاد نووری) بوو.

١٢ ـ مەحموود خاکی : [دەستگێر] ئەم پیاوە لەساڵی ١٩٤٩ز بەردەوام خەریکی کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامە فرۆشتنە.

سەرچاوە:

---

ڕەئووف مەعروف: خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژ.



## (کتێبخانەی بابانەکان)

لەکاتێکا کە بابانەکان مزگەوتی گەورەیان ئاوا کردەوە کردیان بە (مەدرەسە)و شێخ مەعرووفی نۆدێ (مودەڕسیان بوو)و لەوێدا کتێبخانەیەکی بەنرخی تیابوو. ئەمەش میری بابان تیا دانابوو جگە لەوەش هەر کتێبێکیان بخوێندایەوە دوای تەواو بوونی ئەیان نارد بۆ ئەم کتێبخانەیە، تا وای لێهات بوو بە کتێبخانەیەکی زۆر گەورەو بەنـرخ. تەنـانـەت (ئـەحمەد پاشای شۆڕشگێڕ) کە والی بوو لە (یـەمەن)، گەلێ کتێبی بەنرخی لەوێ کڕیو ناردی بۆ ئەم کتێبخانەیە، بەڵام بەداخەوە ئێستا چەند کتێبێکی کەم لەوانە ماون کە مۆری ئەحمەد پاشایان پێوەبوو.

هەتا ساڵی ١٩١٩ز نزیکەی شەش هەزار کتێبی زۆر بەنرخ لەم کتێبخانەیەدا کۆبـووبوەوە. بەڵام لەدوای کارەساتی بەدیل گرتنی (شێخ مەحموی نەمر) لە دەربەندی بازیان و هاتنی هێزی ئینگلیزەکان بۆ سلەیمانی، هەرچی کتێبێك لەم کتێبخانەیەدا بوو هەموویان هێناو لە حەوشی مزگەوتی گەورەدا سوتاندنیان و دوکەڵ و خۆڵەمیشی هەموو ناوچەکەی گرتەوەو زۆر بەداخەوە کە ئەم گەنجینەیە لەکیس چوو، تەنیا نزیکەی (٤٠٠) کتێبێك مابوەوە، ئەویش ئێستا زوربەیان لە کتێبخانەکەی ئەوقافی سلەیمانیان.

# (کتێبخانەی گشتی سلەیمانی)

کتێبخانەی گشتی سلەیمانی لە ساڵی ١٩٤٢ ـ ١٩٤٣ز بەنزیکەی (٥٠٠) کتێبێك و لە شوێنێکی بچوکا دامەزرا ئێستا خانویەکی گەورەی هەیە بەرامبەر مزگەوتی گەورەو هۆڵێکی گەورەی تیایەو ژمارەی کتێبەکانی گەیشتۆتە (٩٤٧٧) کتێب و گوڤارەکانی زیاترە لە (٤٠٠٠) گوڤارو گەلێ رۆژنامەو گوڤاریشی بۆ دێو مێـزو کورسی ریـك وپێکی تیایە بۆ دانیشتن و خوێندنەوە. هەمووکاتێك کتێب ئەدری بە هەمـوو خوینـدەوارێو بێجیـاوازی بەمەرجێ بناسرێ یان هەویەو دەفتەری نفوسی پێ بێ.

هەمـوو چەشنـە کتێبێـك لە کتێبخـانـە دەس ئەکـەوێو ئەدرێ بەمەرجێ ئاگاداری‌یان بکات.

ئێستا خویندەواران زۆر هاتوچۆی کتێبخانە ئەکەن و هیچ مانگێك نیە کە پتر لە (٢٠٠٠) کتێب نەخوێندرێتەوە.

لە ماوەی ساڵی ١٩٦٠ز دا زیـاتـر لە (١٨٠٠٠) خوێنـدەوار هاتـوچـۆی کتێبخـانـەی کردوەو (٧٣١٤) کتێبێش لەنـاو کتێبخـانـەدا خوێنراوەتەوە، وە (٧٤١٥) کتێب براوە بۆ دەرەوە بۆ خوێندنەوە.

کتێبخانە هەمیشە لە خزمەت کردنایەو کردنەوەشی بەم جۆرەیە: هەمورۆژێك بۆ پیاوان و ژنان بی‌جیاوازیو ژنان هۆڵی تایبەتی‌خویانیان هەیە:

١ ـ بەیانیان لە کات ژمێری (٨) تا (١)

٢ ـ ئێواران لە کات ژمێری (٣) تا (٥)

٣ ـ رۆژانی سێشەممەو جەژنەکان کتێبخانە نیە.

٤ ـ رۆژانی هەینی تەنیا بەیانیان لە کات ژمێر (٨) تا (١)

«کتێبخانەی گشتی».

سەرچاوە: رۆژی نوێ ژمارە یانزە ـ ١ی شوبات ساڵی ١٩٦١ز

تێبینی:ـ

بۆ یەکـەم جار لە سلەیمـانیـا کتێبخانەی گشتی لە قوتابخانەی زانستی‌یا کرایەوە نزیکەی (٢٠٠) ژمارەیە کتێبی تیابو.

# «ئەو دەستگاو زاتانەی کە خەلکیان فێریی خوێندەواریی کردوە »

لە گوڤاری هیوا

ژمارە (٥)

٨ی شوباتی ١٩٥٨

هەڵگری چرای زانستی: خواجە ئەفەنی

ناوی عەزیز کوڕی وەسماناغای لە نەوەی عەلیبانوو لە بنەماڵەی ناوداری دێی گەلاڵەیـە کە چ قەلاچوالان و چ لە سلەیمانی لەپێشتر پیاو بوون لەلای بابانەکان، وە هەر بە سەرۆکی هاتون تا دوارۆژی ڕۆژانی بابانەکان.

لە ساڵی ١٨٤١ز لەدایك بوەو لە ساڵی ١٩٤٢ز لەپاشی (١٠١) ساڵ ژیان هەر لە سلەیمانی کۆچی دوایی کردوە.

خوالیخۆشبو لە تەمەنی (٧) ساڵیا خوێنەوار بووە لەلای ماموٚستا مەلا سەعی گەورە خوێندویەتیو (ڕوشدیەی مەلەکی) تەواو کردوە.

لە تەمـەنی (١٨) ساڵیـا لەسەر وتەی ماموٚستای لەلایەن (کاك ئەحمەدی شێخ)ەوە پێیفەرموراوە بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك.

لە ساڵی ١٨٥٨زدا قوتابخانەیەکی کردەوە، بەوێنەیەکیوا بە قوتابی ئەخوێند کە سوودی تەواویان لێ وەرئەگرت، وە بوو بەهۆی هان دانی هەموو دانیشتوانی شاری سلەیمانی بۆ چوونەبەر خوێندن، گەورەو بچوك بەجارێ ڕوویان کردە ئەو شوێنە پیرۆزە کە بووبوو بە کانگای زانستی. لە چەند ساڵێکا وایلێهات کە کوڕە ئاغـاو کوڕە کوێخـاکانی لادێش ڕوویان تێکرد، بەجۆریکیوا خوێندەواری لە سلەیمـانیـا بلاوبـوەوە کە خواجـەفـەنی توانی هانیـان بدا بۆ کردنـەوەی قوتابخانەیەکی بەرزتر لەلای خۆی کە میری بۆیان بکاتەوە.

هەر لەســەر ئەو هان دانە (سەعی پاشای ـ سەدری ئەعزەم) کە خەڵکی سلەیمانی بووە دوابەدوای ئەم داواکردنەیان نامەیەکی ناردوە بۆ خواجەئەفەنی بە تورکی، ئەمە کوردیەکەیەتی:

(مـامـۆسـتـای بەڕێـز خواجـەفەنی ـ لە هەموو دەرو دیوانێکا چاکەبێژتم، بۆ کردنـەوەی قوتـابخـانەکە خەریکم، نابێ ئەو قوتابخانەیە لە پییت وپیرۆزی تۆ بێبەش بێ).

فەریق (تەحسین پاشای والی) کە هاتە سلەیمانی لە ڕیزەی گەڕانی بەناو شارا سەری لە قوتـابخـانـەکـەی خواجـەفـەنیش دا لە وێنەی پێخوێندنیو ڕیکوپێکی قوتابیەکانی خۆشحاڵ بوو لەسەر ئەم پێخۆشبونەی لەسەر کیسەی میری قوتابخانەکەی بۆ ڕێك خست و کورسیو مێزی بۆ دروست کردو بە بەزم و ئاهەنگێکی گەورەو بەفەرەوە لەگەڵ هەموو پیاوە گەورەو بەڕێزەکانی سلەیمانیو بەئـاوازی مۆسیقـای عەسکـەریـیـەوە لە بەردەمی قوتـابخـانـەکـەیا پیرۆزی خواجەئەفەنیان کرد، لەپاشا دوو ڕێگەی بۆ خواجەئەفەنی دانا:

١ ـ قوتـابخـانـەکەی بکا بە ڕەسمیو بە ناوی (تەحسین)ەوە ناوبنرێ، ئەگەر ئەمەش پەسەند نەکرا.

٢ ـ لەگەڵیا بچێت بۆ (ئەستەموڵ) لەوێ بیکا بەمەئموورێکی گەورەو زبانی دایە کە بیکا بە (شێخول ئیسلام).

بۆ ئەم دوو خواستە (وەسماناغای) باوکی ماوەی نەداو هەر لە سلەیمانی چرای زانستی ڕۆژبـەڕۆژ لە برووزا بوو، لەو قوتابخانەیە کە (سەعی پاشا) بەنـاوی (ڕوشدیەی عەسکەری)یەوە لە سلەیمانی کردیەوە کرا بە مامۆستاو دەرسی تیا ئەوەتەوەو دەمێکی فەرەنسیشی ئەدا بە قوتابیە پێشکەوتوەکان.

خواڵێخۆشبوو لە تەمەنی (١٨) ساڵیەوە تا ساڵێ پێش کۆچ کردنی دوایی لە پێگـەیـانـدن و پێشـخستنی زانستی لە سلەیمـانی بێوچـان لە کۆشش و هەوڵ دانا بوە.





● فوتابخانەی زانستی - ١٩٢٩



● گواستنەوەی تەرمەکەی نەجمەدین مەلا بۆ ئەزمڕ ٤/٥/١٩٧٠



● خواجه ئەفەندی ١٨٤١ - ١٩٤٢



● نەجمەدین مەلا ١٩٠٢ - ١٩٦٢



● مەلا کاکە حەمەی حاجی
سەیفوڵڵا ١٨٩٠ - ١٩٦١

له ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (١٦٦٥)
لاپەڕە (٥)
پێنج شەمەو ٢٢/٢/١٩٦٢ز

## (زانایەکی نەمر مامۆستا مەلا کاکەحەمە)

**بەپێنووسی: مامۆستا نەجمەدین مەلا**

مامۆستا مەلا کاکەحەمە کوڕی (حاجی سەیفوڵڵا) لە بنەماڵەیەکی زانیاری‌یە لە ساڵی ١٨٨٤ز هاتۆتە دنیاوە. خاوەنی سەرگوزەشتە دەستی لە دنیا هەڵگرتبو، هەموو ژیانی خۆی بۆ ڕێی زانیاری تەرخان کردبو، شاری بەجێ‌هێشتبوو لە دێهـاتـەکانا بە هەزاران خوێنەواری پێ‌گەیاند. جگە لەوەش ئەم کتێبانەی لە عەرەبی‌یەوە کردوە بە کوردی.

١ ـ تەفسیری قورئان هەر سیی جزمەکەی بەکورتی.
٢ ـ مینهاجی نەوەوی بە تحقیقاتی ئیبنووحەجەرەوە.
٣ ـ وەزع.
٤ ـ ئیستیعارە.
٥ ـ لەعیلمی مەنتیقا ئیساغۆجی.
٦ ـ تەهزیبول کەلام وتەشریحول ئەفلاك.
٧ ـ قەواعیدی کوردی.
٨ ـ گەلێ کتێبی مەکتەبی بەکوردی داناوە وەکوو: مێژوو، ژمارە، تەندروستی، هەندەسە.
٩ ـ هەندێ لە قانوونەکانی عیراق

ئەم پیاوە زانایە ڕۆژی (١٠)ی مایسی ساڵی ١٩٦١ز کۆچی دوایی‌کردوەو لە گردی سەیوان نێژرا. ئێستاش جەلال بە جەماڵەوە لەسەر ڕێی ئەو ئەڕۆن.



## (قوتابخانەی زانستی کوردان)

ڕۆژنامەی ژین

ژمارە ١٥٧٩ دووشەممە

١٩٦٠/١٢/٢٦

دامەزراندنی زانستی

[لای من بەخوێندەواری‌یە ئا خوێندەواری‌یە هەر میللەتێ کە فەننی نەبی دەردی کاری‌یە] لەبەرئەوە ڕۆڵە دڵسۆزەکان چاکی مەردانەیان لێ هەڵماڵیو کەوتنە خۆ، لە ساڵی ١٩٢٦زدا لە شاری سلەیمانی‌دا یەکەم کۆمەڵێکی ئاشکرا بە ناوی (کۆمەڵی زانستی)یەوە پێك هاتوە، دەستەی دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵە لە (ڕەفیقەفەندی فایەق بەگی مارف بەگ و ڕەمزی ئەفندی فەتاح). دەستەی دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵە لە نیسانی ساڵی ١٩٢٦زدا لە بینای بەلەدیەی سلەیمانی گردبوونەوەو دەستــەی بەڕێـوەبـەری کۆمەڵی زانستیان هەڵبژارد کە بریتی‌بوون لەم زاتانە (ئـەحمەد بەگی تۆفیق بەگ کە موتەسەڕیفی سلەیمانی بوو کرا بە سەرۆکی کۆمــەڵ و جەمــال بابــان کە حاکمی مونفەریدی سلەیمانی بوو کرا بە نائبی سەرۆکی کومەڵ و پیرەمێرد کرا بە باوەڕپێکراوو سکرتێرو فایەق بەگی مارف بەگ کرا بە محـاسب و شێخ مستەفا قەرەداخی کە قازی سلەیمانی بوو لەگەڵ ڕەمزی فەتاح و غەفووراغاو حەمەی ئەورەحماناغاو عیزەت بەگی وەسمان پاشا کران بە ئەندام.

ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگ کە سەرۆکی کۆمەڵەکە بوو هەوڵێکی زۆری دا بۆ سەرگرتنی کاروباری ئەو کۆمەڵە، (حەپسەخانی نەقیبیش) توانی لقێك بکاتەوە بۆ ئافرەتان.

لە پێك هێنانی زانستیيەوە تا شەڕی بەردەرکی سەرا کە لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠زدا ڕوویدا گەلی ئاڵ وگۆڕ بەسەر دەستەی بەڕێوەبەرا هات، تا لە شەشی ئەیلوولا زانستی داخرا.

لە ساڵی ١٩٣٢زدا کە ئەحمەد بەگی توفیق بەگ کرایەوە بە موتەسەریفی سلەیمانی، سەرلەنوێ هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دا تا توانی قوتابخانەی زانستی ـ کۆمەڵی زانستی ـ پێك بهێنێتەوەو ئەم جارە دەستەی بەڕێوەبەری‌زانستی بریتی‌بوو لە:

(ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ سەرۆك و یەکتابەگ کە سەرۆکی شارەوانی بوو لەگەڵ پیرەمێردو ڕەشید زەکی ـ ڕەشید کابان ـ و کەریمی سەعی بەگ «زانستی» دوای ئەوەی بۆجاری دووەم ئەحمەد بەگ لە سلەیمانی گوێزرایەوە ئیتر پیرەمێرد کرا بە سەرۆکی کۆمەڵ، کۆمەڵێکی زانستی هەرچەندە کۆمەڵێکی زانستی بو بەڵام لەڕاستیا گەورەترین قوتابخانەیەك بوو بۆ پێگەیاندنی دەستەیەکی تازەی نیشتمان پەروەر، وە کارێکی بەهێزی کردە سەر بوژانەوەو جووڵاندنی هێزی نەتەوایەتی لەناو گەلی کوردا.

کاربەدەستانی میری ئەوسا زۆر سڵیان لەم کۆمەڵە ئەکرد، بە هیچ جۆرێ دەستی یارمەتیان بۆ درێژ نەئەکرد، (قوتابخانەی زانستی) کە پێویستی بە پارە بوو. بۆ جێبەجێکردنی کاروباری خەڵکی سلەیمانی بۆ ئامادەکردنی ئەو پێویستیانە دریغیان نەکرد، ئەو گەنجە تازەپێگەیشتوانەش کە بۆ خوێندن چووبوونە بەغاو گەڕابوونەوە بە گیانێکی پاك و هەستێکی زۆر بەرزەوە، هەموو خۆیان تەرخان کردبوو بۆ دەرس و لە قوتابخانەی زانستی‌دا بە بێ‌پارە.

## (قوتابخانەی زانستی خزمەت کردنی زانستیو
## جەژنی نەورۆز، دڵی پاك و زبانی پاك و کردەوەی چاك)

- قوتابیانی زانستیو شەشی ئەیلوول -

دانشتوانی سلەیمانی ئەوکاتە یەکجار کەم درامەت بوون، ئەو قوتابیانەی کە لە زانستیا ئەیانخوێند زوربەیان کاسبکارو کرێکارو کەم دەس بوون، بەلاّم یەکجار بەپەرۆش بوون بۆ فێربوون و خوێندەواری، زۆربەی ئەوانەی کە جاران بە شەرەگەرەك و شەرە قۆچەقانیو گەرۆکیەوە خەریك بوون، بەهۆی قوتابخانەی زانستییەوە وازیان لە هەموو هێناو ملیان نا بۆ خوێندن و نووسین.

لەبیرم یە منال بووم ئێواران تاقم تاقم دەفتەرو کتێبیان لە بن دەسا بوو روویان ئەکردە زانستی، منیش جاروبار لە دەرگای قوتابخانەکەوە تەماشام ئەکردن کە چۆن لە حەوشەی قوتابخانەکەدا تاقم تاقم ئەوەستان جاروبار پیرەمێرد یادئەکەمەوە بە خۆیو گۆچانەکەیەوە لەناو ئەو قوتابیانەدا ئەوەستاو شانی هەڵ ئەتەکانوو گوێی شل ئەکرد بۆ ئەو وتارو شیعرانەی کە قوتابیاکان ئەیان وت... لە سەرەتاوە بە سروودە تایبەتییەکی مامۆستا شاکیر فەتاح دەستیپێئەکرد. کە قوتابیەکان دەنگیان

بەرزئەکردەوە ئەگەیشتە کەشکەلانی فەلەك، من بەو منالّیەوە مووچرکەم پیا ئەهاتو هەردوو چاوم فرمێسکی شادی لێ ئەتکایە خوارێ:

وا وەرن وا وەرن کۆمەڵی لاوان
یەك گرین پێش بخەین زانستیمان

زانستی جیگەی عیلم و عیرفانە
شوێنی سەربەرزی قەومی کوردانە
وا وەرن لاوەکان یەك گرین یەك گرین
زانستی راگرین
ئێمەو لاوی هەموو میللەتی سەرزەمین
هەوڵ ئەدەین بۆ بڵاوکردنەوەی زانین
بۆیە وا گەورەن و بەرزن و دووربین
ئێمە پاش کەوتووی دەستی نەزانین
وا وەرن لاوەکان یەك گرین
زانستی راگرین.
یاریدەی لاو نەبێ، هەڵەتی لاو نەبێ
هەوڵ و کۆششمان شەو لەگەڵ رۆژ نەبێ
بۆ بڵندکردنەوەی زانستی کوردان
ناگرین ناگرین جێگەمان ون کەین نیشتمان
وا وەرن لاوەکان یەك گرین یەك گرین
زانستی راگرین.

زانستی هەموو ساڵێ لە بەهارا، بەتایبەتی لە رۆژی (نەورۆزا) سەیرانێکیان ئەکردو ئاگری نەورۆز ئەکرایەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ روویان ئەکردە دەشت بۆ یادکردنەوەی رۆڵەی چەکوش وەشێنی.. یادی کاوەی ئاسنگەر، سەر پان کەرەوەی زوحاکی نموونەی خوێن مژو زۆرداری کوردیان ئەکردەوە:

(یادکەن برادەر یادکەن یادی کاوەی ئاسنگەر)
(سەر رێو شوێنی بگرن تاکوو وەتەن بێتەدەر)

ئەمە ئەو تاکە دێرەیە کە لەبیرم ماوە لەو سروودە نیشتمانیەی کە شاگردانی ئەوسای زانستی بەدەم رۆینی سەیران و نەورۆزەوە ئەیان وت، سروودە بەرزو تەقەدومیەکەی خوالێخۆشبو (عەبدول واحید نووری)یەکێ بوو لەو سروودانەی کە قوتابیانی زانستی ئەیان وت لەو کۆبوونەوەیەدا کە لەپێش دابەش بوون بەسەر پۆلەکانا ئەوترا:

ڕاچڵەکێن و وریا بوین
ڕاپەڕین و هوشیار بوین
بەرگی جەهالەتمان دڕان
تا بە جاهیلی نەمرین
ئەژین، ئەژین، ئێمەش وەك عالەم ئەژین
ژیانێکی شێرانە، وەتەن ئەکەین بە لانە
ئەپیارێزین لە میکرۆب، لە میکرۆب و بێگانە
نەژی، نەژی، دەردی جەهالەت نەژی
نەژی، نەژی، دەردی عەتالەت نەژی

زانستی ژمارەی پۆلەکانی گەیشتبوە پۆلی شەشەم و شەهادەکەی بە شەهادەی پۆلی شەش ئەژمێررا، هەرکەسێ کە زانستی تەواو بکردایە شەهادەیەکی ئەدرایە کە لێی‌نوسرابوو:
(کۆمەڵی زانستی کوردان، لەخواریەوە نوسرابوو دڵی پاك زبانی پاك و کردوەی چاك).
کە وەکو مامۆستا شاکیر فەتاح ئەڵێ ئەم دروشمە لە ئاینی زەردەشتی‌یەوە وەرگیرابوو.
ژمـارەی قوتـابیانی زانستی گەیشتبوە (٢٥٠) کەس، وە لەبەر بێ‌جێگەیی ناچار ئەبوون دەستیان ئەنا بە ڕووی زۆر کەسەوە، تەنانەت جوولەکەکانی ئەوسای سلەیمانی ژمارەیەکی زۆریان لە زانستی ئەیانخوێند.
قوتـابیـانی ئەم قوتـابخانەیە بەشی زۆریان لە شەڕی شەشی ئەیلوولا ئەبوون بە پێشمەرگەو سنگیان ئەنا بەگوللەوە...
جووڵانەوەی هێزی نەتەوایەتی گەیشتبوە ڕادەیەك بە هیچ جۆری جۆشی دانەئەمردەوە.
پرۆگرامی خوێندن لە زانستی‌دا نەختێ دەسکاری کرابوو لەچاو قوتابخانەکانی‌تری میری‌یا، کوردی، حساب، مەعاریفی عامە، چەند جارێکیش دەرسی ئینگلیزی ئەخوێنرا، شەوانی شەموان لە هەموو هەفتەیەکا تەرخان کرابوو بۆ شیعرو خیتابەو گاڵتەوگەپ و پێکەنین و بەزم ورەزم، وە یاری دومبەڵەو شەوەدا ئەکراو مامۆستاکان هەوڵیان ئەدا کە شاگردەکان فێری شەرم و تەریق نەبوونەوە ببن، کەم ڕوویی‌و شەرم کردن گەورەترین کۆسپێکە لەڕێی قوتابیانی زانستیا لە سەرەتادا، بەڵام لەدواییا وایان لێ‌هات هەموو

ڕوویان کرایەوەو شاعیرو خەتیبیان لێ‌هەڵکەوت... زۆر باشم لەبیرە کە (بەنگینە) ئەهاتە دەرەوەو شیعـرەکـانی خۆی بۆ ئەخوێندەوە هەروەها (حاجی عەلی ماستاو) یش لەو قوتابیانە بوو کە ئەهاتە دەرەوەو قسەی ئەکرد.

چەنـد جارێ لەسەر شانۆی زانستی چەند چیرۆکێکی ناو کوردەواری پێشکەش کراوە وەك (مەم وزین، مەحمواغای شیوەکەڵ)و گەلێ چیرۆکی‌تر.

بۆیە ئەم جارە کتێبخانەی گشتی لە قوتابخانەی زانستیا کرایەوە چونکە (٢٠٠) ژمـارەیـە کتێبی تیـابـوو، هەروەهـا پیشـانگـەیـەکیش (مـەعـرەز) لە ئیشی دەسی شاگـردانی‌قـوتـابخـانـە کە پێك هاتبوو کە بریتی‌بوو لە دارتاشی‌و چەخماخ سازی‌و بەرگ درووییـو ئاسنگـەری، ئەو شتانەی لەو پیشانگەیەدا دانرابوو هەمووی لەلایەن هاووڵاتیەکانەوە کڕران.

بەڵام لە ساڵی ١٩٣٦ز بەدواوە وردە وردە دەرامەتی زانستی هاتەکزی‌و پارەی لێ بڕا و لە ساڵی ١٩٣٨زدا ئیجازەی زانستی لەغوکرایەوەو قوتابخانەی زانستی خرایە سەر قوتابخانەکانی میری، بەم پێیە لاپەڕەکانی مێژووی تێکۆشانی گەلی کوردیش هەڵدرایەوە.

جگە لەوەی لە ڕۆژنامەی (ژین)دا ئەم باسە بڵاوکراوەتەوە خۆشمان توانیمان گەلێك شتی‌تـر دەربـارەی ئەم باسـە کۆبکـەینـەوەو زیـاتر ڕوونی‌کەینەوە، ئەویش بەهۆی پەیوەندی‌کردن بەوخەڵکەوە کە ئاگاداری‌یان هەیەو یاخۆیان ئیشیان تیا کردوە، وا لێرەدا پێشکەش ئێوەی خۆشەویستی ئەکەین.

نیشتەجێ‌بوونی قوتابخانەی زانستی کە لە ساڵی ١٩٢٦زدا بوو لە ماڵی (جەمیل بەگی بابان) بوو کە باوکی (تایەر بەگە) بۆ ماوەی ساڵێ لەوێدا بوو، دوای ئەوە (تۆفیق قەزاز) کڕی‌و کردی بەم بینایەی کە ئێستاپێی‌ئەڵێن (قەسرەکەی تۆفیق قەزاز).

دوای ئەم ساڵە گوێزرایەوە بۆ ماڵی (مەلا حەکیم) لە گەڕەکی سابونکەران.

لە ساڵی ١٩٣٥زدا قوتـابیانی زانستی شانۆیی‌یەکیان پێشکەش کرد لەژێر ناوی (شێرۆو نازەنین) وە پارەکەی کرا بە چوار ژوور لە شوێنی قوتابخانەی ئێستای گوێژەی کوڕان وە ئەم قوتابخانەی زانستی‌یە کە لە ساڵی ١٩٣٨زدا ئیجازەی لێ سەنرایەوە لەلایەن میری‌یەوە خرایە سەر قوتابخانەکانی تری میری

وە لەدواییدا بوو بە قوتابخانەی سانەوی شەو.

ماموستاکانی قوتابخانەی زانستی هەموویان بەبێپارە دەرسیان ئەوتەوە، وە لە یەکەم جارا سێ پۆلی لێ کراوەتەوە.

لە سەرەتای دامەزرانیا ئەوانەی دەرسیان ئەوتەوە ئەم زاتانە بوون:

١ ـ بەرێز سەعی قەزاز دەرسی ئینگلیزی وتوەتەوە

٢ ـ بەرێز ئەحمەدی عەزیزاغا دەرسی کوردی وتوەتەوە

٣ ـ بەرێز فوئاد رەشید بەکر دەرسی عەرەبی وتوەتەوە

٤ ـ پاش ماوەیەك (کەریم بەگی سەعی بەگی سلێمان بەگ) کە ناسراوە بە (کەریم بەگی زانستی)بووە بە بەرێوەبەرو خۆشی هەر دەرسی وتوەتەوە، دوای ماوەیێتر ئەم ماموستایانەش دەرسیان وتووەتەوە:

٥ ـ بەرێز سالح قەفتان

٦ ـ بەرێز رەفیق حیلمی

٧ ـ بەرێز مەلا سەعی کابان

٨ ـ بەرێز عەبدول واحید نووری

٩ ـ بەرێز فایەق بێکەس

١٠ ـ بەرێز عەبدوڵڵا گۆران

١١ ـ بەرێز نووری حاجی سالحاغا

١٢ ـ بەرێز مستەفا سائیب

١٣ ـ بەرێز نووری شێخ سالح

١٤ ـ بەرێز مەلا سدیق

١٥ ـ بەرێز سەی کەریمی سەی ئەحمەد

١٦ ـ بەرێز فایەق زێوەر

١٧ ـ بەرێز رەشید کەریم

١٨ ـ بەرێز خەسرەوی حاجیاغا

١٩ ـ بەرێز حەمەپاشای عەبدوڵڵا ناجی

٢٠ ـ بەرێز فەهمی قەفتان

٢١ ـ بەرێز رەوف ئەحمەد ئەفەنی

٢٢ ـ بەڕێز بەهجەتی عەونی ئەفەنی .
٢٣ ـ بەڕێز عەزیزی میرزا ساڵح
٢٤ ـ بەڕێز شێخ حەسەنی شێخ حەمەمارف
٢٥ ـ بەڕێز شێخ ئەبوبەکری شێخ جەلال (هەوری)
٢٦ ـ بەڕێز غەنی ئەفەنی شاڵی
٢٧ ـ بەڕێز عەبدول قادر حیشمەت

دوای کەریم بەگی زانستی مامۆستا شێخ ئەبوبەکری شێخ جەلال (هەوری) بوو بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و جگە لەو مامۆستایانەی ناومان بردن چەند مامۆستایەکیتریش دەرسیان وتوەتەوە.

هەروەها لقی زانستی بۆ ئافرەتانیش کرایەوە لە ساڵی (١٩٢٩ ـ ١٩٣٠)دا بۆ فیرکـردنی حیســاب و کوردی ئەمــەش ساڵیکی خایاندو شەڕی بەردەرکی سەرای بەسەراهاتو داخرا.

هەروەها شوێنەکەی بەرامبەری ماڵی شێخ قادری حەفید کە ئەوسا ئەرزە بوە خوالێخۆشبو (حەپسەخانی نەقیب) بەخشی لەپێناوی ئەم مەبەستەدا وە لەلایەن میرییەوە کرا بە قوتابخانەی کچان، وە کە لقی زانستی کراوەتەوە (٥٠) پەنجا قوتـابیەك بوون وە لەو قوتابیانە (حەپسەخانی نەقیب و حەلاوە خانی خێزانی قوتـابیـەك بوون وە لەو قوتـابیـانە [حەپسەخانی نەقیب و حەلاوە خانی خێزانی رەمزی فەتــاح و ئامــیـنــە خانــی خێــرانــی عەفووراغاو پیرۆز خانی خێزانی فایەق بەگی مارف بەگ و مەلیحەخانی خێزانی ئەورەحمــان جادرو ناهیـدەخـانی خێزانی ساڵح سەعیو کامیلەخانی خیزانی عیزەتیتەل و زەکێخانی خێزانی شێخ نووری شێخ ساڵح بوون] .



## (مامۆستا نەجمەدین مەلا)

مامۆستای دڵسۆزی کورد نەجمەدین مەلا کوڕی مەلا ئیبراهیم کە لەکاتی دروست بوونی شاری سلەیمانیو گەشداری فەرمان ڕەوایی بابانییەکان لەسەر خواستی (ئیبـراهیم پاشا) باپیرە گەورەی لە قەڵاچوالانەوە هاتۆتە سلەیمانیو بووە بە مامۆستا لە مزگەوتێکا.

لەپـاش جێ گیـیربـوونی ئەم بنەماڵەیە لە سلەیمانی لە ساڵی (١٩٠٢ز)یا نەجمەدین مەلا لە شاری سلەیمانی لەدایك بووە وە مامۆستا نەجمەدین هێشتا منـاڵ ئەبێ (ڕشـانەوەکە) داهاتوە وە بوەتە هۆی مردنی زیاتر لە هەزارەهای ڕەش و ڕووتی ئەم ناوچـەیـە، سەرەڕای دەربـەدەربـوونی دانیشتـوان بەرەو دێهاتەکان، هەر ئەمەش بوەتە هۆی ئەوەی کە مەلا غەفووری باوکی بە خۆیو خاووخێزانەوە بچێتە دێی (ڕەشەکانی).

خوێندنی لەلای (حاجی مستەفای قازی)و لەلای باوکیو پاشان لە سلەیمانی لە قوتابخانەی (ئەعدادیەی مەلەکی)و بە پلەی یەکەم دەرچووە.

شایـانی باس ئەوەیە مامۆستا نەجمەدین مەلا هەموو ژیانی پڕئەشکەنجەو کارەساتی جگەربڕ بوە، هەرچەندە ماوەیەکی زۆر کەم مووچەخۆری دەوڵەت بووە لە (ڕانیە) بەڵام حەزی لە ژیانی مووچەخۆری نەکردوە، بۆیە ماوەیە بێئیش بووە وە ماوەیـەکیش بە نووکی پاچ و خاکـەنـاز تەمـەنی هەرزەکـاری بردۆتەسەر، ماوەیەکیش دەربەدەر بوە لە شاری (حەڵەب)و ناچار بووە بە پاقلاوەفرۆشی خۆی ژیاندوە.

له زەمانی هێرشی تورکە عوسمانیەکانا (عەبدول مەجیدی) برای کە زۆر زاناو زیرەك بووە، تورکەکان گرتویانەو ڕەوانەی شاری حەلەب یان کردوە، هەر بەوداخەوە لە ساڵی (١٣٣٣)ی کۆچی باوکیان سەری‌نایەوە، ئەم برایەشی لە شەڕی جیهانی یەکەما براوە بۆ سەفەربەلك بە سەربازی‌و لە (ئەرزڕووم) شەهید کراوە.

هەروەها (عەلی) برای مامۆستا نەجمەدین مەلا کاتی خۆی لەسەر ڕووداوێکی کوشتن چوە بۆ ئێران و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردوە.

برایەکی‌تریشی بوە ناوی (حەمەبچکۆل)بووە ئەویش لە شاری سلەیمانی کۆچی دوایی کردوە.

مامۆستای خێرنەدیو حەزی لە ژیانی مەلایەتی نەکردوە وە زوربەی ژیانی خۆی بە دەرس وتنەوەوە لە قوتابخانەکەیا بردۆتە سەر، وە سەبارەت بە ژن هێنانی، هەندێك ئەڵێن کە گوایە ژنی نەهێناوە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە گوایە لە دەس نووسەکانی خۆیا ناوی ئەمەی نەهێناوە، بەڵام لەڕاستیا ژنی هێناوەو ژنەکەی ناوی (فاتمەخان) بووە، وە کچێکی لێی بووە بەڵام ئەم کچە تەمەنی کورت بووەو کۆچی دوایی کردوە. هەر دوای ئەمە مامۆستا بە ماوەیەکی کەم دەستی لە خێزانەکەی هەڵگرتوەو لێی جیابۆتەوە.

مامۆستا هەمیشە خەریکی بووژاندنەوەی ئەدەبەکەمان بووە وە چرای ڕۆشنبیری‌و زانیاری بەرزکردۆتەوە لە پێناوی سوودی گشتی‌یا وە ژیانی خۆی تەرخان کردوە بۆ ڕۆشنبیری‌و زانیاری و شەونخوونی کێشاوە بەدیار ڕۆشن کردنەوەی ئەو دەس نووسانەی کە دەستی‌کەوتوەو بۆی گەڕاوە ئەم شارو ئەو شارو ئەم دێ‌و ئەو دێ بۆئەوەی بەرچاوی خوێندەوارانی خا.

مامۆستا خاوەنی (٩٠) چیرۆکە کە لە بەشی مناڵانا داینابوون وە بە هەستێکی ناسك و بە شێوازێکی ڕەوان ئەیخستە بابەتی گوێ ئاگردان و مناڵانی لە خۆی کۆئەکردەوەو چیرۆکە ناودارەکانی کوردەواریمانی بۆ ئەگێڕانەوە.

هەروەها نابێ لەبیرمان بچێ کە ماوەیەکی زۆر خزمەتێکی بە دڵ و بە گیانی ڕۆژنامەی (ژین)ی کرد بە شیعرو چیرۆك و مەتەڵ.

مامۆستا نەجمەدین مەلا دوای ئەوە نزیکەی (٦٥٠٠) شەش هەزارو

پێنج سەد نەخوێندەواری فێری خوێندەواری کردوە، سەدەها خەڵکی‌تری فێری ئەو زمانانە کردوە کە خۆی ئەیزانی وەکو فارسی‌و عەرەبی، وە نزیکەی (٢٠٠٠) دووهەزار شیعری شاعیری کوردی کۆکردۆتەوە بە قەڵەمە رەنگینەکەی کە ئێستا بوونەتە مایەی شانازی، وە لە کتێبخانەکەی خۆیا کە ناوی نابوو (کەشتی نووح) کە ئەویش بریتی‌بوو لە دوو دوکانی تاریکی نووتەك بەرامبەر بە توونەکەی گەرماوی موفتی بەوشێوەیە کوچی دوایی‌کرد کە هەمووماں ئەیزانین و پاش چەند رۆژێ پێزانرا ئەویش بەهۆی کرێکارانی رۆژنامەی (ژین)ەوە کە عەودالی ون بوونی مامۆستا بوون ئەمەش لە مانگی چواری ساڵی ١٩٦٢ز یا بوو، وە ئەوەبوو لە گردی سەیوان نێژرا بەڵام لەسەر وەسیەتی خۆی گوێزرایەوە بۆ شاخی ئەزمڕ. بەڵام لەکاتی کۆچ کردنیا نەتوانرا وەسیەتەکەی بەجێ‌بهێنرێ لەبەر هەندێ هۆی پڕ تەنگ وچەڵەمە لەو کاتەدا. هەر بەم بۆنەیەوە بەرێز (قادر برسی شاعیر) لە رۆژنامەی (ژین) ژمارە (١٦٧٧)ی ساڵی ١٩٦٢ی ز بە شیعرێکی زۆر جوان هەستی خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بە بەجێ‌نەهێنانی وەسیەتەکەی‌و ئەڵی:

کوا کەشتی نووح و کەشتیەوانەکەی؟.... لێلاییم دایە
ئاخۆ ناسۆری وەسیەت نامەکەی.... لە دڵمانایە؟
ئەی‌وت نەك بمرم لەناکاو لەپڕ.... لە لاکۆڵانێ
بە زوورناو دەهۆڵ بمبەنە ئەزمڕ.... با شار بزانێ
لەوێ بمنێژن بەرزو دیارە.... ئەڕوانێتە شار
هەروەك (پیرەمێرد) لای (مامەیارە).... بەهارەو بەهار
با مەزارەکەم بێتە سەیرانگا.... کە سەیرانتان کرد
ئاگر لای منیش کڵپ وهووڕ بکا.... کە نەورۆزتان کرد
ئاخری بێ‌ئاوات سەری نایەوە... هێنرایە (سەیوان)
ئۆباڵی وەسیەت وەك خۆی مایەوە.... بە ملی هەموان

بەڵام بێگومان وەسیەتەکەی مامۆستا هاتەدی لەکاتی وەرگرتنی بەیان نامەکەی (١١)ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ی‌ز لەسەر خواستی خۆی لە گردی

(سەیوان)ەوە بەرەو (ئەزمڕ) لە بیرەوەرییەکی زۆر گەورەو جوانا بەرێخرا بەرەو (ئەزمڕ)، وە بۆیە حەزی لەوە بوو کە (ئەزمڕ) ببێتە ئارامگەو جێگای بۆئەوەی هەمیشە چاوی لە کاژاوی گەردن کەشی (پیرەمەگروون)و (سوورکێو)و مەرزی (بابان)و (قەڵاچوالان)و (ئالان)و سلەیمانی قارەمان و (شارەزووری) بەهارتەڕو (هەورامانی) بەهەشت بێ.

سەرچاوە:

---

١ - ڕۆژنامەی (ژین).
٢ - نامیلکەی (بۆتان ئەگێڕمەوە) لە ئامادەکردنی (بەیاد عەبدول قادر).
٣ - خزمەکانی مامۆستا نەجمەدین مەلا.

تێبینی:

---

لە سەرچاوەکانا دیاریکرابوو کە گوایە مامۆستا نەجمەدین مەلا لە ساڵی (١٨٩٨)ز لەدایك بووە بەڵام هەندێ دەستنووسی خۆیمان دەس کەوت کە ئەڵێ (من لە ساڵی ١٣٢٠ی کۆچی لەدایك بووم کە ئەکاتە ساڵی (١٩٠٢)ی ز.

**هەڵبەستی مەلا سمایل بۆ گواستنەوەی تەرمی مەلا نجم الدین بۆ ئەزمڕ**

مەلا نجم الدین کوردی حقیقی
خۆ تۆ لەگەڵ من گەلێك ڕەفیقی

بۆچ بەجێت هێشتم بە تاقو تەنیا
تاریك بوو لە من ڕووناکی دنیا

مەلا نجم الدین ئەستێرەی باوەڕ
دڵم قوڵپ ئەدا وێنەی سەماوەڕ

یەزدان بتبەخشێ تۆ بە پێغەمبەر
زەحمەتت نەبێت لە ڕۆژی مەحشەر

بەڕاستی تۆ بووی نیشتمان پەروەر
شاعیری مەشهور ئوستادی سەروەر

زۆرت نەجات دا بە خوێندەواری
لەناو کورداندا وەك ڕۆژی دیاری

لەسەر وەصیەتت برایە ئەزمر
نەجات بوون کوردان لە کوشتنوبڕ

مەلا سمایل، سکاڵانووس
١٩٧٠

* * *

# (جەمعیەتی کوردستان)

لە کاتێکا هەواڵی کوردستانی عێراق بەم جۆرە بوو (مستەفا پاشا)ی یامولکی لە (ئەستەموول) گەڕابوەوە، بەینێبوو لە سلەیمانی بوو. وەکو ئەیوت لەلایەکەوە بۆ بەربەست دانەوەی - پڕۆپاگاندەی - تورك و پاراستنی سلێمانی لە هەڵەتی (ئوزدەمیر)، لە لایەکی تریشەوە بۆ تازەکردنەوەی گیانی نیشتمانیو هۆشی میللی کورد واتە بە بیری دانانی ڕێی تەقەلایەکی تازە بۆ دامەزرانەوەی کوردستانی سەربەخۆ، پێویست بە ڕێخستنی (کۆمەڵەیەکی کوردی هەبوو).

ئەم باسە زوو کەوتە سەرزبان. ئینجا (مستەفاپاشا) لە حکومەتی سیاسی سلەیمـانی ئیـزنی وەرگرت و لە (٢١ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٢ز) پاش نوێژی جومعە لە مزگەوتی (نالی) واتە مزگەوتی (سەیحەسەنی موفتی) یا خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوەو دەربارەی ئەم مەبەسە (مستەفا پاشا) وتارێکی دوورودرێژی کوردی خوێندەوە دوای ئەمە بە هەڵبژاردنی نهێنی ئەندامەکانی دامەزرێنەری کۆمەڵە هەڵبژێرران کە ناوەکانیان بەپێی ژمارەی دەنگەکان بەڕیزەوە ئەمانەبوون:

١ - بەڕێز مامۆستا ڕەفیق حیلمی - نووسەری ئەم یادداشتە.
٢ - بەڕێز ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ - دوایی بوو بە موتەسەریفی سلەیمانی.
٣ - بەڕێز فایەق بەگی مارف بەگ - لە خزمانی سەعی پاشای باوکی شەریف پاشا.

٤ ـ بەڕێز شێخ عەلی سەرکار ـ خاڵی بەڕێز حەپسەخانی نەقیب.
٥ ـ بەڕێز شێخ محەمەدی گوڵانی ـ لە عالمەکانی سلەیمانی.
٦ ـ بەڕێز ساڵح ئەفەنی قەفتان ـ لە تاقمی بازرگانی سلەیمانیو زابتانی دەوری عوسمانی،بەینێك لە ئەعدادی مامۆستای تەئریخ بوو.
٧ ـ بەڕێـز صدیق ئەفـەنی عەلەکـە ـ لە عیسـاییـیـە کوردەکان و بازرگانە ناودارەکـانی سلەیمـانیو برازای (کەریمی عەلەکە)یە کە لە حکومەتی (شێخ مەحمودا) رەئیس وەیا وەزیری مالیە بوو.

مستەفا پاشا خۆی کە دامەزرێنەری کۆمەڵە بوو کرا بە رەئیسیو کۆمەڵەش ناونـرا (جـەمعیەتی کوردستان). لەگەڵ ئیزنی دامەزرانی کۆمەڵەدا، بە ناوی کۆمـەڵەوە ئیـزنی بڵاوکردنەوەی (رۆژنامە) یەکیشی وەرگرتبوو. (مستەفا پاشا) دەربارەی ئەوە کە بووم بە ئەندامی (جەمعیەتی کوردستان) بە ئیمزای خۆیو بە مێـژووی (٢٢)ی جولای (تـەمـوز) واتـە دوای کۆبـوونـەوەکەی مزگەوتی (سەیحەسەن) بە رۆژێ نامەیەکی بۆ ناردم. ئەو نامەیە تائێستا لەلام ماوەتەوەو لەناو نووسراوەکانی ئەو دەورەدا هەڵم گرتوە.

بۆ یەکەم جار لە ماڵی (مستەفا پاشا) کۆبوینەوە. لەناو بریارەکانیترا بریاری ئەوش درا کە رۆژنامەکەمان بە سێ زبان (کوردیو فارسیو تورکی) بنووسرێو ژمـارەی یەکـەمی (بـانگی کوردستان) لە (٢)ی ئاغستوزی ساڵی (١٩٢٢)ز بڵاوکـرایـەوە. (من نووسـەری یادداشت) بەلای نووسینی بەشێکی کوردیو فارسی‌یەوە بەتایبەتی سەرپاکی نووسینەکانی بەشی تورکیشم خرابوە ئەستۆ.

سەرچاوە: یادداشتی رەفیق حیلمی بەرگی پێنجەم.

* * *

(سەرگوزەشتەی یەكێك
لە ئازاو دلێرە
ناودارەكانی سلەیمانی)

● مامە یارە دەستكری
خالد زامدار




## ■ مامـــــــــــە یارە

بێ گومان زۆركەس گردەكەی (مامەیارە)یان بیستووە كە ئەكەوێتە ڕۆژهەلاتی شاری سلەیمانیەوە، ڕەنگ هەیە گەلێكیش چووبنە سەریو دەوروپشتی بۆ سەیـران لە بەهــارانـا، سەیـرانی ڕۆژەكـانی نەورۆز كە تاكو خوالێخۆشبوو (پیرەمێرد) مابوو پێكی ئەهێناو ئەیكرد بە شاییو زەماوەند لەوناوەدا.

جا ئایە ئەو (مامەیارە)یە كێیە كە ئەم گردەی بەناوەوە ناونراوە؟

(مامەیارە) لە بنچینەدا خەڵكی دێی (كانیدركە)ی ناوچەی شارباژێرە، خۆی یەكێ ئەبێ لە تۆپ چییەكانی (ئەحمەد پاشا)ی دوامیری بابان، (ئەحمەد پاشا) كە ئەبێ بە شەری لەگەڵ سوپای (توركا)و تەنگ بە لەشكرەكەیان هەڵ ئەچنێ لە ناوچـەی (كـۆیـە)داو لەوەدا ئەبێ توركـەكان بشكێنێو تەفرو تونایان بكا (نـەجیب پاشـای گورلگی) كە ئەودەمــە والی تورك ئەبێ لە بەغـا، هانـای رێـك كەوتنی ئەباتە بەر (ئەحمەد پاشا) بەڵام (ئەحمەد پاشا) گوێی ناداتێ، ناچار (نەجیب پاشا) ئەكەوێتە تەڵەكەو ساختە بازی بەناو شێخ و مەلاو پیاوە ئاینیەكاناو پێیان ئەسەلمێنێ هەركەسێ شەر بكاو دەس لە سەربازی والی بەغا بكـاتــەوە وائــەگەیەنێ كە چەك لە سوڵتان واتە لە (خەلیفەی ئیسلام) خۆی هەڵئــەكێشێ. ئەم ئاین وئـۆینــە كاری خۆی كرد لەنـاو شەركـەرەكـانا واتــە شەرەكەرەكانی (ئەحمەد باشا) كە هەموو دەسیان لە شەر كێشایەوەو هەركەس

بەلایەکا بڵاوەیان لێکرد، (ئەحمەد پاشاش) ناچار ڕویشت و وڵاتی بەجێهێشت.

لە ساڵی (١٨٤٩ ـ ١٨٥٠). (سۆفی یارە) لەم شەڕەدا لە بارەگای (ئەحمەد پاشا)دا مایەوەو لەگەڵ لەشکرە شکاوەکەدا هەڵ نەهات کە پیاوەکانی (نەجیب گورزەلگی) ئەچن بۆ تالانی بارەگای لەشکری شکاو، (سۆفی یارە) هەر لەسەر تۆپەکەی خۆیەوە ئەیانداتە بەر ئاگرو لێزمەی گوللە، تادرەنگێك نایەڵێت کەس بچێتە ناو بارەگاکەیانەوە تاکوو لەدواییدا ئەیگرن، کە ئەیبەنە لای والی، والی لێی ئەپرسێ:

ها تۆ ئەمەت بۆ کرد، بە چاوی خۆت دیت لەشکر شکاو هەڵهات، بۆ خۆت نەدا بەدەستـەوە؟ ئەویش لە وەڵامـا ئەڵێ شکانی لەشکر نابێ من لە ئیش و (واجب)ی خۆم بخات من کە سەربازێکم نابێ خۆم بەدەستەوە بدەم، لەبەرئەوە ناچاربووم تا من لە وزەما بێ چیم لەسەربوو بەجێیبێنم.

والی وەڵامەکەی زۆر لا جوان ئەبێ لەبەرئەوە دێی (کانیدرکە)ی سەروبەر ئەداتێ، ئێستا ئەو دێیە بە (کانی درکەی سەگانیسۆفی یارە) ناوی دەرکردوە، چونکە مامەسۆفی ڕاوچی ئەبێو سەگەلێکی زۆری بووە.

دیسـان ئەڵێن هەر لەبەر ئەو ئازاییو چالاکییەی (مامەیارە) کە لە شەڕا نوانـدویـەتیو لە پاداشی وەڵامـە جوانـەکـەی والی کە داویـەتەوە ئەیبەن بۆ (ئەستەموڵ) لەوێ لێی ئەپرسن... خواستت چییە؟ ئەویش جگە لە ئازادیی خۆی لە دێی (کـانیدرکـە)و گردەکـەی خۆی (گردی مامەیارە) زیاتر داوای هیچیتر ناکا کە گورج پێیئەبەخشن، وەك ماڵی دایکی ئەوان بێ!!! لام وایە ئەگەر بیویستایە کام پایە لە میرییا کە بۆ شان و بازووی ئەو بشیایە تورکەکان ئەیاندایە بەڵام مامە ژێردەسیو مووچەخۆری پێ هەزم نەکراوەو نەیگۆڕیوەتەوە بە سەربەستی.

مامـەیـارە بۆ شیرینیشی بە گردەکەدا چوە؟ چونکە شوێنەکەی لە گوێئاوە ڕوونەکەی کارێزی وەستا شەریفی ئێستا بوە کە دیمەنێکی جوان و دڵ فرێنە.

مامەیارە پیاوێکی بەئاین و تێگەیشتوو پیاوچاك و دەس بڵاو بووە، گوایە پاش داگـیرکـردنی سلەیمـانی لەلایـەن تورکـەکـانـەوە ئەم بە بەرگی سەربـازیو جەنگاوەرێتییەوە، بە چەك و زرێوە یاخود بەسواریو ڕم بەدەسەوەو سوننی بە

لاقەدەوەو خەنجەر بە بەرۆكەوە (بە یادی جاران) جارجار هەر سووراوەتەوەو وەك جارچی جاری‌داوە بۆ كردەوەی باش و ئیشی دروست، لام وایە هەر بیرەوەری ئەوساشیەوە (پانتۆڵ) واتە شەرواڵی سەربازی‌یەكەی دانەكەندوەو هەر لەبەریا بووە.

(مامەیارە) پیاوێكی زۆر بەسام و رێزگیراویش بووە، بیریشی ئەوەندە بەرز بووە ویستویەتی (كانی دركە) كە ئەوسا چۆڵ و وێرانەو بێكشت وكاڵ و باخات بووە بە شێوەیەكی نوێ لەسەر هونەری كشت وكاڵ ئاوای‌كاتەوە.

خوالێخۆش بوو (مامەیارە) تا مردنییشی هەر دڵسۆز بووە بۆ (ئەحمەد پاشا)و بنەماڵەی بابان.

لەم دواییەدا لە خانوەكەی خۆیا ئەژیا لە سلەیمانی لە گەرەكی گۆیژە كە ژوورێكی تەرخان كردبوو بۆ خۆی‌و ژێرەكەی كردبوو بە خانی ولاغ لەوە رۆژی چەند (بێچوو)یەكی دەس ئەكەوت و گوزەرانی پێ‌ئەكرد بۆخۆی، جا لەبەرئەوەی وەجاخیشی كوێر بوو كە كۆچی دوایی كرد جێ‌ماوی هەمووی بە (ئەحمەد گۆساڵە) ناوێك درا كە خزمی بوو یاخۆ ئەم خۆی كردبوو بە خزمی، لەسەر راسپاردەی خۆی لە گردەكەی خۆی ناشتیان، گردی (مامەیارە) ئەو گردەی كە شاعیری مەزن (پیرەمێرد)یش رای سپارد كە مرد هەر لەوێ بینێژن.

ئێستا گردی (مامەیارە)ی پیرۆز تەرمی دوو رۆڵەی نەمر، واتە گۆری دوو ئەستێرەی گەشی كوردی پێوەیە، یەكێكیان (مامەیارەی) قارەمان لە ئازایی‌و راستی‌و پیاوچاكی‌و ئایینداری‌یا، ئەوی‌تریان (پیرەمێردی) مەزن و نەمر، فەیلەسووفی گەورەی كورد لەئەدەب و پەندی جوان وبیری بەرزو نیشتمان پەروەری‌یا.

لەگۆڤاری (شەفەق)ەوە ژمارە (٥و٦) مایس و حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٨ز لاپەرە (٣٧).

نووسینی ـ جەمال بابان

١ ـ بێچو: پارەیەكی كەمی ئەوكاتە بوە وابزانم وەكوو پێنج فلسی ئێستا بووە نرخی.

پاش وەرگـرتنی ئەم باسـەی مامـۆستـا جەمـال بابان خۆم کەوتمە سۆراخی مامەیارەو شوێنەواریو ئەم ئەنجامەم دەستکەوت:

«... مامەیارە ناوی (یار ئەحمەد) کوڕی خدربەگی هۆمەر ئاغای خەڵکی دێی (وەننـەرێنە)یە لە ناوچەی بەرزنجەو بەپاڵ شاخی کوزەکاژاوەوە. هۆمەر ئاغای باپیری وەك دەڵێن یەکێك بووە لە دوانزە سوارەی مەریوان.

مامەیارە ئەفسەرێکی تۆپچیی ناوداری لەشکری بابانەکان بووە، پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانە بووە،ماڵیان لە گەڕەکی گۆیژە بوو، خەڵکی سلیمانیی زۆر خۆش ویستـووەو خوێنـدەوارێکی باش بووە، لەسـەر بڕیاری خۆی لە گردی (گـولان)[1] نێـژراوەو ئەو گردە بە ناوی گردی مامـەیـارەوە ناوی دەرکردووە. لەبەرئەوەی وەجاخی کوێر بووە، هەموو موڵك و ماڵی بە برازایەکی برا کە ناوی ئەحمـەد ئاغـای سلێمان ئاغا (ئەحە گۆساڵە) بووە. ئەمیش لەگەڵ ماميا لەو خانووەدا ژیاوە.

ئەحمـەد ئاغـا ئەو شتـانـەی مامـەیارە کە یادگارێکی پیرۆزە جوان و پاك هەڵئەگرێ. کوڕەکەی کە ناوی حاجی سابیر[2] بووە ئاگادار ئەکات کە پاش خۆی ئەو شتانە نەفەوتێن. شتەکان لەناو سندوقێکی تەختەدا هەڵگیرابوون.

(١) لەم ماوەیـەی پێشـوودا لە کۆڕی چاپخانەکەی مامۆستای شاعیر کاکەی فەللاحدا باسی ئەوە دەکرا کە ئایا ئەم گردە «گردی گوڵان»ە یا (گردی گولان)، مامۆستای شاعیر عەلیی عارف ئاغا لە قسەدا وتی: (گولان)ە، تەنانەت بیرمە ئەوانـەی تووشی نەخـۆشیی (گـولی دەبـوون لە بانـەو سەقـزو ئەو دەورەوە دەرئەکران، ئەهاتن رووەو سلێمانی لێرە نەیانئەهێشت بێنە شارەوە لەو دەشتە چادریان بۆ هەڵدابوون و خەڵك خۆراکی بەخێر بۆ ئەبردن، کە ئەمردن لەو گردە کەلایە ئەنیژران، لەبەرئەوە بە گردەکە ئەووترا گردی (گولان).

(ع.م.ر)

(٢) حاجی سابیر ساڵی ١٩١٧، لە گەڕەکی گۆیژە لەدایك بووە، ئێستا ماڵیان لە شاری کەرکووکە لە گەڕەکی ئیمام قاسم، دوکانی بەقاڵیی هەبوو لەو گەڕەکە، لە

سالّی ١٩٨٤دا کۆچی دوایی کردو حەوت کورو کچێکی هەیە، کە ئێستا لەگەڵ خێزانەکەیدا ئەژین.

لە پاشماوەی مامەیارە، ئەوەی لە ماڵی حاجی سابیر دەستمان کەوت یەکێك بوو لەو دوو دەمانچە دوو لوولەییانەی کە کاتێك ئەفسەری تۆپچی‌ی بابانەکان بووە هەڵیگرتووەو بەکاری‌هێناوە، لەگەڵ هەندێ دەستنووسی خۆی کە باسی داستانی رۆستەمی زاڵ ئەکات.

خێزانەکەی حاجی سابیر ئەڵێ - ئەمە دوو دەمانچە بوون، ئەویتریان لەگەڵ بەرگە عەسکەری‌یەکەی کە سەرشان و کڵاوەکەی زنجیری پێوەبوو بە قایش نەخش کرابوو، لەگەڵ قوتوی جگەرەو دار جگەرەکەیدا لە سەرەتای حەفتاکاندا فەوتاوە. هەوڵی ئەوە ئەدەین بیاندۆزینەوە.

تێبینی: لەم بەرگەدا وێنەی دەمانچەکەی مامەیارە ئەبینن.



● دەمانچەیەکی مامەیارە.



## زانای هەلکەوتوو
## سەییدئەحمەد فائز بەرزنجی

سەیید ئەحمەد فائز کوڕی سەیید مەحموودی سەید ئەحمەد سەید عەبدول سەمەد فەیزوڵڵای شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە، لە ساڵی (١٢٥٨)ی کۆچی بەرامبەر ساڵی (١٨٤٢)ز لە دێی گڵەزەردە کە (سەعدان)یشی پێئەوترێ لەدایك بووە کە ئەکەوێتە خوارووی سلەیمانی‌یەوە بەنزیکەی (١٠) کیلۆمەترێك، کوڕی بنەماڵەیەکی سەر بە ئاین و زانست بووە کە لە سەییدەکانی بەرزنجەن.

لەسەرەتاوە لە (گڵەزەردە) لای باوکی خوێندوویەتی لەپاشا هاتۆتە سلەیمانی‌و لای (محەمەد غالیب) خوێندوویەتی‌و دوایی چۆتە لای (سەی مستەفای) بەرزنجی موفتی سلەیمانی بۆ خوێندن. دوای ئەمەش چۆتەلایی (ئەحمەدی پیرحەسەنی چاومار) بۆخوێندن و دواپلەی خوێندنی لای (حاجی کاك ئەحمەدی شێخ) خوێندویەتی کە خاڵی خۆی بووە.

لەسەرەتاوە بووە بە مودەریس پاشان بە قازی‌یەتی چووە بۆ (مەرگەو کۆیەو قەرەداخ و کووت و مونتەفیك و کەربەلاو دەرسییم و ئورفەو قەستەموونی‌و موسڵ) لەدوای ئەمە چۆتە (ئەستەموول)و بووە بە ئەندامی (ئەنجومەنی بەرزی مەعاریف)

(١٨) هەژدە کتێبی لە زانستە عەربی‌و ئیسلامی‌یەکانا بە تورکی‌و عەرەبی بەجێ‌هێشتووە.

به کتێبی (کنز اللسن) ناوبانگێکی گەورەی پەیداکردوە کە هونەرو سنعەتکاری‌یەکی زۆر گەورەی لە دانانیدا نواندووە.

ئەم کتێبـە بریتی‌یە لە (١١) عەموود لەناو (١٢) هونەردا کە بریتیشە لە شەش زبان (عـەربی‌و تورکی‌و فارسی‌و فەرەنسی‌و رووسی‌و کوردی) کە بە (١٥) جۆر ئەخوێنرێتەوە، کە (١٣) جۆری (عەموودی)یە واتە لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەخوێنرێتەوەو چواردەمینیان لەڕاستەوە بۆ چەپ ئەخوێنرێتەوە.

ئەم کتێبە بەم جۆرە ئەخوێنرێتەوە:

عەموودی یەکەم لەسەرەوە بۆخوارەوە تا دوایی کتێبەکە

ئینجا عەموودی دوەم هەر بەم شیوەیە ئینجا چوارەم و پێنجەم تادوایی...

چواردەمـین جۆری خوێنـدنـەوەی کە وەکـو هەمـوو کتێبێکی تر لەڕاستـەوە ئەخـوێنـرێتـەوە بۆ چەپ، ئەویش هەمـوو زبـانەکان ئەبن بە عەرەبی هەموو عیلمەکانیش ئەگۆڕێن بۆ عیلمی فیقهی ئیسلام.

پانـزدەـەمـین جۆریشی لە دوایی کتێبـەکـەدا لە هەرعەموودە دووا وشەی هەڵگری‌و بیخەیتە تەنشت یەکەوە ئەبێ بە ناوی کتێبەکەو مێژووی نووسینی‌و ناوی نوسەری.

(مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ) ستایشێکی زۆری خوو ڕەوشتی بەرزی ئەم زانایە ئەکا.

ئەحمەد فائزی بەرزنجی لە ساڵی (١٣٣٨ کۆچی - ١٩١٨)ز لە (ئەستەموول) کۆچی دوایی کردووە.

تێبینی:

دەربارەی ئەم زانایە تەماشای:

- (التعریف بمساجد السلیمانیة)ی مەلا محەمەدی قزلجی‌و
- (تأریخ السلیمانیة وانحائها)ی محەمەد ئەمین زەکی‌بەگ و
- (مێژووی بەرزنجە) دەستنووسی مەلا مستەفای سەفوەت و
- پێشەکی‌و چاپکردنی (کنز اللسن)ی شێخ محەمەدی خاڵ بکە.

* * *

له ڕۆژنامەی (ژین)
ژمارە (١٤٧٨)
پێنج شەممە ٨/١٠/١٩٥٩ز

بەبۆنەی یادی سێیەمین ساڵی کۆچی دوایی (شێخ مەحمود)ەوە

● شێخ مەحموودی نەمر
بە بەرگی مەلیکی‌یەوە، ١٩١٨



## (لە ژیانی شێخ مەحمودا چی ڕووی‌دا)

لە ساڵی (١٨٨١)ز هاتۆتە دنیایەوەو لە (٩/١٠/١٩٥٦)ز کۆچی دوایی کرد.
لە ساڵی (١٣١٧) کۆچی سوڵتان عەبدول حەمید شێخ مەحمودی لەگەڵ باوکیا بانگ کرد بۆ ئەستەموڵ و پایەی (مارشاڵ)ی پێدان.
لە ساڵی (١٣٢٦) کۆچی (لە شەڕی موسڵا) شێخ سەعی باوکی‌و شێخ ئەحمەدی برای لە موسڵ شەهید کران و شێخ مەحمود ڕزگاری بوو.
لە ساڵی (١٩١٥)ز کە هێزی ئینگلیز هاتە سەر بەسرە حکومەتی عوسمانی داوای یارمەتی لە شێخ مەحمود کرد، ئەویش بە ناوی پاک کردنەوەو ڕزگاری بشتمانەوە.(٢٠٠٠) دوو هەزار سواری پیادەی بە پارەو چەکی خۆی ئامادە

کردو ناردی بۆ شەڕ لە (کووت و شوعەیبە).

لە ساڵی (١٩١٨)ز ئیدارەی شاری سلەیمانی وەرگرت وە هەموو ئینگلیزەکانی لە شاری سلەیمانیا گرت.

لە مانگی مایسی ساڵی (١٩١٩)ز بەرامبەر بە (٧٥٠٫٠٠٠) حەوت سەدو پەنجا هەزار سەربازی ئینگلیزی وەستا لە دەربەندی بازیان.

لە ڕۆژی (١٨)ی حوزەیرانی هەمان ساڵا لەپەنا (بەردە قارەمان)ی دەربەندا بریندارکراو نێررا بۆ (کوێت)و لەدواییا بەئیعدام حوکم درا، لەپاشا گۆڕرا بە (١٠) دە ساڵ و (١٠٫٠٠٠) دەهەزار ڕوپێو نێررا بۆ (هیندستان)وە دوای ئەمە ئینگلیز هاتە سلەیمانییەوە.

لە پاشا لەژێر زەبری داواکردنی گەل و عەشایەرەکانا شێخ مەحمودیان هێنایەوەو عەفویان کرد.

لە ساڵی (١٩٢٢)ز لە مانگی ئاغستوزا ئینگلیزەکان سلەیمانیان بەجێهێشت.

لە ڕۆژی (٣٠) ئەیلوولی هەمان ساڵا شێخ مەحمود لەگەڵ (١٠٠٠) هەزار سوارا گەیشتەوە سلەیمانی، وە بوو بە حوکمداری کوردستان و ئاڵای کوردستانی هەڵکرد و ئەنجومەنی وەزیرانی ڕیك خست و (پوولی) کوردستانی دروست کرد.

لە ڕۆژی (٣)ی مارتی (١٩٢٣)ز فرۆکە هاتە سەر سلەیمانیو بەیان نامەی فرێدا کە ئەبێ شێخ مەحمود سلەیمانی بەجێبێڵێو بچێت بۆ بەغا، بەڵام شێخ گوێی‌نەدانێو وتی نایەم.

لە پاشا لەسەر ئەمە ئینگلیزەکان سلەیمانیان دایە بەر بۆمباو شێخ بە خۆیو سوپاکەیەوە ڕوویکردە (سورداش)و لەوێ لە ئەشکەوتی (جاسەنە) جێگیر بوو.

لە ڕۆژی (٦)ی مایسی (١٩٢٣)ز دیسان ئینگلیزەکان بە هێزیکی زۆرەوە سلەیمانیان داگیرکرد، هێزەکەی شێخ لە (سورداش)ەوە ڕوویکردە دەشتی (مەرگە)و لەوێوە چوون بۆ (مەریوان).

لە مانگی تەموزی (١٩٢٣)ز ئینگلیزەکان سلەیمانیان چۆڵ کرد، شێخ مەحمود لە (مەریوان)ەوە گەڕایەوە بۆ سلەیمانی دەستیکرد بە حوکم کردن.

لەم ماوەیـەدا دوو جار سلەیمـانی بومبـابـاران کرایەوەو لە ڕۆژی (٣)ی مایسەوە تا (٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٣). بێوچان سلەیمانیان بۆمباباران کرد وە شێخ بە خۆیو هێزەکەیەوە ڕوویان کردە چیاکانی (قەرەداخ).

- لە ڕۆژی (١٢) ئاغستـۆزی ساڵی (١٩٢٤)ز سوپـای عیراقی هاتـە ناو سلەیمانییەوەو شێخ مەحمود ڕووی کردە (مەریوان).

لە ساڵی (١٩٢٧)ز یەکەم موتەسەڕڕیف بۆ سلەیمانی دانرا ناوی (ئەحمەد ئەفەنی هەولێری) بوو، نامەیەکی نارد بۆ شێخ مەحموود نووسیبوی کە بێتەوەو شێخ مەحمود هاتەوە بۆ سلەیمانی.

لە ساڵی (١٩٣٠)ز لەسەر هەڵبژاردن دانیشتوانی سلەیمانیو حکومەت چوون بەگژیەکاو شێخ مەحمود جووڵایەوەو دەستیکرد بە شەڕکردن لەگەڵ حکومەتا لە (کەناروێ)و (ئاوباریك)و (سورداش).

لە ساڵی (١٩٣١)ز شێخ مەحمودیان برد بۆ بەغاو لە ئەعزەمییە نیشتەجێیان کرد.

لە ساڵی (١٩٤١)ز لە هەراکـەی ئەوسـاڵەدا شێـخ مەحمـود هاتـەوە بۆ سلەیمانیو لە (داریکەلی) دانیشت.

لەوکاتەوە لەوێ مایەوە تا (عومەر عەلی) لە ساڵی (١٩٥٦)ز لەسەر فەرمانی ئینگلیـزەکان کرا بە موتەسەڕڕفی سلەیمانیو تەنگی بە شێخ هەڵچنیو شێخ شەڕی لەگەڵ کرد بەڵام لەوکاتەدا شێخ نەخۆش کەوت و چوو بۆ بەغا بۆ چارەی نەخۆشییەکەیو لەوی لە ڕۆژی (٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٦)ز کۆچی دوایی کرد.



● شێخ مەحموودو لەشکرەکەی لە دەربەندی بازیان ساڵی ١٩١٩



● میرلیوا صدیق مظهر پاشا موفەتیشی عموومی حکومەتی کوردستان



● قارەمان عەولە سیس شەهیدی شەشم ئەیلوول



● مولازم یونس عەبدولقادر سەعید ئەفسەری

سوپای شێخ مەحموود ١٨٩٧ - ١٩٧٩/٣/١



● ئوسو ئاغای عەبدوللا ئاغا دەمراستی

شێخ مەحموود ١٨٨٥ - ١٩٥٧



●کەریمی کاکە زاڵ کوڕی ئازاو حەس

حەس باشی، ١٨٨٦ - ١٩٥٧



● مستەفا ئاغای برای ئوسو ئاغا ١٨٩٤ -

١٩٥٦



● محەی سالە سوور ١٨٩٥ - ١٩٧٥



● شێخ محەمەدی سەی بچکۆلە لە
١٠/٩/١٩٥٨دا کۆچی دوایی کردووە



● درسی رەحیمە کوژنە ١٩٨٤ کۆچی
کردووە



● مەجی قالەی حەمامچی ١٨٩٢ - ١٩٧٧



● لەشكری تازەی كوردستان ١١/٧/١٩٢٢





● وینەی بوردومانی مالیك - ١٩٢٤



● لافاوی بەردەرکی سەرا سالی ١٩٥٧



● لافاوی شەقامی کاوە - ١٩٥٧



خۆپیشاندانی بەردەرگای سەرا رۆژی پێنجی ئەیلوول



● لاناوی سلێمانی ١٩٥٧

## (ئەنجوومەنی وەزیرانی کوردستان)

دامــەزرانی ئەنجوومەنی وەزیرانی کوردستان لەساڵی (١٩٢٢)ز لەکاتێکا شێخ مەحمود بوو بە (مەلیك) لەم کوردانە پێك هات.

١ - بەڕێــز شێــخ قادری شێخ سەعی حەفید برای شێخ مەحمود سەرۆکی وەزیران و سوپاسالار.

٢ - بەڕێز شێخ حەمەغەریب  وەزیری ناوخۆ

٣ - بەڕێز عەبدول کەریم عەلەکە  وەزیری دارایی

٤ - بەڕێز حاجی مستەفاپاشای یامولکی  وەزیری زانیاری

٥ - بەڕێز ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی ساحێب قران (حەمدی) شاعیر - وەزیری گومرگ

٦ - بەڕێز حاجی مەلاسەعی  وەزیری دادگەری

٧ - بەڕێز حەماغای ئەورەحماناغا  وەزیری نافعە

٨ - بەڕێز ساڵح زەکی بەگی ساحێب قران  وەزیری هێزی میللی

جگە لە وەزیران.

٩ - بەڕێز سەی ئەحمەدی بەرزنجی (مەرەخەس) - سەرۆکی ئەمینەتی گشتی

١٠ - بەڕێز سدیق پاشا قادری  - موفەتیشی گشتی کوردستان

سەرچاوە:

---

لە (یادداشت) بەرگی پێنجەم و شەشەم - نووسینی (ڕەفیق حیلمی).



# (ناوی ئەفسەرەکانی سوپای حکومەتی کوردستانی جنووبی)
# ساڵی ١٩١٩ - ١٩٢٢ز

١ - بەڕێز ساڵح زەکی بەگی ساحێب قران - قائیدی سوپای گشتی

٢ - بەڕێز رەزابەگی ئیسماعیل بەگ ــ قائیدی سوپای گشتی دوای ساڵح زەکی بەگ.

٣ - بەڕێز قادر سەعی فەتاح (قالەی ئایشەخان) - قائیدی سوپا لە دەربەندی بازیان بەدیل گیرا ساڵی ١٩١٩ز.

٤ - بەڕێز جەمال عیرفان - مێجەری سوپا لە ساڵی (١٩٢٣)ز بەدەسیسە کوژرا.

٥ - بەڕێز عیزەت تۆپچی - موستەشارو نوێنەری شێخ مەحمود.

٦ - بەڕێز ماجید مستەفا - قائیدی سوپای سوارە.

٧ - بەڕێز رەئوف ئەفەنی ئەمین ئەفەنی وەسمانئاغا - فەرماندەی سەربازی دیوانی شێخ مەحموود.

٨ - بەڕێز ئەحمەد فەهمی حاجی حسەین - مێجەر لە سوپای شێخ مەحمود.

٩ - بەڕێز رەشید ئەفەنی عاسیەخان - لە چەم چەماڵ ساڵی (١٩١٩)ز شەهید کرا.

١٠ - بەڕێز عەبدوڵلا عادیل - ئەفسەری پیادە (حقوقی).
١١ - بەڕێز ئیبراهیم زوری - ئەفسەری پیادە.
١٢ - بەڕێز فایەق کاکەمین - ئەفسەری پیادە.
١٣ - بەڕێز عەزیز حیکمەت قەزاز - ئەفسەری پیادە.
١٤ - بەڕێز یوونس عەبدول قادر - ئەفسەری پیادە.
١٥ - بەڕێز رەمزی عەبدول کەریم - ئەفسەری پیادە.
١٦ - بەڕێز رەشید عەبدول کەریم - ئەفسەری پیادە.
١٧ - بەڕێـز کامیـلی حەسـەن ئەفەنی - دوائەفسەر بوو مایەوە لەگەڵ شێخ مەحمودو بەشداری کرد لە شەڕی (ئاوباریك) دا.
١٨ - بەڕێز عومەری حاجی قادری فەرخە.
١٩ - بەڕێز عەزە زرە.
٢٠ - بەڕێز عەبدوڵلاغای توتنچی.
٢١ - بەڕێز حیکمەت ئەمین.
٢٢ - بەڕێز فؤاد مەستی.

## (ناوی هەندێ لەو کورە ئازایانەی کە لە سوپای شێخ مەحمود بەشداری شەڕیان کردوە)

لە خزمەکانی شێخ خۆی (شیخان):-
١ - بەڕێـز حاجی سەیحەسەن - مامی شێخ مەحمود لە ساڵی (١٩١٩) ا دەربەندی بازیان شەهید کرا.
٢ - بەڕێز سەیعومەری برای حاجی سەیحەسەن.
٣ - بەڕێز شێخ حەمەغەریب.
٤ - بەڕێز شێخ قادری شێخ سەعی حەفید - برای شێخ مەحمود.
٥ - بەڕێز شێخ محەمەدی سەیبچکۆلە.
٦ - بەڕێز شێخ جەلالی ئەحمەدی حەفید.
٧ - بەڕێز شێخ محەمەدی حاجی سەیحەسەن.

٨ - بەڕێز شێخ محەمەدی شێخ عەلی (حەمەی شێخەلی).
ئەمانەش جگە لە تایەفەی شێخان بەشداری‌یان کردوە:-
٩ - بەڕێز تایەری حەمەدئەفەنی کەریم ئاغا - لە ساڵی ١٩١٩ز لە دەربەندی بازیان شەهیدکرا.
١٠ - بەڕێز حاجی خدری کانی‌تووی - لەلای سورداشەوە بریندارکرا.
١١ - بەڕێز مەلا کەریمی ئەورەحمان.
١٢ - بەڕێز کەریم قلْبش ئەحمەد.
١٣ - بەڕێز عەلی وەیسی ئەفەنی.
١٤ - بەڕێز ئەحەی بەکر - لەپشتی (عەربەت) شەهیدکرا.
١٥ - بەڕێز مەجید بەکر - لە (پێنجوین) شەهیدکرا.
١٦ - بەڕێز مەجیدی قالەی حەمامچی.
١٧ - بەڕێز محەی سالەسوور.
١٨ - بەڕێز حەمەی سەعەی فەتاح.
١٩ - بەڕێز فارسی رەحیمە کوردە (فارسە قەڵەو) لە پردی (تابین) بریندارکرا.
٢٠ - بەڕێز دەرویش ئەحمەدی پەزجی.
٢١ - ئوسو ئاغا دەم راستی شێخ مەحموود.
٢٢ - مصطفی ئاغا برای ئوسو ئاغا.
٢٣ - بەڕێز شێخ حەمەعەلی باڵاوی - لە (سێ بۆران) لە ناوچەی پێنجوێن شەهیدکرا.
٢٤ - بەڕێز شێخ نوری قزلەری - لە (سێ‌بۆران) لە ناوچەی پێنجوین شەهیدکرا.
٢٥ - بەڕێز شێخ رەشی باخ - لە شەڕی (ئاوباریك) لە (تاریەر) لە رێگای پێنجوێن شەهیدکرا.
٢٦ - بەڕێز عیزەت کوردی (مەترالیۆز).
٢٧ - بەڕێز توفیقە سووری چوارتایی.
٢٨ - بەڕێز ئەحە خورشەی چوارتایی.
٢٩ - بەڕێز فەتاحە سووری قەساب.
٣٠ - بەڕێز ئەحە قەڵەو.
٣١ - بەڕێز جەلالی رەشەی عاسیەخان.

٣٢ ـ بەڕێز یارە چنگێ.

٣٣ ـ بەڕێز سەعە چەتە.

٣٤ ـ بەڕێز عەلی چەتە (ئەلە چەتە)

٣٥ ـ بەڕێز شەریف چاوەش.

٣٦ ـ بەڕێز حەمە کوردەی مزگەر.

٣٧ ـ بەڕێز حەمەی کەرەمی وەیسی.

٣٨ ـ بەڕێز تۆفیقی شەریف.

٣٩ ـ بەڕێز حەمە شەریفی قرگەیی.

٤٠ ـ کەریمە کێچ.

٤١ ـ حەمەدمینی کۆزەرەقەیی.

٤٢ ـ حەمەکوێری قەساب.

٤٣ ـ سالّحە سوور شارباژێڕی

تێبینی:

ئەمانەی نووسیومانە جگە لەو عەشایەرانەو خەڵکی دیهاتەکانی کوردستان.

یەکەم عەشیرەت کە لە سەرەتای شۆڕشەوە بەشداری کردبێ لە زەمانی تورکەکانەوە تا دوایی شوڕش، وە بەئازاییو بەوەفایی ناوی دەرکردبێ عەشیرەتی (هەمەوەندە) بە سەرکردایەتی (کەریم بەگی فەتاح بەگ)و کورەکانی (سابیربەگ) و (عەبدوڵڵا) بەگ.

سەرچاوە:

١ ـ یادداشتەکانی مامۆستا رەفیق حیلمی.

٢ ـ بەرگەکانی (چیم دی)ی مامۆستائەحمەد خواجە.

٣ ـ رۆژنامەکانی (بانگی کوردستان) ساڵی (١٩٢٢ ـ ١٩٢٣)ز.

٤ ـ بەڕێز (فارسی رەحێ کوردە) کە خۆی یەکێ بووە لەوانەی بەدرێژایی شورش بەشداری کردووەو بریندارکراوەو تا ئیستاش ماوە لەژیانا.



## ● شێخ مەحموودی نەمر

چرای بەختی کورد وا کوژایەوە
شێخ چوو بۆ بەغا نەگەڕایەوە
کێ دڵی یەشان نەمێنێ تەختی
بە دڵ تۆراوی سەری نایەوە
شیوەن و ناڵەی کوردان بە بێسوود
لەدوای نەمانی کاکە شێخ مەحموود
چی ئەکا بیکا کوردی بێچارە
لەپاش ڕووخانی قەڵای بەرزی کورد
کوانێ ئەو پیاوەی لەسەر کوردستان
سەرکردەی جەنگی دەربەندو پیران
لەسەر ماف کورد برایە دیلی
خرایە بەندو کۆتی هیندستان
کواگرمەی شێرو پلنگ و نەهەنگ
ئاسمانیان پرکرد لە نالەی تفەنگ
ئەو بەردەی ئێستا بێناز کەوتووە
بەردێك بوو لەبۆ پەنای شێری جەنگ

هەموو بەردێکی ئەم کوردستانە
سوودی شۆڕش و جەنگ و هەستانە
ئەوان شێخ مەحمودی نەمر ئەناسن
چوون ڕۆستەمێك بوو بۆ ئەم داستانە

ئێستاش ئەو ڕۆژە هەر لە بەرچاوە
لە مێژووی کوردا بەسوور نوسراوە
جێی شانازییە بۆ کوردی جیهان
پیاوی وا نامرێ نەمردوەو ماوە

ماوە زیندوە وا لە دڵایە
چونکە نەوەی ئازادی خوایە
کاك ئەحمەدی شێخ دەستەونزایە
مەردێکی وەك خۆی بێنێتەکایە.

(قادر برسی)

* * *

# پیرەمێردی شاعیرو ڕۆژنامەنووس

پیرەمـێرد لە ساڵی (١٨٦٧)ز لە شاری سلەیمانی لە گەڕەکی گۆیژە هاتۆتە دنیاوە، خۆی ناوی (تۆفیق)ە کوڕی مەحمودئاغای هەمزاغایە ، لە تەمەنی حەوت ساڵیا ئەچێتە حوجرە.

لەپاش تەواوکردنی خوێندنی نەقێیەتی، ئەکرێتە نووسەر لە نفووسی سلەیمانی، لە ساڵی (١٨٨٦)ز ئەبێ بە باش کاتب لە دادگەی شاربازێڕ، وە هەر بەوجۆرە چەند فرمانێکی‌تری گرتۆتەدەس تا ساڵی (١٨٩٨)ز لەگەڵ (شێخ سەعی) بڕیاری ئەوە ئەدەن کە بەیەکەوە بچن بۆ تورکیا وەرۆیشتن، لە ساڵی (١٨٩٩)ز لەگەڵ (شێخ سەعی) ئەچن بۆ حەج وەزیارەتی ماڵی خوا ئەکەن لەپاش ماوەیە لەقەبی (بـەگ)ی ئەدرێتێ بۆیە پێی‌ئەوترا (حاجی تۆفیق بەگ) سەبارەت بە بلیمەتی‌و زرنگی‌یەوە ناوی پایەبەرزێتی بە هەموو لایەکا بڵاوئەبێتەوە بۆیە لە ڕۆژی (١٤)ی ئەیلوولی ساڵی (١٨٩٩)ز بە فەرمانی (سوڵتان عەبدول حەمید) حاجی تۆفیق بەگ ئەکرێ بە ئەندامی (ئەنجومەنی ئەستەموڵ).

وە لەو سەردەمـەدا کە لە ئەستەموڵ بوو بۆ خوێندنی بەرز چوە کولی‌یەی حقـوق)، لەپاش ماوەیە تەواوی ئەکاو، دوای ماوەیەکی‌تر ئیمتیازی گۆڤارێکی ورکی لەوێ وەرئـەگـرێ بە ناوی (ڕەسملی کیتاب)ەوە چوار ساڵ ئەم گۆڤارە ەرئەکا، لە پاشا وازی لێ‌یەـێ، وە هەر لەوێ بەشداری دەرچوونی ڕۆژنامەی مـەتسـوور موحیتی) کرد وە زۆر جار سـەروتـاری بۆ ڕۆژنـامـەی (ئیقدام)و ەورییەت) ئەنووسی، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژنامەی (فەرهەنگ)و شەفەقی ورخ)ی فارسی بەردەوام بوو، لە هەمـان کاتـیشـا پیرەمـێرد یەکێ بوو لە ەڵسـوڕێنـەرانی ڕۆژنـامـەی (کورد) کە لەلایەن (شێخ عەبدول قادری شێخ ەبدوڵڵا)وە دەرئەچوو.



●پیرەمێردی نەمر ١٨٦٧ - ١٩٥٠

حاجی تۆفیق بەگ لە ساڵی (١٩٠٩)ز تا (١٩٢٣)ز پیشەی رۆژنامەگەرێتی بەجێئەهێڵێو لەو ماوەیەدا چەند فرمانێکی رەسمی ئەگرێتە دەس، ئەوەبوو کرا بە قایمەقامی (جولەمێرگ و بالاو بەیتول شەباب و گوش کوی‌و ئەدەبازاری) لەپاشا لە ساڵی (١٩١٨)ز کرا بە موتەسەرریفی (ئەماسیە). بەلام لەبەرئەوەی حاجی تۆفیق بەگ لە دەرەوەی وڵات نیشتمانەکەی لەیادنەکردبوو، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٤ز دەسی لە فەرمانەکەی میری هەڵگرت و گەرایەوە بۆ شاری سلەیمانی، لەم ساڵانەی دواییدا ناوی خۆی نا (پیرەمێرد)و دیسانەوە پەیمانی

تازه کردەوە کە بەوپەڕی تواناوە خزمەتی گەل و نیشتمانەکەی بکا. هەر لەبەر ئەو مەبەسەسە دوا ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتی وێژەو ڕۆژنامەگەری کوردی، وە ژیانی (٢٦) ساڵی دوایی لەگەڵ دوو گۆشەگیرەکەدا (ژیان و ژین) بردەسەر وە لەسەر ئەم ژیانە دواییەی باسێکی دووروو درێژ هەیە وا سەرەتایەکی ئەو باسەتان ئەخەینە پێش چاو:

ئەوەبوو لەمەوپێش باسمان کرد کە کاربەدەستانی میری (ڕۆژنامەی (ژیان)یان دەرکرد بۆئەوە ئیسکی خۆیان لای میللەت سووك بکەن و خۆیان لەگەلی کورد نزیك بکەنەوەو بچنە ناخی دڵی لە قینیان...

هەرچۆنێك بوو چەند نووسەرێکی تایبەتی هاوبەشی‌یان کرد بە نووسینە کانیان بە وتاری پڕماناو بەکەڵك کە تیرێ بوو ئاراستەی دڵی دوژمنان ئەکرا، ئا لەم دەرفەتەدا پیرەمێرد هاتە پێشەوەو بە چەند هەڵبەست و پەخشانێکی ڕەنگینەوە هاوکاری نووسینەوەی کرد، وە لە دوای کۆچ کردنی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە (حسەین نازم) ئیش وکاری هەڵسووڕاندن و بەڕێوەبردن و نوسیینەوەی درا بە ئەستۆی پیرەمێردا ئەمیش لە ژمارە (٣٢١)ی‌یەوە دەستی‌کرد بە دەرچواندنی هەتا ژمارە (٤٠٦)ی ڕۆژنامەکەی لەژێر چاودێری خۆیا دەرکرد.

لەدوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر لە ڕۆژی (١٤) ئابی ساڵی (١٩٣٤)ز پیرەمێرد توانی ئیمتیازی ڕوژنامەکە لە ژمارەی (٤٠٦)ەوە بە ناوی خۆیەوە وەرگرێ لەگەڵ ئەمەشا چاپخانەی شارەوانی بەکرێ‌گرت بۆ لەچاپ دانی ڕۆژنامەکەی. لەم بوارەدا بایەخی دا بە ڕۆژنامەکەی‌و بە شێوەیەکی قەشەنگ لە (١٢) لا پەڕەدا هێنایە بەرهەم، بەوجۆرە ماوەیەك بەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەکەدا تێپەڕی‌و چەند ژمارەیەکی بە ڕێك وپێك و پرسوودی بەکەڵکی لێ بڵاوکردەوە، کوتوپڕ کەشمەکەشێ یەخەی گرت کە ئەویش کۆتایی هاتنی ماوەی بەکرێ‌گرتنەکەی چاپخانەکە بوو، لێرەدا فیری نەی‌ویست دووبارە چاپخانەکە بەکرێ‌بداتەوە بە پیرەمێرد بۆئەوەی ڕۆژنامەکە پەکی بکەوێ‌و دەرنەچێ، چونکە بەگوێرەی سازو ئاوازی ئاغای ئینگلیزیان هەڵ ناپەڕێ نابێتە زورنای دەم و کاوێژیان، بەڵام پیرەمێردی پڕ عەزم و هیمەت بە هەرچۆنی بوو هەرچی سامانێکی هەبوو فرۆشتی بەو پارەیە چاپخانەیەکی سەربەخۆی کڕی. ئینجا بە باوەڕێکی بەتینەوە ڕوژنامەی (ژیان)ی

دەرکرد بە بێدریغی کردن تا ڕۆژی (١٠)ی نەورۆزی ساڵی (١٩٣٨)ز ژمارەی ڕۆژنامەکەی گەیاندە (٥٥٣) ڕۆژنامە، ئیتر ئەوە دوا ژمارەی ڕۆژنامەی (ژیان)بوو چونکە مافی ئیمتیازی ڕۆژنامەکەیان لێ سەندەوەو دەرگایان لە ڕۆژنامەکە داخست. ئەویش سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی هۆنراوەو سروودی نیشتمانی شۆڕشگێڕ لەسەر ڕووپەڕەکانی ڕۆژنامەکە کە لەگەڵ ڕێبازی کاربەدەستانا نەئەگونجا...

پیرەمێرد لە ڕۆژی (٢٢)ي کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٩)ز ئیمتیازی ڕوژنامەی (ژین)ی وەرگرت، یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکە ژمارە (٥٥٤)ی هەڵگرتبوو لەبەرئەوەی لەسەر زنجیرەی خوشکە جوانەمەرگەکەی (ژیان) ئەڕۆین، ، ئا بەو جۆرە سەرلەنوێ پیرەمێرد گەشەیدا بە ڕۆژنامەکەو گۆشەی هەمەجۆرەی سوودبەخشی تیا بڵاوکردەوە، خزمەتی کۆمەڵ و زیندوکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتیمانی گرتبوە ئەستۆ.

ڕۆژنامەی ژین، لەکاتی گەرمەی خەباتە نەپساوەکەیا لەکاتی جەنگی گیتی دووەما گەلێ چەرمەسەریو دەس کورتی هاتۆتە پێش، بەڵام بە گیانێکی پڕئارامەوە توانی زاڵ ببێ بەسەر هەموو ئەو کۆسپانەدا کە هاتە ڕیگای.

ئابەو جۆرە پیرەمێردی کوردپەروەرو ئازاو بلیمەت هەتا ڕۆژی (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٠)ز توانی کە (١٠١٥) ژمارە لەڕۆژنامەکە بخاتە ژێردەستی خوێندەوارانی نەتەوەکەی، وە لە ڕۆژی (١٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٠)ز لە تەمەنی (٨٣) ساڵیا کۆچی دوایی کرد لەسەر ڕاسپاردەکەی خۆی لەگردی (مامەیارە) نێژرا.

ئەوەشمان لە بیرنەچێت کە پیرەمێردی خوالێخۆشبوو لە سەرەمەرگا وەسیەتی کرد کە ئەبێ چاپخانەو ڕۆژنامەکە بە پوختەیی بەخێو بکرێ.

بەڵێ... پیرەمێردی نەمر لە ماوەی (٢٦) ساڵی ڕەبەقا خۆی بە دەرکردنی ڕۆژنامەی (ژیان)و (ژین)ەوە ماندوو کرد، وە لەو ماوەیەدا هیچ فەرمانبەرییەکی میری نەگرتە دەست، ژیانی خۆی تەنیا بۆ پیشەی ڕوژنامەگەریو نووسینی ویژەیی تەرخان کرد.

هەروەکو خوێندەوارانی بەڕێز شارەزان کە پیرەمێرد بەتەنیا نووسەر نەبوە

بەڵکو دەستێکی باڵای بووە لە هەڵبەستوهونینەوەدا، خاوەنی دیوانێکی شیعری دەوڵەمەند بووە، وە لە بەرهەمە نازدارەکانی پیرەمێرد ئەمانەن:-

١ ـ لە پاشماوە دێرینەکانی پیرەمێرد (١٠٠٠٠) دەهەزار دێرە هۆنراوەکانیەتی کە بە شێوەی (پەندی پێشینان) هۆنیویەتەوە لە رووپەڕەکانی ڕۆژنامەی (ژین)دا لەژێر ناوی (پەندی پێشینان)دا هەموو جارێ چەند دێڕیکی بڵاوکردۆتەوە وە لە ساڵی (١٩٦٩)ز بە سەرپەرشتی مامۆستا (کاکەی فەللاح) چەند بەرگێکی لەچاپ دراوە.

٢ ـ هۆنراوەکانی شاعیری نەمر (مەولەوی) کە پیرەمێرد لەسەر شێوەی سۆرانی هۆنیویەتەوە وە لە دوو بەرگا لەچاپخانەی (ژین) چاپیکردوون.

٣ ـ (مەم وزین) لەسەر شێوەی چیرۆکی پەخشان چاپیکردوە.

٤ ـ (دوانزە سوارەی مەریوان) چیرۆکێکە دەربارەی ئازایی کورد.

٥ ـ (مەحمودئاغای شیوەکەڵ) چیرۆکێکی ڕووداوە لەناو کوردەواری‌یا.

٦ ـ (گاڵتەوگەپ) بریتیە لە پەندو سەرگوزشتەی کوردی.

٧ ـ (کەمانچەژەن) چیرۆکێکی ئەڵمانی‌یە لە تورکی‌یەوە کردویەتی بە کوردی.

ئەم بەرهەمانەی باسمان کردن هەموویان چاپ کراون و بڵاوکراونەتەوە.

سەرچاوە: لە کتێبی مێژووی ڕۆژنامەگەری ساڵی ١٩٧٠ز.

## (وەسیەت نامەکەی پیرەمێرد)

ئەمجارە ئەمرم، لە مردن ناترسم، ژیانێکی باش و عومرێکی درێژم رابواردوە، گەلێ شاران و وڵاتـان گەراوم، گەورەو پادشـاهـانم دیوە، تاڵی و سوێری زۆرم چەشتـوە، بە نیـوەخـوێنـدەواری لە سلێمـانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە، بە سەر بەرزی ئەزانم کە لە رێی باوەری خۆما حەپس و زیندانێکی زۆرم دیـوە لەم وڵاتـەدا، دوو چاوم هەبـووە یەکێ (زانستی)و یەکێ (ژین)، ئێستاکە ئیتر لەوانەیە کەڵکی خزمەتم پێوە نەمێنێ‌و ببم بە بار بەسەر خەڵکەوە، رووئەکەمە قاپی ئەبەدی، رووئەکەمە قاپی ئەبەدی بە بێ‌ئەوەی کە ماڵی کەسم خواردبێ، محتاجی کەس بووبێتم، هیچم پاشەکەوت نەکردوە، هیچیشم لەدوا بەجێ‌نەماوە، چاوم لەدوای خۆم نی‌یە، خۆم بە ئاخرخێر ئەزانم، هەرچەندە یەگانە هیـوام ئەبوو کە ببینم قەوم و میللەتەکەم پلەیەك لەمە بەرزترو خوێندەوارترو پێگەیشتوتر بن، بوو بە گرێ لەدڵما نەمدی، لەگەڵ ئەوەشدا بەختیارم چونکە بۆم دەرکـەوت کە قەوم و میللەتـەکـەم لە پێشکـەوتنـدان و هەمـوو جۆرە توانـاو قابلیەتێکیان تێدایە. ئامۆژگاریم ئەوەیە بخوێنن، کورو کچ تا خوێندەوار نەبن بێ‌سوودە، هەموو شتێك بە عیلم و فەنەوەیە، وەکو وتومە:

لای من خوێندەواری‌یە، ئا خوێندەواری‌یە
هەر میللەتێ کە فەننی نەبێ دەردی کاری‌یە
ئاخ خوزگە خوێندنیش وەکو من ئارەزوو ئەکەم
ببینم و نەبێتە گرێی قورسی کفنەکەم

ئامۆژگاریم ئەوەیە بەشوێن مادە نەکەون، دنیا زۆر بەگران مەگرن، تا ئەتوانن خزمەتی ڕاست و بێمقابلی قەوم و زمان و وڵاتەکەتان بکەن و دەستی داماوان بگرن و لە دین لامەدەن، خواو پێغەمبەری خۆتان بناسن و ڕەوشتتان پاك و خاوێن بێت.

ئامۆژگاریم ئەوەیە چاپخانەکە مەفەوتێنن، ئەم قەڵەندەرخانەیە تێك مەدەن. ئەو یەك دوو کەسانەی ئەم بەینە لەم قەڵەندەرخانەیەدا خۆیان داوەتە پەنای من بێنازیان مەکەن، حەقیان بەسەرمەوەیە، ڕۆژنامەکەش لەدەست مەدەن.

چاپخانەکە ئیش پێبکەن چونکە، لە لایەکەوە ناکوژێتەوەو خزمەتێکی پێ ئەکرێ، لە لایـەکیتریشەوە ئەو جیهەتانەی من یارمەتیم داون بەڵکو بەهۆی ئیش کردنی چاپخـانەکەوە ئەو یارمەتییەیان لێ نەبڕێت، ئامۆژگاریم ئەوەیە شیعرو نووسینەکانم کۆکراوەیە مەیفەوتێنن ئیستفادەی لێ ئەکرێت. ئامۆژگاریم ئەوەیە لە (گـردی یارە) بمنێـژن. بۆم مەگـرین، ئەگـەر زۆر بیرتـان کردم جارجـار سەرم لێبدەن. فایەق ئەم ئامۆژگاریانەم بۆ تۆیەو بۆ ئەوکەسانەیە بەتەنگمەوەن..

سەرچاوە:

---

پیرەمێردی نەمر ١٨٦٧ ـ ١٩٥٠ نووسینی محمد ڕسول «هاوار»



● مەلا حەمدوون زەکی

١٨٥٦ - ١٩١٨

# شاعیرو بلیمەتی بەناوبانگ مەلا حەمدوون زەکی

ناوی مەلا محمدی کوڕی مەلا ئیسماعیلی کوڕی مەلا یوسفە لە بنەماڵەیەکی مەلازادە لە ساڵی ١٨٥٦ز لە سلێمانی لە گەڕەکی سەرکارێز بەکوێری هاتۆتە دنیاوە، دوو برای هەبووە یەکەمیان حاجی مەلا ئەورەحمانی دەرمان کوت کە لە سەرەداری «بیەکاژاو» پاش سوتاندنی دەرمانی تێکەڵ ئەکردو باروتی لێ دروست ئەکرد بۆ تەقەمەنی، خەزوری خەلفە فەرەجی وەستا توفیقی کەبابچی بوو، دووەمیان ناوی عەبدوڵڵا بووە کە لە شەڕی پشدەردا لە سەردەمی عوسمانی کوژراوە. خێزانەکەی ناوی «حەبیبە» خانی کچی صالح ئاغای حەمەمین ئاغای بینباشی بووە ئەمیش بەکوێری هاتوەتە دنیاوە لە گەڕەکی سابون کەران، ئەم ژنە دەنگی خۆش بووە، لە تەعزیەی ژناندا قورئانی خوێندوە، دوو کوڕی هەبووە کەورەکەیان مەلاحیدی شاعیرە کە دەنگی خوش بووە لە تەعزیەو مەولودا خوێندویەتی‌و حوجرەشی هەبووە، دووەمیان مەلا جەلالە کە لە کفری ژیاوەو هەر لەوی‌و کوچی دوایی کردوە.

ئەم کوێرەبلیمەتە جگە لە قورئان کە لەبەر خوێندویەتی هیچ جۆرە قوتابخانەیەکی نەدیوە، بەڵام خوا زیرەکی‌یەکی وای دابوویە کە لە کەم کەسدا لە مرۆڤدا هەبووە، وە هەروەها بە بێ بێچاو هەستێکی‌وای دابوویە کە لە هیچ چاوساغێکدا نەبووە، وە جگە لە کوردی بە فارسیش شیعری وتوە، مەلا حەمدون پیاوێکی ڕەشتاڵەی کونجی باڵا بەرزو ڕەقەڵە بووە، لە ڕێگاوباندا جارجار دەستیان ئەگرت وە زۆرجاریش بەتەنها ئەسورایەوە تەنانەت بەوکوێرییە بە تاقی

تەنیا شارەزای هەموو کوچەو بازاری ئەستەمبوڵ بوو، هەمووساڵێك لە هاویندا لەگەڵ چەند کوێرێکی‌تردا چووە بۆ کوردستانی ئێران وەك سنەو سەقزو سەردەشت و سابلاغ و دێهاتی ئەو ناوچانە بۆ نان پەیداکردن تا پایزێکی درەنگ ئنجا هاتۆتەوە. بەبۆنەی ئەم هاتوچۆی دەرەوەو ئەو شارانە ناوبانگی شیعری‌و وریایی‌و بلیمەتی‌و بەسەرهاتی سەیری ناوی دەرکردبوو. ئەم کوێرە وریایە تابڵێی قسەخۆش و بەزەوق و دەم بەپێکەنین بووە، چوبێتە هەر کۆڕێکەوە بووە بە بەزم و سەرگورشتە گێرانەوە ئەو دانیشتنەی خۆش کردوە زۆرجار یاری «شەترنج»و «دامە»یان لەگەڵ کردوە کەس نەبوە لێی بەرێتەوە. زۆری وەختی لەناو فەقێ‌و مەلاکاندا بەسەربردوە هەر جارە یاری‌یەکی وای لێ داهێناون هەموو سەرسام بوون.

جارێکیان چمکی هەردوو فەقیانەی فەقێیەك گرێ‌ئەدا لەپاشا فەقێیەکی‌تر دێنێ فەقیانەکەی ئەکا بە فەقیانەکەی ئەم فەقێیەدا وە چمکی هەردوو فەقیانەکەی ئەمیش گرێ‌ئەدا ئەمجا بەرەڵایان ئەکاو پێیان ئەڵێ بزانم بە بێ‌کردنەوەی یەك لەم دوو فەقیانەیە ئەتوانن خۆتان ڕزگار بکەن ئەوانیش هەرچەند ئەکەن نازانن چی‌بکەن دوایی بڕیار ئەدەن هەر خۆی نەبێ ناتوانن ڕزگاریان بێت، کوێرە دێت ئەمیان ئەکات بە کونی فەقیانەی ئەویاناو ئەوی‌تریان ئەکات بە کونی فەقیانەی ئەمیانا بەجۆرێك هەر خۆی ئەیزانێ چۆن هەردووکیان لە یەك جیابکاتەوە.

زۆرجار سەعاتیان تێك وپێك ئەداو پارچە پارچەیان ئەکرد ئنجا ئەیان دایە دەستی ڕێك وپێك چاکی ئەکردەوەو ئەیخستەوەکار، ئەگەر گوێی لە تەپەی پێی ئافرەت بوایە ئەیزانی ئەمەژ نە یان کچە، ئایەتی قورئانت لێ بپرسیایە ئەی‌وت

ئەم ئایەتە لە قورئانی حافظ عوثمانا کەوتۆتە فلان پەرەوە.

زیرەکی ئەم پیاوە بەوکوێری‌یە گەیشتبوە رادەیەك خەڵك ئەیان وت بەڵێ چاوی نی‌یە بەڵام جنۆکەی هەیە شتی پێ‌دەڵێ لە ژورێکدا پێت بووتایە ئەم ژوورە چەند داری دارەڕای تیایە هەڵئەسایە سەرپێ‌و هەردووباڵی لەم سەری ژورەکەوە بۆ ئەوســەری چەنـد جار ڕێـك درێژ ئەکرد و ئەیوت ئەوەندە داری تیایە ئەگەر بتـژمـاردایـە کەم و زیـادی نەبوو، فیشەکیان ئەدایە دەستی هەندێ دەستی لێئەخست وە دوایی لەناو سی چل فیشەك دا تێکەڵیان ئەکرد نوختەیان بە قەڵەم لێـئـەدا ئینجـا ئەیـان دایـەوە دەستی یەکـەیـەکە دەستی لێئەخستن و لەناو هەمـویـانـدا فیشەکەکەی ئەدۆزیەوە، یان کتێبێکیان دابێتە دەست ڕووەکەی دۆزیوەتەوە واتە ڕووی کتێبەکەی کردۆتە خۆی وەك یەکێك بیەوێت بیخوێنێتەوە، یاخود سێ چوارکەسی نەناسیاو قسەیان لەگەڵ کردوە ئەم بلیمەتە وتویەتی ئەوەیان درێژەو باڵابەرزە ئەوەیان کورتەباڵایە یان ئەوەیان پیرەو ئەوەیان گەنجە یان سەیر ئەوە بووە کە جوان و ناشرینی بەدەنگیانا جیاکردۆتەوە لەمانە سەیرتر ئەوەیە ئەم کوێـرە وشیارە لە کۆڕی دانیشتندا لێیان پرسیوە مامۆستا ئێمە لێرەدا چەند کەسـین کەمێـك گوێی گرتووە پاشان وتوویەتی ئەوەندە کەسن کە تەماشایان کردوە دەق ئەوەندە کەس دەرچووە.

بۆئەوەی زیاتر لە ژیانی ئەم بلیمەتە بزانن ئەوا چەند بەسەرهاتێکی خۆشتان بۆ باس ئەکەین لەگەڵ نموونەیەك لە شیعرەکانی:ـ

١ ـ مەلا حەمدوون و مەحمود پاشای جاف:

ـــــــــــــــــــــــــــــــــــــ :ـ ڕۆژێ مەحمـــود پاشـــای جاف ئەڵێ حەمـدوون بیستومە ئەڵێن لەناو تۆپێ جگەرەدا جگەرەیەك ئەدۆزیتەوە ئەویش ئەڵێت پاشـا وایە، ئەڵێت ئەگەر وەها بێ خەڵاتت ئەکەم، پاشا ئەڵێت و تۆپە جگەرەکەی بۆدێنن وە جگەرەیەك ئەداتە دەست حەمدون وە دەستی لێئەخات و ئەیداتەوە دەست پاشا، ئنجا پاشا ئاغزەکەی دەردێنی‌و ئاغزەیەکی‌تری تێئەخات وە بە قەڵەم نوختـەیەکی لێئەدات و تێکەڵی تۆپە جگەرەکەی ئەکات و ئەیدەنە

دەست حەمـدوون ئەویش یەکە یەکە جگەرەکان ئەگرێت بەدەستیەوە وە باش دەستی لێ‌ئـەخـات کە ئەگـاتە سەر ئەو جگەرەیە ڕائەوستێت و هەر ئەم سەرو ئەوسەری ئەکات و دای‌نانێ مەحمود پاشا ئەڵێت ها کوێرە بۆ داینانێیت، ئەڵێ پاشا بەخوا ئەم جگەرەیە خۆیەتی بەڵام سەرم لە ئاغزەکەی سورماوە لەو ناچێت ئەبێت گۆڕیبێتت، ئنجـا مەحمـوود پاشـا ئەڵێت کوێرە بە کەلامی خوا، خوا زانیویەتی چاوت گەرەك نی‌یە بۆیە پێی‌نەداویت.

٢ ـ حەمدون و سەعاتەکەی:

______________: ـ حەمـدون لە ئێرانـەوە دێـتـەوە لای سەقـزەوە سەعاتەکەی لەبەری ئەپەڕێت و سەعات ژمێرەکەی‌و دەقیقەژمێرەکەی ئەشکێت، هەر لەوێدا حەمدون دائەنیشێت و شقارتەکەی دەرئەهێنێت لە تەختەی قەپاغی شقارتەکە سەعات ژمێرو دەقیقەژمێری لێ دروست ئەکات و ئیشی پێ‌ئەکات هەتا ئەگاتەوە سلێمانی.

٣ ـ حەمدون و عەلی ئاغای گەورە:

______________: ـ حەمدون لە خانوویەکدا ئەبێت لەژوور ماڵی عەلی ئاغای گەورەوە، لە گەرەکی سەرکارێز، وا ڕێك ئەکەوێت ئەو ئاوەی دێت بۆ ماڵی عەلی ئـاغـا لە کارێـزەوە بە گونـج بەوخـانـووەدا دێـت کە حەمـدونی تیـایـە، حەمدون دێت بۆلای عەلی ئاغاو ئەڵێت ئاغا من کوێرم وە خێزانەکەشم هەر کوێرە کە ئەچێت بۆ کارێز بۆ ئاو زۆر زەحمەت ئەبینێت خێرت ئەگاتێ ڕازی ببە ئەو ئاوە بەقەدەر مەرکانەیەك هەڵبدەینەوە بۆ بەکارهێنانی وە پەیمانت ئەدەمێ کە پیسی ناکەین وە زۆر چاك ئاگاداری ئەکەین، لەمە عەلی‌ئاغا تورەئەبێت و ئەڵێ کوێرە من ئاو لە ماڵما سەرچاوەیە تۆ هەڵت دایەوە ئەو پاکیەی نامێنێت و خەڵك پێی فێر ئەبێت بەخوا پەنجەی لێ بدەیت پەنجەت ئەبڕم.

حەمدون بەزویری دێتە دەرەوە ئەڵێت باشە دەستی لێ‌نادەم.

دوای ماوەیەك بە عەلی ئاغا ئەڵێن، ماوەیەکە نابینین مەلاژن بێت بۆ کارێز بۆ ئاو، ئەبێ ئاوەکەی هەڵدابێتەوە ئاغا بە مەلا ئەڵێ‌و مەلاش ئەڵێ نەبوە، ئاغا لێی

ڕۆشن ئەبێت کەوا حەمـدون ئاوەکەی هەڵداوەتەوە وا بە باش ئەزانێت خۆی ئازاری حەمدون نەدات وە بە حکومەت تەمێی بکات.
خەبەر ئەدات بە قوڵاغاسی ئەوڕۆژەی زەمانی تورك بە چەند زەفتیۆە دێت بۆ ماڵی حەمدون و موختار لەگەڵیاندا ئەکەونە گەڕان لە ماڵی حەمدون حەوش و هەیوان و ژوور هیچیـان بۆ نادۆزرێتـەوە حەمـدون و مەلاژنیش هەر ئەبـوڵێنن و دۆعا ئەکەن و ئەڵێن ئەمە حەقی دراوسێیەتییە؟ قوڵاغاسیو زفتیێ بێنێتە سەر کوێری بێدەسەڵاتی وەکو ئێمە قوڵاغاسی لە عەلیئاغا گرژ ئەبێت و ئەڵێئاغا عەیبە گەر بە کوێـرێکی وەهـا ئەکـەیت کوا ئاو، ئاغـا ئەڵێت قوربـان باوەڕ بکـە ئاوی هەڵداوەتەوە ئێمە نایدۆزینەوە تۆ ئەمە ناناسیت، ئەڵێ ئاغا ئاو چۆن ون ئەبێت ئاخـر کوا؟ ئاغا لە دیوارێکدا دۆڵابێ ئەبینێ ئەڵێ حەمدون ئەبێ ئەو دۆڵابە بکەیتەوە حەمدون ئەڵێ ئاغا تۆزێ غیرەتت بێ ئەمە جل وبەرگی مەلاژنی تیایە عەیبە، ئەبێ بەقرەیان مەلا دولابەکە ئەکاتەوەو ئەڵێ ئەو قورئانەی سنگم کرد بەگژتا بۆ بێغیرەتیت، دۆلاب ئەکاتەوە بەڵێ جل وبەرگی مەلاژنی تیایە، قوڵاغاسی تەواو لە عەلی ئاغا تورە ئەبێت دێتە دەرەوەو ئەڵێت برۆ ئیتر ناوی ئەم کوێرە بێنیت خراپت پێئەکەم دیارە تۆ شتێکت هەیە لەگەڵ ئەم کوێرە ئیش لە ئاوا نییە، ئاغا بە هەناسەی ساردەوە ئەڕواتەدەرێ. تومەس دۆڵاب سەیارەو ئاوەکەی وا لەژێردا ئیشی پێئەکەن و دۆڵاب قایم ئەکەنەوە. حەمدون ئەڵێ مەلاژن ئیمرۆ قنچکە بامێو تڵپە ترشەکەی برێژە ئاوەکەوە با بچێ بۆ ماڵی ئاغا، ئاغا سەیر ئەکات وا قنچکە بامێو تڵپەترشی بە ئاوەکەدا بۆ دێتە خوارێ، بەڵام چیبکات ئاوی نەدۆزیەوەو قوڵاغاسی هەڕەشەی لێ کردوە ناوی حەمدون بێنێ.
سبـەینـێ مەلاژنی نارد ڕەنگی سوورو سەوزو شین و زەردی بۆ کڕی لە سلێمـانی. ڕەنگـە سوورەکـەی دا بەدەم ئاوەوە بۆ ئاغا، ئاغا سەیریکرد وا سوراوی بۆ دێتە خوارەوە سەرێکی ڕاوەشاندو وتی بەخوا سەرچاوەی چاکم هەیە تۆزێکیتر بوو بە سەوزەئاو، نەختێکیتر بوو بە شین، ئاو نزیك عەسر بوو بە زەرداو بە ڕاکردن ڕۆیشت بۆ ماڵی حەمدون قاپی داخرابو دای لە قاپی حەمدون وتی کێیە عەلیئاغا وتی منم مەلا وتی چییە ئاغا دیسان چییە بۆچ وازم لێ ناهێنی لەباتی یاریدەو خزمەتم شەرم پێ ئەفرۆشی، گەورەی گەرەك وەها ئەبێت،

بابە ئەم خانووە چۆڵ ئەکەم وئەڕۆم بۆ گەڕەکێکیتر، عەلیئاغا ئەڵێ مەلا مەیکە بە هەرا بەخوا ڕازیم، ڕازیم هەر ڕەنگی تێمەکە، بەڵام پێم بڵێ چۆنت دزیوە شەرت بێ هیچ دەنگ ناکەم و تۆش پیسی مەکە، ئەڵێ وەرە ژوورەوە، دۆڵابەکەی پیشان ئەدات سەیرئەکات مەرکانەیەك وا لەژێریا لەلایەکەوە ئاوەکەیتێ ئەچێو لەلایەکەوە ئەچێتەوە بۆ گونجەکە.

٤ ـ کەرەتیك مەلا حەمدون کەڵەشێرێکی چاکی ئەبێت زۆری خۆش ئەوێت، ڕۆژێك لێی ئەدزن، بە دزینی ئەم کەڵەشێرە زۆر دڵ تەنگ ئەبێت هەر لە بیری ناچێتەوە، پاش ساڵێك بە گەڕەکێکیتردا تێئەپەڕێ گوێیێ لە دەنگی کەڵەشێرێك ئەبێت بە دەنگی خوێندنیدا دەیناسێتەوە کەڵەشێرەکەی خۆیەتی ئەچێتە سەریان بە ناونیشان لێیان ئەسێنێتەوە.

٥ ـ مەلا حامیدی کوڕی مەلا حەمدون گێڕایەوە جارێکیان مەلا حەمدون لەماڵی حاجی مەلا ئەورەحمانی دەرمان کوتی برای لە حەوشەکەیان دائەنیشێ لەوکاتەدا ماڵی حاجی مەلا ئەورەحمان کەسی لێ نابێت جگە لە ڕەحمەخان کە خێزانی حاجی مەلا ئەورەحمانە پاشان ئەویش دەڕوا بۆ ماڵە دراوسێیەکیان ماڵ چۆڵ ئەکەن لە حەوشەکەدا حاجی مەلا ئەورەحمان بەرانێکی ناپاب و وریایان دەبێت ناوی «مەرجان» دەبێت، مەرجان هەمووکات بەرەڵا ئەکرا بۆ دەشت و لەوەڕ بێئەوەی کەسی لەگەڵ بێ خۆی لەپاش لەوەڕ هاتۆتەوە بۆ ماڵەوە کە مەرجان مەلا حەمدون ئەبینێ ئەچێتە پێشەوە لێی دەست ئەکات بە جوونی فەقیانەکانی مەلا حەمدون، تا وایلێدێت مەلا حەمدون هەردوو دەستی قورس ئەبیو بێتاقەت ئەبێ لەپڕ مەلا حەمدون بە هەموو هێزی خۆی هەردوو دەستی ڕائەپسکێنی بۆئەوەی لەدەست مەرجان ڕزگاری بێت لەوکاتەدا مەرجان دوور ئەکەوێتەوە بۆ ئەوەی گوڕ ببەستێتەوەو بە هەموو هێزی شۆقێك لە مەلا حەمدون بدات ـ مەلا حەمدون وتویەتی کە مەرجان دوورکەوتەوە زانیم ئەیەوێ گوڕ بخواتەوەو بە هەموو هێزی شۆقم لێبدا.. ئا لەوکاتەدا ئەم بلیمەتە توانیویەتی لەو ماوە کەمەدا کە مەرجان خەریکی گوڕبەستنەوە بوو ئەو دارتووە گەورەیەی لە حەوشەکەیاندا

بوو دۆزیوێتەوەو بە یەك هەناسە سەركەوتۆتە سەرەوە تا لە شاخەكانی مەرجان ڕزگاری بێت، گەر چاوساغ بكەوێتە حاڵەتی واوە كونەمشكی لێ ئەبێ بە قەیسەری، كاتێك كە ڕەحمەخانی خێزانی حاجی مەلا ئەورەحمان دەگەڕێتەوە تەماشا ئەكات مەلا حەمدون دیار نی‌یە.. ئەم لا ئەكا ئەولا ئەكا بێ‌سوود دەبێت ـ پاشان مەلا حەمدون لەسەر دار توەكەوە هاوار دەكات بڕوانە ڕەحمە وام لێرە دڵت هیچ نەكات ـ ـ پاشان دێتە خوارەوە.

٦ ـ مەلا حامید گێڕایەوە وتی كەرەتێك مەلا حەمدون میوانی شێخ طیبی تاڵەبانی ئەبێ ... هەموو شەو كە لە حوجرە نانی بۆ دائەنێن تا لە مزگەوت دەگەڕێتەوە تەماشا ئەكات نانەكەی كە شێخ طیب بۆی داناوە لە تەكیەكەی نەماوەو خوراوە شەوێ دووشەو سێ‌شەو ئەمە دووبارە ئەبێتەوە، پاشان بۆی دەرئەكەوێ كە پشیلەیەك بە نانەكەی فێر بووە، مەلا حەمدون زۆر داخ لە دڵ دەبێ‌و هەر شەو بێ‌شێو سەرئەنێتەوە هیچ دەنگ ناكات ئەم كوێرە بلیمەتە ئەهێنێ چوار پۆتین لە گوێز هەڵدەكۆڵێ بە قەڵەم بڕ ئامادەی دەكات و كەمێ قیر پەیدا دەكات، شەوێ لە شەوان پیرە پشیلە دەگرێ‌و بە قیر قاچەكانی پشیلە لە گوێز دەگرێ‌و پاشان بەرەڵای دەكات و دەڵێ دەبڕۆ بۆ ناودێ، دەیكاتە خۆراكی سەگ و لەكۆڵ خۆی دەكاتەوە..

٧ ـ مەلا حامید گێڕایەوە وتی سەفەرێك مەلا حەمدون ئەچێ بۆ لای عبدوڵڵا بەگ «ئەدەب» لە دێی «ئەرمەنی بلاغی» كە دێی «ئەدەب» بووە، ئەچێتە دیوەخان، لە دیوەخان نابێت، جوابی بۆ ئەنێرن كەوا مەلا حەمدون هاتووە بۆ خزمەتت لە سلێمانیەوە، حەزدەكات بێتە خزمەتت، ئەویش نایەت بۆ دیوەخان و ئەڵێ جارێ كاتی ئیسراحەتە دوایی ئەیبینم، خێرا مەلا حەمدون ئەم شیعرەی بۆ دێت .. كە دەڵێ:

كە تۆ میصباحی دیوانی وڵاتی
قەراری سەبرو ئارام و ثەباتی
شل و توند ناوقەدم گرتی لەكوندا
كەچی كلكت پسا بۆم دەرنەهاتی

ئنجا مەلا حەمدون دیوەخان بەجیٚدەهیٚلیٚت و دەڕات، پاشان کە میصباح الدیوان «ئەدەب» دەزانیٚ مەلاحەمدون ڕۆیشتووە پەشیمان دەبیٚتەوە، بەڵام مەلا حەمدون ناگەڕیٚتەوە هەرچەند پیاوەکانی بەسواری دەچن بەشویٚنیدا دەڵیٚ هەموو ئیٚرانم لەسەر تاپۆ بکەن ناگەڕیٚمەوە.

٨ ـ جاریٚك مەلا حەمدون لە لادیٚ بزنیٚکی دەست ئەکەویٚ، ئەو ماڵەی تیایدا ئەبیٚ حەوشی نابیٚ، شەویٚ خۆیو خاوەن ماڵەکە لەسەر بان ئەنوون بزنەکە لە خوارەوە ئەبەستیٚتەوە بە گوریسیٚکەوە، سەری گوریسەکە لە سەربان ئەبەستیٚ بە دەستی خۆیەوە نیوەشەو گورگیٚك دیٚتە سەر بزنەکە، کویٚرە خەبەری ئەبیٚتەوە بە جوڵانەوەی گوریسەکە، عاستی گورگەکە ئەدۆزیٚتەوە لەتەنیشت خۆیەوە دەست ئەداتە تفەنگ، تفەنگیٚ ئەنیٚت بە گورگەکەوە ئەیکوژیٚ ئنجا خاوەن ماڵ خەبەریان ئەبیٚتەوە.

٩ ـ لە سلیٚمانی «عەجەم ئۆغلیٚ» ناویٚك لەگەڵ شەش هاوڕیٚیتری کوژران، ئیٚرانی بوون، لە دوکانیٚکدا نزیك ئەصحابەسپی، ئەم خویٚنەیان هیٚنا بەسەر مەلا مەحمودو مەلا ڕەشیدی کوڕانی حاجی مەلا ئەوڕەحمانی دەرمان کوت دا، کە برازای مەلا حەمدون بوون، هەردووکیان ڕائەکەن ئەچن بۆ دیٚی «دووڕووە» لە ئیٚران، لەپاش چەند ساڵیٚك مەلا ڕەشیدیان ئەیەویٚت بەدزیەوە سەریٚکی سلیٚمانی بداتەوبۆ بینینی دایکیو باوکیو کەسوکاری لە ڕیٚگا لە نیوەشەویٚکا خۆی ئەکا بە دیٚی «وکان»دا ئەچیٚتە ماڵی عبدالقادری مەهدی کە موختاری ئەو دیٚیەیە و ناسیاوی خۆیانن وە بیٚچرپە دەست ئەنیٚت بە دەرگای دیوەخانەکەوە، کە ئەچیٚتە ژوورەوە تەماشا ئەکات دوو کەس لەژیٚر لیٚفەدا نوستون لە چونە ژورەوەکەی ئەم کویٚرە وشیارە خەبەری ئەبیٚتەوەو سەری لیٚفەکەی لائەدا ئەڵیٚ ڕەشید ئەوە کەی هاتیت؟! ئەمیش لەبەرئەوەی کە بە قاچاغی هاتووە قسە ناکات، ئەمجا تیٚیئەخوڕیٚ ئەڵیٚ ڕەشید ئەوە بۆ قسە ناکەیت؟ ئەمیش ئەڵیٚت بەخوا مامە ئیٚستا گەیشتومەجیٚ، مەلا ڕەشید هەتا مرد هەر ئەی وت ئیٚستاش نازانم ئەو چۆنی ناسیمەوە، بەو نیوەشەوەو بەدەم خەوەوە، چۆنی زانی لە ئیٚرانەوە گەیشتومەتە ئەویٚ.

١٠ - جارێکیان مەلا حەمدون لە ژووری خۆی دائەنیشێ لەگەڵ خێزانەکەیدا لەپڕ گوێی لە تەپەی پێی زەلامێك ئەبێت لە سەربانەوە تێئەپەڕێت لەپاش نیوسەعات دووبارە گوێی لە تەپەی پێی زەلامیك ئەبێت لە سەربا نەوە ئەگەڕێتەوە، ئەم کوێرە بە ژنەکەی ئەڵێ: ئەم هاتوچۆیە یەك زەلامە کە ڕۆیشت کچ بوو، کە گەڕایەوە لەوسەرەوە بووە بە ژن. خێزانەکەی ئەڵێ باوانت شێوێ چۆن ئەبێت شتیوا، کە ئەچنە بنج و بناوانیەوە دەرئەکەوێ کە قسەکەی ڕاست بووە و کێ بوەو کێ نەبووە.



ئەم شاعیرە بلیمەتە (مەلا حەمدون زەکی) لە زستانی ساڵی ١٩١٨ز لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کردوەو لە گۆڕستانی (پیرمحەمە) بە خاك سپێراوە، بێئەوەی یەکێ لە کێلی گۆڕەکەی بنوسێ.... ئەمە گۆڕی بلیمەت و هەڵکەوتوو شاعیری گەورەی کورد (مەلا حەمدون زەکی)یە.
نمونەیەك لە شیعری مەلا حەمدون کە بەسەر (سەفەربەلگ)دا هەڵیداوە:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە عالەم شڵەژاوە؟
هەرکەس بە جەخارێ جگەری قیمە کراوە؟
دنیا پڕی ئاشووبە خەلایق بە عموومی
ئاسایشی لێ مەنعە ئەڵێی هێرشی ئاوە!..
کامەی کە ئەڵێی خۆشیەتی دوورە لە میحنەت
ڕیشەی دڵی ئالاوە بە سەد دەردو بەڵاوە!
گیرۆدەیە ئەم عالەمە هەرکەس بە سیاقێ
کەوتوونەتە زنجیرەیی ئەنواعی بەڵاوە!
وەك تەرزە ئەبارێ بە هەموودەم ئەسەف و غەم
هەوری غەزەب و قەهری خوا توندو بەتاوە!
نیك و بەدی ئەم زومرەیی ئیسلامە بەجارێ
کەوتوونە کەشاکەش بە قوماندەی ئومەراوە.

ئەم زاڵمی سەففاکی «سەفەربەلگە» ئەمرۆ
فەرمانی بە خوێن ڕشتنی ئەم عالەمە داوە
ژاندرمە ئەسوڕێتەوە وەك واشەیی برسی
بۆ لاشەیی میللەت بە فروفێڵێ غەزاوە!..
فەوتاوە لەبەر سوغرە کەرو ئێسترو یابوو
حوشتر سەقەت و شەل بووە، گا پشتی شکاوە!
کەر شەوقی زەرینی نی‌یە حەتتا لە بەهارا
ترسی هەیە نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە
هەر شەش جیهەتی گرتووە ئاشووب و موسیبەت
مێشوولە مەجالی نی‌یە دەرچێ لە حەواوە!
تەییارە بە ئەسبابی شەڕو فیتنەوە دایم
جەولانی ئەڵێی هەورە بەسەر مەرکەبی باوە!
باڵۆنی «هەلۆ» شێوەی لەگەڵ دێتە تەحەڕڕوك
عالەم لەنەزەریا بە مەسەل پۆری خوراوە!
ئەم جووتە بەلازادەیی باڵندەیە ئەمرۆ
سەییارەیی فەوقن بە ئەلکتریکی چراوە
عالەم لە شریخەو شەرەری بم بمی بۆمبا
حەیران و سەراسیمەوو عەقڵی خەرەفاوە
بەرقی غەزەبی دانەوو نارنجەك و تۆربید
ئاگر ئەپژێنێ لە زەمین و لە سەماوە!
شەو ڕۆژە لەبەر بەرقی قلیچ و ڕم و سوتنی
لەمعەی قەسەتۆرەش بەمەسەل بەرقی هەتاوە!
دەشت و جەبەل و بەحرو جزیرەو هەموو دنیا
شەق شەق بووە مەجمووعی بەدەم تۆپی قەزاوە!
وشك و تەڕی ئەم سەتحی کورەی ئەرزە بەجارێ
گوڵگون بووە، ڕەنگینە بە خوێنی شوهەداوە!
تا حوکمی تەماشایی تەسەوور لە هەمووڵا
هەر لاشەیی جنراوو سەرو دەستی شکاوە!

رووسی غەم و ئینگلیزی خەفەت هەردوو بەجارێ
هاتوونەتە سەر مؤمینیعوشرەت بە سوپاوە
هەر لەحزەیێ سەد لەك، چ لە مؤمن، چ لە موشریك
واسڵ بە دوو جێمن، بە عەتاوو بە خەتاوە!

واپۆری سەفینەو بەلەم و کەشتییو ئوستۆڵ
ئامادەیی حەربن، لە هەموو لا تەنراوە
گیراوە بە هێزی چەك و تەییارەوو ساروخ
مەعموورەوو ویرانە هەچی ناوی براوە

لەورۆژەوە دنیا هەیە تا ئەم دممە بێشك
مەغلووبەیی بەم غایەتە نەبووەو نەکراوە!
بۆ گرتن و بۆ کوشتنی ئەم عالەمە یەك سەر
ئەم عەرسەیی ئافاقە ئەڵێی حەلقەیی داوە!

ئەم دینە لەپێشا وەکو سەرچاوەیی زەمزەم
بێغەش بوو، ئەمێستاکە ئەڵێی عەینی قوڕاوە!
بنچینەیی دەرکەوتووە بنیادی شەریعەت
یەك سەر هەرەسی بردووە ئاساری نەماوە

پرگەردی غەمە ناوی سەعاتی دڵی عالەم
ڕەققاس و چەروزەنبەلەك و چەرخی شکاوە!
یارەببی لەبەر حورمەت و اکرامی «محمد»
ڕەحمێ بکە بەم باقییی ئیسلامە کە ماوە

کەم زۆرە ئەگەر نەسرەتی حەق ڕاهنما بێ
بێنەسرەتی حەق لەشکری «دارا» سەرە واوە!
«حەمدی» دڵی یەخسیری فەرەنگی غەمە ئەمرۆ
بەربوونی بە بەربوونی گەرووی «بەسرە» وو «فاو»ە!

سەرچاوە:

---

١ ـ ئەدەبی کوردیو لێکۆڵینەوە. علاءالدین سجادی، ١٩٦٨.

٢ ـ شانۆی ناوماڵ، نوسینی مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوڵ (صفوەت)، ١٩٧١.

٣ ـ گۆڤاری ڕۆژی نوێ، شێخ محمدی خاڵ.

٤ ـ کەمال فەرەج توفیق، کە ژیان و بەسەرهاتی لە مەلا حامیدی کوڕی مەلا حەمدون وەرگرتووەو نوسیویەتەوە، کە ئامۆزای دایکی‌یەتی.

* * *

تێبینی : [1] خۆزگە شیعرەکانی ئەم شاعیرە بلیمەتەمان ئەدۆزرایەوە کە ئەزانین لای هەندێ کەس هەیەولەکاتی خۆیدا چەند کەسێك شیعرەکانی لە مەلاحامیدی کوڕی یان وەرگرتووە. بەڵام بەداخەوە تا ئێستا هیچیان نەگەیاند بە ئامانج . ئەمەش نمونەیەك لەشیعرە ون بووەکانی بە شانازیەوە ئەڵێت:

هەرچەندە کە چاوم نیەتەعریفی قەمەرکەم
ئەمما بە زەکا مومکینە سەمعم بەبەصەرکەم
ئیسپاتە چ موحتاجە کە ئیظهاری هونەرکەم
هەردەم غەزەلی تازەیی طاهیر کە لەبەرکەم

٢ ـ دەستەی عەجەم ئۆغڵی ساڵی ١٩١٣ لە سلێمانی کوژراون.
[نووسەر]



● خواجه کەریمی ئەلەکە
١٨٤٥ - ١٩٤٨

## کەریمی عەلەکە

## - ١٨٤٥ز - ١٩٤٨ز

ناوی ڕەوشتی چاك ئەمێنێ‌و نامرێ ئەگەرچی ئەوکەسە لە ژیانیشا نەمابێ، بەڵام کاتێ کە ناوی هاتە پێشەوە لای خەڵکی بەڕێزەوە ناوی ئەبرێ، تەنانەت چاکەو کرداری باشی لە دەروونی خەڵکیا جێ‌گیر ئەبێ‌و ناکوژێتەوەو لە شوێنێکی واشا جێی‌ئەکاتەوە کە هەزاران بەسەرهات ڕوویدا ئەو هەڵنەکەنرێ‌و لەجێی خۆشیا بەسەرهات و چاکەو پیاوەتی لێ بگێڕرێتەوە.

لەم دواییەدا کە شارەوانی ناوی شەقامەکانی ناوشاری سلەیمانی نا شەقامێك ناونرا بە ناوی (کەریمی عەلەکە)وە، ناوبراویش لە بنەماڵەیەکی کۆنی ئەم شارەیەو پشتاوپشت لەگەڵمان هاتونەخوارێ‌و لە خۆشی‌و ناخۆشیا بەشدار بوون و خۆیان جیانەکردۆتەوە.

عەبدول کەریم کوڕی ئەلیاسە . جا لەبەرئەوەی خەڵکی خۆشیان ویستوە (ئەلیاسە)کەیان گۆڕیوە بۆ (عەلەکە)، وە عەلەکە بوە بە ناونیشانی خێزانیان.

کەریمی عەلەکە لەسەر ئاینی باووباپیرانی خۆی (مەسیحی) بوو، وە تابڵێی پیاوێکی ڕاست و پاك و لەخواترس بوەو کرداری جوانی خۆی پێشی خستوە لە ژیانا. سەرەتای ژیانی بە بازرگانی‌یەوە خەریك بووە تا لەئەنجاما بەجۆرێ نیشەکەی پەرەی سەندووە کە هەموو ناوچەی کوردستانی عیراق و ئێرانی گرتۆتەوە. وە شوێنی کەسابەتی لە خانەسووتاو لەگەڵ هاوشانەکانی ئەوسای خۆیا بووە.

له دەوری حوكمی شێخ مەحمودی نەمرا له ڕۆژی (١٠)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٢٢)ز بەشـداری كردوەو فەرمـانی (وەزیـری دارایی مالیـە)ی پێ سپـێرراوە. خواڵیخـوشبـوو یەكێك بووە له پیاوماقوڵانی دیوەخانی بابانەكان و شیخانی ئەو سەردەمە، وە پیاوێكی زۆر عاقڵ و زیرەك و دووربیین بوە، لەبەرئەوە هەر كە هەستی كردوە بە ڕوودانی شەڕی جیهانی یەكەم، دەغڵ ودانێكی زۆری عەمـار كردوەو، له ڕۆژی ڕەشـا بە پارەیەكی كەم فرۆشتویەتی بەوەی توانای كڕینی هەیە بۆئەوەی له شارەكەدا، دەغڵ و دان زۆر بێ ئەمە جگە لەوەی كە هەموو ئێوارەیە چێشتی لێناوە بە مەنجەڵی زنجیرە داری گەورەو بەسەر هەژارانا دابەش كراوە، چاكەو پیاوەتی ئەم زاتە بەوەشەوە نەوەستا، ئاوی كارێزی (حاجی عەبـاس)كـە بە ملكـایەتی هی خۆی بوو بەخشی بەو مزگەوتانەی كە ئەكەوتە سەری، وەكو مزگەوتی (حاجی شێخ ئەمین)و مزگەوتی تەكێ ڕووتەو مزگەوتی (هەمزاغا)و مزگەوتی (شێخ محەمەدی بەرزنجی).

لەكاتێكا كە ئینگلیزەكان تالانی ماڵی شیخانیان كرد بەتایبەتی ناوبراو دەستی یارمــەتی بۆ درێـژكـردن و چییـان ویست دریخی نەكـردو بە قەرزو قوڵە دەستیگرتن، تاكوو كەوتنە سەرخۆیان و قەرزەكەیان دایەوە.

له بۆردومانی شاری سلەیمانیا تاكە ماڵێ كە شاری چۆڵ نەكرد لە گەڕەكی گۆیژە ماڵی حاجی برایماغاو ماڵی كەریمی عەلەكە بوو، لەپاشا كە فەرمان داری شار لێیان پرسی هۆی نەڕۆیشتن و چۆڵ نەكردنتان چیبوو؟ لە وەڵاما ئەڵێ: من نەوەی ئەم خاكەم چۆنی بەجێیەڵم!!! وە پاشەڕۆژی من ئەبێ هەر لەگەڵ ئەم خاكەدا بێ.

ناوبراو جگە لەوەی كە زبانی (كلدانی) زبانی دیینی بوو كوردیو فارسیو عەرەبی زۆر باش زانیوە. كۆتایی ژیانیشی لە بەغا بردۆتە سەر تا ساڵی (١٩٤٨)ز وە لەم ساڵەدا گیـانی پاكی بە یەزدان سپـاردووەو هەرلەوێش لە گۆرستانی (كاسولیك) نێژراوە... دوای تەمەنێكی پڕ لە چاكەو خێرخواییو نیشتمان پەروەری.

سەرچاوە: بڵاوكراوەی سلەیمانی

لە بڵاوکراوەکانی - شارەوانی سلەیمانی
ژمارە (٩) ساڵی (١٩٦٨)ز لاپەڕە (٥١)
نووسیینی - غەرییب زێوەر.

* * *

(سەرگوزەشتەی زانایەکی نەمر)
حاجی مەلاعەلی مەڵکەنی



● حاجی مەلا عەلی مەڵکەندی
١٨٥٨ ـ ١٩٤٨
بە پێنووسی مامۆستا نەجمەدین مەلا

ڕۆژنامەی (ژین)
ژمارە (١٦٢٩)
دووشەممە ٣١/٧/١٩٦١ز
خویندەوارانی بەڕێز

پێویستە لەسەرمان کردەوەی چاکەی ئەو پیاوە چاکانە لەیادنەکەین کە دەربارەی مرۆڤ چاکەیان کردوەو ڕێی ڕاستی‌یان پیشانی مرۆڤ داوە چونکە ڕێـزی ڕۆییوان بگیرێ ئایندە بەچاکەو بەڕێز یەتە کایەوە، ئەوا ئەم وێنەیەی خوالیخۆشبوو (مامۆستا حاجی مەلا عەلی مەڵکەنی)م پێشکەش کردن لەگەڵ سەرگوزەشتەی ژیانی تا ببێ بە نمونەیە هەمووکەس لە ژیانیا بۆ ئایین و جیهان تێکۆشێ وە لە کارو کردەوەی چاکە دریغی نەکا.

حاجی مەلاعەلی مەڵکەنی: کوڕی (حاجی عەبدوڵلا)ی (محەمەد ئەميناغا)یە کە بە سێ پشت ئەچنەوە سەر (سوبحاناغا)ی خاوەنی (سەراوی سوبحاناغا). ساڵی (١٨٥٨)ز لە سلەیمانی لە گەڕەکی مەڵکەنی هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی لە حوجرەو لە مزگەوتەکانی سلەیمانی لای مامۆستایانی دینی بووە بۆ خوێندن تا شاری (سنە)ش چووە.

دوای کۆچی دوایی باوکی خێزانێکی زۆری بەسەرا کەوتوە بەڵام بە بەرهەمی زەوی‌وزارو چەند دووکانێك کە لە باوکی‌یەوە بۆی بەجێ‌ماوە بەخێوی کردوون، وە خۆیشی بە کشت وکاڵ و بازرگانی‌یەوە خەریك بووە. وە لە مزگەوتی مەڵکەنیا بە بێ مووچەو بەخۆڕایی دەرسی وتوەو پێش نوێژی کردوە.

حاجی مەلاعـەلی مەڵکـەنی: پیاوێکی رەوشت و خوو بەرزو دڵ و دەروون خۆش و باش و هێمن بوو لە ئەنجوومەنا قسەی نەستەق و شیرین بوو، مەلایەکی عەسری‌و بەخشندە بوو هەمیشە حەزی بە چاکەو سەربلندی نەتەوەکەی ئەکرد، خاوەنی سەرگـوزەشتـەی جوان جوان بوو، لە سەردەمی عوسمـانیـا (ئیمامی تابورر) بوو، ماوەیەکیش قازی (ئاغجەلەر) بوو، کە دەور گۆڕاو بوو بە دەوری ئینگلیز وازی لە مووچە خۆری هێنا چونکە مووچەی ئینگلیزی لەلا حەرام بوو، لەبـەرئـەمـە لە دووکـانێ لە دووکـانـەکـانی خۆی لە بەردەرکی سەرا بە مۆرهـەڵکـەنـدن و سکـالانـووسیینەوە خەریك بوو، لە زبانی بێگانەدا عەربی‌و تورکی‌و فارسی باش زانیـوە، وە ماوەیکیش بە پارێـزەری لەگەڵ (فەتاحەفەنی شەیدایی)و (مەلا عەلی مامەشێخە)دا هاوکار بووە.

لە هەمووی سەیرتر کە ئازایی‌و ماف پەرستی (مەلاعەلی) پیشان بدا ئەوەیە کە (مێجـەرسـۆن) حاکمی سیـاسی ئینگلیـز کە لە هەموانەوە زانراوە یەکجار دڵ‌ڕەق و زۆردار بوو کە بە شەقام و بازارا ئەڕۆیی ئەبوایە دانیشتوان لەبەری هەستانایەو رێبواریش ئەبوایە ڕابوەستایەو مل کەچ سلاوی بۆ بکردایە چونکە خۆی بۆ ئەمە فەرمانی دابوو.

ڕۆژێ (مێجەر سۆن) بە بەر دووکانەکانی بەردەرکی سەرادا دێتە خوارێ هەمـوو دووکاندارەکان لەبەری هەڵ ئەسن تەنیا (مەلا عەلی) لەبەری هەڵناسێ (مێجەر سون)یش یەتە بەردەمی (مەلا عەلی) ئەڵێ: بۆچی ئەم هەموو خەڵکە لەبـەرم هەڵسـاو تۆ لەبـەرم هەڵ نەسـای؟. (مـەلاعەلی)یش ئەڵێ تۆ پیاوێکی غەیرەدینی بەدینی من، دروست نیە لەبەر تۆ هەڵسم چونکە خوا فەرموویەتی: (یاایها الذین آمنو لا تتخذوا الیهود والنصاری أولیاء لکم فمن یتخذهم منکم فهو منهم). (مێجەرسۆن) ئەمەی زۆر پێ ناخۆش ئەبێ بەڵام هیچ قسە ناکاو بۆ سبـەینێ توورەکـەیـە پڕ ئەکـا لە پارەو ئەینـێرێ بۆ (مەلا عەلی) ئەویش

گلی‌ناداته‌وه‌و ئه‌ڵێ:
پاره‌ی غه‌یره‌دین به‌که‌ڵکی من نایه‌و من پێویستییم به‌ پاره‌ نی‌یه‌و ده‌وڵه‌مه‌نم.
دوای ماوه‌یه‌ چه‌ند ئینگلیزێ یه‌نه‌ لای (مێجه‌رسۆن) ئه‌ویش باسی (مه‌لا عه‌لی)یان بۆئه‌کا ئه‌ڵێ: مه‌لایه‌کی هوشیارو زیره‌که‌ ئینگلیزه‌کان ئه‌نێرن به‌شوێن (مه‌لا عه‌لی)یا ئه‌ڵێن:
ئێوه‌ بۆچی به‌ فه‌رمان ره‌واییو حوکمی ئێمه‌ رازی نین؟ ئێمه‌ رێی پاکو خاوینی‌مان پشاندان و رێوبان و شه‌قاممان بۆ زۆر کردوون؟ (مه‌لا عه‌لی) له‌ وه‌ڵاما ئه‌ڵێ: پاك و خاوێنی دروشمی موسوڵمانه‌و موسوڵمان هه‌میشه‌ جل وبه‌رگ و له‌شی خاوێنه‌و له‌ شه‌ووڕۆژێکا (٥) جار ده‌س نوێژ ئه‌شوا، وه‌ رێوبان ته‌خت کردن و دروست کردن کرده‌وه‌ی موسوڵمانانه‌و ئاینی ئیسلام ئه‌ڵێ هه‌رکه‌سێ به‌ردێ له‌سه‌ر رێگا ببینێ پێویسته‌ له‌سه‌ری لای‌به‌رێ نه‌وه‌کوو یه‌کێکی لێ هه‌ڵ نووتێو بکه‌وێ، هه‌روه‌ها ده‌ستی یاریده‌ درێژ کردن و ئازووقه‌ زۆر کردن پیشه‌ی ئێمه‌یه‌. ئێوه‌ وازمان لێ‌بێنن و سواری سه‌رمان نه‌بن وڵاتی کوردستان ئه‌وه‌نده‌ به‌فه‌رو به‌ره‌که‌ته‌ به‌شی زۆری جیهان به‌خێوئه‌کا. ئینگلیزه‌کان ئه‌م وه‌ڵامه‌یان له‌لا جوان ئه‌بێو ئافه‌رینی ئه‌که‌ن.
داخی گرانم ئه‌م پیاوه‌ زانایه‌ له‌ ته‌مه‌نی (٩٠) ساڵیا رۆژی (١٩)ی تشرینی یه‌که‌م ساڵی (١٩٤٨)ز له‌ سله‌یمانی کۆچی دوایی‌کردو له‌ گردی جۆگا نێژرا که‌ ئه‌و زه‌وی‌یه‌ هی خۆی بوو به‌خشی که‌ بکرێ به‌ گۆڕستانی گشتی.

* * *

## (شێخ لەتیف ی دانسان)

شێـخ لەتـییف لە ساڵی (١٨٨٨)ی‌ز لە سلەیمـانی لەدایـك بووە لەدوای وەفات کردنی باوکی، شێخ لەتیف زۆر مناڵ بووە تەمەنی چوار پێنج ساڵ بووە، دوای وەفاتی باوکی بە شەش مانگ دایکیشی ئەمری خوا بەجێ‌یەنێ، لەگەڵ برا گەورەکـەیا کە شێخ ڕەحیمی ناو بوەو تەمەنی حەوت هەشت ساڵ بووەو دوو خوشکیـان هەبـوە ناچار ئەبن بچن بۆلای مامە شێخ محەمەد سەعیدیان کە مودەڕیسی مزگـەوتی (خـورماڵ) بووە، دوای ساڵێ ئەویش وەفات ئەکاو شێخ نەسییم کە مامی باوکیـان بووە ئەیان باتە لای خۆی‌و ئەویش دوای ماوەیەك وەفات ئەکا. دوای ئەوە چەند شوێنێکی‌تر ئەکەن و دەردی سەری زۆریان تووش ئەبێ‌و بەم جۆرە ژیـان ئەبـەنەسەر تا زەمانی (سەفەربەر) کە حوکم بەدەس تورکەوە ئەبێ، ئەوکاتەش تەمەنی‌شێخ لەتییف ئەگاتە تەمەنی گەنجی واتە (١٧ ـ ١٨) ساڵ، ناچار لەترسی عەسکەری خۆی ئەشارێتەوەو لە ماڵەوە خەریکی (زەردداڕشتن)و مۆرهـەڵکـەنـدن و قەڵەم بڕ دروست کردن ئەبێ‌و دوای ئەوە گرانیەکەی بەسەرا دێ، لەوەشا بەهۆی چەندخزمێکیەوە ڕزگاری ئەبێ لە مردن.

لەکـاتی بۆردومـانی سلەیمـانیا شێـخ لەتیێف ئەچێ بۆ هەڵەبجـە لەوێ دەست ئەکـاتـەوە بە سنعـەتەکەی خۆی، لەوکاتەدا کابرایەك دێت بۆ (بیارە) بۆئـەوەی تاقمی دان دروست بکـا بۆ (شێخ عەلا دین)و (جەعفەر سوڵتان)ی سەرۆکی هەورامی‌یـەکـانی (لهۆن) بە پارەیەکی زۆر (شێخ مەولانا خالید)ی کوری (شێخ عەلادین) فێر ئەکا، شێخ لەتییف ئەمەی لێ ئەبێ بەمەراق و خولیاو ئەچێتە سەری‌یەوە تا لە ئەنجاما نهێنی‌یەکەی فێر ئەبێ، یەکسەر دەس ئەکا بە دروست کردنی تاقمی‌دان.

شێـخ لەتییف چونکـە مرۆڤیکی زیرەك و بەسەلیقە بوو گەلێ سنعەتی‌تری ئەزانی، وەکوو سەعات چێ‌تی‌و تەنانەت ئەڵێن سەعاتی لە دار دروست کردوە، بەناوبانگ بوە بەوەی کە (سکەی لێداوە) واتە پارەی دروست کردوە.

جارێکیان ماڵی (ئەحمەد بەگی ریشێن) ئەپشکنن زەربێکی لیرە ئەدۆزنەوەو حاکمی هەڵەبجە کە ئینگلیز بووە سەیری ئەکاو ئەڵێ ئەمە ئیبشی کەس نی‌یە شێخ لەتییف نەبێ! ئەمری گرتنی شێخ لەتییف دەرئەکاو ئەویش کە پێ‌ئەزانێ رائـەکـا، تا لەدواییـا (شێـخ عەلادین)و (جـەعفـەر سوڵتـان) ئەبنـە هۆی لێخـۆش بوونی، لەدواییـا حاکمـەکـە بانگی شێـخ لەتییف ئەکـا لەوکـاتـەدا (تەل سزی) ئینگلیزەکان خراپ ئەبێ بە شێخ لەتییفی چاك ئەکاتەوەو زۆر هەوڵ ئەدا کە بینێرێ بۆ (لەندەن) بەڵام شێخ لەتییف ئەمە قوبوڵ ناکا.

لەدواییـا شێخ لەتییف یەتەوە بۆ سلەیمانی‌و دوکانی سەعاتچێتی دائەنێ. لەوکـاتـەدا (مێجـەرسۆن) حوکمداری سلەیمانی ئەبێ ئەوکاتە وا باو بوو کە (مێجەرسۆن) بەناو بازارا ئەگەراو بە بەردەمی هەر دوکانێکا برۆشتایە لەبەری هەڵئەسان، جارێ بە بەردەمی دوکانی شێخ لەتییفا ئەروا جا یا شێخ لەتییف ئاگـای لێ نابێ یا خۆی لێ گێـل ئەکا هەڵناسێ لەبەر (مێجەرسۆن)، ئەمییش ئەگـەرێتـەوەو ئەچێتـە ناو دوکـانەکەی شێخ لەتییفەوە، لەوێ چونکە شوێنی خۆیـەتی لە بەری هەڵئـەسێ‌و (مێجـەرسۆن) دەس ئەداتە مقەستێ کە لەوێ دانـرابـوو، سەیـرئـەکـا زەمبیلەیـە هەڵواسراوە بە مقەستەکە پەتی زەمبیلەکە ئەقرتێنێ‌و سەیرێکی شێخ لەتییف ئەکاو پێی ئەڵێ ئەم مقەستە سەرێکی پێم ئەڵێ لەت لەتت بکەم و سەرەکەی‌تری پێم ئەڵێ رێزت لێ‌بگرم، دوایی کە لە مقەستەکە

ورد ئەبێتــەوە ئەبینێ لێی‌نوسراوە (دەسکردی کوردستان ـ عەبدول لەتییف) ئیتر مقەستەکە هەڵ ئەگرێ بۆ خۆی‌و ئەڕوا.

شێخ لەتییف جگە لەوەی سنعەتکارێکی وردبووە خولیای قەومەکەشی لەناخیا هەر جووڵاوەو هەوڵی داوە بۆ یەکخستنی، لە زەمــانی شێخ مەحمودا هەوڵێکی زۆری لەگەڵ خەڵکی داوە کە لە شێخ دوورنەکەونەوەو پشتگیری‌بکەن وە خۆی ئەگەڕاو ئەچوو بۆلایان و باسی ئەوەی بۆ ئەکردن کە کورد ئەبێ یەك بێ.

لە ساڵی (١٩٣٥)ز (کۆمەڵی برایەتی کورد)یان دامەزراندو شێخ لەتییف یەکێ بوو لە دامەزرێنەرەکان و ئەم کۆمەڵە پەرەی سەندو ئەندامانی گەیشتە سەدەها هەزار کەس و لقی لە هەموو شارەکانی کوردستانی عیراق و ئیران دا بڵاوبۆوەو نامەی پشتگیری‌یان لە تورکیاو سوریاشەوە بۆ ئەهات، وە ئەم کۆمەڵە لە هەموو جۆرێ خەڵکی تیا بووە وەك مەئموورو کاسبکارو سەربازو پۆلیس و کریکار و هەمووجۆرێ کەسانی‌تر. لەبەرئەوە حکومەتی کۆنەپەرستی (عەبدول ئیلا) ترسی لێ پەیــابوو، وە بە گەورەکەی ڕاگەیاند کە (سەفییری بەریتانیا) بوو لە بەغاو بە موافەقەتی هەردوکیان دەسیان کرد بە گرتنی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەو لە مانگی تەموزی ساڵی (١٩٣٩)ز یەکێ لەو ئەندامانە کە شێخ لەتییف بوو بۆ ماوەی (٣٩) ڕۆژ گیــرا، چونکــە یەکێ‌لە بەکــرێ‌گــیراوەکانی ئینگلیز کە موتەسەڕفی سلەیمانی بوو داوایان کرد کە حوکمی ئەندامە گیراوەکان بدەن بۆ ماوەی (٦) مانگ، بەم جۆرە حوکمی (١٩) کەسیان لێ‌دراو لە سەرێکی‌تریشەوە ئینگلیزەکان ئەیان ویست کە شۆڕشێ هەڵگیرسێنێ. شێخ لەتییف و هەندێ لە برادەرەکانی داوایان لە کۆمەڵ کرد کە بێ‌دەنگ بن تا ئەو هەلە لەدەس ئینگلیزەکان بدەن، وە هەرواش بوو نەیان توانی بە ئامانجی خۆیان نەگەیشتن وە ئەم گرتن و برینە زیاتر بوە هۆی چاوکردنەوەی کورد .

«شێــخ. لەتییف»ی زیرەك گەلێ سنعەتی زانیوە وەك دارتاشی‌و تۆکمەچێتی‌و هەڵکەندن و خەت نووسیین و تفەنگ سازی‌و کیمیاگەری‌و سکەلێدان وە لە ژیانی خۆیا چوار مقەستی پۆلابڕو هەزاران قەلەم بڕی شووشەبڕی دروست کردوە، وەلەم دواییەدا کۆمەڵێ بەرینەو چەکوش و پینج تفەنگی هەوایی دروست کردو لە هەموویان بەخەتە خۆشەکەی ناوی خۆی لەسەر هەڵکەندوون. ئێستاش یەکی





● شێخ لەتیفی دانساز ١٨٨٨ - ١٩٤٨

● مقەستو قەڵەم بڕ، دەستکردی شێخ لەتیفی دانساز

لەوتفەنگانە لای یەکێ لە کورەکانی ماوەو یەکێکی تریشیان لای خوشکەزایەکی یەتی لە هەڵەبجـە. لەکاتی جەنگی جیهانی دووەما لەشووشەی پەنجەرە گەڵی ژێرپیاڵەی دروست کردوە.

هەروەها شێخ لەتییف زۆر ئارەزووی جوانی باخ و سروشتی بووە، باخێکی گەلێ جوانی ڕازانوەتەوە کە پڕبووە لەگوڵی جوان و میوەی بەزدار وپێیان وتوە دوەم باغە لەسلەیمانیا دوای باخی گشتی کە هی میری بوو.

شێـخ لەتـییف دوای گرتن و بەردانی تێکـەڵی خەڵکی کەم کردەوەو خۆی بەدانسازییەوە خەریك ئەکرد. لەئێوارەی ڕۆژی ١٨/٥/١٩٤٨ز لەناو باخەکەیا کە لە مەجلسا دانیشتبوون وەفاتێکی کوتوپڕی کردو ئەوانەی لەو مەجلیسەدا دانیشتبون بەڕێزان (قازی ئەحمەد موختار و مەلا عینایەت و مەلا ساڵح کوردەو شێخ محەمەد سەعی چنارەو) گەلێ پیاو ماقوڵی تربوون.

شێخ لەتییف دوای خۆی شەش کوری هەیە کەئەوانیش ئەمە ناوەکانیانە بە پێی تەمەنیان - شێخ عەبدوڵڵاو شێخ بابا عەلیو شێخ عوسمان و شێخ فاروق و شێخ محەمەد سەعیو شێخ سەمەد. لەمانە شیخ عەبدوڵڵا کەکوری گەورەیەتی توانی دانسازی کە فرمانی باوکی بوو بیگریتە دەس و بیبابەڕێوە.

سەرچاوە: شێخ عەبدوڵڵای شێخ لەتیفی دانساز کە بە سەرهاتی ژیانی باوکی کۆکردوەتەوە لەگەڵ هەندێ سەرچاوەیتر.

* * *

# (هونەروەر حەسەن فەلاح)ی
# وێنەکێشی بەناوبانگ

ناوی (شەمسەدین)ە کوڕی شێخ عەبدوول قادری کوڕی شێخ سەلامی قازی یە لەپێشا لە حوجرەو لەدواییا لە قوتابخانە خوێندویەتی، مرۆڤێکی وریاو زیرەك و بلیمەت بووە، هەر لە سەرەتای ژیانی‌یەوە خەریکی وێنەکێشی بووە لەدوایشا هەر ئەوەی کردوە بە پیشە، وە زۆر ناوی بە وێنەکیشی دەرکردووە، تەنانەت نەك هەر لە سلەیمانیا بەڵکو لە زۆر ناوچەکانی‌تری کوردستانا، ئەی‌توانی وێنەی هەرکەسێك لە بەردەمیا بوەستێ بیکێشێ، وێنەی سروشتی جوان جوان و بە خەیاڵی خۆی لە گەڵێ چایخانەو شوێنە گشتی‌یەکانا کردبوو جگە لەو وینانەی لەسەر لەوحە کردبوی‌و ئەیکرد.

(حەسەن فەلاح) پیاوێکی گەڕۆك بوو، هەر ڕۆژەی ئەچوە شوێنێ، جارێك ئەچێ بۆ موسڵ؛ بۆلای براکەی کە لە دەوروپشتی (موسڵ) مودیری ناحیە ئەبێ، ئەم برایەی ناوی (خالید) بوە، بێوەژنێك مارە ئەکات کە ناوی (سەکینیە حەسەن)بوە کچێکی خۆی ئەبێ کە لە براکەی (حەسەن فەلاح) نەبووە، ئەم کچە ناوی (نەدیمە) بووە (حەسەن فەلاح) مارەی‌ئەکا. ماوەیەك (حەسەن فەلاح) لە (کەرکوك) دائەنیشێ‌و لەگەڵ ئینگلیزەکانا ئیش ئەکاو کەرەتێ لەگەڵیانا ئەچێ بۆ کەشف بۆ دەوروبەری (کفری) لە ساڵی (١٩٣٧ ـ ١٩٣٨)ز، کاتێ کە تاریك دایە (٣) سێ جەردە بەچەکەوە ئەدەن بەسەریاناو ڕووتیان ئەکەنەوەو چییان پێ‌ئەبێ لە پارەو سەعات و شتی بەنرخ لێیان ئەسێنن، لەوکاتەدا یەکێك لە جەردەکان دەماخەکەی دەم وچاوی لائەدا، (حەسەن فەلاح) فرسەت یەنێ‌و جگەرەیەك دەرئەهێنێ‌و بەو بیانووەوە داوایان لێ ئەکات کە شقارتەیەکی بۆ لیدەن بۆئەوەی جگەرەکەی داگیرسێنێ کە ئەزانێ کوردن بە کوردی ئەیان دوێنێ‌و ئەڵێ من لەگەڵ ئەم ئینگلیزانەدا کارئەکەم، ئەوانیش کە ئەزانن کوردە خێرا شقارتە دەریەنن و جگەرەکەی بۆ دائەگیرسێنن.



● وێنەکێشی ناسراو

حەسەن فەللاح

١٩١٠ - ١٩٧٧

ئەمیش چاک دەم وچاوی ئەو جەردەیەی دەماخەکەی لادابوو ئەبینیّو لەمێشکیا هەڵئەگرێ، کە جەردەکان دوورئەکەونەوە بەپەلە وێنەی کابرا لەسەر پشتی پاکەتەکەی ئەکێشیّوە هەر ئەو شەوە ئەچنە ناحیەی (قەرەتەپە)و بۆ بەیانی خەبەر ئەدەن بە پۆلیس و ئەچن بۆلای مودیری ناحیەو کارەساتەکەی بۆ ئەگێرنەوە، (حەسەن فەلاح) پاکەتەکەی دەرئەهێنیّو ئەڵێ ئەمەش وێنەی یەکێکیانە، مدیری ناحیە ئەنێرێ بەدوای خەڵکی ئەو ناوچەیەدا کە ئەمەی لەنیوانا کراوە، وە بەهۆی وێنەکەوە دزەکە ئەناسنەوەو ئەیگرن و بەم جۆرە تاوانەکە دەرئەکەویّو دەستی بەسەرا ئەگرن و شتەکانیان لێئەسێننەوەو ئەیدەنەوە بەمان و ئەوانیش ئەدرێن بە دادگە بۆئەوەی سزای خۆیان وەرگرن.

لە ساڵی (١٩٤١)ز لە کاتی شەرەکەی (رەشید عالی گەیلانی)دا کە ماوەیەك حوکمیان بەدەستەوە بوو (حەسەن فەلاح) لە گۆڤاری (حەبەز بۆز) دا لە بەغا بە کاریکاتێر وێنەی (عەبدول ئیلا - وەسی) لەگەڵ (نووری سەعید)و (جەمیل مەدفەعی)و (عەلی جەودەت) ئەکێشی بە شێوەیەکی نەنگیو گاڵتە پێکردن، کە بڵاو ئەبێتەوە بەناو خەڵکا زۆر سەرنج راکێش ئەبێ، لەدواییا کەئەمان دەس ئەگرنەوە بەسەر حوکما، (حەسەن فەلاح) لەتاوا رائەکاو ئەگەرێتەوە بۆ سلەیمانیو، لەوکاتەدا ئەبێ کە تازە دوای (١٠) دە ساڵ دوورخراوەیی (شێخ مەحمود) گەراوەتەوە سلەیمانیو لە (داریکەلی) دائەنیشی ئەمیش واتە (حەسەن فەلاح) ئەچێتە (داری کەلی) بۆلای شێخ کە خاڵۆزای دایکییەتیو لەوێ

دائـەنیشێو لەوێ ناوی خۆی ئەنێ (حـەسـەن فەلاح) چونکە لەوەبەر هەر بە (شەمسەدین) ناسراو بوە.

لە ساڵی (١٩٤٧)ز هەر بە ناوی (حــەســەن فەلاح)ەوە ئەچێ بۆ (کویت) لەوێش هەر خەریکی وێنەکردن ئەبێ.

جارێـك وێنــەیـەکی جوانی ئەمیری (کویت) ئەکاو بۆ ئەمیری (کویت)ی ئەنێرێ، ئەویش کە وێنەکە ئەبینێ ئەنێرێ بەدوایاو ڕێزی لێ ئەگرێو خەلاتێکی باشی ئەکات بەم جۆرەو بە وێنەکێشان لە (کوێت) ناوبانگ پەیدائەکات و هەر لەوێوە پارەی ئەناردەوە بۆ ماڵ و مناڵەکانی بۆ سلەیمانی.

(حەسەن فەلاح) ماڵیان لە سلەیمانی لە گەڕەکی کانێسکان بوو لە کۆڵانێ بەرامبەر شەخسەکەی (شێخ جافر) لە شەقامی (کاك ئەحمەدی شێخ).،

لە ساڵی (١٩٥٥)ز ئەگەڕێتەوە بۆ سلەیمانیو دەس ئەکا بە وێنەکێشان، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ خێزانەکەیا نەگونجاوە لەبەر ئەم هۆیەش بووە کە بەشێوەیەکی دائیمی لە سلەیمانی نەماوەتەوە.

لە ساڵی (١٩٦٣)ز خێزانەی بەجێئەهێڵێو ئەچێتە بەغا لەوێ دائەنیشێ، لە ماڵی (مـەلیحـەخـان)ی خوشکی، وە لەپـاش (٥) پێنــج ساڵ خێزانەکەی بە هەرجۆرێ ئەبێ خانوەکەی ئەفرۆشێو ئەمانیش ئەچنە بەغا لەوێ دائەنیشن و بەم جۆرە ئەمێننەوە تا لە ساڵی (١٩٧٧)ز (حەسەن فەلاح) کۆچی دوایی ئەکا لە تەمەنی (٦٧) ساڵیاو هەر لەوێ نێژراوە.

(حەسەن فەلاح) چوار کچ و چوار کوڕی بووە و یەکێك لە کوڕەکانی عەسکەر ئەبێ لە (دەربەندیخان) لە ساڵی (١٩٦٧ ـ ١٩٦٨)ز لەوێ لە ئاوی دەربەندا مەلە ئەکاو، ئەبێ بەهۆی ئەوەی لە ئاوەکەدا بخنکێو ئەیهێننەوە بۆ سلەیمانیو لە (گردی جۆگا)ی نزیك گەڕەکی کۆنی خویان ئەینێژن.

تێ بینی:

لەبەرئەوەی (حەسەن فەلاح) سلەیمانی بەجێهێشت لە ساڵی (١٩٦٣)ز و کەس نەیزانی بۆ کوێ چوو و چی بەسەرهات زۆر بەگران ئەوانەی باسمان کرد دەسمــان کەوت، ئەویش بەهــۆی خزمــەکانی سلەیمانییانەوە دەستمان کەوت

تەنانەت ناردیان بۆ بەغدا بۆلای کەس وکاری لەوێ، وە وێنەیەکی خۆیمان دەس کەوت لەگەڵ چەند وێنەیەکا کە بەدەستی خۆی کێشابووی بۆیان هێناین... زۆر سوپاسیان ئەکەین.

سەرچاوە:

بەڕێز (شێخ فەتحوڵڵای شێخ ڕەشید) تەنەکەچی کە پوورزای (حەسەن فەلاح)ە.

* * *



● شەڕی دەربەندی بازیان دەستکردی حەسەن فەللاح



● وینەیەکی تری حەسەن فەللاح سالی ١٩٦٣

## پیاوی سوعبەتچیو قسەخۆش

ئەوەندەی لە زەمانی ڕابوردودا گاڵتەوگەپ و قسەی بە توێکڵ (بەڵام بێکینە)و پیاوی قسەخۆش و سوعبەتچی زۆر بووە بەپێچەوانەی ئەمە ئێستا نە ئەو پیاوە قسەخۆشانە ماون، نە گاڵتەو ڕابواردن ماوە، بێگومان هۆی ئەمەش گۆڕان و پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتیو ڕێگای نان پەیداکردنە، جاران خەڵکی بەسادەیی ژیاون و قەناعەتیان هەبووە... ئەوەندە بیریان لە شت نەکردۆتەوە، هەر خەریکی ڕابواردن بوون.

ئێستاکە قەناعەت نەماوە، چاوڵێکەریو خۆپەرستی هەموو شتێکی لەبیر بردوەتەوە، هەروەها تەنگ و چەڵەمەش ڕۆژ بەڕۆژو ساڵ بەساڵ لە زیاد بوونایە وەك پێشینان ئەڵێن (ساڵ بەساڵ خۆزگەم بە پار)..

ئەو پیاوانەی قسەخۆش و سوعبەتچی بوون ناویان هەبووە لە شارەکەدا، خەڵك لێیان کۆئەبونەوە بۆئەوەی بیان جووڵێنن بۆ قسەو سەرگوزشتەی خۆش، ئەوەندەی توانیومانە ناوی ئەو پیاوە قسەخۆشانەمان کۆکردۆتەوە لەگەڵ نیشەکەیان. (١)

. . . . . . . . . . . .

(١) زۆر جار قسەی خۆش و گاڵتەوگەپ لەگەڵ شاری سلێمانی‌دا دەبێتە هاوتاو هاووشە . ئەگەر نووسەر لێرەدا نزیکەی دووسەدوپەنجا ناوی کۆکردبێتەوە، ئەوە هەر بە دانانی تاقە نوقتەیەك دووهەزارو پێنج سەد قسەی خۆش و گاڵتەی مانادار کۆدەبێتەوە لاپەرەکانی چەند بەرگەکەی (ڕشتەی مرواری)ی مامۆستا عەلادین سجادی‌و (گاڵتەوگەپ)ی پیرەمێردو (شانۆی ناوماڵ)ی مستەفا سەفوەت زۆر قسەی خۆشی ئەم شارەیان تێدایە. خۆ خاڵە ڕەجەب خۆیشی لە (ترش و شیرین)ەکەیدا کۆمەڵێکی بۆ گێراوینەتەوە. نووسەری ئەم کتێبە پرۆژەی کۆکردنەوەی گاڵتەوگەپ و قسەی خۆشی شاری سلێمانی بەدەستەوەیە خۆزگە دەستی یارمەتی بۆ درێژ ئەکراو وئەو سامانە بەنرخەمان لەکیس نەدەچوو.
(ع.م.ر)

تێبینی: بۆ بەجێ‌هێنانی ئەم پرۆژەیە تکایە بە نووسین دەستی یارمەتی‌مان بۆ درێژبکرێ‌و بەرهەمی گاڵتەوگەپمان بەهۆی چاپخانەکەی کاکەی فەللاحەوە بۆ بنێرری، چونکە ئەو شاعیرە بەڕێزەش سەروکاری ئەو پرۆژەیەمان ئەکات.
نووسەر

«ناوەکان ئەمانەن»

١ ـ شێخ مەحموودی نەمر.
٢ ـ حاجی ئەحمەدی کرنو ـ شەربەت فرۆش لە هاوینا، وە لە زستاندا قەنیلەی نۆك (قاورمەی نۆك)، تەنیشت دوکانی وەستا توفیقی کەبابچی باوکی خەلفە فەرەجی کەبابچی.
٣ ـ حاجی مستەفا پاشای یاملکی، ئەفسەر لە سەرکردایەتی ئەرکانی سوپای عوسمانی.
٤ ـ حاجی قادر ئەفەندی‌ی یاملکی، برای حاجی مستەفا پاشا.
٥ ـ عیزەتی فاتەی خولەدرێژ (عیزەت تۆبچی) ئەفسەری زەمانی عوسمانی.
٦ ـ حەمە میرخان، ئەفسەری زەمانی عوسمانی.

٧ ـ کەریم ڕۆستەم شالوم، ئەفسەری زەمانی عوسمانی،

٨ ـ ئەحە نەسیم، قەسابی سەرپێیی.

٩ ـ ئەوڕەحمانی خامە، ئاسنگەر.

١٠ ـ مەجۆلی خامە، چایچیو چاوەشی شارەوانی.

١١ ـ تۆفیقی گوڵناز، پینەچی.

١٢ ـ عەزیز بەگی سەڕاج، تووڕەش دەبوو.

١٣ ـ حاجی صالحە شەلە، صابونچی.

١٤ ـ خولە ئایشێی دەلاڵ، کۆنەفرۆش.

١٥ ـ تۆفیقە زلە، خەیات.

١٦ ـ ئەوڕەحمانی حەسەن لەلە، موچەخۆری عوسمانی، بە بن باخەڵ بۆی لێنەدا.

١٧ ـ وەستا بەکری مارف، پانیبەرزدروو، تووڕەش دەبوو.

١٨ ـ عیزەتی حاجی ئەمینی ئاشچی، چاوەشی شارەوانی.

١٩ ـ صاڵحە تریل، جارچی.

٢٠ ـ محانی جارچی.

٢١ ـ ئەحەی نەبی سەقا، لە ناوبازاڕ لە جرت لێدانا بەناوبانگ بوو.

٢٢ ـ ڕەشید دارا، موچەخوری عوسمانی.

٢٣ ـ ڕەشەی بابەچان، موچەخۆری عوسمانی.

٢٤ ـ ڕەشەی پێخاوس، بارچاوەشی عوسمانی.

٢٥ ـ ڕەشەی حەسەنی گورون، کاسبی توتن.

٢٦ ـ حەمەی قالەی پیرۆت (حەمە دووباش) چاوەشی ئیشغال.

٢٧ ـ کەریم خان، قەڵەمچی ـ (بازرگانی توتن بەکۆمەڵ).

٢٨ ـ خولەی گوڵناز ـ خەیات.

٢٩ ـ حاجی بارام حاجی کەریم ـ مەلاك و سەرەکی بەردکێشی مەڵکەندی.

٣٠ ـ نەمینی لاوە ـ چایچی.

٣١ ـ حەمەوبەگ (میران) چاوەشی شارەوانی ـ تووڕەش ئەبوو.

٣٢ ـ وەستا مارفە درێژ ـ بەنا.

٣٣ ـ تۆفیقی حەمە خێل ـ بەردکێش و بەفرکێشی مەڵکەندی.

٣٤ ـ کەریمی جاو ـ خەیات، خوشکەزای ئەحەی جاو.

٣٥ ـ خولەی ئەمینی بووك ـ باخەوان، تووڕەش ئەبوو.

٣٦ ـ بەکری میسری ـ چایچیو جەڕاح.

٣٧ ـ شێخ محەمەدی گولانی ـ عالم و مەلاك.

٣٨ ـ عەونی ئەفەنی حاجی کورون، ئەفسەری زەمانی عوسمانی.

٣٩ ـ زەکی ئەفەندی، مامۆستا.

٤٠ ـ صالح گوێڕەپ ـ نانەوا.

٤١ ـ مەلا محیٚدینی ماستاو ـ ماستاوفرۆش.

٤٢ ـ حاجی ئەمینی کاکەحەمە ـ تاجر، مامی فایەق بێکەس.

٤٣ ـ ـ فایەق بیکەس ـ ماموستاو شاعیر.

٤٤ ـ محەی هەمزاغا ـ خەیات.

٤٥ ـ حسە کەڕ ـ چایچی.

٤٦ ـ صاڵحی وەستا بستە ـ چایچی.

٤٧ ـ ڕەشەی موختار ـ موختاری گۆیژە.

٤٨ ـ سدیقی مەحموود ئاغا ـ برای ڕەشەی موختار، پۆلیسی سوارە.

٤٩ ـ حەمە گاسوار ـ قەبرهەڵکەن.

٥٠ ـ فەرەجی حەمەمراد ـ چایچی.

٥١ ـ سەعەی سالەی وەنەوش ـ خەیات.

٥٢ ـ عەلیوەیسی ئەفەندی ـ زارع و سەر بە شیخ مەحموود.

٥٣ ـ بلەشەل ـ پیاوی شێخ مەحموود.

٥٤ ـ شێخ سەمەد ـ پیاوی شێخ لەتیف.

٥٥ ـ مستەفای حاجی ئەحمەدی زڵغ ـ کەوش دروو.

٥٦ ـ یەزینک ـ لوقنتەچی.

٥٧ ـ قادر زەکی ـ ئوتومبێلچی ئیشغال.

٥٨ ـ ئەحمەد پیاوخور ـ توونچی.

٥٩ ـ سالە گاکوژ ـ قەساب.

٦٠ - نەحەی حەمەعەزیز - قەساب.
٦١ - عارفی فیتك - قەساب و چایچی.
٦٢ - مینەی قالە شوان - جامبازی ئاژەڵ (حەیوان)، توورەش ئەبوو.
٦٣ - عەبەی شەمام - جامبازی وولاخ، توورەش ئەبوو.
٦٤ - بریسە کەچەڵ - توونچی.
٦٥ - فەرەجی ئەمینی حەسەن - دارتاش.
٦٦ - رەشەی خەجیەلاو - کاسبی هەمەجۆرە.
٦٧ - عارفی ئاڵی - پینەچی.
٦٨ - مەحموود بەگی جەراح - جەراح و مەلاك.
٦٩ - مەجید بەگ برای مەحموود بەگ - پانیبەرز دروو، توورەش دەبوو.
٧٠ - محەی مێفنجان - خەیات.
٧١ - حەمەوبەگی بەقاڵ - بەقاڵ.
٧٢ - حەمە فەرەجی لارە - نان فرۆش (دەستگێر).
٧٣ - فەرەج شۆکل - چایچی.
٧٤ - عەلی شاملی - ریخۆڵەچی.
٧٥ - رەشەی سنگ هەڵکێش - قاچاخچی.
٧٦ - حەسەنەکۆڵ - کاسبی سەرپێیی.
٧٧ - سەعەی دەوڵەت - عەمی - قەڵەمچی.
٧٨ - حەسەنی دەوڵەت - بەقاڵی وشکە.
٧٩ - سەعە دەرەناری - کاسبی توتن.
٨٠ - عەبەی قالەی مارفە رەش - چاوەشی ئیشغال.
٨١ - حەمەی برازا - کاسبی سەرپێیی.
٨٢ - عەلی تورکە - موچەخۆر لە شارەوانی.
٨٣ - حسەین مەزلوم، موچەخوری زەمانی عوسمانی.
٨٤ - حەمەی ئەمینی ئەفەندی (باوکی موحەررەم)، موچەخۆری عوسمانی.
٨٥ - شیخ بابا عەلی تەکیە ، نیمامی مزگەوتی شیخ باباعەلی.
٨٦ - شێخ نوری شێخ باباعەلی ، ئیمامی مزگەوتی شێخ باباعەلی.

٨٧ ـ مەلا سەیغەفور ـ ئیمامی مزگەوتی سەیحەسەن.
٨٨ ـ سەی ئەحمەدی شێخ ئەورەحمانی عازەبانی ـ ئیمامی مزگەوتی (هەلاجەکان).
٨٩ ـ مەلا عەلی کانیکەوەیی ـ ئیمامی مزگەوتی شێخ مستەفای نەقیب.
٩٠ ـ مەلا مەحموود (بێخود) ـ شاعیرو ئیمامی مزگەوتی موفتی.
٩١ ـ مەلا سەلام ـ ئیمامی مزگەوتی مەلا حسەینی پیسکەندی.
٩٢ ـ ئەحەی ناصر ـ گۆرانی بێژ.
٩٣ ـ مەلا ئەحمەدی دیلان ـ قەڵەمچی.
٩٤ ـ ئەحمەدی تەها ـ قەڵەمچی.
٩٥ ـ مەلا کەریم ـ برنج فرۆش.
٩٦ ـ عەبەی حەمە خەیات ـ بەقاڵی میوە.
٩٧ ـ عەلی ئاگا ـ بەڕێوەبەری قوتابخانەی فەیسەڵیە.
٩٨ ـ مچەی مەولود ـ بەریوەبەری قوتابخانەی خالیدیە.
٩٩ ـ تۆفیق قەزاز ـ مەلاك.
١٠٠ ـ قوتبەدین ئەفەنی ـ دکتۆری بەیتەرە.
١٠١ ـ حاجی مەلا فەرەجی پڵاوخۆر ـ بەقاڵی وشکە.
١٠٢ ـ حەمە ساڵحی ریش ـ عەلاف.
١٠٣ ـ میرزا مارف ـ شاعیر.
١٠٤ ـ شێخ سەلام ـ شاعیر.
١٠٥ ـ عەلادین سوجادی ـ ئەدیب و زانای گەورەی کورد.
١٠٦ ـ حەمەوبەگی حاجی رەسوڵ بەگ ـ مەلاك.
١٠٧ ـ خولە سنەیی ـ شەربەتچی.
١٠٨ ـ حەمەی سەعەی فەتاح ـ کاسب.
١٠٩ ـ عەلی دەرویش ئەمین ـ حەمامچی.
١١٠ ـ حەموش ئاغا ـ کاسب.
١١١ ـ مامەسەعە سوك سوك ـ چایچی لە بەر خانەقا.
١١٢ ـ حەمە رەشی تۆفیق ـ چایچی لە بەر خانەقا.

١١٣ - عارفه شيت - كونه‌فروش.

١١٤ - مه‌حموود ده‌لی - جگه‌رچی.

١١٥ - ئه‌مین ئه‌فه‌ندی عه‌لی شه‌یدایی - مه‌لاك.

١١٦ - عومه‌ره شه‌لی حاجی سه‌عیدی عاسم - بازرگان.

١١٧ - ساله‌ی ئه‌حه‌ی خوله - چایچی.

١١٨ - حه‌مه‌ومین ئاغا - له انحصار.

١١٩ - سه‌ی عه‌لی عه‌تار - عه‌تاری داوودەرمان.

١٢٠ - كه‌ریم ئاغا - عه‌تاری شه‌كرو چا.

١٢١ - ئه‌وره‌حمان حاجی عه‌زیز - وه‌كیلی سنگر.

١٢٢ - قادر ئاغای برایم ئاغا - عه‌تار له قه‌یسه‌ری نه‌قیب هاتوچۆی
ماڵی شێخانی ئه‌كرد، توره‌یان ئه‌كرد.

١٢٣ - سابیری ته‌په‌چنه - [illegible]ات.

١٢٤ - كه‌ریمی ته‌په‌چنه - [illegible]سبی سه‌رپێیی.

١٢٥ - عه‌لی حاجی شه‌ر[illegible]ه‌تیت)، چایچی‌و جگه‌رچی پشتی شێخ جافر
ده‌شتی كۆڵك.

١٢٦ - ئه‌حمه‌دی توفیق ئه‌فه‌ندی - موچه‌خور له شاره‌وان.

١٢٧ - عه‌زاوی برای ئه‌حلان و كه‌ریم چاوشین - چایچی.

١٢٨ - فه‌ره‌ج چاوشین - برای عه‌زاوی، پۆلیسی سواره.

١٢٩ - ده‌روێش ئه‌حمه‌دی چایچی - چایچی ده‌ستگێر.

١٣٠ - حاجی ره‌حیمه كۆڵكه - نۆبه‌چی له ئیشغال.

١٣١ - ئه‌مینی عاسه‌ی ته‌له‌عفه‌ر - به‌یارمه‌تی خه‌ڵك ئه‌ژیا.

١٣١ - عه‌لی چاوه‌ش - قه‌پانچی.

١٣١ - حه‌مه گوێزه - چایچی.

١٣ - حه‌مه‌ی مه‌لا برایم، چایچی.

١٣ - مینه‌ی مه‌لا برایم - چایچی.

١٣ - ئه‌حه‌ره‌شی مه‌لا برایم، چایچی.

١٣ - ئه‌حه تێڵا - دارتاش.

١٣٨ ـ ئەحە دێرەیی ـ بەقاڵ، تووڕەش ئەبوو.

١٣٩ ـ عەبلی عەبان ـ پولیس.

١٤٠ ـ خولەشەلی خەیات ـ خەیات.

١٤١ ـ غەفوری خولەدرێژ ـ کۆپان دروو.

١٤٢ ـ مەلا سمایل ـ شکالا نووس و حیکایەت خوان.

١٤٣ ـ ئەمین چتێر ـ بەقاڵی وشکە.

١٤٤ ـ دەروێش شەریف ـ چایچی.

١٤٥ ـ کەریمی عەزولە (خاڵە کەریم) ـ چایچی.

١٤٦ ـ فەتاحی قادر ئاغا ـ خاوەنی کەراجی سەی نوری، پێش فەرەج ئەفەنی برای مەحموود ئەفەنی سەرۆکی شارەوانی بوو.

١٤٧ ـ توفیق تەیارە ـ ئوتومبیلچی.

١٤٨ ـ خولەسنەیی ـ قەتارچی.

١٤٩ ـ ڕەشەی شێخەلی ـ مەلاك.

١٥٠ ـ حەمە جەلیل ـ جگەرچی.

١٥١ ـ صالح نەریمان ـ قەتارچی.

١٥٢ ـ غەریبە کوێر ـ بەفرکێشی مەڵکەندی.

١٥٣ ـ مچەی حاجی برایم ئاغا (خاڵە مچە، موچەخۆر لە بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ.)

١٥٤ ـ مەحموودی قالە شەوقە ـ باش کاتب لە پۆلیس خانە.

١٥٥ ـ صاڵح عەلی صاڵح ـ سەرپەرشتیاری وەرزش.

١٥٦ ـ ئەحمەدی عەزیز ئاغا ـ مامۆستاو فەرمانبەر.

١٥٧ ـ شێخ لەتیفی حەفید ـ مەلاك.

١٥٨ ـ ڕەشۆڵ عەبدوڵلا ـ بەڵێندەری یانەی فەرمانبەران.

١٥٩ ـ غەفورئاغای حاجی مەلا سەعید ـ مەلاك.

١٦٠ ـ ئەحەی میرزا عارف ـ بەڕێوەبەری زەریبەی عەقار.

١٦١ ـ خاڵە ڕەجەب ـ فەراشی سەرۆکی شارەوانی.

١٦٢ ـ نوری کاکەحەمەی ئەمینی عەتار ـ ئەندازیار.

١٦٣ - بەشیری گاور - تاجیر.
١٦٤ - ئەڵڵاوێردی گاور - موتابچی.
١٦٥ - مەتی ئەڵڵاوێردی - فەراشی ئیعاشە.
١٦٦ - ئەورام شالوم تاجیر جولەکە.
١٦٧ - سەبیلە - بازرگان جولەکە.
١٦٨ - ویسە، جولەکە - کوتاڵ فرۆش ، دەسگێر.
١٦٩ - جریوە، جولەکە - کوتاڵ فرۆش، دەسگێر.
١٧٠ - ئەلیاو، جولەکە، بەهاراتی ئەفرۆشت و کتێبیشی ئەگرتەوە، دەسگێر.
١٧١ - عەزەی قەساب - قەساب، جولەکە، جرتی لێئەدا.
١٧٢ - حەمە کەریم، چەرخچی.
١٧٣ - حسەی قالە حەیتە - جگەرچی، برای عەبودی پاڵەوان.
١٧٤ - کەریمە شێت - کەوەرفرۆش.
١٧٥ - ئەحەی خلە - بەنا - جرتی چاکی لێئەدا توورەش ئەبوو.
١٧٦ - عوسمانی حەمە نادر، بەقاڵ.
١٧٧ - عومەری نەعمان - چاوەشی ئیشغال.
١٧٨ - عەلی دەدە - توتن چی.
١٧٩ - قالەی سالحەفەنی - قالە مەرمەما، چاوەش لە ئیشغال.
١٨٠ - عەزە بابوجی - چایچی.
ئەم چوارکەسەی سەرەوە زیاد لە (٦٠) شەست ساڵ برادەر بوون. ئەمە نمونەی برادەرایەتی ئەو زەمانەیە.
١٨١ - ئەورەحمانی وەستا گورون - دارتاش.
١٨٢ - جەلال حەمدی - مامۆستا.
١٨٣ - مەلا عوبێدی مەلا حەسەن - موچەخۆر لە بانقی زراعی.
١٨٤ - فارسی قاوەچی - قاوەچی دەسگێر.
١٨٥ - شێخ مستەفای شێخ موحەمەدی گوڵانی - خاوەن کتێبخانە.
١٨٦ - حەمەی حاجی قادر - چاوەشی شارەوانی.
١٨٧ - بلەی ئەولێ - نۆبەچی (مرور).

١٨٨ ـ ئەحەی حەمەی ئەولێ ـ موچەخۆر.

١٨٩ ـ حەمەومین ئەفەنی ـ برین پێچ.

١٩٠ ـ حسە دەبۆی قەڵەو ـ ئوتومبێلچی لە خەستەخانە.

١٩١ ـ حەسەنی سەید ئەحمەد ـ موچەخۆر لە تەسویە.

١٩٢ ـ بلەکوێری قەساب ـ قەساب بوو، بو بە ژێر ئوتومبیلەوە.

١٩٣ ـ حەمەلوری ـ ئوتومبێلچی (ئەم بەتاریکی لە رێی سەرچنار بلە کوێری کرد بەژێرەوە).

١٩٤ ـ حەمەی کەللەی بابم ـ ئوتومبێلچی.

١٩٥ ـ ئەحمەد هوشیار ـ خەیات.

١٩٦ ـ ئەورەحمانی سۆفی کەریمی سەراج (حەکە) قوتابی.

١٩٧ ـ ئەحەی سەعە بانەیی ـ بازرگان.

١٩٨ ـ حەمەی سەید ئیبراهیم ـ بەقاڵ.

١٩٩ ـ عومەری حەمە قاوەچی ـ برین پێچ.

٢٠٠ ـ جەلالی فارسی قاوەچی ـ موچەخۆر.

، ئەم شەش کەسەی سەرەوە زۆر برادەر بوون و زۆر بەزم و رەزمیان پێکەوە هەبووە..

٢٠١ ـ عەبەی حاجی حەملان ـ حەڵواچی.

٢٠٢ ـ رەفیق چالاك ـ موچەخۆر.

٢٠٣ ـ مەجید عەبدوڵلا سەبری ـ موچەخۆر.

٢٠٤ ـ ئەحمەدی سۆفی صالح ـ معاونی پۆلیس.

٢٠٥ ـ رەحمەتوڵلا غەفور ـ لە بەرێوەبەرایەتی ناوخۆ.

٢٠٦ ـ حسەینی میرزا صالح ـ فەرمانبەر لە بەلەدیە.

٢٠٧ ـ بەهجەتی عەونی ئەفەنی ـ ئەفسەر.

٢٠٨ ـ حەمە تۆلە ـ ئەفسەر.

٢٠٩ ـ حسەین قەراخی ـ لە ئیستگەی کوردی.

٢١٠ ـ مچەی مەلا حەکیم ـ مەلاك.

٢١١ ـ ئەحمەد شوکری ـ شاعیر.

٢١٢ ـ مەولود مریەم ـ فەرمانبەر لە مەعاریف.
٢١٣ ـ عەلی فەوتاو ـ دوکاندار لە قاوەخانەی سەرچیمەن.
٢١٤ ـ جەمیلی سەعی بەگ ـ کاسب.
٢١٥ ـ حسەینی سەی ئەحمەد ـ فەرمانبەر لە بانقی زراعی.
٢١٦ ـ قادر دیلان ـ هونەرمەند.
٢١٧ ـ حەمەی بەکر ـ خاوەنی نەقلیاتی سلێمانی.
٢١٨ ـ عەبە عەفریت ـ مامۆستا.
٢١٩ ـ ئەحمەدی میرزا غەفور ـ خاوەنی کۆگای شیرین.
٢٢٠ ـ ئیبراهیمی شێخ فەرەج ـ ئاسنگەر.
٢٢١ ـ عومەری عارف قاپ ڕەش ـ مودەریس.
٢٢٢ ـ ئیبراهیم ئەمین باڵدار ـ مامۆستای زانکۆ.
٢٢٣ ـ شەماڵ صائب ـ مامۆستای زانکۆ.
٢٢٤ ـ عەبدوڵڵای ئوسواغا ـ فەرمانبەر لە انحصار.
٢٢٥ ـ ئاغای حاجی صاڵحی قاسم ـ لە زەراعە.
٢٢٦ ـ عەبدوڵڵای کەریم چاوشین ـ بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی.
٢٢٧ ـ عەبدوڵڵای میرزا مارف ـ مامۆستا.
٢٢٨ ـ مەسیح ئەسکەندەر ـ مودەریس.
٢٢٩ ـ ئەنوەر ئەدهەم ـ فەرمانبەر لە انحصار.
٢٣٠ ـ عومەر مەجید ـ فەرمانبەر لە ئەوقاف.
٢٣١ ـ حسەڕەش ـ خەیات.
٢٣٢ ـ جەمال حەکیم ـ مەلاك.
٢٣٣ ـ ئەحە سوور ـ دەلاك.
٢٣٤ ـ ئەحەی عارف هەڵو ـ چاوەشی بەلەدیە.
٢٣٥ ـ ساماڵی حەماغای عەتار ـ فەرمانبەر لە ئیعاشە.
٢٣٦ ـ عەلی حاجی مەجید ـ ئوتوچی.
٢٣٧ ـ عومەری عارفی وەیسی ئەفەنی ـ لاسیك بڕ.
٢٣٨ ـ مەلا عەبدوڵڵای مەلا حەسەن ـ بەقاڵی وشکە.

٢٣٩ ـ ئەحە لەگلۆش ـ پۆلیس.
٢٤٠ ـ ئەحمەد کەریم ولۆبەیی ـ نانەوا.
٢٤١ ـ عەلی حاجی صالّح ـ موختاری سەرشەقام.
٢٤٢ ـ مچەی بەکر ـ پانی بەرز دروو.
٢٤٣ ـ سەیئەحمەد عازەبانی ـ لە دائیرەی ئاو.
٢٤٤ ـ ئەحەی عەبەی شەمام ـ ئوتومبێلچی.
٢٤٥ ـ عومەر میراو ـ لە کارگەی چیمەنتۆ.
٢٤٦ ـ هادیە کوێر ـ ئوتومبێلچی.
٢٤٧ ـ عومەری عارف فیتك ـ قەساب.
٢٤٨ ـ حەمەی سارۆ ـ ئوتومبێلچی.
٢٤٩ ـ سدیق ئەبوشوارب ـ کاسب.
٢٥٠ ـ قادر برسی ـ شاعیر ـ موچەخۆر لە شارەوانی.
٢٥١ ـ بلەی حەمەبەگ ـ بەقالّ.
٢٥٢ ـ نوری عەبە پاشا ـ موچەخۆر.
٢٥٣ ـ شەوکەتی عەبە پاشا ـ کاسبی هەمەجۆر.
٢٥٤ ـ فەریقە کوێر ـ قاوەچی دەسگێڕ.
٢٥٥ ـ عەبدولی سوران ـ موچەخۆر لە کارگەی جگەرە.
٢٥٦ ـ جەزای میرزا حسەین ـ موچەخۆر لە زەراعە.
٢٥٧ ـ حەسەن حسەین میرزا سالّح ـ مامۆستا.
٢٥٨ ـ جەمال ئەحمەد ـ مامۆستای زانکۆ.
٢٥٩ ـ فوئاد ئەسکەندەر ـ مودەریس.
٢٦٠ ـ جەمیل نوری (مەدفەعی) ـ لە کارگەی جگەرە.
٢٦١ ـ تالب سەی عەلی ـ لە کارگەی چیمەنتۆ.
٢٦٢ ـ ئەحەی مارف مۆریاسی ـ مامۆستا.
٢٦٣ ـ ڕەئوف کەریم چاوشین ـ مامۆستا.
٢٦٤ ـ شەوکەتی حەمەوبەگ ـ مامۆستا.
٢٦٥ ـ کەریمی وەستا ئەحمەدی بانەیی ـ موچەخۆر لە دوکان.

٢٦٦ ـ فەخری حاجی عەبدوڵلا بۆسکانی ـ مامۆستا.

٢٦٧ ـ یاسین خەلیل چاوەش ـ بەڵێندەر.

٢٦٨ ـ سەردار مستەفا مەزهەر ـ موچەخۆر لە کارگەی شەکر.

٢٦٩ ـ ماجید ئەحمەد عەزیز ئاغا ـ پزیشك.

٢٧٠ ـ بەکری سەعە ڕەش ـ ئوتومبێلچی.

٢٧١ ـ عەباس ئوبوشوارب ـ کەبابچی.

٢٧٢ ـ عەزیز ئەحمەد جۆڵا ـ خاوەن گەراچی شتن و چەورکردن.

٢٧٣ ـ لوتفی مەحموود ئەفەنی ـ بەناوبانگ بو بە (کشمیش) ـ وێنەگر.

٢٧٤ ـ عیزتی حاجی ئەمین ئیسماعیل ـ بەناوبانگ بوبە (عیزەت یەك پارچە) ـ قەزوان فروش.

٢٧٥ ـ بەشیر ڕەشید ـ فەرمانبەر لە تاپۆ.

تێبینی:ـ هەر لە کۆنەوە لە هەموو کوردستاندا خەڵکی سلێمانی بەناوبانگ بوون بە قسەی خۆش و گاڵتەوگەپ، چوبنەهەرچ شوێنێك لە دەرەوەی شارو وولات بەزم ورەزمی خۆیان هەر کردوەو زانیویانە خەڵکی سلێمانین ئێمە ئەم ناوانە کە تۆمارمان کردوە هەر ئەوەندە هاتووە بە بیری خەڵکدا مانای ئەوە نی‌یە بەبیرەوەری هەر ئەم زاتانە بوبێ، خۆی شارەکە بەگشتی حەزیان لە قسەو بەزم ورەزم هەیە بەلام ئێمە هەر ئەوەندمان دەست کەوتووە، بۆ ئەو پرۆژەیەی بەدەستەوەیە داوا لە خەڵکی شارە خۆشەخویستەکەمان ئەکەم ئەتوانن ناوی ترمان بۆ بنێرن بە خەتێکی خۆش لەگەڵ نمونەی قسەی خۆش و کردەوەی سەیریان تا ئەو پرۆژە گەورەیە پێك بێنین بە هەموولایەك، لەم کاتی تەنگ و چەڵەمەیەدا پێشکەش بکەین بە شارەکەمان بۆئەوەی تۆزێ زاخاوی مێشکیان و دەرونیان بدەنەوە.



● حاجی مستەفا پاشا

١٨٨٦ - ١٩٣٦/١/٢٥



● شێخ لەتیفی حەفید

١٩١٧ - ١٩٧٢/٥/١٢



● حەمە گاسوار ١٨٦٤ - ١٩٧١



● قوتبەدین ئەفەندی

١٩٠٦ - ١٩٧٥



● عیزەت توپچی ١٨٨٧ - ١٩٥٤



● ئەوڕەحمانی خامە سنەیی



● عەلی وەیسی ئەفەندی



● فەرەجی حەمە موراد



● ئەحمەد هوشیار ١٩٢٤
- ١٩٦١



● جەمیل سەعید بەگی بابان



● ئەحمەدی عەزیز ئاغا
١٨٩٩ - ١٩٦٩



● عومەری حەمە قاوەچی
١٩٢٤ - ١٩٧٤



● خاڵە ڕەجەب ١٩١٣
- ١٩٨٤



ساله ئەحەی خوله
١٩.٢ - ١٩٧٦



● قالەی سالحەفەنی
١٩٠٩ - ١٩٦٨



● عەزەبابی



● سابیری تەپەچنە
١٨٩٠ - ١٩٧٥



● توفیقی گولناز



● کەریم خانی حاجی حسەین
ئاغا ١٨٦١ - ١٩٦٨



● قادر زەکی



● عوسمانی حەمە نایەر



● رەشەی شەریف ئەفەندی
مۆختار ١٩١٣ - ١٩٧٠



● عیزەتی حاجی ئەمین
١٩٠٧ - ١٩٧٥



● مەلا سمایلی حاجی حەسەن
١٨٩٥ - ١٩٧٣



● وەستا بەکری پانی بەرزدروو
١٨٧٨ - ١٩٦٨



● حەسەنی دەولەت



●مەجولی خامە سنەیی



● ئەمین چتیر



● حسە دەبو، سالی ١٩٣٢
لە دایك بووە



● عەزیز ئەحمەد جولا



● بەکری حاجی سەعە ڕەش
١٩٣٩ - ١٩٧٨



● بلە کویری قەساب



● عەلی دەدە ١٩٠٧ ـ ١٩٨٦



● حەمەی سەی برایم
١٩٢٥ ـ ١٩٨٤



● کەریم شالووم ١٨٨٥ ـ ١٩٦١



● عومەری نوعمان ١٩٠٣ ـ ١٩٨٤



● مەتی ئەڵلا وێردی



● لوتفی مەحموود ئەفەندی
«کشمیش» ١٩٣٥ ـ ١٩٧٠



● سدیق ئەبو شەوارب



● عیزەتی حاجی ئەمین
«یەك پارچە» ١٩٣٨ ـ ١٩٧٠



● عەلی ئاگا ١٩٠٧ ـ ١٩٨٢



● ئەوڕەحمانی حاجی
عەزیزی ئاغاڵە



● ئەوڕەحمانی سوفی کەریمی
سەڕاج «حەکە» ١٩٢٢ ـ ١٩٤٤



● فەریقە کوێر و شەوکەتی
عەبە پاشا

## هەندێك پیاوی تایبەتی

١ ـ ئەحە تێڵا: ئەم پیاوە دووکانەکەی لەژێر پردەکەدا بوو زۆر جار لەبازا ئەبینرا باڵی پان کردبووەوەو بە خەڵکی ئەووت ئەندازەکەم لێ تێك مەدەن ناو (وەستا ئەحمەد) بوو بەڵام بە ئەحە تێلا ناوئەبرا، دارتاش بوو پەیژەی دروسە ئەکرد بەقەدەر باڵای خۆیو کە تەواوی ئەکرد بە بازارا ئەیگێڕا بۆ فرۆشتن

٢ ـ ئەحەی محەی جگەر: ـ ئەم پیاوە خەیات بووە لە جادەی مەولەوی لا شەیـدای خەیاتەوە، لەدواییدا لە ماڵەوە ئیشی دەکرد، شاگردی نەبوو، کەو ژنانەی ئەدووری. پیاوێکی زۆر قوشمەو قسەخۆش بوو وە زۆر سەیر بوو دوکانەکەیدا هەموو جۆرە تەیرێکی ڕاگرتبوو، وە لە مەولوودا بەشداری دەک چونکە دەنگی خۆش بوو بە جیسابی خۆی دەروێشی قادرکەرەم بوو. زۆر ـ بوو لە ئیشکردندا، بە ساڵێك کەوایەکی تەواو نەدەکرد هەتا خوا حەزی بکرد مێباز بوو. تا مرد ژنی نەهێنابوو.

٣ ـ ئاخ سەمـــەنێ: ـ ئەم پیـــاوە. ناوی (مـــامـــەعـــەبـــە) بوو کابـــرایـــە لەســـەرخـــۆریشێکی سپی درێـــژی هەبـــوو هەمووکات پەستەکێکی لەبەرابو چیرۆکی بۆ خەڵك ئەگێڕایەوەو یارمەتیان ئەدا وە کە لە چیرۆکەکە دەبۆوەوە ئەم دەووت :ـ

ئاخ سەمەنێ. داخ سەمەنی پێم لێ ئەنێیت، ڕووم لێ مەنێ، ڕووم لێ ئەنێیت ڕ لێ مەنێ تو شێخەکەی قازیبەنێ.

٤ ـ فەرەجی حاجی ڕەشید :ـ پیاوێکی بێدەنگ و دڵساف و بێوەی بوو، بەناوبانگ بوو بە (فـەریـد) چونکـە یەکە پشت گیری (فەرید ئەترەش )بوو. زۆری حەز بە گۆرانیو ئاهەنگ ئەکرد، دەنگی خۆی بەلاوە یەکەم بوو. هەمووجار بۆ ڕابواردن پێیان ئەووت: کاکـە فەرەج بۆچی شریتت زۆر نیـە لە بازاڕدا ئەویش ئەیووت بابە گیان شریتی من لای مـحـافـظ و فلان مودیـرو سەرەك عەشیرەت و فلانە وەزیر هەیە. هەرچەندە لەڕاستیدا دەنگی وا نەبوو بەڵام زۆر خۆشەویست بوو لەلایەن خەڵکی سلیمانیەوە، وە هەمیشە گۆرانی فەریدی ئەووت وە گیرفانی هەمیشە پڕبوو لە هەموو جۆرێ نوقوڵ چکلێت و پاکەتە جگەرەو شقارتە، کە هەندێ جار لە ئاهەنگدا گۆرانی ئەووت لەجێی دەسکەگوڵ ئینجانە گوڵیان بۆ ئەبردە سەرشانۆ.

٥ ـ مەلای خەیاڵ:ـ لە حەوت ساڵیدا بە ئاوڵە کوێر بووە، ناوی (حەمەی خەیاڵە) هەمـوو جۆرە کاسبیـەك دەکـات زۆر زیـرەکـەو پۆشتەو فەنتازە، ئەگەر یەکێك لە تەنیشتیـەوە بێت ئۆتـومبیل لێئەخوڕێ، کۆتربازێکی سەیرە وە لەسەر بان کۆتری هەڵداوە زانیوییەتی کامیان تەقلەی لێداوە، دەستی لە فەرش داوە بە دەنکە شقارتە زانیویەتی فەرشێکە باشە یان نا، دەنگی خۆش بووە بۆ کاسبی هاتووچۆی ئێرانی زۆر کردووە، سورەتێـك لە قورئـانی ئەخوێند لە تەعزێی ناسیاودا، لە گەنجیدا کوڕێکی ئازا بووەو خەنجەری وەشاندووە، وە هەروەها لەسەر جوڵانەوەی نیشتیمانی بەنـدکـراوە، وە کوڕێکی قسـەخـۆشە. لە ساڵی ١٩٤٨ز کە هەڵبژاردنی ساختەی نوێنەرانی پەرلەمان بووە خەڵك کەوتنە خۆپیشاندان، زۆر گیران، مەلا خەیاڵ یەکێك بوو لەوانە جا لە بەندیخانەی سلێمانیدا هاواری ئەکرد:

«أنتخابات حرة و ملای خیاڵ في السجون»...

٦ ـ محەمەد کوڕی محیەددینی کوپان درووـ: ـ بەم پیاوەیان ئەووت (حەمەدەد) هەتا بڵێی زیرەك و دانا بوو بلیمەت بوو بەکوردی‌یەوە هەشت زمانی ئەزانی وەکو. عربی، ئینگلیزی فەرەنسی، ئەلمانی، هیندی، فارسی، تورکی، بەڵام ئینگلیزی‌یەکەی وەکو بلبل قسەی پێئەکرد وەکو کوردی، سەربازی لیوی بوو لە حەببانی‌یە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا زۆر شوێن و وولات گەڕابوو دوایی ژیانی بە بێکاری بردۆتەسەر وە لە ساڵی ١٩٦٣زدا لە ڕێگای جەلەولا بە بەندی یەتی بە ڕووداوێك کوژرا.

٧ ـ ئەحەی بەکری پانیبەرز درووـ: کوڕێکی زۆر قسەخۆش بوو هەموو کاسبی‌یەکی ئەکـرد زۆر گاڵتـەچی بوو، هەر ڕۆژەی جۆرە بەرگێکی ئەکـردەبـەر، ڕۆژێـك جلی

کەرکوکی‌و، ڕۆژێك جلی کوردی خۆمان ڕۆژێك چاکەت و پانتۆڵ یان چەفتەو عەگالی لەسەر ئەکرد. لە دەوری مەلیکی‌دا ماوەیەك بەرامبەر بەندیخانە چایخانەیەکی کردبووەوە چەند کۆترێکی سپی ڕاگرتبوو کە حەپسی سیاسیان ئەهێنا بۆ بەندیخانە ئەم کۆترەکانی هەڵئەدان بەسەریاندا بەمانای منیش ئاشتی خوازم.

٨ ـ مەلا نوری کەریم چاوەش:ـ ئەم پیاوە هەر لە منداڵییەوە قاچێکی نەبووە بە دارشەق ئەڕۆیشت بەڵام وەکو مرۆڤێکی ساغ هەڵسوکەوتی ئەکرد، یاری تۆپێنی ئەکرد هەروەها یاری ئاسن بازی دەکردو کۆتربازی دەکرد، وە زۆر بەهێز بوو زۆر جار گرەوی لەسەر دەست بادان دەکرد وە هەمووی ئەبردەوە وە زۆر یاری‌تری ئەکرد کە بە هێزی دەست و بازوو دەکرا، دووکانی هەبوو لە تەنیشت شەخسەکەی پیرەسوورەوە، وە لە لافاوەکەی سلێمانیدا ساڵی ١٩٥٧ز ماڵەکەیان پڕبووبوو لە ئاو، ئەمیش دوو بەرانی گەورەی لە حەوشەکەدا بەستبۆوە وە توانی یەکەیەکە بەرانەکان بەرێتە سەربان و لە خنکانیان ڕزگار بکات ئەمەش بەهۆی خستنە سەرشانیەوە بوو، ماوەیەك بەندکراوە لەسەر خەنجەر وەشاندن کوڕێکی زۆر قسەخۆشە.

٩ ـ عبدالرحمن محمد سعید بەناوبانگ بوو بە (ئەورەحمانە شەل):ـ

لە ساڵی ١٩٢٥ز لەدایک بووە ئێستاش کە تەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵە ئێمچە دوکانێکی لاکۆڵانی هەیە لە گەڕەکی مەڵکندی لەپشت سەرای کۆنەوە، لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا کە لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی‌دا ئەخوێنێ لەکاتی پشوی ساڵانەدا بەهۆی هەژاری‌و دەست کورتی‌یەوە لەگەڵ باوکیا ئەچێت بۆ کەرکوك بۆ کرێکاری، لەوێ شەوێك بەدەم خەوەوە هەڵئەستێت و لە سەربان ئەکەوێتە خوارەوە گازەڕای پشتی ئەشکێت و لەکەمەری بەرەو خوار ئەمرێت. ئەوەی شایانی باسە ئەورەحمانەشەل هەتاکو ئێستا بە عەرەبانەکەی ئەڕوات و بەوپەڕی شەرەفەوە خۆی ئەژێنێت و لەوە زیاتر خاوەنی هیچ سامانێکی‌تر نییە لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە سەربەرزە هەوڵ ئەدا بۆ هان دانی خەڵك بۆ یارمەتی لێقەوماوان و هەژاران. کاك ئەورەحمان بەم هەموو دەست کورتی‌و لێقەوماوییەوە هەتا ئێستا لەباتی ئەوەی بەزەیی بەخۆیدا بهاتایەتەوە هەر بەزەیی بە فەقیرو هەژاردا دێتەوە بیر لەوان زیاتر ئەکاتەوە ئەمەش زۆر جێی شەرەف و شانازی‌یە کە خۆی ئەژێنێ. لەپاڵ ئەو شەلی‌و شکستییەیی‌و داماوی‌یەدا نانی منەتی کەس ناخوات.

ئەم پیـاوە هەمیشـە هەستی نیشتیمـان لە دڵ و دەرونیـا بووە وە هەر بۆ ئەو مەبـەستـەش تووشی ئەشکـەنجـەو تەنـگ و چەڵەمـە بوە، بۆنمـونە لە سەردەمی موتـەسـەریفی عومـەر عەلیدا راپێچی بەندیخانە کراوە لەرێی گەلەکەیدا لەتەك کۆمەڵێك لە نیشتیمان پەروەرانیتردا، هەر عومەر عەلی خۆی لە بەرچاوی بەندەکان پێیدەڵێت [شـەلە ئەگەر هیچ کوێت ئیش ناکات، خۆ دڵ و زمانت ئیش دەکات] ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە کاك ئەورەحمان بەو گرفتارییەوە لە کاروانی تێکۆشانی گەلەکـەی دوانـەکەوتووە. زۆرجار کە وەکو فەلسەفەیەك لەسەری بڕوا باسی شت ئەکات کە وشەکان کاریگەرو بەهێزن ئەوانەش :ـ

أ ـ رزق :ـ هەتا سەرم بجوڵێت و دڵم لێبدات خۆم بەخێو دەکەم و، داوای رزق لە کەس ناکەم و نانی منەت و شەرمەزاری کەس ناخۆم.

ب ـ گونـاە: ـ چونکـە خۆم بەرامبـەر بە هیـچ کەسێـك بە تاوانبار نازانم لە هیچ روویەکەوە لەبەرئەوە هەتا ماوم داوای لێبوردن لە کەس ناکەم.

ج ـ تەمەن : ـ لەبەرئەوەی لە سەرەتای لاویمەوە تائێستا هیچ جۆرە خێرو خۆشیەکم نەدیـوەو لە هەمـوو چێژو هیواو ئاواتێکی پڕ خەوو خەیاڵاتی لاویم بێبەش بووم لەبەرئەوە داوای تەمەن درێژی لە کەس ناکەم.

هەر لە دڵیەوە هەڵئەقوڵا کە زۆر جار گوێمان لێئەبوو ئەیووت :ـ

(ئای رۆژگار بەخوا نە بە بەرخی تێر شیر بووم نە بە کاوری تێر گیا).

تێبینی: کاك ئەورەحمـان کە برای قادر برسییە نموونەی دوو برای خۆشەویست بوون کە زیاد لە پەنجا ساڵ لەگەڵ کاك قادرو خێزانەکەی بردوەتەسەر. ئەم پیاوە بەهـەوڵ و رەنجی خۆی لەگـەڵیـانـدا ژیـاوە تا دوا هەنـاسـەی کە لە رۆژی ١٧ / ٢ / ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووە.

١٠ ـ عەلی تۆفیق شلك (عەلی فەوتاو) :ـ کاك عەلی لە سلێمانی لە گەرەکی گۆیژە لە قاوەخـانـەی سەرچـیـمـەن، لە ساڵی ١٩٢٤ز لەدایـك بووە، خوێندنی هەتا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی زانستی تەواوکردووە، حەزی بە بەرزی نیشتیمانەکەی کردووە، کورێکی ناسراو بووە لەناو خەڵکدا و خۆشەویست بووە، لەگـەڵ ئەوەشدا قسەخۆش و دەنگ خۆش بووە وە هەموو ژیانی بەسادەیی

ردۆتەسەر. لە تەمەنی حەوتساڵیدا ئەبێت کە دایکی ناوساجی سورئەکاتەوەو کاک عەلی دەست ئەبات بۆ ناوتاوەکە ئەپرژێت بەچاویاو پاش ماوەیەکی کەم چاوێکی کوێر ئەبێت. دوای ئەوەی کە لە زانستی دێتە دەرەوە ئەبێت بە شاگردی تەنەکەچی لای شێخ جەلال لەناو بازارا نزیك خەلفە فەرەجی کەبابچی بۆ ماوەی پێنج شەش ساڵ. لەدواییدا لەلای عەبە دەلاك ئەبێت بە شاگرد دەلاك لە ئەسحابە سپی هەتاکو ساڵی ١٩٤٢، هەر لەم ساڵەدا لە کاتی بەهارا لەگەڵ هاورێکانی ئەچن بۆ شارەزوورو دەوروپشتی هەڵەبجە بۆ سەیران و راو لە (قوروچیا] بەهەڵە دەست رێژیان لێئەکەن، لەئەنجامی ئەم گوللەبارانەدا کاك عەلی گولەیەك بەر دەم ولوتی ئەکەوێت هەروەها لەوێدا حەسەنی رەزا بەگ و نوری حاجی محمد کۆچی دوایی ئەکەن و جەمیلی سەعید بەگ گولەیەك تیغ ئەکات بەسەریەوە هەروەها ئەیوبی ئۆتۆمبیلچی بریندار ئەبێت و پاش هەفتەیەك وەفات ئەکات.

حەمۆل غەفوریش دوو پەنجەی بریندار ئەبێت، لەدوای ئەم بەسەرهاتەوە کاك عەلی چونکە هەر لەوەپێش چاوێکی کوێر بوبو وە لێرەشدا دەم ولوتی بەرکەوت ئیتر ناونرا عەلی فەوتاو.

هەر لەپاش ئەم رووداوە لە گەرەکی خۆیان دوکانیعەتاری دائەنێت لە قاوخانەی سەرچیمەن وە هەتاوەکو ئێستاش هەر لەو دوکانەدا لەکاسبی بەردەوامە.

لە ساڵی ١٩٥٠ زوە هەتاوەکو ١٩٦٣ز جگە لەوەی کە دوکانی هەبوو لە سینەمای رەشید لە قاپی چلی بلیتی ئەفرۆشت ئیتر هەرچەندە لە کۆلانەکاندا منال ئەیانبینی ئەیان ووت ئەوە پیاوی سینەماکەیە. لە ساڵی ١٩٥٩ز وە هەتاکو ١٩٦٠ز مانای بۆ ماوەی ساڵێك کە بەهۆی شۆرشی چواردەی گەلاوێژەوە نەقابەی کرێکارانی سینەماکان کرایەوە کاك عەلی بو بەسەرۆکی ئەو نەقابەیە، بەڵام لەبەرئەوەی لە سلێمانیدا دوو سینەما هەبوو وە ئەندامانی ئەو نەقابەیە نزیکە (١٠کەس] بوون لایان بردوو خستیانەسەر نەقابەیەکی‌تر.

هەر لە ساڵی ١٩٥٩زدا کاك عەلی رۆیشتووە بۆ چیکوسلۆفاکیا بۆ چارەسەرکردنی دەم ولوتیوە لە [پراگ] ئەبێت بە میوانی قادر دیلان کە لە بەشی مۆسیقا ئەیخوێند، وە هەروەها برادەری کۆن بوون وکوری یەك گەرەکیش بوون، وە بۆ ماوەی سێ مانگ ئەمێنێتەوەوە وە نەختێك بۆی دەستکاری ئەکەن وە دوای ئەوە پێی ئەڵێن بمێنەرەوە

بەڵام ئەم تاقەتی ئەچێت وە بە نیوەچڵی بەجێی‌دێڵێت ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی کاک عەلی بەسەرهاتی خۆشی هەیە، یەکێك لەوانە:ـ جارێکیان کە بەنهێنی لە جولانەوەی نیشتیمانی ناوشاردا ئیش ئەکات لە ساڵی ١٩٥٤زدا وە ئەم جولانەوەیە پەرەئەسێنێت و میری دەستی‌کردبوو بە لێدانیان و هەروەها گرتنی جەماوەر، لەوکاتەداو برادەرێك لە خۆی بەرزتر نامەیەکی بەنهێنی ئەداتێ کە بەگورج وگۆڵی بیگەیەنێتە برادەرەکانی‌تریان لە سابونکەران و کاك عەلی بەپەلە ئەڕوات و برادەرەکەی لە شوێنێکدا چاوەڕوانی ئەکات پاش ماوەیەك سەیرئەکات کابرایەك دەماخی کردووەو عەینەکی قەپاغلی لەچاودایە جوتێ گۆرەی‌و پوزەوانەی لێ‌هەڵکێشاوەو کۆمەڵێکی زۆر منداڵی بەدواوەیەوە دێتە بەردەمی دەماخەکەی لائەبات سەیر ئەکا کاك عەلی‌یە پێی‌ئەڵێ ئەوە چیت کردووە ئەڵێت هەروەها گەڕامەوە چونکە منداڵان ئەبونە هۆی ئەوەی کە پۆلیس بمناسێتەوە بەردەستیان بکەوم لەبەرئەوە هیچم بۆ نەکراو لەترسی ئەم منداڵانە گەڕامەوە برادەرەکەی دەست ئەکات بەپێکەنین و پێی‌ئەڵێ: ئەڵێی لە چلەی زستانداییت وە ئەچیت بۆ دزی‌و ماڵ بڕین، ئیتر نامەکەی لێ وەرئەگرێتەوەو بە یەکێکی‌تردا ئە ینێرێت.

بەڵام کاك عەلی لەدوای سالانی شەستەوە دەست ئەکات بە نوێژکردن و دوای ئەوە ژن دێنێت وە پاش چەند سالێك بێ‌خشپە ئەچێت بۆ حەج و هەتا ئێستاش کەم کەس ئەزانێ کە حەجی کردووە من خۆم زۆر برادەرێکی نزیکی بووم یەکێکم لەوانەی کە ئاگام لە حەجەکەی نەبووە هەتاوەکو لەم دواییەدا کە چوومەلای بۆ نوسینەوەی ژیانی، لەدوای هاتنەوەی لە حەج خوا کچێکی داوەتێ ناوی چراخانە کە هێشتا لە پۆلی سێ‌هەمی سەرەتاییە لەخوا داواکارم کە چراخان ببێتە چرایەك بۆ خزمەتی نیشتمان و هەروەها تەمەنی درێژیش بۆ کاك عەلی لەخوا داواکارین.

١١ ـ عوسمانی شەریف ئەفەندی (عوسمان دانش): ـ لە ساڵی ١٩١٧ ز لە گەڕەکی مەڵکەندی لەدایك بووە سەرەتایی تەواوکردووە دوای تەواوبونی لە عەسکەری لەبەر بارو دۆخی رامیاری وولات نەی توانیوە جێگیر بێ لە کارو گوزەرانی میریدا ناچاربووە بە سکالانوس [ئەرزوحاڵ چی].

کاك عوسمان ساڵی ١٩٤٦ز بەشداری کۆمەڵەی جمهوریەتی مەهابادی کردووە زۆر جار لەسەر جولانەوەی نیشتیمانی گیراوەو دوورخراوەتەوە. پیاوێکی قوشمەو

ڕوویەكی كۆمەڵایەتی خۆشی هەبوە، زۆر ئارەزووشی لە خواردن هەبووەو ناسراوە بە زۆرخۆری، لە ژیانیا درێخی لە خۆی و ماڵ و منداڵی نەكردووە. بەڵگەش بۆئەوە لەدوای كۆچی خۆی هیچ شتێكی ئەوتۆی بۆ دوارۆژی منداڵەكانی بەجێ‌نەهێشتووە، تەنها ئەو دەستمـایـەیـە نەبێت كە منداڵەكانی شانازی بە ناوونیشانی باوكیانەوە بكەن بەرادەیـەكیش دڵسـۆز بوو بەرامبـەر براكـانی ئەوەنـدەش هاوپـەیمان بوو هەتا مردنەكەیان لەتەك كاك ڕەشیدی موختاری برایدا تەنها سێ ڕۆژی بەین بوو، لە ڕۆژی ١٠/ ١٠/ ١٩٧٠ لە بەغدا [مدينة الطب] لە بەغدا كۆچی دوایی كردو تەرمەكەیان هێنایەوە بۆ سلێمانی وە لەگردی سەیوان نێژرا.

١٢ ـ (خاچادۆر كریكۆر خاچادۆری ئەرمەنی‌ی):

خاچادۆر كوڕی كریكۆری نانەوا بوو.

مرۆڤێكی تابڵێی ڕوو خۆش و لەسـەرخـۆو ڕاست گۆ بوو، هەمیشە لەناو كۆڕو كۆمـەڵی لاوانی سەردەمی خۆیـا بەخۆشی كاتی بردۆتەسەر لە ژیانیا مووچەخۆری میری نەبووە، لە كاتی خۆی‌یا یارمەتی باوكی داوەو لە ساڵانی چلەكانا لە سلەیمانی لە سینەمای (سەلاحەدین) بلیت فرۆش بوو.

لە ساڵەكـانی پەنجاكانا كۆگایەكی جوانی خنجیلانەی دانا نزیك چێشتخانەی لاوانی ئێستـا لەژێـر دائـیرەی ئەوقافا بەرامبەر (سینەمای ڕەشید)، هەمووكاتێك لاوانی ئەوسا كۆڕیان لە بەر كوگاكەیا ئەبەست و ئەمیش بەبێ‌ئەوەی پێی ناخۆش بێ پێشوازی ئەكردن و قسەی خۆشی بۆ ئەكردن.

چەنـد ساڵێك بەم جۆرەی بردەسەر دوایی چونكە مەبەستی پارە دەس كەوتن نەبـوو لەبـەر دڵ پاكی خۆی دووكانەكەی هەموو بەقەرزقۆڵە لەدەس چوو، بە بێ دەس مایەو ئیش مایەوەو لەوكاتەدا تووشی نەخۆشیی (شەلەل) هات و هەرئەوەش بوو بە هۆی كۆتـایی ژیـانی، زۆر حەزی بەوە ئەكـرد كە خزمـەتی خەڵك بكـاو هەركـەسێكی بناسیایەو نەی‌ناسیایە ئەم مەرحەبای لێ ئەكردو مەرجی ئەوە نەبوو وەڵامی بدرێتـەوە، ناوبـراو ناوی خەڵكی زوو لەبیرئەچووەوە، بە زۆر كەسیی ئەوت (مەهرەبا ڕەشید).

خوالێ خۆشبـوو لە دێی (ئـەرەب گیـر) لە توركیـا هاتـۆتـە دنیـاوە لەنـزیـك (ئەستەموول) پاش قەتڵ‌عامی ئەرمەن بە چەند ساڵێك، لە ساڵی (١٩٢١)ز هاتۆتە دنیاوەو لە ڕۆژی (١١/ ١/ ١٩٧٥)ز لە سلەیمانی وەفاتی‌كردوە. ناوبراو كووڕیك و

کچێکی بوە کچەکەی ناوناوە (لوشقارت) کە لە ساڵی (١٩٥٨)ز لەدایك بووە،
کوورەکەیشی ناوی (سێڤان)ە لە ساڵی (١٩٦٠)ز لەدایك بوەو ئێستا هەردوکیان لە
شاری سلەیما نین لەلای کورکێنی مامیانن .



● جاچادۆر کریکۆر ١٩٢١ - ١٩٧٥



● فەرەجی حاجی ڕەشید «فەرید»



●ئەحەی بەکری پانی بەرزدروو



● مەلای خەیاڵ



● مەلا نوری کەریم چاوەش



● عوسمان دانش ١٩١٧ - ١٩٧١
«وێنەی ساڵی ١٩٤٦ مەهاباد»



● ئەورەحمانە شەل ١٩٢٥ ـ ١٩٨٥



●عەلی فەوتاو

## هەندێك پیاوی سەیر

هەنـدێ پیاوی سەیر هەبووە لە شارەکەماندا وێنەیان نەبووە، هەریەکە لەمانە جۆرە ئیشێـك و جۆرە خوورەوشتێکی تایبـەتیان هەبووە هەموویان خۆشەویست بوون و ناسراو بوون لەنـاو خەڵکـا زۆربـەی کاتیان بە قسەی خۆش ئەبردەسەر. ئەمەش ناوو باسی چەند کەسێك لەمانە:

١ ـ مچەی حەبێ کشمیش: کابرایەکی کەتەی گەورەو دەموچاو پان و سوروسپی بوو، جووتێ سمێڵی گەورەی پێوەبوو، زۆر دڵ تەربوو، هەمیشە جلوبەرگی جوانی لەبـەرئەکرد، بەزۆری کەواو سەڵتەی عاسمانیی لەگەڵ جووتێ فەقیانەی گەورەی کەتانی ئەبەست و جووتێ کەوشی رەشی لێوارسوری لە پێ ئەکرد. زۆریش ژنانی بوو هەمیشە حەزی بە ناوژنان ئەکرد، تەنانەت دەنگی ناسك بوو وەکو ژن، زۆر جار لەناو ژنانا ئەیگوت بەزیای خێرم نەکرد مێردەکانتان چۆنتان لێ قبوول ئەکەن چۆن چێشت لێنان و جل شتن وائەبێ، چونکە خۆی جوانترین چێشتنی لێئەناو جلی ئەشت، ئەم پیـاوە زۆر کچ کە شووی بکردایە یان کوڕ ژنی بهێنایە ئەبوایە ئاگاداری ئەمیان بکردایە ئەچوو بۆ خوازبێنی بۆ لای کچەو دایکی کچەو لە هەمان شاییشدا ئەبوایە سەرچـۆپی هەڵپـەرکێکەی بگرتایە. زۆر بەرچاو فەرەح بوو رەزیل نەبوو، زۆر جار زیافەتی بۆ خەڵك ئەکرد خۆشی چێشتنەکەی لێئەنا، ئیشێکی تایبەتی نەبووە، هەر بەم جۆرە ژیاوە بەڵام لە ژیانیا ژنی نەهێناوە ئەشیتوانی ژن بێنێ ئەم کابرایە ناوی دەرکردبوو لەشارا تائێستاش ئەمە هەر بووە بە مەسەل یەکێك ئەگەرتۆزێ ژنانی بێت پێیئەڵێن ئەڵێی [مچەی حەبێ کشمیش] ●.

٢ ـ حەمــە عاشق: ـ لە زەمانی تورك و ئینگلیزدا لێفەیەکی ئەدا بەشانیا لەبازارا ئەســورایەوە لیفەی ئەفرۆشت، شان و پشتی دووعای پیا هەڵواسیبوو، کڵاوەکەی سەری هەمــووی شەوەو شیلانی پێوەبوو، هەموو ساڵێك لە رەمەزانا پێش ئەوەی کارەباو رادیۆ بێتە سلێمانی‌یەوە ئەم ئەچوو بۆ لای قازی قورئانی ئەخوارد ئەیووت من مانگم دیوە، زۆر قسەخۆش بوو خەڵکی گەرەکی (سەرچیمەن) بوو.

٣ ـ مەلاعەلی‌یە شێتە: ـ ئەقلی سووك بوو هەمیشە جلەکانی شڕ بوو، کەواو سەڵتەی لەبەرابوو، خەڵك خێری پێ ئەکرد کە تورەیان ئەکرد هاواری ئەکرد ئەیووت: [ئێوە خۆخۆرن وەك کەو وان].

٤ ـ پیران: بەنــاو کوڵ گێر بوو واتــە [حەماڵ] توورە ئەبوو کفری ئەکرد. هەر کە توورەیان بکردایە پێیان ئەگوت [عەرز بیگرە عاسمان قووتی‌دە]، ئیتر توورەو دەهری ئەبوو دەکەوتە کفری خراپ کردن.

٥ ـ عالا دەلعوونە: ـ ئەم کابرایە زلەیەکی سوروسپی دەروێش بوو پرچە سپی‌یەکەی شۆڕ ببــووەوە، دەستگــێڕ شتی بەکــۆلانــانــا دەگــێراو دەی‌فــرۆشت و منــدالان دوای‌ئەکەوتن بە (عالادەلعوونە] ووتن، زۆر توورە ئەبوو جوێنی پیسی ئەداو کفریشی لەگەلا ئەکرد.

٦ ـ کەریمی لۆقتنــەچی: ـ بەرامبەر [چێشتخانەی تارا] پیاوێکی زۆر توورە بووە ئەگەر خەڵکی سەریان بکردایە سەری هەرچی چێشت هەبوو لە لۆقنتەکەیا هەمووی ئەرشت بەتایبەتی لە رەمەزانا کە پۆلیس و چاوەشی شارەوانی نەیان ئەوێرا بە بەردەم لۆقنتــەکــەیــا برۆن چونکە یاساغ بوو و بیان ووتایە یاساغە هەموو مەنجەڵەکانی تێ‌ئەگرتن بەچێشتەوە بەڵام پیاوێکی هەژارو بەسزمان بوو.

٧ ـ قالانە: ـ پێیان ئەووت [قالانە، پاشانە، چاکانە] ئەمیش خۆی هەر بەوشێوەیە وەڵامی ئەدانەوە ئەم پیاوە بە عەرەق خواردنەوە مرد.

٨ ـ مامەحەمەی عەقراوی: [باوکی خولە تەرەزان] بوو توورەیان ئەکرد پێیان ئەووت [مامەحەمەی عەقراوی ـ هێلکە ئەکا بە مراوی].

٩ ـ حەمە کەچەڵ:ـ لە بەرماڵی خۆیانا کە بەرامبەر سەرا بوو قیرتەبەقی دانابوو بە بەتاڵی و مندالان توورەیان ئەکردو پێیان ئەووت [مامەحەمە گون تەمتەمە..].

١٠ ـ قادر ئاغــای ئبراهیم ئاغا:ـ عەتار بوو لە قەیسەری نەقیب هاتووچۆی ماڵی

شێخانی ئەکردو لەو ماڵانە تووڕەیان ئەکردو ئەویش دەستی ئەکرد بە جنێودان و ئەهاتە دەرەوە.

١١ ـ وەهـابە کەچەڵ:ـ ئەم پیاوە حەماڵ بوو خەڵکی تووڕەیان ئەکرد ئەیان ووت [کولایەوە] ئەویش بەگژ دارو بەردا ئەچوو.

١٢ ـ قاقامچە:ـ ئەم پیاوە دەستگێر بوو هەر ڕۆژەی لە شوێنێك بوو، قسە خۆش بوو جارجار کە تووڕەیان ئەکرد جنێوی ئەدا، وەکو کابرایەکی تورك فێری کوردی بووبێت وا جنێوی ئەدا [گەواد، کوڕ گەواد، تەرەس کوڕ سەگباب کوڕ قەحبە دایك]. زۆری ژیـانی لە کەرکـووك و بەغـداد بردۆتەسەر. یەکەم کەس بووە شتی لەسەر سینی فرۆشتووە، ئەیگێرا وەکو پارووە هێلکەو ترشیات، جەژنان لگاوی دادەنا ئەم لگاوە جۆرە قومارێکە بە مۆری تاوڵە ئەکرا لەسەر مێزیك بەقووتوویەك یاری پێ‌ئەکرا.

١٣ ـ سەی عەلی بسم الله:ـ بەوە توورە ئەبـوو بە هەر شوێنیکـا برویشتـایـە پێیان بووتایە بسم الله ئیتر کەللەیی ئەبوو ئەچوو بەگژ دارو بەردا.

١٤ ـ ساڵح دەمـانچـە:ـ ئەم کابـرایـە حەڵوای ئەفـرۆشت بەوە توورە ئەبوو کە پێیان ئەووت (ساڵح دەمانچە) زۆر توورە ئەبوو، گوچانێکی پێ‌بوو هەڵی‌ئەسوراند یان ئەی‌هاویشت بۆ ناو خەڵکەکە جا بەر کێ ئەکەوت خۆی‌و شانسی.

١٥ ـ ئەحە خورشە:ـ ئەم پیاوە شاگرد خەیات بوو لە قەیسەری وەسمان پاشا، تۆزێ عەقـڵی سووك بوو، بەڵام زۆر خۆش بووەو شتی سەیـری لێ ئەگـێڕنەوە. ئەڵێن لە ژوورێکی قوردا لە گەڕەکی شێخان هەر خۆی بە تەنیا ژیاوەوە بەردەمی ژوورەکەی لەسەر کۆڵان بوو بە توورەکەو گلۆڵەبەن و مێزەڵانی حەیوان و کاغەزی چکلێت و پاکـەتی جگـەرەی بەتـاڵ هەڵ واسیبـوو، هەروەهـا لە ژوورەکەشیا کلاشەکۆن و کەوشـەکـۆن و لێفەکۆن و کەواکۆن و کەلوپەلی‌تری هەڵواسیبوو سەربانەکەشی بە پارچە قوماشی کۆنی گەورە داپۆشیبوو دایکوتابوو بە بزمار ئەی‌ووت بادلۆپە نەکات، زۆر کات بەکولانانا بە توورەکەیەکەوە پەڕوکۆنی کۆئەکردەوەو یان هەندیکی ئەخستە گیرفانیەوە زۆر قسەخۆش بوو بە هەموو کەسێکی ئەووت [ڕەفیق] زۆر جاریش خەڵك توورەیان ئەکرد.

١٦ ـ قەزەڕۆسی دەلاك: ـ خەڵکی قەفقاس بوو پێش ئەوەی بێتە سلێمانی چووبوو بۆ یـارە بولای شێخ علائەددینی بیارە لەوێ ژنیان بۆ هێنا، پاشان هاتە سلێمانی

دووکـانی دەلاکی کردەوە بەرامبـەر خەلفە ڕەشیدی کەبابچی تەنیشت سینەمای سیروان، پاشان گواستیەوە بۆکانیسکان بەرامبەر ماڵی شێخ لەتیف چاکەت و پانتۆڵی لەبەرئەکردو کڵاو مشکی لەسەر ئەکرد کەس نەیئەوێرا بچێتە لای بۆسەرتاشین نەك لەکاتی سەرتاشینا توورەی بکەن و شوێنێکی ئەوکەسە بە گوێزان بریندار بکات، بەڵام ئەوکەسانەی کە نەشارەزا بوون و نەیان ئەناسی ئەچوون سەریان ئەتاشی ، کە دائەنیشتن هەموو سەروچاوو پشتیملی ئەکردن بە کەف سابوون، بەس چاویان دیار ئەما، خەڵك زۆر ئەهاتن بۆلای پێیان ئەووت قەزەڕۆس....، ئەویش تەوریکی هەبوو ئەیگرتە خەڵکەکە زۆریش بەهێز بوو هەرکەسێکی بگرتایە ئەینایە ژێر خۆی. ئەڵێن زۆرجار شێخ لەتیف ئەهاتەوە بۆماڵ لەودیوو دەرگاکەیانەوە بانگی ئەکرد (قەزەڕۆس) ئەویش توورە ئەبوو جنێوی پیسی ئەدا پاشان ناچار سلێمانی بەجێئەهێڵێ لەبەر ئەم بەزم ورەزمە.

١٧ ـ ئینگـرام:ـ ئەم پیـاوە سەیدێکی ئەو خوارانە بوو نەگبەتی گرتبوی هاتبووە سلێمـانی بۆئـەوەی خەلك یارمـەتی بدەن، جلەکانی وەکو سەیدی خواروو وابوو، کورتەباڵا بوو لەبەر ئەوە پێیان ئەووت [ئینگرام] جنێوی ئەدا بە کوردیو عەرەبی ناچار سلێمانی بەجێهیشت، ڕۆژێك لە بەغدا بەرێکەوت توێکڵە مۆزێك لە بەر قاچیا پێی پیـا دەنێو دەکـەوێو لە بەردەمی کۆمـەڵێکـا هەڵی ئەستێتـەوە، بەرێکەوت هەموویان خەلکی سلێمانی دەبن ئەبێ یەکسەر دەیناسنەوە پێیئەڵێن (ئەڵلا بلخێر) دەست ئەکا بە جنێودان و دەڵێ [ئەهلی سلیمانی مایجوزون مني] لە ساڵی ١٩٥٦دا جارێك لە کەرکوك بەند ئەبێ لەوێ تووشی کۆمەڵێك خەڵکی سلێمانی ئەبێت هەرچەند ئەیەوێت خۆی ئاشکرا نەکات بەڵام ئەوان ئەچنە لایەوە پێی ئەڵێن [ئینگرام] ئەو چیئەکەیت لێرە؟ ئەویش بەتوورەیی‌یەکەوە دەڵێت لەتاو خەڵکی سلیمانی هاتوومەتە ئێرە لێرەش وازم لێ ناهێنن.

١٨ ـ خەلیل ژنانی :ـ ئەم پیاوە باڵابەرزێك بوو پاکو تەمیزو جل بەرگی سەوزو سوری لەبەرئەکردو دەستی لە خەنە ئەگرت و چاوی بە کل ئەرشت و سمێڵی ئەتاشی وەکو ژن قسـەی ئەکردو ئەڕۆیشت بەرێگەدا لای حاجی تۆفیق (پیرەمێرد) بو خزمەتی ئەکردو چێشتی بۆ لێئەناو هاتوچۆی ئەو ماڵە دراوسێیانەی ئەکردو لەگەڵ ژنەکان ئیشی ئەکردو نانی لەگەڵا ئەکردنەوە بە نان پێوەرەکەی ئەووت ئێسکت مرێ مەیەڵ

نانەکەت بسوتێ با نەبێ بە (کوڵو)، ئەم کابرایە قسەخۆش بوەو کەسیشی نەبووە لێرە.
١٩ ـ حاجی فرێ:ـ هیچ ئیش وکارێکی نەبوو و. هەموو شوێنێك دەگەڕا پێیان ئەووت حاجی فرێ ئەویش ئەیکرد بە چەپڵە لێدان و ئەیووت [کەمەرە لوولە هەیاسە ـ حاجی شێت بووە بۆ عاسە] تابڵێ پاك و تەمیز بوو، چاویشی بە کل ئەڕشت، زۆر قسەخۆش بوو، سوعبەت چی بوو. خەڵك یارمەتی ئەدا کەرێکی بچوکی هەبوو هەموو ناوچەی سلێمانی پێئەگەڕا بەتایبەتی هاتووچۆی بەگزادەکانی هەڵەبجەی ئەکرد زۆر خۆشیان ئەویست و یارمەتیان ئەدا.
٢٠ ـ فەرەج قوزێك بەرەوە:ـ ئەم پیاوە حەماڵ بوو منالان توورەیان ئەکرد پێیان ئەووت [فەرەج قوزێك بەرەوە] بەمە زۆر تووڕە ئەبوو، هەرچیەکی پێبوایە دایئەناو دوای منالەکان ئەکەوت بە جنێودان.
٢١ ـ مجەی دەرابە: ئەم کابرایە هەموو ئیشەکەی ئەوەبوو دارێکی درێژی پێبوو سەرەکەی پەڕۆی تێوەئالاندبوو تەنەکەیەك ڕۆنی ئۆتۆمبیلی هەڵ ئەگرت و دەرابەی دووکانەکانی چەور ئەکرد کە ئەچووە بەردوکانێك لەباتی بڵێت [چەوریکەم] ئەیووت [چەوری عام] هەمیشە سەرخۆش بوو ئەم گۆرانییەشی ئەووت:ـ [عەبدی مەیخانە پارەم پێنیە ـ عەرەقی بونو عارەق بونو]
[عەبد مەیخانەچییەك بووە لە سلێمانی جوولەکە بووە].
٢٢ ـ تۆفان بەگ (تۆفەخرە): ناوی تۆفیق کوڕی ئیبراهیم بەگی مارف بەگە برازای فایەق بەگی مارف بەگە ناسراوبوو بە [تۆفەخرە]، پیاوێکی کورتەبنە بوو، بە لەنجەولار ئەڕۆیشت بەریگادا هەروەکو مراوی، عادەتی وابوو کە لە ناوبازارا ئەگەڕا بە هەچ دوکاندارێك بگەیشتایە پێیئەووت: ئەم دوکان و بازارە یاخود ئەم حەمام و قەیسەرییە هەمووی هی منە، باوکم بۆی بەجێهێشتووم و خەڵك لێی داگیرکردووم، ئەوانیش پێیان ئەووت: زۆر چاکە برۆ دوو شایەت و مختارێك بەرە بۆ تاپۆو ئەرزوحاڵێك بنووسە بۆت جێبەجێ ئەکەن، بەم جۆرە تۆفە بەدائیمی لە تاپۆ کەوتبوو، لەوێش فەرمان بەرەکان لەگەڵی ڕاهاتبوون و هەر ئەم ژوورو ئەو ژووریان پێئەکرد، ڕۆژی وا هەبوون بەقەدەر دوو فەراش ئیشی خۆیان پێئەکرد، بە ناوی ئیشەکەی خۆیەوە لەدواییدا پێیان ئەووت ناردوومانە بۆ بەغا کە بۆت ساغ بکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تۆفە زۆری حەز لە ژن بوو، دایم هەر باسی دەکرد. جارێکیان عەزەی

بارام كە دەلاڵی نقلیـاتی سلێمانی بوو پێی‌ئەڵێت: تۆفە گیان خۆم ژنت بۆ ئەهێنم بەم جۆرە هەڵی‌ئەخڵەتێنێت و ڕۆژێك ئەیبات بۆحەمام زۆر چاك ئەی‌شۆن و دەستێك جلی جوانی تازەی لەبەرئەکەن و هەندێك ئالاو والای پێوەئەکەن و شاییو بەزمی بۆ دروست ئەکەن، کەریمی بارام ئەکەن بە بووك و عوسەگۆج ئەکەن بە بەربووك و لە کەلاوەکەی بەرماڵی عەزمی‌بەگی بابان سێ شەوو سێ ڕۆژ بەزم ئەگێڕن و لەدواییدا بە (٢٠) قەمــەرەیەك بە بەزم و هۆرن لێدان ئەیبەن بۆ ماڵی مام بارام لە سەرکارێزو ژنانی گەڕەك ئەیبەنە ژوورەوو داخڵی ژووری بوکێی ئەکەن تۆفەش بەخۆشیەکەوە ئەچێتــە لای بوکــەوەو عەبــاکــەی لەســـەر لائــەبـا، کە چاوی بە کەریم ئەکـەوێ ڕائــەکـاتــەدەرەوەو هەرچی بەدەمیـا بێت پێـان ئەڵێت. ئەوانیش بە چەپڵەڕێـزان بەرێی‌ئــەکەن. ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٩٥٢ ـ ١٩٥٣زدا ڕوویداوە. ئەم کابرایە ساڵی ١٩٧٤ لە مزگـەوتی (هــەلاجــەکان) ئەنوست بەیانیەك لەو مزگەوتە لەپڕ دڵی ئەوەستێ‌و کۆچی دوایی ئەکات.



● جەمال ڕەسوڵ «کەرەی نەوت»



● توفان بەگ

**بە بەرگی زاوایەتی یەوە**



● ئەنوەری ڕەزا بەگ



● سالْح پیرۆت «کەڕەی تەنەکەچی»



● ئەحە خورشەی خەیات

# «پەك كەوتە» «كەرەكان و شێتەكان»

ئێستا لە زۆر وڵاتی جیهاندا مەسەلەی بایەخدان بە پەك كەوتە «معوق» بووەتە ئەركێكی گرنگی كۆمەڵ، چۆن ئامادە بكرێن بۆ هەندێ ئیش وكار، چۆن هەندێ توانـایان بەرەوپێشەوە ببرێت، بیرمە كەباسی كاك ئەحمەدی شێخ دەكرا، باوكم «مەلا مستەفای سەفوەت» لەپێش هەموو كارێكی گەورەی كاك ئەحمەددا باسی ئەوەی ئەكرد كە چۆن هەموو كوێرەكانی شاری لە مزگەوتی گەورەدا كۆكردۆتەوەو بناغەی فێربوون و خوێندنی قورئانی بۆ دامەزراندوون و بەوچەشنە هۆی ژیان و نان پەیداكردنی بۆ دابین كردوون. حەپسەخانی نەقیبیش ئەو رێیەی كوێر نەكردەوە.

ئەمە كوێرەكانی شار. هەرچی كەرو لاڵ و پەك كەوتەی ئەم شارەیە، ئەوە بۆ كەسێك بەدوایدا بگەرێ لە مێژووی سلێمانیدا رێبازی تایبەتیی بایەخدان بەم مەسەلەیە ئەبینێ كە بەشێكی هونەری تاقە كەسێكەو هەندێكی لەخۆیەوە هاتووە، لەبەرئـەوە سەیر نییە كە لەنـاو پەك كەوتـەكـانی شاردا تەنـانـەت كەسی دیارو هوشیاریش هەڵكەوتبێ ئەمەش لە باسی كەرەكانی شاردا ئەبینی.

لە تەمەنی خۆم دا لە كەم شاری ئەم جیهانەدا ئەو دیاردەیەی شاری سلێمانیم بینیوە، كە شێتـەكـانی شار بەخێوبكـرێن و یارمـەتی بدرێن و ببنـە كەرەسـەی رابواردن و دڵخۆش كردنی خەڵكی شار.

ئەم چەنـد لاپـەرەیەش كە نوسـەر بۆ باسی هەنـدێ لە شێتـەكـانی شاری تەرخان كردووە لەپاڵ ئەوەدا كە تەزوویەكی خۆشت ئەدەنێ، سەرەتای كەرەسە دۆزینەوەو دامەزراندنی هەندێ شەخسییەتیشە بۆ چیرۆك نوسەكانمان.

«ع . م . ر»

# کەڕەکان

١ ـ ڕەزا کەڕ:ماڵیان لە سەرچیمەن بوو، بانگوشیو کرێکاریی ئەکرد.
٢ ـ کەڕەی ماڵی شێخان: لە کانێسکان هاتوچۆی ماڵی شێخانی ئەکردو ئیشی بۆ ئەکردن.
٣ ـ کەڕەی ماڵی حاجی مەلا سەعید: ناوی حەمەعزیز بوو، ئێشی بۆ ماڵی حاجی مەلا سەعید ئەکرد.
٤ ـ کەڕەی شاڵی: ناوی حەمە ئەمین بوو، لە سەرچیمەن ئێشی بۆ ماڵی حاجی ئەولای مستەفابەگ ئەکرد.
٥ ـ کەڕەی قالەی شاڵی: ماڵیان لە دەرگەزێن بوو، ئیشی نەئەکرد.
٦ ـ کەڕەی شەربەت: دووکانی هەبوو لەخوار حەمامی سوورەتەوە، لەوێ شەربەتی دروست ئەکردو ئەیکردە کووپەوەو ئەیگێڕا بەناو بازاڕدا، هەر لە دوکانەکەی خۆی ئەنوست.
٧ ـ ئەحەکەڕ: کوڕی ڕەشەی سورکە بوو، ماڵیان لە مەڵکەندی بوو، ئەمە پێستە ڕێوی ئەفرۆشت. جارێك پێستە ڕێوی پێ ئەبێت ئەیگێڕێ بەناو شاردا ئەچێتە بازاڕ لای حاجی ڕەشیدی سەعیدی قادر ئاغا کە ئەوکاتە تاجر بوو هەموو جۆرە پێویستیەکی ئەکڕی وە لەگەڵ ئەحەکەڕدا معامەلە ئەکات، لەدوایی‌دا ئەحە پێ‌ی ئەڵێ: «ئەتڕی بتڕە ناتڕی حاجی برایم ئاغا ئەتڕێ».

مانای ئەوەبە ئەگەر تۆ نایکریِ ئەو ئەیکریّت. ئەمە بوو بە باو لەناو شاردا، بەسەر زمانی خەڵکەوە بوو.

٨ ـ کەرەی خەیان: ناوی ئەحەکەری خەیات بوو.

لە مەزادخانەکە لای خولەشەلی خەیات و ماڵیان لە کانێسکان بوو، ئەحە هەر کەواو سوخمەی ژنانی ئەدوری.

٩ ـ کەرەی عیّزەت بەگ: ناوی عەلی‌بەگ بوو ماڵیان لە سەرگۆل و کوڕی عیزەت بەگی وەسمان پاشا بوو.

١٠ ـ کەرەی ڕەزابەگ: ناوی ئەنوەرە، ماڵیان لەسابونکەرانە، کوڕی ڕەزابەگی قایمقامە، ئیش ناکات، ئەم کەرە هەر لە تەمەنی لاوی‌یەوە پاکو تەمیزو جل وبەرگی جوانی لەبەرئەکردو هەر خەریکی مێبازی بۆ.

١١ ـ کەرەی تەنەکەچی: ناوی صالح پیرۆت برای بلەی پیرۆتی تەنەکەچی بوو، هەر لەگەڵ ئەوا ئیشی ئەکرد. ماڵیان لە مەڵکەندی لەپشت شەخسەکەی شێخ جافرەوە بوو.

١٢ ـ کەرەی نەوت: ناوی جەمال کوڕی مام ڕەسوڵی نەوت فرۆش بوو کە ئەگەڕا بە کۆڵانانا لەگەڵ باوکیا عەرەبانەکەیان ڕائەکێشا ئێستا سائیقە لەسەر بیلدۆزەر لای میری.

# شێتەکان

١ - ئەسپەڕەش: لە زەمانی عوسمانلیدا کابرایەکی کەتەی زلی ڕەش تاڵەی شێت بووە، پێیان وتووە ئەسپەڕەش. ڕۆژێك بەردێك ئەکێشێت بە پیاوێکداو ئەیکوژێ، پیاوە ئەبەن ئەینێژن. لەپاش دا شەو جومعانەی بۆ ئەکەن و حەڵوای بۆ ئەبەخشنەوە، ئەسپەڕەش ئەچێو هیچی بەش نادەن و دەریئەکەن، ئەویش ئەیکات بە هەراو هاوار هاوار ئەڵێ سەیرکەن سەیرکەن من خۆم کوشتومەو حەڵواشم بەش نادەن.

٢ - فەرەجی پۆزێ، کارگەچیو پیاوی شێخ مەحموود بوو، لە پێش دا شێت نەبووە، هەمیشە ئەسوڕایەوە. زۆر جار جلەکانی دائەکەندو بەڕووتی ئەسوڕایەوە، تەنانەت لە زستانیش دا وایئەکرد. زۆر حەزی لە ماست کردووە، لە هەر شوێنێ ماستی بدیایە چنگی پیا ئەکرد و ئەیخوارد. ئێوارەیەك لە ماڵەوە نان ئەخوات و لێفەیەك لەگەڵ خۆی ئەبات بۆ ماڵی شێخ مەحموود لە سلێمانی شەو لەوێ ئەنوێت بە لێفەکەی خۆی، بەیانی خەبەری نابێتەوە، شێخ مەحموود ئەبینێ فەرەج نوستووە بە قاچ خەبەری ئەکاتەوە.

پێی ئەڵێ: بۆچی تائێستا نوستووی؟ هەڵسە..؟

فەرەج وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ خۆم بە نانی خۆم و لێفەی خۆم نوستوم بە نان و لیفەی تۆ نەنوستوم. ئیتر شێخ وازی لێ دێنێ.

٣ ـ ئادوو ئادوو گەڕ ئەکات: هەر ئەڕۆیشت بەڕێگاداو ئەیوت ئادوو ئادوو گەڕئەکات. خەلك هەر بەوناوەوە ئەیان ناسیو بانگیان ئەکرد.
٤ ـ مێشۆ: ناوی تۆفیق بووە، سەرباز ئەبێ لە سوپای عوسمانلیدا. کەرەتێ لە عەسکەریدا چەکی پێ ئەبێ لە کاتی شەودا لە گایەك ئەخوڕی، دیارە گا وەلام ناداتەوە یەکسەر تەقەی لێ ئەکات کە بەریئەکەوێت گاکە ئەبۆڕێنێ، ئەویش ئەڵێ: قوزەڵقورت بۆ نەت ووت من گام، لەسەر ئەمە لە عەسکەری دەری ئەکەن ئەڵێن نەك یەکێ بکوژێ وەك گاکە.
٥ ـ ئەحەی جاو: حەڵوافرۆش لەسەر سینی ئەگەڕا بە بازاڕو چاخانەکاندا، هەمیشە دەستەیەك کاغەزی قوماری پێبوو لەگەڵ خەڵك دا ئەسکەملی پێئەکرد.. پێیان ئەوت حەڵوا بە چەند؟ لە وەلام دا ئەیووت: بە لیرەیەك، ئەی چۆن خانوو دروست بکەم و چۆن ژن بهێنم... بەدەم جوێن دانەوە ئەم قسانەی ئەکرد. بەیانی کە هەڵ ئەستا ئەچوو بۆ بازاڕ ئەیووت ئەم خەڵکە بۆ شەو ئەمرن و بە ڕۆژ زیندوو ئەبنەوە؟
دیسان ئەیووت: لەکوێ جێگە هەیە ئەم هەموو خەڵکەی تیا بنوێ؟
جارجاریش گۆرانی ئەوت. کەرەتێ ئەحە لە بەر حەمامی موفتیدا ئەبێت ئافرەتێك دێتە دەرەوە لە حەمامەکە منداڵێکی پێئەبێت داوای حەڵوای لێ ئەکات.. دایکی منداڵەکەش بە ئەحە ئەڵێ حەڵوایەکی بدەرێ، ئەویش ئەڵێ بە لیرەیەك، ژنەکە ئەڵێ: چۆن بە لیرەیەك؟ مناڵەکەش هەر ئەگری حەڵواکەی ناداتێ. جارێکی تریش ئەحەی جاو ئەچێتە سەردوکانی کەریمی جاوی خوشکەزای لە قەیسەری غەفوراغا بە کەریمی خوشکەزای ئەڵێ خۆزگە بەو ساڵە کە دایکت ژنی من بوو، کەریمی خوشکەزای پێی ئەڵێ خۆ دایکم خوشکتە چۆن ئەڵێی ژنم بوو؟ پاشان ئەڵێت کەریم ڕاست ئەکەی لەبیرم چۆتەوە.
ئەحەی جاو سینییەك حەڵوای ئەکری دوو سێ دانەی بە گران بە پیاوان ئەفرۆشت تا پارەکەی دەرئەهێنایەوە، ئیتر ئەوانیتری بەخۆڕایی ئەدا بە منداڵان و ئەچوو سینییەکیتری ئەکری.
٦ ـ ڕەحەشێت: ئەم کابرایە ناوی عەبدولرەحمان بوو زستان و هاوین بە پێی پەتی ئەسوڕایەوە، لە زستان فەرەنجییەکی لەبەرئەکرد، ئەگەر یەکێ لەدواوە شەقێکی

تیٚ هەڵدایە ئەمیش کیٚ لەپیٚشەوە بوایە شەقی لەو هەڵ ئەدا.

کەرەتیٚ شەقی تیٚ هەڵ ئەدەن، ئەمیش جەندرمەیەکی تورکی لەپیٚشەوە ئەبیٚت شەقیٚکی تیٚهەڵ ئەدا، جەندرمەکە ئەیکاتە هەرا ئەیەویٚت بیبات حەپسی بکات خەڵکەکە کۆئەبنەوە پیٚی ئەڵیٚن ئەمە شیٚتە هەرچی شەقی تیٚهەڵبدا، کیٚ لەپیٚشەوە بیٚت لەو کەسە هەڵ ئەدات.. لە بەرچاوی ئەیکەنەوە ئەویش وازی لیٚ دیٚنیٚ.

٧ ـ مەلا حەسەنە شیٚتەی صابونچی: هەمیشە کۆتری لە باخەڵا بوو هەڵیٚ ئەدا کۆترەکە ئەهاتەوە ئەیخستەوە باخەڵی.

٨ ـ فەحە شیٚت: «جارچی» پیٚیان ئەوت کەریٚك بەبارەوە ون بووە... ئەویش بۆ ئەوەی پارەی بدەنیٚ ئەیوت کیٚ کەریٚکی دۆزیوەتەوە بەباریٚکەوە هەر ئەوانیش جریتان بۆ لیٚئەدا ئەمیشە تورە ئەبوو و جنیٚوی ئەدا.

٩ ـ شەریفە شیٚت: ئەیوت ئەسپەکەی شەریف وەختی جۆیەتی.. ئەسپەکەی شەریف شەریف رۆیەتی.

١٠ ـ کەریم قەلان: کە پیٚیان ئەوت کەریم قەلانیکەدەرپیٚ کـەی دائـەکـەنـد گەڵ وگونی بۆ خەڵکەکە دەرئەخست. هەموو کاتیٚك جامیٚکی پیٚبوو کە تینووی ئەبـوو ئەچـوو بۆ دەبـاشان لە کانی‌یەکە ئاوی ئەخواردەوە.. رۆژی چەند جار تینووی ببوایە هەر ئەچووەوە بۆ دەباشان.

١١ ـ جانی‌یە شیٚت: ئوتومبیلچی بوو، تابلیٚی کوریٚکی قۆز بوو رەگەزی ئەرمەنی بوو. ئەم جانی‌یە ژنیٚکی زۆر جوانی ئەبیٚت ناوی «لولو» بووە کوریٚکی مەسیحی ژنـەکەی لیٚ هەڵ گیٚرایەوە شوی بەو کرد وازی لە جانی هیٚنا... پاشان جانی شیٚت بوو. خەڵکەکەبەوە تورەیان ئەکرد جنیویان بە «لولو»ئەدا، ئەویش تورە ئەبوو جیٚگای نوستنی مزگەوت و توونی حەمامەکان بوو هەتامرد.

١٢ ـ ئەحـە سەرایلی: لەپیٚشا جەندرمەی عوسمانلی بوو، لەدوایی‌دا خووی دایە تلیاك خواردن، تیٚك ئەچـوو، بە هەرکـەسیٚ ئەگـەیشت قسەی هەلەق ومەلەقی ئەکرد: «دەمنویەی بەبەی من و قازی مراغا منو قازی چەمچەماڵ واماں وت»

هەمیشە گۆچانیٚکی بەدەستەوە بوو، ریشیشی قەڵەم ئەکرد. سوارچاکیش بوو.

١٣ ـ ئایشیٚ شیٚت: ئافرەت بوو، لە گەنجیدا جوانیش بووە. کورو کچی بووە،

پاشـان تێك چووه، لەناوشاردا ئەگەڕا، بەشەرواڵێکەوە بە پێ‌خاوسی. بەگوێزان سەری ئەتاشی، هەمیشە دارێکی بە دەستەوە بوو، لە قەراخ شار شوێنی ئەدۆزیەوە خانووی بە قوڕو بەرد دروست ئەکرد، وەك کولانەسەگ ماوەیەك تیا ئەبوو پاشان ئەی‌ڕوخان و ئەچووە شوێنێکی‌تر دروستی ئەکردەوە، بەڵام شێتیکی بێ‌دەنگ بووە.

١٤ ـ بەهێ شێت: ئافرەت بوو ئەسوڕایەوە بەناو شاردا تووڕەیان ئەکرد، بەردی ئەهاویشت، ئەچووە سەر قەسابەکان بەزۆر گۆشتی لێ‌ئەسەندن. کە ئەچووە لای قالەی عاسەی قەساب ئەی‌وت: من ژنی تۆم ئەبێ بەخێوم بکەیت. ئەم ئافرەتە کوڕێکی هەبوو.

١٥ ـ نەنەبیستی: ئەم پیرێژنە ئەقڵی سووك بوو، بەناو بازاڕدا سواڵی ئەکرد، منداڵان دوای‌ئەکەوتن، پێ‌یان ئەوت: نەنە بیستی بۆت بکەم بەسی، بۆت بکەم بە چل.. بۆت بکەم بە جل. ئەویش جنێوی ئەدا.

١٦ ـ سەعـە شێت: پێ‌یان ئەوت سەعە کاژاو، سووتا. ئەویش سێ کەڕەت ئەی‌پرسی هەر سووتا؟ دوایی لە بەر نانەواخانەکانا بەتایبەتی نانەواخانەی گوێڕەپ لە مەیدانی خوڕ بەلەدی‌یەکە پەلاماری نانی ئەدا، سێ نانی ئەفراند، ئەی‌وت: منیش سێ نان ئەبەم بۆ کاژاو سێ جار سووتا.

١٧ ـ ڕەشیدە فەنی‌یە شێتە: «ڕەشیدی حاجی برایم ئاغا» برای خاڵە مچە. ئەم کابرایە مولازم ئەووەل بووە لە زەمانی عوسمانلی‌دا لە «قاهرە» لەکاتی شەڕی تورك و فەرەنسی‌یەکـان بریـنـدار ئەبێت ئەیبـەن بۆ خەستەخانە ڕووتی ئەکەنەوە بۆئەوەی تیماری بکەن، کیسەیەك لیرەی ڕەشادی پێ‌ئەبێ لیبێ‌ی ئەسێنن و ئەی‌دزن. دوای چاك بوونەوەی ئەروانێ کیسە لیرەکەی نەماوە، لەتاوا مێشکی تێك ئەچێ. پاشان لە عەسکەری دەری‌ئەکەن، دێتەوە بۆ سلێمانی. ئەم پیاوە ئەڵێن زۆر جار بە ماتۆڕ لە سلێمانی‌یەوە چووە بۆ ئەستەموڵ، وە بە پاسکیل ئەچوو بۆ کەرکووك و ئەهاتەوە. زۆر حەزی لە ناخونەك ئەکرد. ئەچووە لای بەقاڵەکان بۆ ناخونەك. ڕۆژێك پێ‌ی ئەڵێن دایکت مردووە، بڕۆ بۆ ماڵەوە؟ ئەویش ئەڵێت ناچمەوە بۆ ماڵەوە.. ئەڵێن بۆچی؟ ئەڵێ تائێستا دایکم بووە ئێستا کە لە دایکیم دەرچووە من حەقم نییە بەسەریەوە.

ناوبراو یەکەم کەس بوو لە سلێمانی سمێڵی ئەتاشی. . جارجاریش بە پێ ئەچوو بۆ کەرکووك و ئەهاتەوە.

١٨ ـ ئەحەکەرێ: شێتێکی زۆر بێدەنگ بوو، کراسێکی درێژی شینی جاو نەبێ هیچی تری لەبەرنەئەکرد. پێی پەتی بوو، سەری رووت بوو، بەگوێزان ئەیتاشی. هەرکاتێ کە برسی ئەبوو ئەیوت: پەپە ئیتر خواردنیان ئەدایە، جارجاریش ئەگەر ژنێك تەلاق بدرایە مەلا بیوتایە ئەتوانێت بە جاش مارەی بکەنەوە ئەحە کەرێیان بۆ جاش بەکارئەهێنا. لەبەرئەوەی بێدەنگ بووەو هیچی نەزانیوە.

١٩ ـ ساله شێت: لەپێشا بە منالێ شاگرد ئاسنگەر ئەبێت. وەستاکەی لەکاتی نوستنا لیێ ئەداو تێك ئەچێ. ساله کوری سەعەی قاله دەستگێری شەربەت بوو، بە ناوبازارا لەگەڵ خۆی ئەیگێرا. ساله کراسێکی درێژی لەبەرئەکرد، جارجاریش شەرواڵی لەبەرئەکردو سەری پاك ئەتاشی زۆر جاریش سدارەی لەسەر ئەکرد، ساله کە تورەیان ئەکرد، بە دوو پەنجە ژمارەی پێنجیان بۆ دروستبکردایەو پێیان ئەوت ساله پێنج قەید ئەکات، ئیتر توورە ئەبوو و بەردی ئەهاویشت چی لە بەردەما بوایە ئەیدایە بەر شەق. دەستی خۆی ئەگەزی، ساله شێتێکی زۆر بەلا بوو،لە هەر گوزەرێکدا کە توورەیان ئەکرد هەموو دوکانەکانیان دائەخست لەترسی ساله. هەرکەسی ببینایە خۆی ناوێکی لێئەنا ئیتر هەر ئەو ناوە بوو لە بیری نەئەچووەوە.

ساله سالانی دوایی ژیانی لە شێتخانەی بەغدا بردەسەر، خەڵکی شار جارجار بە ئیجازە ئەیان هێنایەوەو ئەیان بردەوە.

٢٠ ـ فەرەجە شێت: ئەم کابرایە گۆج و شەل بوو، زمانیشی ئەیگرت. جارجار گۆرانی ئەوت بۆ منالان. ریشێکی سپیو درێژی پێوەبوو. هامشۆی مالانی ئەکرد. بە ئافرەتەکانی ئەوت: «ئاغاش خۆش بێت خانم گیان لە منیش و لەویش». زۆرجار سواری کەرێك ئەبوو بە دێهاتانەوە ئەگەرا بۆ یارمەتی.

٢١ ـ عەبە شەکەنە: ئەرۆیشت بە رێگاداو ئەیوت: عەبە نوقسانی هەیە. مانای پارەکە کەمە. یان تەنەکەیان بۆ دائەنا ئەیان وت عەبە بازئەدات، ئەویش ماوەیەکی زۆر خۆی ئەهێناو ئەبرد، ئەیوت: بەحری سوورە، لەپڕ بازی ئەدا بەسەر

تەنەکەکەدا، ئەیوت: هەر شەکەنە، زۆر جار کە پارەی پێ نەبوایە دەستی ئەکرد بە بۆرەبــۆرو گریان بۆ پارە. پێیان ئەوت ئەو پارەیەت بۆ چییە؟ ئەیوت: ئەیبەمەوە بۆ پیرۆز «کە دایکی بوو».

٢٢ ـ نۆزدەی قەڵب:

پێش شێت بوونی عەریفی پۆلیس بووە، بە ناوی «عەریف سەعید»ەوە پاشان وردە وردە شێت بووە. لەپێشا لەسەر قەیاغەکەی دوکان سینیە حەڵوای پێ‌بووە ئەیفرۆشت، چەند جار ئەم قەیاغە ئەمبەرو ئەوبەری بکردایە دانەئەبەزی، پاشان هاتــەوە ناو شار لە کونە گورگێکـدا ئەژیا، سەرو بانقی رافیدەینــەوە. هەمیشە زەمیلەیەکی پێ‌بوو شت وەکی خۆی لەگەڵ عەرەقەکەی تیابوو. بە عەرەقی ئەوت گۆشت قاز، پارەیان ئەدایە ئەیانوت: ئەوە بۆ گۆشت قازەکەت. کە تورەیان ئەکرد ئەیانوت نۆزدەی قەڵب یان نۆزدەی هار ئەویش جنێوی‌ئەدا ئەیوت دایکتان واو باوکتان واو

کێری هەرچی تەیارەچیەکانی لەندەن هەیە بە «........».

٢٣ ـ ئاڵتوونی گاور: پێیان ئەوت ئەوساویلێ، بەمە تورە ئەبوو. ئەم شێتە گۆرەوی بەنی ئەفرۆشت، لە گەرەکی گاوران بۆیان دروست ئەکرد... ئەیهێنا بۆ ناوبازار ئەیدا بە شانیا. ئەم کابرایە زۆرترین کاتی لە کەلاوەکانی گاوران بوو. منداڵان لێی کۆئەبوونەوە بە ئەوسایلێ تورەیان ئەکرد.

٢٤ ـ مەلا فایەق: ئەم کابرایەش تێکچونەکەی وەهابوو بەهاران بە شەوو بە رۆژ ئەچوو بۆ سەرقەبران. هەروەها هاتوچۆی ماڵانی ئەکرد، هەموو جارێك خۆی بە خۆی ئەوت باینجان و تەماتە.. ئەم شێتی‌یەی من هەڵاتە. لە ساڵی ١٩٨٢ بوو بەژێر ئوتومبێلەوە لە خەستەخانە مرد. لە قسەکانی:

باینجان و تەماتە ـ شێتی‌یەکەی من هەڵاتە

باینجان شێتی کردم ـ عەقل و شعوری بردم.

٢٥ ـ بە هادین برای مەلافایەق: قوتابی بوو، لە پۆلی پێنجی عیلمی‌دا شێت بوو کاغەزو چیلکەی کۆئەکردەوە، ئەیکردە تورەکەیەکەوە ئەیدا بەشانیا. جگەرەیەکی ئەکرد بە پەئاگوێیا جاروبار وتاری ئەخوێندەوە بەئینگلیزی‌و عەرەبی.

٢٦ ـ خولــە بووز: شێتێکی زۆر بەســەزمـان بوو، کە ئەرۆیشت بە رێگـادا

لەبەرخۆیەوە قسەی ئەکرد. جنێوەکەشی ئەی‌وت «میف» مانای «حیز». ئێواران کە ئەڕۆیشتەوە فەقیانەکانی پڕئەکرد لە شت ئەی‌بردەوە بۆ دایکی. خولەکێ لە بەردەمیەوە بڕۆیشتایە بزێکی پێوە ئەکرد. کە قۆڵیت ئەگرت ئەی‌وت:

ئەی ئەی بەرمە خنکام. لە ساڵی ١٩٧٤دا شەو هاتبووە دەرەوە بۆ سەر ئاو لە گەڕەکی مەڵکەندی گوللەیەکی وێڵ ئەی‌پێکێ و ئەمرێ.

٢٧ ـ ئەلە شێت یان ئەلە دۆم:

منالآن تورەیان ئەکرد بە «ئەلەفیش» جنێوی‌ئەداو بەردی تێ‌ئەگرتن. کە قسەی ئەکرد لیك بە دەمیا ئەهاتە خوارێ، چارۆکەیەکی پێ‌بوو پەڕۆکۆنی کۆئەکردەوە ئەی‌برد بۆ دۆمەکان بۆ ژێری کلاش. ئەلەشێت جاروبار بۆ مەسەلەی «جاش» بەکاریان ئەهێنا.. پاشان لێ‌یان ئەپرسی ئەلە خۆش بو؟ چیت کرد؟ ئەی‌وت: بردمیانە حەمام تا بەیانی دوو سێ‌یەکم «.......» ئەمەندە خۆش بوو ئەمەندە خۆش بوو. ئەلەکە گۆرانی ئەوت: «وەی وەی باوانم لەیلی... کوشتەی چاوەکەی تۆم بۆ وا بێ‌مەیلی»ی.

٢٨ ـ حەمەی حەماڵ: شێتێکی زۆر هەژارە کە قسەئەکات بە خاوو خلیچکی ئەدوێ، لیك بەدەمیا دێتە خوارەوە هەمیشە گوێنی‌یەك ئەدا بەشانیا بۆ حەماڵی... خەڵك وردە ئیشی سووکی پێ‌ئەکەن و یارمەتی ئەدەن. زۆربەی کات بە پێ‌ی پەتی ئەسووڕێتەوە. جاروبار سمێڵی ئەتاشێ ئێستاش لەژیاندایە.

٢٩ ـ نامیقە شێت: لە عەسکەریدا برین پێچ بوو، عەریفیش بووە.. کە لە عەسکەری دەرچوو کەوتە سەموون فرۆشتن... وردە وردە تێك چوو و کەوتە جنێو دان و کفرکردن. کە خەلك تورەیان ئەکرد ئەیان وت نامق ئەڵێن خزمەکانت یارمەتیت ئەدەن.. ئەمیش بەوە توورە ئەبوو، جنێوی ئەداو کفری دنیای ئەکرد. رۆژێك بەیانی زوو دێتە دەرەوە سەربازێك تەقەی لێ‌ئەکا قاچی بریندار ئەبێ، ئیتر لەوساوە بە دارشەق ئەڕۆیشت تا ئەوکاتەی کە بەیانیەك ئەچن ئەبینن لە ژوورەکەیا ڕەق بۆتەوەو مردووە.

٣٠ ـ قالەی تەقی: شێتی ئەم کوڕە زکماکی‌یە، زمانی کەمێك لاڵە خەڵك یارمەتی‌ئەدەن چونکە شێتێکی فەقیرە. پێ‌ی ئەڵێن: قالە لەم شۆستەیەوە باز بدەرە سەر جادەکە.. لە وەڵاما ئەڵێت ناوێرم ئەخنکێم... ناوی خەڵکی زوربەی

شارەکە ئەزانێ بەتایبەتی ئەوانەی پرسیاریان لێ ئەکرد.

* * *



● مەلا فایەق



● قالەی تەقی



● وەهابە کەچەڵ



● سالە شێت لە شێتخانەدا



● حەمەی حەماڵ



● عەبە شەکەنە



● فەرەجە گۆج




● نۆزدەی قەڵب



● خولە بوز



● بەهادینە شێت

# کوری ئازاو شەڕە گەڕەك[1]

ناوی ئەو کوڕە ئازایانەی کە لە کاتی خۆیدا لە گەنجیەتیدا لە گەڕەکەکاندا خۆیان بە کوڕی گەڕەك داناوە، وە ناویان هەبووە لە گەڕەك و ناوشاردا ئەم کوڕانە شتی خراپیان قبوڵ نەکردووە، لەسەر ناهەقی ئینسانی بێدەسەڵات هەڵیان داوەتێو لە گرتن و بەندیخانە نەترساون لەگەڵ ئەوەش دا ڕێزی خەڵکیان گرتووە بەتایبەتی پیاوی بەتەمەن. . ئەم کوڕانە ناویان دەرکردبوو، هەندێکیشیان لە شەڕە دەمانچەو هەندێکیان لەشەڕە خەنجەردا، هەندێکیشیان لەشەڕە گەڕەکا بە شەڕەقۆچەقانی و شەڕە کوتەك و تێلا، پێش کوڕانی گەڕەك کەوتوون. . هەندێکیان لە کاتی خۆیدا گەورەی گەڕەك بوون و کوڕی گەڕەك ڕێزیان لێگرتووە. . . ئەو فەرمانی بۆ دەرکردوون وە زۆر جاریش نەیان هێشتووە بێتەکوڕی شەڕەوە.

ئەگەر دوو کوڕیئەووەختە لەسەر شتێکی لێیان ببوایە بە شەڕ، ئەبوایە هەردوکیان ناویان بوایەو شەڕکەر بونایە، ئەگینا پێیان ناشیرین بووە بچن بەگژ ئینسانی بێدەسەڵاتا وە ئەوەی خۆی بە کوڕ بزانیایە نەئەچون گەلەکۆمەکی لە یەکێ یان دووکەس بکەن.

ئەم شەڕەگەڕەکە تا ساڵی ١٩٥٠ بەردەوام بوو ئیتر باوی نەما بەهۆی جوڵانەوەی نیشتمانیو خوێندەواریەوە، بەڵام هیچ کاتێك کوڕی ئازا لەم شارە نەبڕاوەو نابڕێت. . ئێمەش ناوی ئەو کوڕە ئازایانە ئەنووسین تا ساڵی ١٩٥٠ز کە تا ئەوکاتە شەڕەگەڕەك باو بووە ناویان هەبووە. .

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

«١» چەند فلیمێکی میسریم دیوە کە پەردەی ڕۆژانی «فتوەی گەڕەك» ئەگێڕنەوە کە هەر لە بەزمی شەڕەگەڕەکی خۆمان ئەچێت. بێگومان تازە نابێ شەڕەگەڕەك پەسەند بکەین، بەڵام ئەو باسە کەرەسەیەکی باشی بۆ نووسەران تێدایە، کە لەڕێی نەخشەکێشانی شەڕەگەڕەکی ئەو سەردەمەوە بەرامبەر بەدیمەنی ناپەسەندی دووبەرەکی ئەمڕۆ بووەستن و ئازایەتی بەرەو ڕێبازی سوودمەندی خۆی بەرن.

«ع . م . ر»

# چۆن شەڕە گەڕەك دروست ئەبوو؟

زۆر جاری‌وا بووە لەنێوان لاوانی دوگەڕەکی شارێکدا شەڕە گەڕەك لەسەر ناخۆشی‌و تێکچونێکی سادەی بێ‌مانا دامەزراوەو کراوە بە خۆبادان، بەفیزەوە هاتوچۆکردن بە کۆلانانی . گەڕەکێکی ترداو پلارو توانج گرتن لە کیژۆ لەکانیان هاتەچۆیەکی نالەبارو پشاندانی ڕەوشت و خویەکی ناشیرین بەرامبەر بە گەنجانی گەڕەکێکی‌تر. . . بە زۆرەملێ خۆنواندن و شەڕکردن لەگەڵ یەکێك لە دانیشتووانی ئەو گەڕەکە کە بۆتە هۆی لەیەکتردان.

ئەم هەموو هۆیانە بونەتە هۆی پەیدابوونی «ناخۆشی‌و دوژمنایەتی» لەنێوان لاوانی ئەو دوو گەڕەکەدا. بۆ تۆڵەکردنەوەی هاورێکانیان وەلامیان . یەکتری گێڕاوەتەوە کە شەڕە گەڕەك بکەن. ئینجا بۆ ئەم مەبەستە شوێن و کات و ساتیان بڕیارداوە، جۆری شەڕە گەڕەکەکەشیان ناو نووس کردووە وەکو: شەڕەگەڕەك بە قۆچە قانی یان بە دارو تێلا یان بە چەقۆو خەنجەرو دەمانچەو تەورزین.

پاش ئەوەی لاوانی ئازاو یەکی‌یەکی‌و کەڵەکەڵەی هەردوو گەڕەکەکە بڕیاریان لەسەر شەڕەکەو جۆرکەی‌دا ئەوسا لە ڕۆژو کات و ساتی خۆی‌دا لەشوێن شەڕەکە بەرامبەر بە یەك بەدووری «١٠٠ ـ ٢٠٠» گەز زیاتر ڕائەوستان زۆرجاری وابووە چەند گەڕەکێکی‌تر یارمەتی گەڕەکە شەڕ کەرەکان ئەدەن. هەڵمەت دەر لەپێشەوەبووە یارمەتی‌دەری یەکەم یارمەتی بەشی سێیەم کە ئەم یارمەتی‌دەرانە بۆ کاتی تەنگانەو شکاندنی لایەکیان یارمەتی ئەدەن. ئەگەر شەڕەکە شەڕەقۆچەقانی[١] بوایە دوو تیپەکە بە قۆچەقانی‌یەکانیان یەکتری‌یان بەر بەرد ئەدا، ئینجا ئەو بەردانە یان بەر سەریان ئەکەوت ویان بەر دەست و قۆڵ و قاچ و ئەیان شکاندن. جاری‌وا هەبووە بەر چاویان ئەکەوت کوێری ئەکردن یان بەر دڵیان ئەکەوت یەکسەرئەمردن. لەکاتێکدا گەڕەکێکیان زۆری بۆ بهاتایەو گەڕەکەکەی‌تر بیان شکاندایە یارمەتی دەرەکانیان ئەهاتن بەدەنگیانەوە لەسەریان ئەکردنەوە، ئینجا شەڕەکە لەنێوانیان دا گەرم ئەبوو لەئەنجام دا ئەبوو بە شەڕەکوتەك و[٢] چەقۆو خەنجەرو تەورزین[٣] و دەمانچە. بەمە چەندان لاوی بێ‌گوناهـ لەناو ئەچوون یان کەفتەکار ئەبوون.

زۆر جاری‌وا بووه شەڕەکـەیان سێ تا چوار سەعابت درێژەی ئەکێشا تاوەکو گەڕەکێکیان بەتەواوەتی ئەشکاندو ڕاویان ئەنان، ئەوسا پیاوماقووڵ و عاقڵەکانیان ئەکەوتنە ناوبژی کردنیانەوەو ئاشتیان ئەکردنەوە ئەوجا کۆتایی‌یان بە شەڕەکە ئەهێنا.

## تێ بینی :

١ ـ بۆ کۆکردنەوەی لاوە شەڕکەرەکانی گەڕەکەکە وە یان بۆ سەیرکردنی «منالآنی گەڕەکەکە» سەر لە ئێوارە پاش نان خوارن کە دنیا نەختێك تاریك ئەبوو لە ماڵ ئەهاتنە دەرەوە وە لە کۆڵان هاواریان ئەکرد: منالّی گەڕەك، سەر بنە خەڕەك، وەرنە دەرێ بۆ شەڕەگەڕەك.
٢ ـ ئەو دوو گەڕەکەی کە لەگەڵ یەکتری‌دا دوژمن بونایە نەیان ئەهێشت بە گەڕەکی یەکـتری‌دا تیپەڕ ببن و پیایدا بڕۆن بۆدەرەوە بۆ «گەشت و سەیران» ڕێگایان پێ ئەگـرتن و لە سەربانـەکـانیان بۆیان دائـەنیشتن لە «سـەنگـەر» بەردو پلاریان تێ ئـەگـرتن و بەر دەمـانچـەشیان ئەدان، گەڕەکەکەی‌تریش بەرەنگاریان ئەبوون شەڕێکی گەورە لەنێوانیان دا بەرپائەبووەوو ئەبووە هۆی کوشتنی زۆریان.
٣ ـ بەڵام ئێستـا ئەم چەشنـە شەڕانـە نەمـاوە، مندـاڵ و گەنجـەکـانـمان باش پەروەردەکراون و هۆشیارن خەریکی خوێندن یان کاسبی‌کردنن.

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

١ ـ قۆچەقانی: لە بەنی سەوزو سوور دووستکراوە، ناوەکەی نەختێك پان چنراوە، دوو کلکی درێژی هەبوو.

٢ ـ کوتەك: دارێکی قایمی سەر خڕی پتەوە.

٣ ـ تەورزین: پارچە ئاسنێکی دەم تیژە لە وێنەی داس دا کراوە بە سەری دارێکەوە.

# ناوی کوڕە ئازاکان گەڕەك بە گەڕەك

## «گەڕەکی مەڵکەندی»

١ ـ تۆفیق ئاغای حەسەن ئاغا .
٢ ـ خولەی حەسەن ئاغا: برا بوون، قەتاری وڵاخیان هەبوو.
٣ ـ مەجیدی قالەی حەمامچی ـ توتنچی .
٤ ـ محەی سالە سوور ـ توتنچی .
٥ ـ ئەحلان چاوشین ـ عەلاف .
٦ ـ عارفی صاڵحی ڕەشە ـ ڕیخۆڵەچی .
٧ ـ ئەلە گون سووتاو ـ چایچی لە شەڕی بەردەرکی سەرادا شەهید کرا .
٨ ـ عەلی سەرسوور ـ کەوش دروو.
٩ ـ ئەمینە خێل ـ کەوش دروو.
١٠ ـ قالەی مەحموود ئاغا ـ موختاری گەڕەك .
١١ ـ پەتولی شانەگەر ـ پۆستەچی زەمانی تورك .
١٢ ـ ڕەشەی خلەی بلە ـ چاوشی ئیشغال .
١٣ ـ نووری عەلی‌ی قادر چاوش ـ دەلاك .
١٤ ـ ئەحەی عەزەی هەمزە ـ ئاسنگەر.
١٥ ـ حسێنی توفیقی حەمەخێل ـ بەردکێش و بەفرکێش .
١٦ ـ ڕەشەی کاکە ـ بەردکێش و بەفرکێش .

١٧ ـ مچەی حەمەبۆر ـ دارتاش.
١٨ ـ حەمەڕەشی خاتوون ـ جگەرچی.
١٩ ـ تۆفیقی عەلیی چایچی ـ چایچی.
٢٠ ـ ئەحەی عەبدوللا ـ بەقاڵ.
٢١ ـ کەریم دار سەلیم ـ دارتاش.
٢٢ ـ تۆفیقە گەڕە ـ جگەرچی.
٢٣ ـ عەول کەریم خەرابەیی ـ بەقاڵ.
٢٤ ـ کەریمی قالەی قجول ـ بازرگان.
٢٥ ـ ئاغای حەسەن قەرەنی ـ عەللاف، له بۆردومانەکە بەرکەوت.
٢٦ ـ عەلی حەسەنی قەرەنی ـ عەللاف.
٢٧ ـ کەریمی حەسەنی قەرەنی ـ ئەفسەر، ئاغاو عەلیو کەریم برابوون.
٢٨ ـ عەلیدەدە ـ توتنچی.
٢٩ ـ حەمەعەلی قالەی حەمامچی.
٣٠ ـ عوسمانی تۆفیقی حەسەن ئاغا ـ قوتابی.
٣١ ـ قالەی حەمەوبەگ ـ قوتابی.

## گەڕەکی گۆیژە:

١ ـ کەریمی هەیەر ـ قەساب.
٢ ـ حەمە گورگە بۆر ـ مزگەر.
٣ ـ تۆفیق تریشقە ـ کۆپاندروو.
٤ ـ محەمەدی حاجی مەلا سەعید ـ مەلاك.
٥ ـ وەستا سەعیی وەستا حەسەن ـ بەنا.
٦ ـ سەید ئیبراهیم ـ بەقاڵ.
٧ ـ ئەحمەدی سەعەی فەتاح ـ بەلێندەری قەسابخانە.
٨ ـ خولەی شێخ قادر ـ خەیات.
٩ ـ بلەی ڕەسوڵ ـ چایچی.

١٠ - عەزەی سەعی چاوەش، عەزە کەچەڵ - خەیات، ئەمە لە شەڕەگەڕەکێکدا گوێژەو دەرگەزێن بوون بە یەك لەدژی سەرشەقام و چوارباخ «ئاغالیە» کێرە سەرشەقامی بە دەمانچە کوشتی.
١١ - محەی قرگەیی - جامبازی وڵاخ.
١٢ - صادقی سەڕاج - سەڕاج.
١٣ - مەولودە درێژ - تەنەکەچی.
١٤ - عەبەی قالەی مارفەرەش - چاوەشی ئیشغال.
١٥ - حەمەی عەلی‌ی وەستا حەبیب - بەنا.
١٦ - تۆفیق حەسەنە قوچ - قاچاخچی دەمانچە.
١٧ - ئەحمەدی حەسەن - تەنەکەچی، برابوون.
١٨ - حەمەی مامە - چاوەشی ئیشغال.
١٩ - حەمکوڵی کەریمی هەیەر - قەساب.
٢٠ - ئەحە نەبەرد - هەلاج.
٢١ - قالەی ساڵحە فەنی - چاوەشی ئیشغال.
٢٢ - ڕەمزی قەزاز - خاوەنی سینەمای سەلاحەدین.
٢٣ - کەمال عەلی‌ی قەزاز - نائیب زابت.
٢٤ - قالەی بلە شێخە - عەللاف.
٢٥ - کەریمی سۆفی ساڵح - برنج فرۆش.
٢٦ - قالە بابی - سابونچی.
٢٧ - نوری‌ی ئەحمەد بەگ - قوتابی.
٢٨ - تایەری ئەحمەدبەگ - قوتابی.
٢٩ - حەمە گەلیین - قوتابی.
٣٠ - قالە سوری گەورە - ئوتومبیلچی.
٣١ - عارفە شێتی قەزاز - کاسبی سەرپێیی.

## گەڕەکی دەرگەزێن

١ - غەفووری زارا - سەڕاج.
٢ - عەولەسیس - چایچی، لە شەڕی بەردەکی سەرادا شەهید کرا.

٣ ـ فەتاحی سەعە گۆج] سەرەك پاسەوان.

٤ ـ ئەنۆلی سەعە گۆج] خەیات.

٥ ـ ئەوڕەحمانی خامە ـ ئاسنگەر.

٦ ـ مەجۆلی خامە ـ چایچی.

٧ ـ سالەی ئاغا نورە ـ قۆڵچی مالیە.

٨ ـ محەکەری وەنەوش ـ لێفە فرۆش.

٩ ـ عارف جوکل ـ چایچی.

١٠ ـ حاجی عەلی ـ ئەلەکەچەڵ ـ چاوەشی ئیشغال لە شەڕی بەردەرکی سەرادا بریندارکرا.

١١ ـ حەمە خورشە ـ باجگر.

١٢ ـ قالەی عەبە نەوتە ـ باجگر.

١٣ ـ ئەحەسیس ـ خەیات.

١٤ ـ ئەحە تێلا ـ دارتاش.

١٥ ـ مچەسیس ـ خەیات.

١٦ ـ سالەی حەبەخان ـ کەوش دروو.

١٧ ـ سەغەی ئەحمەدکۆیی ـ کەوش دروو.

١٨ ـ عەلی ئەوڕەحمانی خامە ـ ئاسنگەر.

١٩ ـ عەلی ئەحەی ئەمین ـ کاسب.

٢٠ ـ نوری‌ی ئەحمەدی تەها ـ قوتابی.

٢١ ـ عەتای کاکەحەمە ـ قوتابی.

٢٢ ـ حەسەنی ڕەزابەگ ـ قوتابی.

٢٣ ـ عومەری محەی قازی ـ قوتابی.

٢٤ ـ مەولووی ڕەسول ـ چایچی.

٢٥ ـ سەعەی ئەحەی ڕێحان ـ باخەوان.

٢٦ ـ حسەڕەش ـ خەیات.

## گەڕەکی سەرشەقام و چوارباخ

١ ـ کەریمی کاکەڕەش ـ عەللاف «گەورەی گەڕەك» ئەم زاتە ساڵی ١٩١٨ لە گرانی

گەورەکەدا دەرگای لەسەر خۆیو خێزانی داخست **پیی ناشیرین بوو داوای نان له** خەڵك بکات نەهاتەدەرێ تاهەموو لەبرسان دا مردن.

٢ ـ ئەحەی قەفەز ـ کەوەرفرۆش.

٣ ـ عەبەی خەجێ ـ کەوەرفرۆش.

٤ ـ ئاغالیه کوێره ـ چراچی.

پێش ئەوەی ئەلــەکتریك «کــارەبــا» بێتــه سلێمانی ئێواران چراکـانی به شاپلێتـه دائەگیرسان. موچەخۆری بەلەدیه بوو. له شەرەگەرەکدا به دەمانچه عەزەی سەعەی چاوش ساتبونکەرانی ئەکوژێ.

٥ ـ عەزەی مەمەند ـ دەباغچی.

٦ ـ فەتاحه سوور ـ قەساب.

٧ ـ کەریمی کاکەزاڵ ـ باشچاوەشی جەندرمەی سوارەی عوسمانلی.

٨ ـ مەحموودی قادر غەزال ـ جەندرمەی سوارەی عوسمانلی.

٩ ـ کوردەی ئەحه چاوشین ـ کرێکار.

١٠ ـ حەمەڕەشی خاتوون ـ نانەوا.

١١ ـ عارف ڕەزای کاکەیی ـ چایچی.

١٢ ـ فەتاح بەگی سەڕاج ـ سەڕاج

١٣ ـ سەعەی داود ـ قەتارچی «خاوەن کەمەن».

١٤ ـ حەمه نەجمی حاجی وەسمان قەتارچی «خاوەن کەمەن».

١٥ ـ ئەحەی سۆفی ـ قۆڵچی گومرگ.

١٦ ـ کەریمی حەمەی شەمسه ـ قۆڵچی گومرگ.

١٧ ـ حەمه کوردە ـ مزگەر.

١٨ ـ حسین ئەسعەد ـ بارچاوەش.

١٩ ـ حەمه قادر ـ چایچی.

٢٠ ـ ئەحەی ئەمین ـ حەماڵی گومرگ.

٢١ ـ نامیق ئاغای مستەفا ئاغا ـ قەڵەم چی.

٢٢ ـ حەمه نوری ڕیحان ـ جامبازی وڵاخ.

٢٣ ـ ڕەشەی بەکر ـ خەیات.

٢٤ ـ عوسه ڕەش ـ چاودێر له شارەوانی.

٢٥ ـ حەمەئەمین سۆفی ـ چاودێر له شارەوانی.

٢٦ ـ حەمەی عارفی زبە ـ قۆڵچی گومرگ.
٢٧ ـ ئەحەی مارفە ڕیچە ـ نانەوا.
٢٨ ـ وسەینەلی ـ دەسگێر.
٢٩ ـ فەیزەی باجی ئیساف ـ نانەوا.
٣٠ ـ مەلای خەیاڵ «کوێر بووە» ـ کاسبی سەرڕێیی.
٣١ ـ قەجەری ـ سیوجگەرچی.
٢٢ ـ حەمەی بلە باڵ پان.

## گەڕەکی کانیئاسکان

١ ـ سەعەی بەرغەش ـ قەساب.
٢ ـ تۆفیق عەنتەر ـ حەکیم.
٣ ـ ڕەفیقی گلە ـ کەوش دروو.
٤ ـ قالەی نوعمان ـ قەساب.
٥ ـ ئەحەی بەکر ـ قەساب.
٦ ـ مەجیی بەکر ـ قەساب.
٧ ـ ساڵح سك ڕەق ـ قەساب.
٨ ـ حەمە سك ڕەق ـ قەساب.
٩ ـ تۆفیق صالح «تۆفیقە» ـ کەبابچی.
١٠ ـ کەریمی حاجی ڕەسووڵ ـ چایچی
١١ ـ ڕەشەی دایانەکە ـ کەوش دروو.
١٢ ـ فەرەج کوردی ـ بەقاڵی میوە.
١٣ ـ حەمەی سەکینە ـ چایچی.
١٤ ـ ئەحەڕەشی شیرگەر، شیرگەر «لە شەڕی بەردەرکی سەرادا شەهید کراوە».
١٥ ـ سەعەشەڵ ـ بۆیەچی.
١٦ ـ حەمەی قالەی ئاغال، برای سەعەشەل، پانیبەرزدروو «لە شەڕی بەردەرکی سەرادا شەهیدکراوە»

١٧ ـ قالەی مەلا کەرە ـ چایچی .

١٨ ـ عەزەی مەلا سەعید ـ کەوش دروو

١٩ ـ حەمەی مەلا سەعید ـ برا بوون، کەوش دروو.

٢٠ ـ عەلی ئەحەی شەرەف «تەڕەزان» ـ کاسبی دەسگێڕ.

٢١ ـ عەبە پشی ـ کاسبی سەرپێ‌یی .

٢٢ ـ کوردەی فەتاح باوەمردەیی ـ بێ‌ئیش .

٢٣ ـ ڕەزا حەمەعەلی ژاڵەیی ـ چایچی لە حامیە .

٢٤ ـ ئەولای سەعەی جاف ـ بێ‌ئیش .

٢٥ ـ سالەی ئەحەی خولە ـ چایچی .

٢٦ ـ عارف قەرەچەتانی ـ کوتاڵ فرۆش .

٢٧ ـ عومەری سەعەی بەرغەش ـ باجگر.

٢٨ ـ عومەری عە بەی مەنیج ـ جگەرچی .

٢٩ ـ ئەحەی حەمدی ـ موچەخۆر لە مەلاریا .

٣٠ ئەحمەی تالەی شاسوار ـ خەیات

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

تێبینی : ئەو ناوانەی لەو گەڕەکانەدا ناویان براوە مەرج نەبووە هەموو بەشداریی شەڕەگەڕەکیان کردبێت، بەڵام لەبەرئەوەی بە کوڕی ئازای گەڕەکی ئەوکاتە ئەژمێر رین بۆیە ناومان بردون .

* * *

**[١]حەمە گورگەبۆر: لەسەفەر بەردا لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازی خەڵکی سلێمانی و دەورو بەری لە ئەستەمبوڵەوە هەڵدێن لەشام ئەگیرسێنەوە بەومە بەستەی لەورێگایەوە بینەوە خاکی کوردستان و خزمەتی بێگانە نەکەن بەڵام بەداخەوە لەوێ ئەگیرێن وئەوەی بەردەست ئەکەوێ لەوێ لە سێدارەیان ئەدەن .**

**« نووسەر»**

## ياخی‌بوه‌كانی ده‌وروپشتی سلێمانی

ئه‌وانـه‌ی له كۆن دا له میری یاخی‌ئه‌بوون به‌رامبه‌ری ئه‌وه‌ستان و شه‌ڕیان له‌گه‌ڵ ئه‌كردو زه‌ره‌یان پێ ئه‌گه‌یاند، پێ‌یان ئه‌وتن چه‌ته . .

زۆربـه‌ی ئه‌مانه له ده‌ست عه‌سكه‌ری ڕایان ئه‌كردو له‌گه‌ڵ ڕژێم تێك ئه‌چوون و به‌ره‌نگاری‌یان ئه‌كرد، هه‌روه‌ها هه‌ندێكی تریان خۆیان به كوڕی ئازا زانیوه گوێ‌یان نه‌داوه‌ته گرتن و كوشتن وه زۆر له پیاوه ده‌سته‌ڵات داره‌كانی ده‌ره‌وه‌ش پشتگیری‌یان كردوون وه‌كـو ئاغـاو شێخـه‌كـان و داڵده‌یان داون، ئه‌مانه هه‌ریه‌كه له ناوچه‌یه‌كدا توانیویانه به‌ره‌نگاریی هێزێكی تایبه‌تی میری بكه‌ن به‌تایبه‌تی له‌و ناوچانه‌دا كه خۆیان شاره‌زایی ته‌واویان تیا هه‌بووه .

له‌وكه‌سانه‌ی كه‌زۆر دیار بوون وه‌كو ئاشكرایه‌و پیاوی شاره‌زا ئه‌یگێڕنه‌وه ئه‌مانه‌ی خواره‌وه بوون :

١ ـ ناله پێ‌پان : له ساڵی ١٩٠٩ی زایینی‌دا تابوری عه‌سكه‌ری تورك له‌كه‌ركووكه‌وه دێن بۆ سلێمانی ، له ڕێگا له ده‌ربه‌ندی بازیان عه‌شیره‌تی هه‌مه‌وه‌ند بۆیان دائه‌نیشن وه ژمـاره‌یه‌كی زۆریان لێ ئه‌كـوژن ته‌نـانه‌ت له‌دوایی‌دا خه‌ڵكی سلێمانی ئه‌م تابوره‌یان ناونابوو تابووری گوێ‌براو، چونكه زۆربه‌ی زۆریان گوێچكه‌یان برابوو هه‌ر له‌وساڵه‌دا له سلێمانی دیوانی عورفی ته‌شكیل كراوه ئه‌و فه‌وجـه عه‌سكه‌ره‌ی له سلێمانی هه‌بوو كه‌وته ته‌عقیبی هه‌مه‌وه‌نده‌كان وه له‌وه‌دا ناله پێ‌پان گیرا له‌گه‌ڵ كه‌ریم به‌گی فه‌تاح به‌گ

وچەند کەسێکی تروە لەدوایی دا واتە لە ساڵی ١٩١٠ی زاینیدا حوکمی خنکاندن درا بەسەر نالە پێ‌پان دا. لە بەردەرکی سەرادا کرا بە پەتا وەکو ئەیگێڕنەوە زۆر بەئازایانە خۆی چوّتـە بەردەمی سێدارەکـەو چوّتە سەر کورسی یەکەو پێش ئەوەی کورسی یەکە لابرێت لەلایەن جەندرمەکانەوە نالە پێ‌پان خۆی شەق لە کورسی یەکەی ژێری هەڵ ئەدات و ئەخنکێت، هەروەها ئەوانەی لەگەڵ نالەدا گیرابوون بەئێجگاری نەفی کران.

نالە پێ‌پان کوڕێکی لەپاش بەجێ‌ما ناوی حەسەن بوو پۆلیسی سوارە بوو ژنەکەی نالەش ناوی خەجێ بوو دوای نالە شووی کردەوە بە سەعەی قالە کە باوکی سالەشێتەو سالەی لەو بوو.

٢ ـ شەریف ڕەننان: لە ناوچەی بازیان و چەمچەماڵ.

**٣ ـ مەجید شانە شینی: ناوچەی بازیان**

٤ـ حەمەتاڵ: ناوچەی پێنجوین و بانە.

٥ ـ سەید عەتا: ناوچەی شارباژێڕو پێنجوین.

٦ ـ خولە قەویلەیی ناوچەی شارباژێڕو پێنجوین.

٧ ـ خولەپیزەو دەستەو هاوڕێکانی:

ناوچەی شارباژێڕو پێنجوین و ئێران.

ئەو هەواڵەی خوارەوە کە لە کاتی خۆیدا لە ڕۆژنامەی «ژین»دا میری بڵاوی کردوّتەوە ئێمەش بۆیە ئەینووسینەوە چونکە کات و ساتی دروست بوونی ئەم کۆمەڵەو مێژووی ڕوداوی ئەو بەسەرهاتانەی تیایە لە سەرەتاوە تا کۆتایی یان، ئێمەش دوای ئەوەی چەنـد ساڵـە بەدوای ڕاستی و زانیاری ئەو کۆمـەڵـە کە کۆمان کردوّتەوە ئەیخەینە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست.

لە ڕۆژنامەی ژین ژمارە ١٢٥١ ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٥٥/٦/٢٠:

دەستە چەتەکانی خولەپیزە دوای پانزە ساڵ چۆن لە بنەڕەت دووایيان هات..؟

بەیانی ئەم سێ‌شەمووی ڕابوردو لەپێشا بەمقۆمقۆ لەدوایی‌دا بەئاشکرا وە لەپڕ لە هەمووولایەکەوە بڵاوبووەوە کە تالە پیزەو دەستەو تاقمەکەی کوژران و ئێمەش دوایی لە سەرچاوەیەکی ڕەسمی و ڕاستەوە چۆنێتی کارەساتەکەمان زانی لێرەش هێندێکیان چۆن بە چاوی خۆمان دی وا بەکورتی لەسەر داوای خوێندەوەرانی خۆشەویست ئەیخەینە بەرچاو تا ژمارەیەکی تر ئەوسا دوورودرێژ باسی ئەم کۆمەڵە چۆن پەیدا بوون وە حیاز کرد؟ وە چۆن دوايیان هات بەوێنەو نیگارەوە پیشانتان ئەدەین.

لەم چەنـد ساڵەی دوایی‌دا تاله پیزەو براکانی‌تری‌و دەستەو تاقمەکەیان بەتەواوی ناوچەی شارباژێریان تێك دابوو وە بەو ڕەحمەیان نەزانی میری لەگەڵیان کردن، عەزەی مینەڕەشی مامیان چووە کەمەکیان هەر بەئێجگاری شوڵیان لێ هەڵکێشابوو، ئەوەبوو کاربـەدەستان بەتایبەتی لەم دوایی‌یەدا کەوتنە خۆ بۆ دوایی پێ‌هێنانی ئەمە. . چەند مانگێك لەمـەوبـەر دیسـان فرسەتێکی تریان دانێ کە بێنەوە سەر ڕێ بەڵام نەچوو بەگـوێیانـا، ئەوە بوو ئەوساکە لە پەلامارێکا کە برایە سەریان بۆرەی برای تالە کوژراو چەند کەسێکیان لێ گیراوە ئیتر دوای ئەوە بەتایبەتی ئەمە مانگێکە کاربەدەستان هەموو تەرتیبێکیان کرد بۆ گرتن یا بەدەست گرتن یا کوشتنیان، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر تەنگیان پێ چنراو کران بەودیو ئێرانا وە بۆئەوێ شوێنیان کەوتن تا هێزانەوە ئەم دیو ئینجا ئەم بەیانە ڕەسمی‌یەی کە لەخوارەوەیە دەکرا:

وە یارمەتی ئەهالی‌و هێزی حکومەت ڕێك خرا وە دووشەمموی ڕابوردوو کە لە ئێرانەوە هاتنەوە ئەم دیو بۆ شاخی «زاخە» هەموو چواردەورو کەل و قوژبنێکیان لێ گیرا. وە ئەو بەیانەشیان دەست خرا ئینجا خۆیان کە هەشت کەس بوون بە تەئسیری ئەم تەرتیباتەو ئەو بەیانە بوون بە دوو بەشەوە.

بەشێکیان «کـەریمـەڕەش و کوڕەکەی‌و ڕەحیمەکوێ و شەریف» بەشەکەی تریان گوێیان نەدایە ئامۆژگاری‌یەکانی میری تا سەر لە بەیانی سێ شەمموی ڕابوردوو هەر لە «زاخە»وە ئەو بەشەیان «تالە پیزەو خولە سەلکەو عەزەی مینە ڕەش و ڕەسوڵ بێورەیی» کوژران و چوارەکـەی تریش تەسلیم بوون، کوژراوەکـان لاشـەکـانیان هێنـایەوە بۆ سلێمانی وە لە بەردەرکی سەرادا فڕێیان داو خەڵك هاتن بۆ سەیری لاشەکانیان. .

دەستە چەتەکانی خولەپیزە چۆن پەیدابوون؟

کەی دەستیان دایە ئەم ڕێگایە؟

پیزه کێ یەو لەکوێ یە؟
کوشتن و برین لە هەمولایەکەوە. . . چۆن حاکمی تەحقیقی هەڵەبجە کوژرا؟ گرتنی طاهر پیزە بەبرینداری. . . کوشتنی خولەپیزە. . دوایی پێ هێنانیان.

خولەپیزە کە سەرکردەی ئەم دەستەو تاقمە بوو، ناوی مەحمود کوری حەمە خەڵکی دێی «چمیاڵـه»یە کە ئەکەوێتە قەزای چوارتاوە خولە خۆیو براکانیو هاورێکانی لەپێش دا خەریکی مەرو ماڵات لەوەراندان بوون «پیزە» کە خولە بەمەوە مەشهورە دایکیانە وە ناوی پیرۆزە هەر ئەم بووە هانیداون وە یارمەتیداون لە هەموو بارێکیا. (1)

ئیتر هەر وەکو لە لایەکیتری ئەم رۆژنامەیە باسمان کردووە ئەم دەستەیە کە دەستیان دایە کوشتن و برین ئەوەبوو طاهیریان گیرا لە کارەساتێکی پێشترادو بەرەڵلا کرا لەپاش ئەوەی کە حوکم درا وە لە ساڵی ١٩٤٧دا خولەپیزە «موحەمەد ئەمین بانیشاری»ی کوشت کە ئامر مەخفەری ولیاوا بوو لەکاتێکا کە چوو بوو بیگرێ بەپێی قانوون.

ئیتر لەپاش ئەمە هەموو براکانی لە خۆی گردکردەوە، وە زیاتر شوڵیان لێ هەڵکێشا وە زۆر سوودیان لەچۆنێتی ئەو ناوچەیە وەرئەگرت چونکە سەخت بوو وە هەمووی شاخ و دۆڵەو دارستانە وە کە زۆریان بۆ ئەهات خۆیان ئەکرد بە ئێران دا.

حاکمی هەڵەبجە:

لە رۆژی ٥/٥/١٩٥٠دا لەکاتێکا کە خوالێ خۆشبوو «عبدالباقی» ساحێب قران حاکمی تەحقیقی هەڵەبجە ئەچوو بۆ پێنجوین وە کە ئەگاتە ناوچەی ناڵپارێز لای ئێوارە ئەبێت دەستەوتاقمەکەی خولەپیزە خۆیان بە شاخەکەوە مەلاس ئەدەن و ئوتومبێلێکی لۆری رائەگرن لەپێش گەیشتنی ئوتومبیلەکەی حاکم دا وە دەست ئەکەن بە تەقەکردن لێیان وە لە ئەنجام دا ئەبێ بە شەر لەگەڵ پۆلیسەکانی حاکم دا، شەو دێ بەسەرداو تەقە نامێنی خولەپیزەو هاورێکانی لە شاخی «هەرزەلە»وە ئەیانەوێ دەرباز بن وە بچن بۆ ئێران لەپاش ئەوەی کە خوا لێخۆشبوو «عبدالباقی» بە گوللەی ئەوان ئەکوژرێت وە «حەمەخان» ناوێك لەگەڵ پۆلیسێکدا بریندار ئەکرێن و هەرچییان پێ ئەبێت لێیان ئەسەنن و لەبەر ئەوەی کە تەعقیباتی ئەم چەتانە بەرێك وپێکی ئەروێ لە «بەردەبەکۆس» لە شاخی سورکێو لەسەر سنوری ئێران لەکاتێکا کە ئەمان ئەیانویست بگەرێنەوە بۆ عیراق بۆ کوشتن و برین سەرلەنوێ لەوێدا برای خولەپیزە «طاهر» بریندار

ئەکرێت، وە بە بریندارى ئەیرفێنن بۆ ئێران، بەڵام هێزى پۆلیس توانى شوێنەکەى بدۆزێتەوەو بیگرن وە لەپێش دا ئینکارى ئەکرد کە ئەو طاهیرە بەڵام لەپاش دا دەرخرا کە ئەوە بیجامەکەى خوالێ خۆشبوو حاکمى لەبەردابوو هەر وەها سەعاتەکەى حەمەخانى لەدەست دا بوو، وە مەحکمەى کوبرا لە سلێمانى حوکمىدا بەسەریا بە ئیعدام وە لە ٢٤/١٢/١٩٥٠ ئیعدام کرا لە سلێمانى لە بەردەرکى سەرا. . .

## «کوشتنى خولە پیزە»

ئیتر هەر لەسەر رێوشوێنى خۆیان ئەرۆیشتن بە کوشتن و برین هەتا خولەپیزە کوژرا لەگەڵ عەول گوڵچین لە ساڵى ١٩٥١دا لە شاخى کەتوى چوارەتاوە کە ئەکوژرێن شەو ئەبێ هەرلەوێ ئەیان نێژن بەڵام پاش دوو رۆژ دۆزرانەوەو هێنران بۆ چوارتا وە لەپاش ئەوەى کە بەتەواوى دەرکەوت کە ئەمە خولەپیزەیەو هێنایانن بۆ سلێمانى وە لە بەردەمى سەرادا بۆ پیشاندان دایان نان ئینجا بردیان بۆ ناڵبارێز ناشتیان لەو شوێنەى کە حاکم عەبدول باقى تیا کوژرا.

## تالب پیزە

لەپاش ئەوەى کە خولەپیزە لەناوبرا تاقمەکەى بە سەرۆکىى تالەپیزە «براى خولەپیزە» ماوەیەك لەسەر ئەم کوشتنە رۆشتن وە ماوەیەکیش لە ئێران دا خۆیان ئەشاردەوە وە لەپاش دا تالب داواى کرد کە عەفو بکرێ و تۆبە ئەکات وە لەپاش ئەوەى کە تەعقیباتى قانوونى کە لەحەقیان هەبوو وەستێنرا لەدێى تیمار دانران بەڵام ئەو رەگ و دەمارەى هەر وازى لێ نەهێنان و چەکیان فرێنەدا وە دانیشتوانى ئەو ناوچەیەیان بەگیرهێنابوو خۆیان سەپاندبوو بەسەریانا هەتا واى لێهات لە دوا رۆژەکان ساڵى ١٩٥٤ داسەعادەتى موتەسەریفى لیواى سلێمانى «زەعیم روکن عومەر عەلى» لەگەڵ مودیرى پۆلیس گەرانێکیان کرد لە ناوچەى چوارتادا وە بۆیان دەرکەوت کە ئەمانە هەر خەریکى خراپەن لەپێشەوە ئامۆژگاریان کردن کە چەك فرێ بدەن وە لە شوێنێکدا دابنیشن کە حوکمەت بۆیان دائەنێ بەڵام ئەمەیان پێ باش نەبوو بەتایبەتى تالب پیزە وە لەبەر ئەوە ئەمر درا کە دیسانەوە

دەست بکرێت بە تەعقیب کردنیان و موتەسەریفی لیوا دوهەم جار گەڕایەوە سەریان وە بە پێ لە چوارەتاوە چووە شوێنەکەیان وە دیسانەوە ماوەی دانێ کە خۆیان تەسلیم بکەن بەڵام براکەی خولەپیزە «بۆرە» دەستی خۆی وەشاندو دوو پۆلیسی کوشت وە هێزی پۆلیسیش مەجبوور بوو کە دەست بکاتەوە وە لەم ماوەیەدا «بۆرە» کوژرا وە هەندێکی تریان لێگرتن بەڵام تالیب و عەزەی مینەڕەش و خولەسەلکە چونکە لەوێ نەبوون هەر مانەوە وە لەپاش ئەوە تەعقیبیان بەهێزتر بوو لەحەقیان وە ئەهالیش دەستی یارمەتی‌یان زیاتر درێژ کرد بۆ گرتنیان هەتا وای لێهات بەتەوای تەنگیان پێ هەڵ چنرا وە لە جارێکی‌تردا لەکاتێکا کە ئەیانویست بێنەوە ناوعێراق یەکێکیان لێ کوژرا وە دوانیان لێ گیرا وە لەپاش ئەوەش هەر وازیان نەهێنا بەڵکو مانگی ڕەمەزانی پیرۆز تالیب و عەزیزو خولەو ڕەسوڵ بێورەیی چونە سەر کوێخا ڕەحیم لە دێی سورەدزێ خۆی‌و براکەیان کوشت وە چونەوە بۆ ناو ئێران.

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

[١] « بۆ ئەوانەی لەبیریانە ئەزانن و ئەوی لە بیری نییە بە خوێندنەوە سەیری لاپەڕەکانی موحاکەمەی یاخی بوونی عومەر عەلی بکەن لە شۆڕشی پیروزی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، ئەم دایکە بە شایەت دەبینیو دەزانی کە وینەی دایکیکی مەردی دڵسۆزی پڕ لە عاتیفە بوو، خۆشەویستی کوڕەکانی‌و کۆرپەی ئەو کوڕانە کە عومەر عەلی بەزیندوویی سوتاندنی لە **عاتیفە** و سوزی کەم نەکرد بووە.

«ع . م . ز»

# «دوایی پێ هێنانیان»

لەپاش ئەم هەموو کارەساتە وە لەپاش ئەوەی کە کاربەدەستان دەستیان لەوە شت کە ئەمانە چاك ببن دەست کرا بە تێکۆشانێکی ڕاست وە بە تەقیباتێکی زۆر بەتوندی وە هەموو ئەو ناوچەیەیان چنی وە چوارەدەوریان نان چ لە عێراق و چ لە ئێران وە بەهۆی ئەو یارمەتی‌یەی کە دایان وە وای لێهات هەموو خۆیان کردەوە بە عیراق دا وە ڕۆژی ۲/٦/۱۹٥٥ دانرا بۆ ڕۆژی هێرش بردن بۆسەریان دا کە دواییان پێ بهێنرێ، وە لە شەوی ۳۰/٥/۱۹٥٥ خۆیان کرد بە قەڵای زاخە لە شاخی «هەڵزانە»دا وە لەم کاتەدا هەموو هێزەکانی حکومەت لەگەڵ ئەهالی خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرش بەڵام لەوکاتەدا هەستیان بەم کارە کردبوو وە بەیانەکەیان خوێندەوە کە بۆیان دەرچووبوو لە ژمارەی «هەرە پێشوودا بڵاو کرایەوە»وە لەبەر ئەمە بوون بە دوو بەشەوە بەشێکیان ئەم چوارە بوون :

١ ـ کەریمە ڕەش

٢ ـ کوڕەکەی کەریمە ڕەش

٣ ـ شەریف فیتك «تووتکانی»

٤ ـ ڕەحیمە کۆڵ

وە بەشەکەی تریان :

١ ـ تالیب پیزە

٢ ـ عەزەی مینە ڕەش

٣ ـ خولە سەلکە

٤ ـ ڕەسووڵ بێورەیی

بەشی یەکەم هەستیان کرد کەوا پێویستە تەسلیم ببن ئەگینا ئەنجامیان کوشتنە، بەڵام بەشی دووەم هەر لەسەر کەللەڕەقی خۆیان ڕۆشتن وە دواڕۆژیان هاتبوو بۆیە کوژران وە ئەوانی تر خۆیان تەسلیم بە میری کرد.

کۆمەڵەکەی خولەپیزە . . .

لە ساڵی ۱۹٤۲ ەوە هەتا ئەمڕۆ .

٩٤ ـ قەزییەی غەیر مۆجیزە، کارەساتی گەورە نووسراوە.

۲۳ کارەساتی ڕووتکردنەو سووتاندنی گەورە.
۱۳۲ کەس کوشتن و بریندارکردنیان، یەکەمین کارەساتیان زیانیان گەیاند بە «فەرەج قادر» ناو لەبەینی دێی «بەهێ و سپیارە»دا لە قەزای چوارتا. . .
گرتنی تاهیر پیزە بە برینداری و ئیعدام کردنی، کوشتنی خولە پیزەو عەول گوڵچێن و تالە پیزەو خولە سەلکەو ڕەسووڵ بێوەریی، چواردە ساڵ لەمەوبەر ڕۆژێ خولە پیزەو عەزەی مینە ڕەشی مامی و دوو کەسی تر ڕێگەیان بە «فەرج قادر» ناو خەڵکی دێی «کورری» ئەگرن وە لەبەینی «بەهێ و سپیارە»ی چوارتادا بۆ پەنگ ڕووتی ئەکەنەوە وە بەم جۆرە دەستیان کرد بە ڕێگری.
لە ساڵی ۱۹٤٤دا تاهیری برای خولە دوای ئەوەی کە چەند سەر گایەکی یەکێ لە دێهاتی یەکان بۆ ئەتك و پەنگ ئەبات گاکان و پۆلیس توشی دێن وە لەو شەرە تفەنگەدا بریندار ئەبێت وە ئەگیری وە لە مەحکەمەی جەزای سلێمانی دوو ساڵ حوکم ئەدرێت.
لە ساڵی ۱۹٤٦ کە لە بەندیخانە دەرئەچێتەوە کۆمەڵی ئەوان لە ساڵی ۱۹٤۷دا کە پۆلیس ئەچن خولە پیزە بگرن، خولە ئامر مەخفەری ولیاوا» حەمە ئەمین بانی شاری ئەکوژێت، ئیتر بەم جۆرە خولە خۆی و عەزەی مینە ڕەشی مامی و تاهیرو تالیب و بۆرەو شەریفی برای و خولە سەلکەی ئامۆزای و زاوای یەك ئەگرن و جاروبار ئەو پیاوکوژو خراپەکارانەی کە لە عەدالەت هەڵهاتوون پاڵ ئەدەنە کۆمەکیان بەم جۆرە بەزۆری لە قەزای شارباژێردا وە جاروبار بۆ پێنجوێنیش لەو شاخ و داخی حدودەوە دەستیان ئەدایە کوشتن و برین و تالان و سووتاندن و ڕێگرتن و دەست درێژی زۆر جار کە زۆریان بۆ ئەهاتت ڕایان ئەکرد بۆ ئێران.
تێ بینی:
زۆرم مەبەست بوو زیاتر لە بەسەرهات و دروست بوونی باری خولەپیزەو دەستەکەی «تاقمەکەی» بگەم چونکە لە کۆتایی ساڵەکانی چل و سەرەتای ساڵەکانی پەنجادا بەجۆرێ سەریان لە میری شێواندبوو، تەنانەت میری بۆ ئەو مەبەستەو بۆ لێدانی جووڵانەوەی نیشتمانی و بۆ نەهێشتنی ئەم دەستەیە زەعیم ڕوکن «عومەر عەلی»ی کرد بە موتەسەریفی سلێمانی. وە هەموو دەسەڵاتێکیان دابوویە بۆ نەمانیان ئەویش دەستی کرد بەهێنانی پۆلیسی «قووەی سەیار». وە چەند فەوجێکی هێنایە سلێمانی بێجگە لە پێکهێنانی غەیرە نیزامی کە لە ئەهلی دێهاتەکان میری چەك و پارەیان ئەدانێ بۆ لەناوبردنیان.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشا لە کوشتنەکەی ئامر مەخفەری ولیاوا حەمە ئەمین بانی شاری کە خولـە پیزە کوشتی، لە ساڵی ۱۹٤۷ز تا ۱۹٥٥/٥/۳۰ کۆتـاییان هات ئەو ماوە دوورودرێژە ئەم هێزە زەفەری پێ‌نەبردن، تا بە پیلانی ئەو چوارە کە خۆیان تەسلیم کردو بوون بە پۆلیس لەژێرەوە لەگـەڵ میری‌دا رێك بوون ئەو چوارە کە نووستبوون کەسی یەك بوون بەڵام چوارەکـەی‌تر بێگانە بوون پێ‌یان. وەختی خۆی چووبوونە تەکیانـەوە بۆیە ئەو فروفێڵەیان سەری گرت، کاتی خۆی خەڵکی نیشتمان پەروەری سلێمانی بەگشتی وە قوتـابیان بەتـایبـەتی هەمـوو کاتێك بەدوای هەواڵی جوڵانـەوەو بەسەرهاتی خولەپیزەو هاورێکانیان ئەگەڕان من ئەوسا قوتابی بووم لە سانەوی شەو لە رێکخراوی قوتابیان بووم زۆرجار باس هەر باسی ئەوان بوو هەموکات دڵمان لایان بوو، چونکە هەردوو لامان دژی ئەو رژێمە بوین ئەوان لەو شاخ و داخە بەچەکەوە ئەجەنگان لەگەڵ میری‌دا ئێمەش بە تێکۆشانی سیاسی هەموو کاتێك لەناو خۆماندا ئەمان وت خۆزگە ئەو کورە ئازایانە ئەهاتنە ژێر ئاڵای رێکخراوی سیاسی‌و بەرەو شۆرش ئەیان د، حەیفە ئەو پاڵەوانانە هەروا بەفیرۆ برۆن، کاتێ کە هەواڵی کوشتنی ئەو چوار شێرانە ات شاری سلێمـانـی بەجـارێ ماتـەمـینی دایگـرت، منیش لە ساڵی ۱۹٤۹ لە شتنەکەی حەمە ئەمین بانی شاری‌یەوە کە لەو خاڵەوە دەنگی ئەم کۆمەڵە دایەوە سلێمانی تا کوشتنی ئەم **چوارە**، بە چاوی خۆم دیم ساڵی ۱۹٥۰ ئەو بەیانیەی تایەر ڵواسرابو لە بەردەرکی سەرا هەروەها دوو لاشەکەی خولە پیزەو عەول گوڵچین ساڵی ۱۹٥٤ ئەوڕۆژەی لەسەر پاص قەمەرەیەك هێنایانن لە بەردەرکی سەرا فڕێ‌یان دان وە ەرەهـا ئەوڕۆژەی ئەو چوار لاشەیەیان هێنا بۆ سلێمانی هەمویم بە چاوی خۆم دی ەوڕۆژەوە خولیای کۆکردنەوەو دروست بوونی‌و بەسەرهاتی ئەم کۆمەڵەم لەمێشکدا رو.

ئەمجا ویستم یەکێك لەو دەستەیەی لەگەڵ خولەپیزەدا بەشداری کردبوو ببینم ئەوە و لە رۆژی ۱۹۸٤/٦/۳ لە قەڵاچـوالان لە ماڵی کاك «فـەتـاح توتکـانی» برای شەریف توتکانی» چوین بۆ ئەو مەبەستە بە میوانی بەڵام لەپێشا ویستمان هەرلەوێ چین بۆ ماڵی شەریفی برا بچووکی خولەپیزەو خوشکی خولە کە فاتمی ناوە، لەگەڵ لورانی خولە کە دوان بوون بە سکێ، ناویان ناسرو سوارە بوو بەڵام سوارەیان چەند ماڵێك لەمەوبەر قاچی بەر تەور ئەکەوێت دوایی ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە، بەڵام

ئەمان لە ماڵ نەبوون ئیتر لە ماڵی کاك فەتاح لەگەڵ برادەرێکی خۆم کە ناسیاوی ئەوان بوو دانیشتین دەست کرا بە قسەکردن و پرسیار کردن، لە وەڵام دا ئەم بەسەرهاتانەی بۆ گێرامەوە؛ ووتی:

لەپێش ڕووداوەکەی کوشتنی حەمە ئەمین بانی شاری‌دا تاهیری برای خولەو ڕەشە لوتەی ئامۆزای لە ڕوداوێکدا لە قەڵاتی لای چەمیاڵە ڕەشە ئەکوژرێ‌و تاهیر بە بریندارى ئەگیرێ‌و حوکمی ئەدا بەسەرا دوایی لە بەندیخانە رائەکا. . . لەپاشا مەفرەزەیەك پۆلیسی سوارە ڕەشە «هەوڵو»یی‌و کەریم عەبدوڵڵاو حەمەعەلی کاکی و فەتاح باپیرو چەند پۆلیسێکی‌تر بە سەرکردایەتی ئامر مەخفەرێ ولیاوا حەمە ئەمین بانی‌شاری دێتە سەریان لە دێی چمیاڵە بۆ گرتنی تاهیری برای بەڵام ئەو لەوێ نابێ ئیتر گر لە خولە پیزە ئەئاڵێنن، ئەڵێن تۆش عەسکەریت لەسەرە وەرە لەگەڵمان، خولە ئەڵێ من موعیلی ماڵ و مناڵەکانم و براکانمم، وازم لێ بێنە جارێ نەخۆشم، دوایی خۆم دێم بۆ چوارتا، بەڵام بێ سوود ئەبێت ئەمجا ڕەحمەی ژنی قورئان بەرەوپیری ئەبات، کە نەخۆشەو وازی لێ بێنێ‌و خۆی بەپێی خۆی دێت بۆ چوارتا، هەر سوودی نابێت ئەڵێت: وەڵڵاهی «٢٩» کەسم کوشتووە بە تۆوە ئەیکەم بە «٣٠» کەس، ئەت دەم بەسەر کەرە ڕەشی خۆتاو ئەتبەم بۆ چوارتا ئەگەر خوت نەدەی بەدەستەوە. دوایی پیزەی دایکی قورئانەکە ئەگرێت بەدەستەوە ئەڵێت:

بیکە بۆ خاتری ئەم قورئانە من سەرم سپی‌یە، بە قسەی من بکە. . ؟ هیچ کەڵك ناگرێ. ئەمجا خولە ئەزانێ سوودی نی‌یە، دەست ئەداتە تفەنگەکەی. . . لە پەنجەرەکەوە تەقەی لێ ئەکات و ئەیکوژێ‌و هەڵدێ‌و سەرو ماڵ بەجێ دێڵێت ئیتر لەم خاڵەوە تێك هەڵچون و یاخی بوونەکە دەست پێ‌ئەکات.

پرسیارم لە کاك فەتاح کرد، ووتم

- بێجگە لە خۆیان کەس وکاریان ناوی چەند کەسێکم پێ بڵێ، کە لەگەڵ خولە پیزە بەشداری‌یان کردووە منیش پێش نووسینی ئەوناوانەی بەشداری‌یان کردووە ئەڵێم:

ئەم بەسەرهاتەی خولە پیزەو دەستەکەی بەدرێژایی ئەوەندە ساڵ کە نووسراوەتەوەو کاتی خۆی لە ئیستگەکانی جیهانی باسی ئازایی خولەپیزەو دەستەکەیان ئەکرد بەتایبەتی ئیستگەی پاریس کە خۆم یەکێك بوم گوێم لێ‌بوو باسی ئەکردن. ئەمە لە هەر وولاتێکی تر ڕووی‌بدایە نووسەران ئەگەڕان بەدوایا ئەیان کرد بە چیرۆکێکی ڕاستەقینەو

روداوێکی سەرسورهێنەرو بە کتێبێك و چەندان جار فلیمیان لەسەر دەرئەکرد، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کەوا زوڵم و زۆر چۆن پاڵ بەخەڵکەوە ئەنێ لەباتی پاراستنی ئاشتی لەو ناوچانەو کە خەڵکی بە زەرعات و رەزو باخ و مەروماڵاتی خۆیانەوە خەریك بن، نەك بە زۆر وایان لێ بکەن لەبەر پاراستنی شەرەفی خۆیان و ماڵ و منالیان پالی بەمانەوە نابێ بۆ گرتنی ئەو رێگـایە تەنـانـەت ئازایەتی خولـەپیزەو هاورێکانی دەنگی دابووەوە لە کوردستانی ئێران و عێراق دا ناوی خولە پیزە بەسەر زمانی خەڵکەوە بەشێوەی شیعرو گۆرانی فولکلوری ئەوترایەوە. تەنانەت مامۆستا هەژار لە شەرەف نامەدا ناوی هێناوە.

هەروەهـا چەنـد جمـوجـۆڵیان بووە لەگەڵ هێزی میری‌دا لە ناوچەی شارباژێرو پێنجـوین ئەوەندەشیان کەم تر نەکردووە لەودیو لەگەڵ هێزی پۆلیسی نیزامی ئێرانی‌و مەخفەرەکانیان، تەنانەت لەوێ ناوی خولە پیزە ئەبرا بە «مەحموود خانی پیرۆز خان» لێرەدا دوو نمونەی ئازایەتی خولە پیزەو خولە سەلکەی ئامۆزای باس ئەکەین کە ئەمە هەر لە فلیمدا بینراوە لەگەڵ چەند دێریك شیعری فولکلۆری کە ئەوکاتە بوو بوو بەگۆرانی بەسـەر زمـانی خەڵکیەوە لە کۆتایی باسەکەمان ئەیخوێنینەوە، هەروەها ئەو وێنانەی خولەپیزەو هاورێکانی لەم کتێبەدا ئەبینین بەچەکەوە ساڵی ١٩٤٩ گیراوە لە سلێمانی لە ماڵی شێخ قادری حەفید کە یەحیائەفەندی رەسام گرتونی ئەوکاتە هاتبوون بەنهێنی بەو مەبـەستەی حەپسەخانی نەقیب رێکیان خات لەگەڵ میری بەڵام دوایی نەگەیشتنە ئامـانجێك بۆی دەرباز بوون. لەوکاتەوە من ئەم وێنانەم هەڵگرتووە کە بۆ ئەم رۆژە سوودی لێ وەرگیرا، بەڵام وێنەی پیزەی دایکی خولە لە دادگای میللی لە بەغدا کە بۆ شایەتی چوو بوو دوای شۆرشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ لەسەر عومەر عەلی لەوێ گیراوە بەڵام وێنەی فاتمەی خوشکی‌و رەحمەی ژنی لە خۆیانم وەرگرتووە. ئیتر ئەگەر بێتوو ئەم رووداوانە کەس وکاریان کۆی‌بکەنەوە یان چەند چیرۆك نوسێك بۆ ماوەیەك خۆیان تەرخـان بکـەن بۆ کۆکـردنـەوەو تۆمـارکردنی ئەبێتە داستانێکی رووداو کە بۆ یادگارێك بمێنێتەوە کە باسی ئازایەتی‌و پاڵەوانیەتی خەڵکی ئەو ناوچانەی کوردستان ئەکات. (١)

هەروەهـا ئەم زانیاری‌یە بۆ یەکەم جار بڵاوئەکەینەوە، ئەو برادەرەی کە دوو جار لەگـەڵم هات بۆ شەمساوا بۆ زیاتر روون کردنەوەو زانیاری دەربارەی دروست بوونی جوڵانەوەی خولەپیزەو هاورێکانی ئەویش دیار بوو لە من زیاتر مەبەستی بوو چونکە

ئەوکاتە خەڵکی دێی بۆسکان بووو نزیك بووە لەوانەوە تەمەنی ئەوکاتە یانزەساڵان بووە زۆر باش لەبیریەتی ئەڵێت لە ساڵی ١٩٤٨ لە شاخی سورکێو چام بۆ خولەو هاورێکانی لێ ئەنا دوو کەس لە سلێمانیەوە هاتبوون بۆلای بەهۆی ساڵحاغای بۆسکان پەیوەندی یان پێوە کرد کە ئەو دووانــە لە پارتێکی سیاسیەوە هاتبـوون کە پێ یان ووتـوە بێتـە ژێر رێکخـراوی حیزب ، ئەگـەر بەتەنیا بێت ئەفەوتێت ئەگەر بێیتە پاڵ ئێمەوە ئەمێنیتەوە ئەویش لە وەڵام دا ئەڵێت بەهـۆی ساڵحـاغـاوە دوایی وەڵامتـان ئەدەمەوە ئیتر ئەوان ئەگەڕێنەوەو هیچیان دەستگیر نابێت ئیتر ئەڵێت دوایی نازانم چی بەسەرهات بەڵام خولە پیزە هەڕەشەی لێ کردم کە ئەمە نەدرکێنم ، ووتی بۆیەکەم جار ئەمە باس ئەکەم .

یەکێ لە نمونەی ئازایەتیەکانی «خولە پیزە» :ـ

جارێکیان خولە لە شەڕدا ئەبێت لەتەك پۆلیس و غەیرە نیزامیەکانی ئەوسای میری لە کێوی هەڵۆان ، لەپڕێکدا هەواڵێکی پێ ئەگات کە گوایا ڕەحمەی خێزانی لە تەنیاماڵەکەی سۆفی حسەین لە هەمان کێودا دەست گیر کراوە لەلایەن مەفرەزەیەکی پۆلیس و غەیرە نیزامی یەوە بەرەو چوارتـا براوە ، خولـەش ناکـاتە نامەردی لەبەرئەوەی بەرگری کردنێکە لە شەرەف و ئابڕوی خۆیو خێزانەکەی شەڕەکە بەجێ دێڵێو بەپەلە سواری ئەسپەکەی دەبێت و بەدوای شوێن پێ ی مەفرەزەکەدا ئەڕوات نایەڵێ بگەنە چوارتا هەر لەوبــەر چەمی چنـارەوە بەتەنیا بۆیان لە سەنگەر ئەدا ، دائەمزرێ هەتا خێزانەکەی و مەفـرەزەکە ئەگەنەجێ ، هەروەکو شێر لێ یان ڕائەپەڕێو چەند کەسێکیان لێ بریندار ئەکـات وە پۆلیسێك لەوێدا ئەکـوژێ وە خێزانـەکـەی خۆی بەوپەڕی ڕووسووری و شەرەفــەوە دەست ئەکـەوێتـەوە ، بەرەو کێوەکـە بەرەو دواوە ئەگـەڕێتـەوە ، ئەمـە لە ١٩٤٧/٢/٢٧دا ڕووی داوە .

یەکێ لە نمونەی ئازایەتیەکانی «خولە سەلکە» :

جارێ لەجاران میری خولەسەلکە بەی دەست ئەکەن ، ئیتر بە هەر فروفێڵ و جۆرێك ئەبێت ، هەردوو باڵی لەپشتـەوە ئەبەستنـەوەو ئەیهـاوێژنە پشتی یەکێك لە ئوتومبیلی پۆلیسەکان . بە هێزێکی زۆرەوە ، پاشا واتە «عومەر عەلی» لەکاتی گەڕانەوەیان بەرەو شاری سلێمانی لە وەستانێکدا یەتە سەر تەماشاو دیداری خولە سەلکە وە بە لاقرتی و گاڵتە پێ کردنێکەوە دەستێ ئەبات بۆ فیشەك لغە خاڵیەکەی ملی خولە سەلکە ، بە قاقاو پێکەنینێکەوە ئەڵێت ئەم ملوانکەو بەرموورە چی یە لەملتا ؛ ئەویش بە توڕەیی و مۆنێکەوە

له وەلام دا ئەلێت باشام ئەمە ملوانکە نی یە بەڵکو فیشەك لغەو بۆ پیاو کراوە.

دوای ئەوە ئەکەونەوە ڕێگا بەرەو سلێمانی لە نزیکی دێی «پارەزان» لەناکاوێکدا بەو دەستە بەستراوەوە خۆی هەڵئەداتە خوارەوە بەرەو ئەو شیوو دۆڵە و دارستانە چڕەی پارەزانەوە بۆی دەرباز ئەبێت، لە هەمان کاتدا پاشا خۆیو ئەو ژمارە پۆلیسانەی کە لە پێنج سەد پۆلیس زیاتر بوون ئەیکەنە تەقەو قرمەو دەستڕێژ بەدوایا لەئەنجامدا بە ناومێدی ئەگەڕێنەوە.

ئەوەش لە پاداشتی ئەو توانج و پلارەی پاشا ئاراستەی خولە سەلکەی کردبوو.

**ئەمەش ئەنجامەکەی بوو.**

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

«١» **لێرەدا لە باسی یاخی بووەکاندا بە تایبەتی خولە** پیزەدا دوو وێنەو دوو کڕانەوە ئەبینین لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە، یەکەمیان ئەوەیە کە لە ڕۆژنامەی ژین دا نووسراوە کە زیاتر لە ڕوانگەی بەگشتی تاوانبارکردنی تاوان و پیاوکوژی یەوەو لەلایەك **و لە ڕوانگەی میری و عومەر عەلی** موتەسەریفی ئەوسای سلێمانیەوە نوسراوە کە نەی ئەویست هیچ جۆرە تواناو دەسەلاتێك لەم نەهاوچەیەدا بهێلێت.

دووەمیشان ئەوەیە کە نووسەر نووسیویتیو هوی ڕاستەقینە بۆ ئەوە دەدۆزێتەوە کە زوڵم وزۆر پیاو بەرەو تاوان کردنیش ئەبات. ئەگەر ئەو ئازایەتیو ڕووبەڕووی زوڵم ڕاپەینەی خولە پیزە لە هەل و مەرجێکی مەوزوعی تردا بووایە لەجیاتی ڕووکردنە تاوان، هەڵبەتە ڕووی ئەکردە شۆرش و شۆرشگێران.

ئەگەر وێنەو ڕوانگەیگی تر مابێ بۆ ئەم ڕووداوە سامناکەی بیست ساڵێك ناوچەی سلێمانی خەریك کرد ئەوە لە فولکلوری سەرزاری خەڵکدا ئەیدوزینەوە کە تا ئیستا لە ناوچەی شارباژێڕدا بڵاوەو کونەکراوەتەوەو زوربەی بە چاوی ئازاو ... ... ئەڕوانێتە خولە پیزەو دەستەکەی.

«ع . م . ر»

## ناوی ئەوانەی کە لەگەڵ خولە پیزەدا بەشداری‌یان کردووە :ـ

١ ـ عەزە توتکانی برای شەفە توتکانی : لە شەڕی سیاگوێز گوژرا .

٢ ـ فەرەج ڕەنگینەیی «ماترلی» ئەلێن لەبەر ئەوەی هیچی لەبارا نەبو وازیان لێ‌هێنا هەتا پێش ئیعدام کردنی تاهیر، وە لە سلێمانی کوشتیان لەبەر داوێن پیسی .

٣ ـ حەمە داداش : دوای ئیعدام کردنی تاهیر نزیکەی بە ساڵێك وازی لێ‌هێنان لەبەر ئەوەی پێ‌یان ئەوت خەتای تۆ بووە تاهیر بە بریندار گیراوە ، لەسەر ئەوە ڕۆیشت . ناوبـراو خەڵکی باریکەیە لای عەربەت ئێستاکە لە دێی لەتیفاوا لە ناوچەی بازیان فەلاحەت ئەکات .

٤ ـ مەلا کەتـان : خەڵکی ئێرانـە لە سەرەتـاوە شکی لێ ئەکەن و گیرفانی ئەگەڕێن نامەیەکی پێ‌ئەبێ کە پەیوەندی بە میری‌یەوە ئەبێت ئیتر لەوێ لە ناوچەی بێورێ ئەیکوژن .

ئەم ڕووداوە پێش کوشتنی خولە پیزە بە ساڵێك زیاتر بوو.

٥ ـ مەجی‌ی ئەول موحەمەد : ئەم کابرایە خاڵی عەول گوڵچینە ، لەپێشا لەگەڵ خولە پیزەدا بوو، دوایی هەڵدێت و ئەچێتە لای عەلی ئاغای ئەحمـاوا پێش کوشتنی خولە پیزە ساڵی ١٩٥١ .

٦ ـ ڕەحیمی مەلا فەتاح «ڕەحیمە لات» : لەپێش کوشتنی خولە پیزەدا جیابووەوە چووە لای حسە تاقە دووساڵ لەگەڵ ئەودا بوو دەوری بینی ، دوایی چووە لای مەحمود بەگی ڕەشەقەڵات لە ئێران ، دوای نەمانی حسە تاقەو دەستەی خولە پیزە هاتەوە بۆ «بارێ» لە ساڵی ١٩٥٧ لەنێوانی چوارتاو چنارەدا کوژرا ، لەسەر ئەوەی وەختی خۆی بە ناهەق کەریم ئاغای وێڵەو کوڕەکەی کوشتووە وەختێك کە لەگەڵ حسە تاقەدا بووە .

هەروەها ئەم پێنج کەسەی خوارەوە هەموو پێکەوە، وازیان هێنا دوای شەڕەکەی تیمار کە بۆرەی تیا کوژرا . خۆیان تەسلیمی میری کرد لە ساڵی ١٩٥٤ ، ئەڵێن زۆری لەبەر ئەو هۆیە وازیان هێنا چونکە بێ‌تاقەت بوون . . هەموو ژنیان هێنا تەنها ساڵح کۆیی لەوەوپێش لەناویانا ژنی هەبوو.

٧ ـ ساڵح کوێی : وەختی خۆی پۆلیس بوو کە هاتە ناو تاقمەکەی خولەوە، لە ژیان دا نەماوەو کۆچی دوایی کردووە.
٨ ـ فەتاح توتکانی : خەڵکی دێی توتکان ناوچەی باسنێ «سیوەل» ئێستاکە لە قەڵاچوالان دائەنیشێت.
٩ ـ حەمە ئەمین توتکانی برای فەتاح توتکانی : ئێستا لە سلێمانی لە گەڕەکی «زەرگەتە» دائەنیشێت.
١٠ ـ ئەحە تیماری : خەڵکی دێی بوڵکی ناوچەی سیوەیل ئێستا لە سلێمانی لە گەڕەکی «کارێزەوشك»دائەنیشێت.
١١ ـ حسە تاقە. : دوای ئیعدام کردنی تایەر جیابووەوەو خۆیشی تاقمی هەبووناوبراو لە بەندیخانەی سلێمانی ڕائەکات دەست ئەکات بە جموجۆڵ دوای کوشتنی خولە پیزە، لە پشتی قزڵجە کورەکانی کەریمە کەشکە لەگەڵیا ئەبن وە ژن برای ئەبن لە فرسەتێکا ئەیکوژن لەگەڵ سمایلی مامەخەلانیو کابرایەکیتری ئێرانی لەسەر ئەوەی وەختی خۆی بەزۆر خوشکەکەیان لێ سەندبوون ئەوانیش پێیان ناشرین ئەبێت لەگەڵیا ئەبن تا تۆڵەی لێ ئەکەنەوە.
کورەکانی کەریمە کەشکە :
١ ـ ڕەحمان
٢ ـ حەمە ئەمین
٣ ـ عەبدوڵڵا
وەختی خۆی حسە تاقە لەگەڵ برایەکی کە دەروێش ڕەشیدی ناو ئەبێت بە منداڵی لە مەریوانەوە دێن لای ئەورەحماناغای نۆرك ئەمێنێتەوە دوایی ئەچێتە لای خولەپیزە بەڵام براکەی لەگەڵیا نەبوو ئەو لە «ساڵیاوە» لە ناوچەی پێنجوین دائە نیشێت.
ئەڵێن ئەو شەوەی کە ڕێکەوتای ٣٠/٥/١٩٥٥ کە تالەو هاوڕێکانی لە ئێرانەوە دێن بەم دیوا لە قەڵای زاخەی شاخی «هەڵوان» لەوێ ئەوشەوە تاقمی کەریمەڕەش کە بریتی بوو لە «حەمەی دوڕیو شەریف توتکانیو ڕەحیمە کۆڵ» لەکاتی خەو «تالیب» خولەسەلکەی ئامۆزاییو ڕەسوڵ پیورەیی ئەکوژن.
ئەڵێن لەژێرەوە لەگەڵ میریدا ڕێکەوتبوون، ئیتر بە نەمانی ئەمان کۆتاییان هات.
بەڵام ئەو چوارە چیان لێ بەسەرهاتدوایی بوون بە پۆلیس : ١ ـ حەمەی کوڕی

کەریمەی ڕەش: ئەمیش لە ساڵی ١٩٦٦دا لە سلێمانی لە شەڕێك لە سەرقەبرانی گردی سەیوان لەنێوانی دوو بەرەی بەهێزدا ڕووی‌دا لەئەنجام ناوبراو کوژرا.

٢ ـ کەریمە ڕەش: لە ساڵی ١٩٧٢ لە سلێمانی لە گەڕەکی مەڵکەندی ئەیکوژنەوە.

٣ ـ شەریف توتکانی: لە سلێمانی لەدوای کوشتنی کەریمە ڕەش لە گەڕەکی مەڵکەندی لای حەمامی بەرخی ئەکوژرێ.

٤ ـ ڕەحیمە کوڵ: پۆلیسی تەقاویتە ئەڵێن لە ناوچەی هەولێر دائەنیشێ..

لە ڕۆژی ٢٥/١١/١٩٨٤دا بۆ جاری دووەم لەگەڵ هەمان برادەردا چوین بۆ قەلاچوالان و شەمساوا بۆ هەمان مەبەست بۆ کۆکردنەوەی زیاتر زانیاری ئەم کۆمەڵە چونکە خۆم لە سەرەتای پەنجاکان تائێستا کە ئەمەم مەبەست بوو، چوین بۆ ماڵی فاتمەی خوشکی خولە پاش ئەوەی ڕێزێکی زۆریان لێ گرتین و نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد، لەگەڵ کۆمەڵە پێك هاتین «فاتم و شەریف» خوشك و برای خولە پیزەو «نامیق و سدیق ئەحمەد» کورانی فاتم واتە خوشکەزای خولەن لەگەڵ «تەهاکوری تالەپیزە»و «ناسر»ی کوڕی خولەپیزەو چەند کەسێکی تر لە کەس و کاری خۆیان وە ئەم زانیاری‌یانەمان دەست کەوت لێیان، کە بە پێویستم زانی ئەمیش لێرەدا بنووسم.

وەك بۆیان گێڕاینەوە چەند کەسێکی تریش بووە لەگەڵ کۆمەڵی خولە پیزەدا بەشداری‌یان کردووە وەك:

١ ـ جانەی حەمەومین خەجێ

٢ ـ عەلی حەسەن بەگی باریی گەورە.

ئەم دوو کەسەش بە پیلانێکی دروست کراو لەلایەن میری‌یەوە لە خەوا هەردووکیان کوژران، هەر لە دێی «بارێی گەورە».

هەروەها «ڕەحیم»ی برای خولەپیزە کە پێیان ئەووت «بۆرە» لە دێی «تیمار» کوژراو «عومەر عەلی» کە موتەسڕیفی ئەوسای سلەیمانی بوو. دڵ ڕەقانە لەناو خانووەکەدا بە خانووەکەوە ئاگری تێبەرداو سووتاندی.

ئەمە پاش ئەوەی شەڕێکی دلێرانەی لەگەڵ کردن و چەند پۆلیسێکی لێ کوشتن.

بۆ ئەوەی خوێندەواری بەڕێز بۆی ڕوون بێتەوەکاتێ کە «تایەر»ی برای خولەپیزە لە سلێمانی لە بەردەرکی سەرا لە سێدارە درا لەلایەن میری‌یەوە، بەلـەدیە مەیتەکەی لە گردی سەیوان ناشت وە پاش ماوەیەك کەسوکاری بەدزی‌یەوە مەیتەکەیان دەرهێنایەوە لە

گۆڕو بردیانـه دێی «سیتـەك» لەوێ ناشتیان، هەروەها پیزەی دایکیان لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا لە دێی «قەڵاتێ» لە ناوچەی «سرۆچك» کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش نێژراوە.

بێینـەوە سەرەوکاری کوڕەکانی خولەپیزە کە ناویان «ناسر»و ئەوی تریان «سوارە» بوون، ئەمانە باوکیان لەکاتی خۆیا ناوی نابوون «هەڵپاچ»و «داپاچ» دوایی ئەم کوڕانە ناوەکانی خۆیان گۆڕی بە «ناسر»و «سوارە».

دایکی ئەمانیش کە ناوی «ڕەحمە» بووە ئێستا ئەویش لە دێی «شەمساوا» دائەنیشێ.

وە ئەم خێزانە لەئەسڵا لە تیرەی «بێسەری»ن وە ئێستا گەلێکیان لە «قەڵاچوالان»و هەندێکیان لە دێی «شەمساوا» بەرامبەر قەڵاچوالان دائەنیش.

«هەندێ لەو هۆنراوانەی بەسەر خولەپیزەو براکانی دا «هەڵدراون»

كاڵێ وەی کاڵی تۆم حەمە تاڵی
تۆم ئامیر مەخفەر ناحیەی خورماڵی
فیشەك ئەهێنم بە بارو بە تا
ئەی کەم بە قرچە لە پشتی چوارتا
ڕەحیم بانگی کرد تایەریان پێکا
لوقمانی حەکیم عیلاجی ناکا
ئەم بەرم شاخە دوو چاڵ قەیاخە
سەرم هەڵبڕی قەیاخ نەمابو
دوو پێ لەولاتر تایەر گیرابو
مەحموود بانگی کرد هۆ سالح کۆیی
تایەرمان کیرا شەرەفمان ڕۆیی
ئەو ئۆتۆمبیلەی شینی قەزوانی
تایەریان تێ‌خست بۆ سلێمانی
ناڵە ناڵێ دێ بەسەر شارەوە
لاشەی تایەرە بە سێدارەوە
بڵێن بە میری وا من بەتەمام

چاوەڕوانیانم لە ئاشی بارام
یاخوا بەخێربێن پۆلیسی سواری
تفەنگ و فیشەك دێنن بەدیاری
شاخەکەی کەتوو پلە پلەیە
تەقەی برنەوی تالەو خولەیە
ئەم بەرم شاخەو ئەوبەر نەکەڕۆس
ئەڵێن تەقەیە لە بەردەبەکۆس
بڵێن بە دایکم خۆی نەکا ئاڵۆز
گوللەکەی مەحموو ئەیکا تەپوتۆز
سەری دەرهێنا وەك شێرلەسەنگەر
شەشی لێ‌کوشتن لە خودەبەسەر
ئەڵێن تەقەیە لە چەمی ئاشان

حەوتی لێ کوشتن لە برنەو بەشان
ئاغام شێخ لەتیف ببمە قوربانی
بۆ دێی عەلیاوا تەشریفی هانی
هەڵگرنە تەرمی ڕوەو چەمپاراو
شینی بۆ بکەن گوڵچین و حەلاو
حەوت ساڵ یاخی‌بون لە دەشت و دەری
سەرکردەت کێ بوو خولە بێ‌سەری
کاڵێ گیان کاڵی تۆم حەمە تاڵی
تۆم ئامیر مەخفەر نوقتەی تەینالی
کاڵێ وەی کاڵی تۆم بای شەماڵی
بە تەقەی برنەو بۆم نابی حاڵی

*****



● لە ڕاستەوە : جانەی حەمەومین خەجی ، خولە پیزە .



● تایەر پیزە



● عەول گولچین



● عەزەی مینە ڕەش مامی حولە پیزە



● عەزە توتکابی‌و هاوڕێیەکی حولە پیزە



● شەریفی برابچووکی خوله پیزه



● حسه تاقه



● پیروز خان «پیزه»

# «ئافرەتان لە گەڕەکەکاندا»

## «مامان»

هەر گەڕەکێك چەند ئافرەتێکی تیابوو پێیان ئەوتن «مامان»، ئەم ئافرەتانە بەساڵاچوو بوون و شارەزا بوون چونکە ئەوکاتە «ممرضە» نەبوو، ئەم مامانانە هەر ماڵێك ژنەکە ژان بیگرتایە ئەچوون بەشوێن مامانا ئەمیش بە شارەزایی خۆی ئەمایەوە لای ژنەکە تا منالەکەی ئەبوو پاش منال بوونەکە سێ چوارشەو ئەمایەوە پاشان پارەی خۆی وەرئەگرت و خواحافیزیی ئەکرد.

## حەکیم «پزیشکی میللی»

لەکاتی خۆیا کە پزیشك و دەرمان کەم بوو ئەم ئافرەتانە شارەزاییان هەبووە لە چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشیدا وەك چاوئێشە، سك ئێشە، سك چوون، وە بریز و لەجێ چوونی ئێسقان وە کەچەڵی، بۆ هەریەکە لەم نەخۆشی‌یانە داوو دەرمانی تایبەتی‌ی خۆیان بۆ کردووە، ئەیاندا بە نەخۆشەکان و چارەسەریان ئەکردن، لە هەر گەڕەکێکا چەند ئافرەتێك هەبوون لەم پزیشکی میللیانە بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی‌ی منال و ئافرەت.

## نان پێوەدەر «نان کەر»

لە هەموو گەڕەکێکا چەند ئافرەتێك هەبوون نان پێوەدەرییان ئەکرد بۆ گەڕەك بەپێ ی زۆری‌و کەمی نانەکە پارەیان وەر ئەگرت، زۆر لەم نان پێوەدەرانە بێ دەرەتانی و فەقیری ناچاری کردبوون کە ڕۆژ تا ئێوارە لەبەر قرچەی گەرمی ئاگری تەنوردا نان پێوە بدەن بۆ ئەوەی منالەکانیان برسی‌و ڕووت نەبن و موحتاجی دەستی ناپیاو نەبن.

## «سوعبەت چی‌و قسەخۆش»

لە سەردەمی ڕابووردوودا لە گەڕەکەکاندا ئافرەتەکان زۆربەی کاتیان بەیەکەوە لەگەڵ دراوسێکانیان ئەبردەسەر بە قسەی خۆش و سوعبەت بەزۆری لە سەرتەنوور لەکاتی نان کردنـدا یان هاوینـان لە بەر دەرگـای ماڵێکـا کۆئـەبـوونەوە هەندێ لە ئافرەتان زۆر قسەخۆش و سوعبەت چی بوون لێیان کۆئەبونەوە، زۆری کاتیان بەخۆشی ئەبردەسەر.

## «ئەو شتانەی کە لە قوڕەسوور دروست ئەکران»

هەندێ ئافرەت لە گەڕەکەکاندا لە قوڕەسوور زۆر شتیان دروست ئەکرد، پاش سوورکردنەوەی لە ئاگرا ئەیان فرۆشت بە پارە وەك کوپە، گۆزە، دیزە دەرخۆنە، سوێنە، کورەی تاسکـەبابی، کەندوو، تەنوور، وە زۆر شتی‌تر. لەکاتێکا ئەم شتانە لەبازارا پارەیان ئەکرد چونکە قاپ و قاچاغی مەعدەن زۆر کەم دەست ئەکەوت وەك «مس» بەلام «فافۆن» هەر نەبوو، ئەم جۆرە شتانە کە دروست ئەکران قوڕەسوورەکە موی بزنی تێکەڵ ئەکراو چوار دەوری بە تەپالە دائەپۆشراو ئاگری تێ بەرئەدراو سوورئەکرایەوە.

نیینۆك كردن :

جاران برۆ و بوو كە منان تا تۆزێ گەورە نەبوایە نیینۆكیان نەئەكرد. ئەیان ووت ئەگەر بە منی نیینۆكی بكرێت بە گەورەیی دز دەرئەچێ .

مانگی سەفەر :

لە مانگی سەفەر كەم كەس سەفەری ئەكرد مەگەر بەدەگمەن وە یا زۆر پێویست بوایە ئەو سەفەرە بكرێ چونكە ئەیان وت ئەم مانگە مانگێكی شووەمەو سەفەری نابێ تیابكرێ. لە مانگی سەفەرا ڕۆژیكی تیایە پێی ئەڵێن (كوڵە چوارشەمووی مانگی سەفەر) ئەورۆژەش ئەكەوێتە چوارەم هەفتەی مانگەكەوە. وە ئەورۆژە ئێوارەكەی ماڵان ئەچوونە سەربان. یان هەر لە بەردەرگا شتێكیان ئەشكاند وەك كوویە یان شەربە. . . ئەیان وت قەزاو بەلا ئەبات لەگەڵ خۆیا. هەروەها لەم ڕۆژەدا دوعایەك هەیە بۆ بەلا لەسەر لابردن مەلاكان بەتایبەتی مامۆستای حوجرە لە دەوری كاشی‌یان ئەنووسی‌یەوە وخەڵكی ئاوی ئەو كاشی‌یان ئەخواردەوە بەنیازی دووركەتنەوەی بەلا. ئەم بەیتە شیعرە بۆ ئەم ڕەژە وتراوە: (ئەورۆژەی من بووم ڕۆژی خەتەر بۆو ـ گوڵە چوارشەمووی مانگی سەفەر بوو).

ئاهـ كردن (پەیمان كردن ـ عەهدكردن) :

جاران ژنێك ئەگەر كوری نەبوایەیان منالی نەبوایە ئەی‌وت (ئاهبێت) واتە عەهد بێت خوایە كوڕێكم ببێ‌و بچێتە كۆڵان و سەری بشكێنن و بەسەروچاوی خوێناوی یەوە بۆمبێتەوە، ئەوەی سەری شكاندووە هێلكەو ڕۆنێكی بۆ بكەم. یان لەلادیكانا ئەگەر ژنێك بەم جۆرە بوایە ئەی‌وت (ئاهـ بێ) خوایە كوڕێكم بدەیتێ‌و گەورە بێ ڕۆژێك ئەیكەم بە شوان.

ئاوی دەباخ خانە :

ژنێك ئەگەر مێردەكەی لەگەڵیا خراپ بوایە ئەی‌وت ئەوە نوشتەی ڕەشی‌یان لێ كردووم، ئەی‌نارد لە دەباخخانە شوشەیە ئاوی دەباخ خانەی بۆ ئەهات و ئەیكرد بە

ڕێگاو ژوورەکانی ناوماڵەکەدا بۆئەوەی کە مێردەکەی بەسەریا ڕۆیشت نوشتەی ڕەشی‌یەکە بەتاڵ بێتەوە، سەیر ئەوە بوو ئەوکەسەی کە ئەچو ئاوی دەباخ خانە بێنێ ئەبوایە کە شووشەکەی پڕکردو هاتەوە تائەو شوێنە ئاوڕ نەداتەوە !

* * *

## (فۆلكلۆری باوەڕی كۆن)

دەردە كۆپان :

نەخـۆشی‌یـە بووە پێیـان وتـوە (دەردەكـۆپان) . ئەگەر یەكێ تووشی ئەو نەخۆشی‌یە ببـوایـە ئەیـان هێنـا نەخـۆشـەكەیان بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك ئەخستە ناو كۆپانی كەرێكەوەو دوایی دەریان ئەهێناوە .گوایە ئەڵێن ئەو نەخۆشیی‌یە بەوجۆرە چاك ئەبێتەوە .

ڕەقیتە :

جاران هەركـەسێ كەرێكی بوایـە خاوەنی سامـان بوو بەتـایبـەتی لە دێكانا چونكە هەمـــوو كاروبـــارێكی گواستنـــەوەو كاسبی بەكـەر ئەكـرا لەبـەرئـەوە كەرئـەوسـا خۆشەویست بوو . ئەگەر بهاتایە كەرێك سەرمای ببوایە ئەیان وت توشی ڕەقیتە بووە كەرەكـەیـان ئەهێنـا ئێـوارە دوای حەمـام چۆڵبـوون كەرەكەیان ئەبردە ژووری گەرمی حەمـامـەوە لەوێدایـانئـەنـا تا بەیانی بۆئەوەی ئارەق بكات و چاك بێتەوە . هەندێجار پیاوی وابووە حەزی بەوە كردوەبەیانیان زۆر زوو بچێت بۆ حەمام و كە چوەو لەپڕ لەژووری گەرمی حەمامەكەدا كەرێكی دیوەو ئەم مەسەلەیەی نەزانیوە، ئەوەندە ترساوە تووشی نەخۆشی بوە.

لەرزوتاو (لەرزبرین):

ئەگەر یەکێ توشیی نەخۆشی لەرزوتا بهاتایە ئەچوو لە لای شێخێ یا مەلایەك دۆعایەکی ئەخوێند بەسەر پەتێکی چەند گرێ لێدراوێکاو ئەکرایە مەچەکی نەخۆشەکە بۆئەوەی نەخۆشی یەکەی لێ بێتەوە بەمەشیان ووتوە (لەرزبرین).

هاڵ)ی زەیستان و موورووی هاڵ:

موورووییەکە لە بەردێکی خاڵخاڵاوی دروست کراوە پێیان ووتوە (موورووی هاڵ). بەکارهاتوە بۆ ژنی زەیستان، لەکاتی مناڵ بوونیاوە کردویانەتە ملی ژنە زەیسێتانەکە بۆئەوەی هاڵ کە جنۆکەیەکە زەرەر ئەدا لە ژنی زەیستان. ئەم بەم مووروو لەمل کردنە نەجاتی بێ لێیێ چونکە وتویانە ئەو زەیستانەی ئەم موورووەی لە ملا بێ هاڵ لە موورووەکە ئەترسێ و ناچێ بەلایا.

کوژەکەی شین:
موورووییەکی شینە بەکارهاتوە بۆچاوەزار، کراوە بەسەری مناڵی تاقانەو وڵاخ و شتومەکی خۆشەویست بۆئەوەی چاوی پیس کاری تێ نەکا.

حەوت ئاسنە:
ئەڵقەیەکە لە حەوت جۆر مەعدەن دروست کراوە، ئەکرێتە پێی ژنی نەزۆك بۆئەوەی سکی پربێ و مناڵی ببێ.

تەنەکەو تەپڵ:
کۆن وا زانراوە ئەگەر لەکاتی مانگ گیرانا تەنەکەو تەپڵ لێ بدرێ مانگەکە بەرئەبێ و رزگاری ئەبێ.

تەقەکردن واتەتفەنگ تەقاندن :ـ واباوبووە کە ئەگەرئافرەتێك جەرابووبێ لەکاتی ژان گرتنا تەقەیان کردوە بۆئەوەی زوو رزگاری بێ .

تەرووبادان :
ئەمە بەکارهاتوە بۆ نەهێشتنی بالووکە .

کەڵەکەبەرد دروست کردن :
کەڵەکەبەردیان دروست کردوە لەسەر ڕێگاوبان بۆئەوەی ئەو رێبوارەی کە لەوێوە رۆیشت بیرووخێنێ تا بالووکەی ئەو بپەڕێ کە بەردەکەی کەڵەك کردووە .

میزکردن بە پشیلەدا :
وتراوە گوایە ئەمەیە ئەبێتە هوی ئەوەی مرۆڤ تووشی بالوکەدەران بێت .

خورووی بەری پێ :

وا زانراوە کە گوایە هەرکەسێ بەری پێی بێتە خوورروو سەفەری دێتەبەر .
خوورووی بەری دەس :

وازانـروەکە گوایە هەرکەسێ بەری دەستی ڕاستی بێتە خوورروو پارەی دێتە دەست ، ئەگەر بەری دەستی چەپی بێتە خوورروو پارەی ئەڕوا .

ڕیوی بەپیرەوە هاتن :

گوایە ئەگەر لەسەفەرا لە ڕیگاوبانا ڕیپوی هاتە سەر ڕێێ هەر کەسێ ئەوا لەو سەفەرەدا تووشی سود ئەبێ و ئەبێ بە سەفەرێکی هات بوی .

کەرۆیشك بەپیرەوە هاتن:
ئەمەش نیشانەی نەهاتیی یە.

دەم وچاو شتنی پشیلەی ناومالْ:
ئەمەش نیشانەی میوانی خۆشەویست هاتنە.

بایەقوش خوێندن:
نیشانەی کاول بوونی ئەو شوێنەیە.

پیرەمێردی شاعیر ئەڵی:

بایەقوش لە هەر جیٚیە بخوێنیٚ
یاخێوی ئەمریٚ یائە یرِوخێنیٚ

خوێندنی مریشك وەك کەڵەشێر:
گوایە نیشانەی سەرخواردنی خاوەنیەتی و گورج مریشکەکە سەرئەبرِن بۆئەوەی سەری خۆی خواردبیٚ.

بارخستنی مریشك:
بارخستنی مریشك و گسکدانی منالْ لەخۆیەوەو شڵپەی ئاو کە ئەرِیٚژرِیٚ، نیشانەی میوان هاتنە.

پیلاو سواربوون:
ئەمەش نیشانەی سەفەرکردنە بەرەو ئەو شوێنەی لوتی پێلاوەکەرِووی تیٚ کردوە.

چاوفرِیین:
چاوی رِاست فرِین نیشانەی خۆشی یەو چاوی چەپ فرِین نیشانەی ناخۆشی یە.

مقەست دانە دەس یەکتر:
مقەست دانە دەس یەکتر بە بێ دانانی ئەبێتە هۆی ناکۆکی ئەو دووکەسە.

نینۆك کردن بە شەو:
ئەمەش گوایە باش نی‌یە.

ئاوڕشتن بەدووی کۆچکەرا:
هیوایە بۆئەوەی زوو بگەڕێتەوە.

کەڵەشێری ناوەخت:
گوایە کەڵەشێر لە ناوەختا بخوێنێ نیشانەی مردوو مردنە، وە بۆ ئەوەی ئەو کارە بەتاڵبێتەوەو ڕوونەدا، خێرا کەڵەشیرەکەیان سەربڕیوە.

دەنگی کلپەی ئاگر:
کە دەنگی کلپەی ئاگری گڕ هات نیشانەی ئەوەیە ئەوەی ئاگرەکەی داگیرساندوە غەیبەتی ئەکرێ.

مێروولە:
ئەڵێن گوایە مێروولە ڕووبکاتە هەر ماڵێك بار بە خاوەنەکەی ئەکات.
شەڕی چۆلەکە: نیشانەی خەبەری خۆشە بۆ ئەو ماڵەی چۆلەکە شەڕی تیا بکات.

بەستنی زاوا:
گوایە ئەگەر لەکاتی مارە کردنا، پەت گرێبدرێ یان پەنجە بتەقێنرێ یا چەقۆ دابخرێ یا تۆز فرێ بدرێ ئەبێتە هۆی بەستنی زاواو لە پیاوەتی ئەکەوێ لەکاتی زاوایی‌یا تا ئەو شتە ئەکرێتەوە.

مێردەزمە (مۆتەکە):
باوەڕ وایە کە ئەگەر یەکێ لەسەر پشت بنوێ (مۆتەکە) یەتە سەری بۆ ئەوەی بیخنکێنی، وە ئەگەر هاتو لەوکاتەدا ئەوکەسە دەس بەرێ بۆ (بەندەخوێنی) دەرپێکەی دەس بەجێ ڕائەکاو ئەوکەسە ڕزگاری ئەبێ.

جنۆکە:
باوەڕ وایە شتێکی نهێنی‌یە ئەتوانێ خۆی بخاتە شێوەی هەموو گیان لەبەرێکەوە. بەزۆری لە گەرماوو سەرکانی‌یا زۆرە.

کلاوی چڵکن:
ئەڵێن گوایە پارەدار کلاوی چڵکنە.

تەماشای ئاوێنە کردن بەشەو:
ئەڵێن ئەگەر بە شەو تەماشای ئاوێنە بکەی ئەچی بۆ غەریبی.

کلاو هەڵ وگێر کردن:
ئەڵێن ئەگەر کلاو بە هەڵەوگێڕاوی بکرێتە سەر نیشانەی هاتنی گرانیە.

ئەم شتانەش وتراوە:
ئەڵێن: دووکەڵی تەپاڵەبۆ ڕەوە مێشوولە باشە.
ئەڵێن: پیاوی پشت مل پان نەفامە.
ئەڵێن: شەو گسك دان باش نی‌یە.
ئەڵێن: سەری زل دەوڵەتەو پێی زل نەگبەتە.
ئەڵێن: گوێی ڕاستت بزرنگێتەوە هەواڵی خۆش ئەبیسی‌و گوێی چەپت بزرنگێتەوە هەواڵی ناخۆش ئەبیسی.
ئەڵێن: سەگ بلوورێنێ هەواڵی کوستی پی‌یە.

ئەڵێن: پۆلیس لەخەوا مەئمووری خوایە.

پێشینان وتوویانە:

- خۆراك ئەبێتە هۆی گۆڕینی کردەوەو ڕەوشتی مرۆڤ.
- ئەو ژنەی حەز لە خواردنی شیرو ئەو شتانەی لە شیر دروست ئەکرێ بکات، هەمیشە هێواش و لەسەرخۆ ئەبێ.
- ئەوەی حەز لە سەوزە بکات، دڵسۆز ئەبێ.
- ئەوەی حەز لە گۆشت بکات، حەز لە گەورەیی ئەکات و بلیمەت ئەبێ.
- ئەوەی حەز لەمیوە بکات، چاوی جوان و سەرنج ڕاکێش ئەبێ.
- ئەوەی حەز لە چەوری بکات، تەمەڵ و تەوەزەڵ ئەبێو حەز لە جولاّن و یاری ناکات

* * *

# داوو دەرمان.

- لە زۆر وولاتی پێشکەوتودا بەتایبەتی لە وولاتانی سۆشیالیستیدا، ئێستا بەگەرمی ڕوویان کردۆتەوە داوودەرمانی میللی‌ی کۆنی خۆیان.

ئەم دەرمانانە کە زۆرتری لە گژوگیاو ڕوەك (نبات)ە، بەری تەجروبەی هەزارەها سالانی ژیانی خەڵکە، لەبەر ئەوە بایەخی زۆربەیان لە تاقیکردنە وەدا سەرکە وتووو زانستی تازە دان بەم ڕاستیانەدا دەنێ و هۆی عیلمی‌یان بۆ ئەدوزێتەوە.

بۆ ئەمرۆی ئێمە، ئەرکی سەرشانی ئەو کەسانەی فۆلکلۆر کۆئەکەنەوە ئەوەیە کە بەدووای ئەم چەشنە داوودەرمانەدا بگەڕێن، ناوو شوێنی بوون و چۆنێتی‌ی بەکارهێنانیان تۆماربکەن. بەمە کەرەسەیەك بۆ زاناو پسپۆرەکانمان ئامادە ئەکەن خۆزگەش بەوە ئەخوازین کە زانایەکی پسپۆڕ ئەرکی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرێتە ئەستۆی و ئەم کەرەسەیبە بکات بە بابەت نامەیەکی زانستی‌وبباتە بەردەم دەستگاکانی زانستی جیهان.

هەرچی لەو بابەتەیەو لە دووتوێی ئەم کتێبەدایە، ئەوە وەرگرتنە لەسەرچاوەیەکی بەنرخی پێشووەوە نووسەر بەمە ڕێگەی گەڕان و وڵێ زیادکردن و کەرەسەی لێکۆڵینەوەی بۆ ئەو مەبەسەی باسمان کرد خۆش کردووە، دیسان دەتوانین لەم کەرەسەیەدا شتی تایبەتی‌ی کوردستان، یا سلێمانی ببینینی‌و ڕەنگە شتی گشتی‌ی ئەم ناوچەیە یا جیهانیش هەبێ، بەتێکرا ئەمە ڕێگە خوشکر دنێکی باشەو چاوەڕێی هەوڵی مەردانەی پسپۆڕانین.

(ع . م . ن)

# فۆلكۆری تیمارکردن

هی مرۆڤ و هی ئاژەڵ

هی مرۆڤ: بە دوو چەشن تیمار ئەکرێ

١ ـ بە دەرمان:

* ئەم دەرمانە سادانە بەکارئەهێنرێن بۆ چارکردن:

بەیبونە گوڵەفەقێ: جۆش ئەدرێن هەریەکەیان بۆ ژانەسك.

عەرەقی نەعنا: ئەخورێتەوە بۆ ئینتەلاو ژانەسك.

ئاوخواردنەوەی بەیانیان: بەناشتا بۆ یاریدەدانی ئازیمە.

گوڵە باخی ئەسل: بە کوڵاندن ئەیدەن بە نەخۆش بۆ ڕەوانی [جۆش ئەدرێ].

بنێشتەتاڵ: ئەخورێ بۆ ڕەوانی.

گەلاتووتن: بۆ مڵەخرە بەکاری ئەهێنن [ئەخرێتە سەری]

گەڵاتو: ئەکوترێ‌و ئەی‌خەنە سەر شوێن پێوەدانی دووپشك.

گەڵای سیس عومەر: ئەکوترێ‌و ئەنرێ لەشوێن پێوەدانی دووپشك.

مۆرد: بەکاری ئەهێنین بۆ وەستانەوەی ڕەوانی.

قەیتەران: ئەی‌کوڵێنن و ئاوەکەی ئەخورێتەوە بۆهێزپەیداکردن و لابردنی لەرزینیی جومگە.

توێکڵەبی: ئەکوڵێنرێ‌و ئاوەکەی ئەخۆن بۆ بەهێزبوون.

گەڵای‌بی: بە تەڕی ئەیخەنە سەر قاچوقولی یەکێك کە تای توندی لێ‌هاتبێ بۆ فێنك کردنەوەی ئەو تایە.

گەڵا چەق چەقە: پاش کوڵاندنی ئاوەکەی ئەدرێ لە زیپکە.

گوڵەهێرۆ: بەکوڵاندن بەکارئەهێنرێ بۆ کۆکە.

قنگاوڵێ: پاش کوڵاندنی بە ڕۆن سوری ئەکەنەوەو ئەیخۆن بۆ ڕەوانی‌و بەهێزکردنی گەدەو ڕیخۆڵەکان.

شەلـەمـە: [شـەرواڵ بەکـۆل]: بە شاخە سەختەکانەوە هەیە، سەلکێکی گۆشتنی

**[١] هەروەها بۆلابردن و نەهێشتنی بەردولمی گورچیلە [ع. م. ر]**

هەیە کە پڕیە لە شیلە، بە کاڵی ئەیخۆن بۆ ڕەوانیو کرم فڕێدان، یاوەکو کلۆیەك شەکر شیلەکەی هەڵ ئەمژن هەرکاتێك بیانەوێ کلۆشەکرەکە ئەخۆن بۆ ئەم مەبەستە.

چای فەریکە قەزوانی ووشك: بۆ وەستاندنەوەی ڕەوانی بەکار هێنرێت.

ڕێواس: ڕێواس بۆ کرم دانان و بۆ ڕەوانیش بە کاڵی ئەیخۆن.

مالەوێچە: بە کوڵاوی ئەخورێ بۆ ڕەوانی.

شاتوو دۆشاوی شاتوو: بۆ خروزەك و دەنگ نوسان.

گەڵاهەنجیر: بۆ کەچەڵی باشە ئەویش سەری کەچەڵی پێ ئەشۆن.

گەڵاتوو: ئەخرێتە سەربرین بۆ دەربوون.

گەڵاگوێز: ئەخرێتە سەربرین بۆ دەربوون.

پیازی نەپیشاو: بۆن ئەکرێت وە ئەیخۆن بۆ هەڵامەت.

تووتنی وورد: لە سەرلەپی دەست هەڵی ئەمژن بۆ هەڵامەت.

بە هێ‌ی‌پیشاو: ئەیخۆن بۆکۆکەو قورگ نووسان.

هەناری شیرینی پیشاو: گەرمی ئەکەن و ئەیخەنە سەر گازی مارو جێ‌ی پێوەدانی دووپشك.

پێزی هەویر: ئەخرێتە سەر شوێنێ کە دەرزیو دڕکی تیابێت لە لەشی مرۆڤدا بۆ دەرهێنانی [بەتایبەتی دەست وپێ].

بۆسۆ: ئەدرێ لە لووتی بێ‌هۆشێ بۆ هێنانەوە سەر هۆش.

شەکراو: بۆ سووتاندن بە کاری ئەهێنن.

مەرەکەب: بۆ سووتان بەکاری ئەهێنن.

ماست: بۆ سووتان بەکاری ئەهێنن.

گەڵای گەرچەك: ئەدرێ لە ئاڵۆی کەوتوو.

ڕێحانە کێویلە: بە کوڵاوی ئەیخۆن بۆ کۆکەو ئازاری سنگ.

جاترە کێویلە: بە کوڵاوی بەکاری‌ئەهێنن بە خواردن بۆ سەرماو ژانەسك.

ڕۆنی کونجی: شوێنی سووتاوی پێ چەور ئەکرێ وە پێش شێلان یشتی پێ

**پیازی پیشاو! بۆدەربونی برین کە بخرێتە سەری وەبۆهەڵامەت .**

برۆیش: ئەخرێتە سەر برینێك کە ئاوسابێ بۆ نیشتنەوەی ئاوسانەکە.
رۆنی درکەزی: ئەیسوتێنن و رۆنەکەی ئەدرێ لە بیرۆ.
رونی داری گوڵەباخ: ئەیسوتێنن و رۆنەکەی ئەدرێ لە بیرۆ.
دۆینە: ئەیگرنە سەری نەخۆشی گرانەتێدار.
ترخێنە: ئەنرێتە سەر مووسلانی منالی باژێڵەدار. وە ئەخورێ بۆ کۆکەو هەلامەت.
رۆن بادام: بو سوریژەو ئاوڵە دەرکردو، بەکارئەهێنرێ، وە ئەخورێ بۆ رەوانی.
ئاوی کەرەوز: ئەخورێ بۆ میز بەردان.
پێستی ئاژەڵی وورده: بە خوێنەکەوە ئەنرێ لە شوێنی گازی مار دوای هەڵژینی بە کەڵەشاخ.
رۆنی ژیشك: بۆ ترەکینی دەست بەکارئەهێنرێ.
شەربەتی مێوژ: بۆ خوێن زۆر کردن و قەڵەو بوون.
دۆشاوی رەگی هەنجیر: پێستی پێ چەور ئەکرێ بۆ بای سەودا.
دووکەڵی جگەرە: قانگی گوێی ئێشاوی پێ ئەدرێت.
هەنگوین: بۆ گرفت ئەیخۆن، هەروەها بۆ بەهێزکردنی گەدەو ریخۆڵە.
ریخۆڵەی ژیشك: بۆ باژێڵەی منال.
تۆوی پەڵپینە: بۆ میز بەردان.
گوشتی رێوی: بۆ باداری باشە لەبەرئەوە ئەیخۆن.
فرووجار: بۆ بەهێزبوون و حەسانەوە.
بەزەتاو: ئەنرێتە سەر برین و ترەکینی پێست.
تۆو کەتان: ئەنرێتە سەر خەیارە بۆ گەیاندنی.
هیزە: بۆ کوڵنج و رەقیتە.
پێستی بەرخ: یا بزن: بۆ دەرهێنانی گوللە لە گۆشتا. بۆ گرتنەوەی شکاویو لەجێ چوون.

شەکر: وورد ئەیهاڕنەوەو ئەیکەنە سەر برین ; **بۆ دەربوون.**
دووکەڵی شەکری سووتاو: بۆن ئەکرێ بو هەڵامەت.
هەڵمی سرکە: بۆن ئەکرێ بۆ سەرئێشە.
ئاوی کولاوی ساردەوەبووی بەر سایەقە : بۆ نەخۆشیێکە ئاوی پێ نەدرێ.
ئاوی گەلابی : بۆ گرێ دەروون.
بەرمێو : ئەخرێتە سەر دوومەڵ بۆ دەربوون.
ئاوی سەروپێ : ئەخورێتەوە بۆ چاك بوونی ئێسکی شکاو.
بەردووگ : بو نیشاندنەوەی ئاوساوی برین.
دۆی گەرم کراو : ئەدرێ لە شوێنی پیوەدانی دووپشك و مارو مەگەز.
دۆی دۆنیە : ئەخورێت و ئەگیرێتە سەری خۆربردوو بۆ چاك بوونەوەی.
شیر : ئەیدەن بە ماران گاز کە بیخواتەوە.
ڕۆنی قرچاو : بۆ خوێن بەستنی ئەندامێك کە پەڕیبێت.
گوشتی قەلەباچکە: ئەیدەن بە سێبەڕۆدار بۆ چاك بوونەوەی.
توێکڵە هەنار : گەرم ئەکرێو ئەنرێ لە تامێلك.
بەلاڵووك: بو ڕەوانیو ژانەسك.
بەڵخی بەردی ناوئاو: ئەیدەن لە برینی دەم و چاوی منال.
گۆگرد: بۆ نەخۆشی پێست.
زاخ : شافی لێ دروست ئەکرێ.
گڵەسوور : بوئەوەی گلاوێ پێ دەربکەن و پاك کردنەوە گازی مەگەز.
خۆڵەمێشی کورەی ئاسنگەر : بۆ کەچەڵی.
ژەکی ژن: بۆ بیرۆ.
ناوکە کولەکەی کاڵ : بۆ کرم دانان.
توێکڵە شووتی: ئەیدەن لە پێست بۆ لابردنی گەرمەژنە.
* دەرمانە تێکەلاوەکان بەکارئەهێنرێن بۆ چارەکردن:
نانی تیری + گەلامێوی ووشك + سابوونی ڕەقی = مەڵحەمێکە بۆ دومەڵ.
گەلا گویز + خەنە = بۆ ژانەسەر.
**گوڵە وەنەوشە + شیری کچ = ئەخورێ بۆ ئەسپەك**
[١] لە مۆسکۆ لە دەرمانخانە کان بۆ ئەومەبەستە ئەیفرۆشن [ع . م . ر]

رازیانه + شەکر = بۆ دڵ ئێشەو ڕەوانی.
ئاردی گەنم + زەردێنەی هێلکه = ئەبێ بە مووشەما بۆ سەر برین.
هەویر + ڕۆن = نیونمەکه ئەیخەنه سەر برین و سەر ڕەقیته.
گیاوەردێنه + شیری کچ = بۆ چاوئێشه.
خەنه + ئاوی شاتەرە = بۆ قڵیشانەوەی ژێرپێو خارشت (حەرارەت).
رازیانه + شیر = ئەخورێ بۆ دڵ ئێشەو قەڵەوبوونی مناڵ.
گوڵە هەناری فارس + سمڵ + زاخ + توێکڵە نارنج + گڵە ئەرمەنی = توزێکه بۆ پووك ئاوسان و دان ئێشه.
کەفی ترشێ + گڵەسوور + خوێ = بۆ هەڵ پشکووتنی لێو.
ترشەسماق + خوێ + ئاو = بۆ ئاگرە.
قاوە + ڕۆن = بۆ دەنگ نووسان.
پوونگه + خوێ = بۆ ژانەسکی مناڵ.
سێپەرە + ئاردەبرنج = بۆ ژانەسکی مناڵ.
زاخ + ئاوی گەڵابی + خەنه = ئەگیرێ لە لەشی مناڵی گەرمابردوو.
پوونگه + ڕۆن = بۆ کوڵنج.
ترشه سماق + گوڵاو = ئەیکەنه چاوی سووریژە دارەوە بۆ پاراستنی.
کەفی ماشی ڕەش + سابوونی ڕەقی = ئەخرێته سەر سێبەنەی مناڵێك میزبکات بەخۆیا.
هەنگوین + توور = بۆ گرفت.
هێلکه + ڕۆن + ترش = بۆ وەستانەوەی سك چوون.
تۆراخ + فەریکه قەزوان =بۆوەستاندنی سك چوون.
گۆشت + زیرە = ئەکرێت بە شفتەو ئەخرێته سەر لاجانگ بۆ سەرئێشه.
گوشتی گا + تاڵیشاری = ئەخرێته سەر موسڵانی مناڵ بۆ باژیلە.
کووزەڵە + ئاڵەت + زەنجەفیل = بۆئەوە بەکاری دێنن کەمناڵی پێ‌لە باربەرن (ئافرەتێك سکی پڕبێو بیەوێ سکەکەی فرێبدا).
مێوژە ڕەشکه + سیر = بۆ مایەسیری ئەیخۆن.

* مورروویەکی یاقیق ئەخرێتە ئاگرەوە لەلایەن یەکێکەوە کە  وومی بێت [ ووم دار ئەوکەسەیە کە لە باووباپیریەوە بۆیماوەتەوە گوایە دەستی بە فەڕە] تا سوورئەبێتەوە دوایی ئەنرێ بە سەروی ناوچاوانی منالا وە ئەیسوتێنن دایکەکەی سێ ڕۆژ لەسەر یەك تفی خوی لێئەدا تا شوێنی سووتانەکە ئەبێ بە برین، ئەمەش بۆ چارکردنی منالی خەرکانەداره دوایئەم هەنگاوە مەلحەمێك دروست ئەکرێ لە :

خەنـە + قەتـرانی خەرکـانـە (وەکـو دۆشـاوی ڕەش وایـە) + ڕۆنێ بێگـانـە (ڕۆنی مالێکیتر) = ئەدرێ لە برینی خەرکانەکە.

*جۆ + گەلابی + مەرداسەنگ (وەکو گوگردە بەلام ئەم سوورە) + گوگرد + زاخ + خەنە + ڕۆن + دووکەلی بن مێچ + ڕۆرنج + ترش + گەلای دارەبەن = ئەمانە هەمـوویـان پێیـان ئەوتـرێ (حـەوت دەرمـانـە) بۆ کەچـەلی بەکاریدێنن گەلای دارەبەن ئەکولێنرێ تا دۆشاوێکی خەستی لێ دەرئەچێ وە ئەیدەن لە سەری کەچەل.

* گەلاگایمە : گەلایەکی گەورەیە ئەکرێ بە مووشەماو ئەدرێلە پشت بۆ باداری.

* بابنی پیچ : بەری گیایە لەگەل حەوت دەنك ڕیقنەی چۆلەکە بۆ ژانەسکی منال.

* قژی ئافرەت : ئەهێنرێ بەناو دەمی منالا بۆ بۆقژە.

* توێکلی شووتی + ڕۆنی کزن = بۆ کەچەلی.

* خوێی هاڕاو + خەلووزی هاڕاو = بۆ پاك کردنەوەی دەم ودان.

* ڕۆنی دووگ + کزنی سووتاو = بۆ کەچەلی.

## ٢ - چارەکردەن بە بێدەرمان :

بە دوو جۆر نەخۆشی چار ئەکرێ :

أ - بە بڕوا کە لەفۆلکلۆری ئاینەوانیا بەدرێژی ئەیخوێننەوە.

ب - بە کردار کە ئەمانەن :

* ناوك گرتنەوە : بە پەت . بەکووپەلە . بەسەرمەقولات بردن. بە خوڕاتەکاندن

بەمەرجێ قاچی لە زەوی ببڕێت.

* دڵ گرتنەوە : بە دەست خستنە سەر سك.

* کولنج بە شێلان.

* فریشك گرتنەوەی منداڵ : بۆ فریشك کەوتن.

* مەلاشوو هەڵ دانەوەی منداڵ بۆ چاك بوونی خێلی.

* شکاوی‌و لەجێ‌چوون گرتنەوە و چاك کردنەوە.

* شمشماڵ ژەندن بۆ یەکێ کە ئەسپەك گرانەتا لێ‌ی‌دابێ.

* دەست بە سکا هێنان بۆ گرفت.

* تیرۆك بە پشتا هێنان : بۆ پشت وەرگەڕان.

* ئەڵقەرێز : بە بەیانیان ئەهێنرێ بەلالغاوەدا بۆ لغاوەبڕە.

* بینی مەلاشوو لە تەپڵی سەرا: بۆ خروزەك.

* ئاڵووگرتنەوە : پەنجە ئەکرێ بە قوڕگا بو تەقاندنی.

* ناوچـەوان و ڕومـەت جنین بە نەشتـەر : بۆ ماشـەرا (نـەخـوشی‌یـەکە دەم وچاو گیڤ ئەکاو سووری‌ئەکاتەوە ).

* زەرو : ئەنرێت بە پێستەوە خوێنی پیس هەڵئەمژێ.

* کەڵەشاخ : بۆخوێن گرتنی پشت و ناوشان و بوگەستنی مار.

* خوێن گرتنی ژێر زمان و بن گوێچکە.

* نەخۆش خستنە ئاوی ساردەوەو داچڵەکاندنی، بۆ پەڕاندنی لەرزو تا.

* پووشینی ڕەش: بۆفێ لێ‌هاتوو ئەدرێ بەسەریا.

* کۆپان: منالێ کە دەردەکۆپانی بێت ئەخرێتە ناو کۆپانێکەوە.

* بۆ ترس دەرکـردنی‌منـاڵ: سێ ئێـوارە لەسـەریـەك لە بەردەرگـای ماڵ پشکـۆ ئەکوژێنرایەوە بەسەر منالا بۆئەوەی ترسی دەرچێت.

* پەڕ بەکارهێنان : ئەکرێ بە قوڕگا بۆ ڕشانەوە.

* گیا بەکارهێنان : ئەکرێ بەلووتا بۆ پژاندنی‌و ڕوون بونەوەی چاو.

* بەردی گەرم: ئەنرێ لە جێ‌ی پێوەدانی مەگەزی وەك زەردەواڵە.

* خشت گەرم کردن : مایەسیریدار لەسەری دائەنیشێ.
* تفەنگ تەقاندن بەسەر ئافرەتی ژان گرتوودا: بۆ ئەوەی زوو منداڵەکەی ببێ.
* بەیانیان چوونە ناو ئاوی ساردەوە پێش هەتاوکەوتن سێ ڕوژ لەسەریەك : بۆخۆربردوو.



## تیمارکردنی ئاژەڵ

توێکڵەهەنار + ماست : بۆ برینی وولاخی بەرزە.
جەوی : بۆ برینی ئاژەڵێك کە کرمی تیا بێت.
ناوکە قەیسی تاڵ: بۆ برینی ئاژەڵێك کە کرمی تیا بێت.
گەلای قۆخ: ئەکوترێو ئاوەکەی ئەکرێتە برینی ئاژەڵ.
داخ کردن : بۆ ولاخی ژان لیهاتوو.
گوێ بریندارکردن: بۆ ولاخی ژان لێ هاتوو.
نەوتی ڕەش و
گوێنی کۆن و
تووتن و
گزگل:
بۆ برینی ولاخی بەرزە .

دۆشاوی ڕەش: بۆ مەقاوی ولاخی بەرزە.
برویش: ئەنرێ لە برین.
قوری پیس: بۆ گەڕی.
تفەنگ تەقاندن بەسەر ڕانا : بۆ پەرینی دەردی تەبەق لەناو ڕانەکەدا.
دۆی ترش: بۆدۆوکەی چاو.
**ڕبەنار، ترش وخوێ: بۆنە خۆشی مریشك.**

ریقنه: ئەنرێ له ئێسکی شکاوی باڵنده.
بنێشتەتاڵ: بۆ شکاوی ئێسکی ئاژەڵ.
دۆشاوی توێکڵەداری بناووچ: بۆ برینی پشتی وڵاخی بەرزه.
سەرچـــاوه: ـ له کتـێـبـی [ســەرنـجـێـــك له دەروازەی فۆلـکـلۆری کوردەوه] له بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان، ساڵی ١٩٦٠ ز.

* * *

## (ئەو شتانەی له ماڵانا بەکار ئەهێنران)

١ ـ مەسینەو لەگەن، له مس دروست ئەکرا، بۆ دەس شتن بەکارئەهات.
٢ ـ سەماوەرو قۆریی شووشەو وپیاڵەو ژێرپیاڵەو کەوچك و چاپاڵێو.
٣ ـ کورەیچالێنان به گڵەسوور دروست ئەکرا به خەڵوز بەکارئەهێنرا.
٤ ـ ئاگردان ـ به گڵەسوور دروست ئەکراو داری ئەخرایه ژێر بۆ چێشت لێنان بەکارئەهێنرا.
٥ ـ مقەڵی زەردو ژێرمقەڵیو مقاش، ئاگری خەڵوزی گەشاوەی ئەخرایه سەرو له مەجلیسا دائەنرا له زستانا.
٦ ـ مەسێنەی حەوت جۆش و مەسینەی مس بۆ ئاو گەرم کردن. بۆئاوەده سخانەبەکارئەهێزا.
٧ ـ سەبەتەی پڵاوپاڵێو پڵاوی پێ ئەپاڵێوراو بۆ نان تەڕکردنیش بەکارئەهات.
٨ ـ قولێنه نانی تیا هەڵئەچنرا بۆ هەڵگرتن.
٩ ـ سەرهەویر: پارچەیه خام بوو ئەدرا بەسەر هەویراو لەکاتی نان تەڕکردنا ئەدرا بەسەر نان دا.
١٠ ـ سوێنه ـ بەگڵەسوور دروست ئەکرا، بۆ جل شتن بەکارئەهات.
١١ ـ تەشتی مس ـ بۆ جل شتن و هەویر شێلان بەکارئەهێنرا.
١٢ ـ سوزگی مس تەشتۆلکەیەکی کون کون بوو بۆ شت تیا ئاوەچۆڕ کردنی دوای شتنەوه بەکارئەهات.

١٣ ـ لەگەن بۆ چیشتی شلە بەکارئەهات.

١٤ ـ یەغنی‌کیش بۆ چیشتی شلە بەکار ئەهات.

١٥ ـ دەوری‌و چینی (فەغفوری) بۆ شلەو برنج.

١٦ ـ کەوچکی دار بۆ چێشت تێك هەڵدان چونکە گەرم نابێ‌و بو چێشت خواردنیش بەکارئەهێنرا، گەورەو بچووکی هەبوو.

١٧ ـ کاسەی دار ـ بۆ ئاوودۆ خواردەنەوە بەکارئەهات.

١٨ ـ جامی فافۆن بۆ ئاوودۆ خواردنەوە بەکارئەهات.

١٩ ـ کاشی ماستاووکەوچکی ماستاوی دار بۆ مامستاوخواردنەوە بەکارئەهات.

٢٠ ـ دییزە بە گڵەسووردرووست ئەکرا بۆ رۆن تیا هەڵگرتن و قاورمە بەکارئەهێنرا.

٢١ ـ گۆزە بە گڵەسوور دروست ئەکرا بۆ ئاو.

٢٢ ـ دەرخۆنە بە گڵەسوور دروست ئەکرا بۆ سەری مەنجەڵ.

٢٣ ـ مەنجەڵی پەردەپلاو لە مس دروست ئەکرا بۆ چێشتی پەردەپلاو.

٢٤ ـ مەنجەڵی مس بۆ چێشتی شلەو برنج.

٢٥ ـ سێپا ی چێشت لێنان لە ئاسن دروست ئەکرا، داری لەژێرا ئەسوتێنرا هەموو جۆرە مەنجەڵێکی ئەخرایەسەر.

٢٦ ـ کوورەی تاس کەبابی لە گڵەسوور دروست ئەکرا ئاگری خەڵوزی تێ‌ئەکراو تایبەتی بوو بۆ لێنانی جێشتی (تاس کەبابی).

٢٧ ـ کەوگیر لە مس دروست ئەکرا بۆ تێك هەڵدانی چێشتی برنج و تێ‌کردنی بەکار ئەهێنرا.

٢٨ ـ دۆڵ و دەسکەدۆڵ لە بەردیش دروست ئەکراو لە داریش بۆ شت کوتان تیایا.

٢٩ ـ دەسکەوانەی زەرد دوبارە بۆ شت تیاکوتان.

٣٠ ـ دەستاڕ ـ لە بەرد دروست ئەکرا بۆ دانەوێڵە هاڕین وەك گەنم و ساوەرو نیسك.

٣١ ـ کەننوو ـ بە گڵەسوور دروست ئەکرا دو سێ فەردە گەنمی ئەگرت، گەنم و جۆو چڵتووکیان تیا هەڵئەگرت.

٣٢ ـ پنەو تیرۆکی دار بۆ نان کردنەوە لەسەری بەکارئەهێنرا. پنەش هەبوو لە گەچ

یا لە دار دروست ئەکرا.
٣٣ ـ کووپە بە کلەسوور دروست ئەکرا بۆ زەخیرە.
٣٤ ـ لەنکەری تەختە زەخیرەی لەسەر بەبائەکرا.
٣٥ ـ شەربە بۆ ئاو ساردکردن بەکارئەهات.
٣٦ ـ ئەسکوی کەوچکێکی گەورەی دار بوو بەکارئەهات بۆ دوو ماستاوو چێشتیشی پێ تێ ئەکراو ڕۆنی لە دیزەدا پێ دەرهێنرا.
٣٧ ـ هێلەك وپێژنگ ووالابێژ بۆپێژانەوەبەکارئەهات.
٣٨ ـ گومگومەی مس بۆ ئاوی گوڵاوو ئارەقی نەعنا بەکارئەهات.
٣٩ ـ کورسی تەختە بەنکی گەورە لە هاوینا هەڵئەدراو خێزان لەسەری ئەنوستن و بە پەیژە بۆی سەرئەکەوتن.
٤٠ ـ چیغ :ـ ئەمەش بە بەرچیغ دروست ئەکرا وە لە هاویندا وەکو ژوور ئەیانگیرا بەدەوری خۆیانداو لەناویا ئەنوستن بۆئەوەی لە سەربانانەکانی‌ترەوە نەبینرین.
٤١ ـ شەکرشکێن : ئەمەش بەکارئەهێنرا بۆ پارچە پارچە کردنی کەڵە شەکر لە شێوەی کلۆدا بۆ پیوەخواردنەوەی چای دیژلەمە.
٤٢ ـ شەکردان :ـ ئەمەش بەزوری لەسەر دار دروست ئەکرا وە کەڵە شەکری لە سەر پارچە پارچە ئەکرا بە شەکرشکێن.
٤٣ ـ چەپەجاخ :ـ ئەمەش لە ئاسن دروست ئەکرا وە بەکارئەهێنرا بۆ وردکردنی گۆشت و بۆ قیمە کردن.
٤٤ ـ گوڵاوپرژێن :ـ گوڵاوپرژێنی وارشاو، گوڵاوپرژێنی شووشە، ئەمەش گوڵاوی تێ‌ئەکراو ئەپرژێنرا بەسەر دەست و دەم و چاوا.
٤٥ ـ ئاشی قاوە: لە زەرد دروست ئەکرا بۆ هاڕینی قاوە.
٤٦ ـ جزووەو فنجانیی قاوە :ـ ئەمانەش کەرەسەیەك بوون بۆ لی‌نان و پێشکەش کردنی قاوە.
٤٧ ـ ڕەندەیی پەنیر :ـ ئەمەش بە زوری لە تەنەکە دروست ئەکرا وە بەکارئەهێنرا بۆ وردکردنی سەلکە پەنیر لە شێوەیەکی ڕێك وپێکدا.
٤٨ ـ بوخچە :ـ ئەمەش لە پارچە قوماش دروست ئەکرا وە بەکارئەهێنرا بۆ

پێچانەوەی جل بەرگ لە ناویدا، وە هەروەها کەرەسەی خۆشتنی تێ ئەخراو ئەپێچرایەوە بۆ حەمام.
٤٩ ـ سندووقی بوڕاق :ـ ئەمەش لەجیاتی کەنتۆری ئێستا لە تەختە دروست ئەکرا ئاوێنەبەند بوو جل وبەرگ و بوخچەی تیادا هەڵئەگیرا.
٥٠ ـ تاسی حەمام :ـ ئەمەش لە مس دروست ئەکرا کەرەسەی خۆشتنی ئەخرایەناو، وەکو لفکەو سابوون و شانەو بەردەپێ و هەندێ شتی تر.
٥١ ـ تەختەی حەمام :ـ بەزۆری بۆ حەمامی ماڵەوە بەکاردێت بۆ دانیشتن لەسەری لەبەر گەرمی وە هەروەها لە حەمامی دەرەوەش هەر بەکاردێت.
٥٢ ـ چرا :ـ ئەمیش لە شووشە دروست کراوە وە نەوتی تێ ئەکرێت وە ئاگر ئەنرێت بە پلیتەکەیەوە وە بەکاردێت بۆ ڕوناکی.
٥٣ ـ قوتیلە :ـ ئەمەش هەر بەکار ئەهات بۆ ڕوناکی وەدروست ئەکرا لە تەنەکەو وە پەڕوو دەزووی ئەستوری تێ هەڵئەکێشراو نەوتی تێ ئەکراو دائەگیرسێنرا.
٥٤ ـ چرای ئاوێنە :ـ ئەمیش هەروەکو چرا وایە بەڵام ئاوێنەیەکی پێوەیە کە ڕووناکیەکە بڵاوئەکاتەوە وە ئەخرێتەسەر کورسی تەختە.
٥٥ ـ بەرماڵ :ـ ئەمیش لە بەنێکی (خوری) ڕەنگاوڕەنگ یان سادە دروست ئەکرێت وە جارجار بە نەخش و نیگارەوە بەکارئەهێنرێت بۆ نوێژکردن لەسەری.
٥٦ ـ قورئان و کورسی و ژێرقورئان :ـ ئەمانەش کەرەسەی قورئان خوێندنن.
٥٧ ـ کەرەسەی خەوتن :ـ وەکو لێفەو دۆشەك و سەرینی پەڕو سەرینی لۆکەو هەروەها جۆرە سەرینێکی تر کە پێی ئەوترێ پشتی.
٥٨ ـ جاجم :ـ ئەمیش هەر لە کەرەسەی بەرماڵ دروست ئەکرا بەڵام گەورەتر بوو وە بەکارئەهێنرا بۆ داپۆشنیی کەرەسەی نوستن واتە ( نوێن).
٥٩ ـ باوەشێن :ـ ئەمەش لە پووش دروست ئەکرا وە دەسکێك دارینی هەبوو لە هاویندا خەڵك خۆی پێ فێنك ئەکردەوە، وە هەرەها لە زستاندا بەکار ئەهات بۆ گەشاندنەوەی ئاگر.
٦٠ ـ بەڕەو حەسیرو فەرش بۆ داخستن.

٦١ ـ کەرەسەی بەفر پاکردنەوەو بان گێران لە زستاندا وەکو پەیژەو بانگردێن و بەفرماڵ .
٦٢ ـ بێشکــە : ئەمــەش منـداڵی ساوای تیـا ئەکـرێتـەخـەو وە بە دەسـرازەکـانی ئەبەسرێتەوەو توندئەکرێت .
٦٣ ـ کەرەسەی مناڵ :ـ ئەمیش هەروەکو بێشکە بۆ منداڵ بەکارئەهێنرێت وەکو بلوێرو قەعادەو رەوەڕەوەجوڵانەی تەختە .
٦٤ ـ تەشی :ـ ئەمەش بەکارئەهێنرا بۆ ڕستنی خوری .
٦٥ ـ میچی کولێرە :ـ ئەمەش ئێسقانی هەندێ ئاژەل بوو (پێچکە) کە بەکارئەهات بۆ نەخشاندنی کولێرە .
٦٦ ـ بەردە یاپراخ :ـ ئەمەش هەندێ بەردی تایبەتی‌یە کە زۆر تەنك و ساف و پانە کە ئەخرێتە سەر یاپراخە لێنراوەکە لەناو مەنجەڵەکەدا بۆئەوەی هەڵنەوەشێت ئینجا سەرقاپەکەی ئەنرێنەوە .
٦٧ ـ گوش و سوژن :ـ ئەمەش جۆرە کەرەسەیە بەکاردێت بۆ دورینەوەی دەمی گونیە .
٦٨ ـ تەِنـــافـی جل :ـ ئەمــەش پەتیکــە لە دوولاوە ئەبــەسـتــرێت وە بە بەرزەوە هەڵئەواسرێت کە دەستی ئادەمیزاد بیگاتێ وە بەکاردێت بۆ هەڵواسینی جل دوای شتنی بۆ ووشك بوونەوە .
٦٩ ـ سواڵــەت :ـ ئەمــەش بریتی‌بـــوو لە پارچـە شکـاوی گۆزەو دیـزەو کووپـەو بەکارئەهات بۆ دانانی خواردن بۆ مریشك و پشیلەو سەگ .

* * *

## (خواردنە کۆنەکان)

زۆر جۆر خواردن دروست ئەکرا کەئێستا زۆربەی ماڵان نەیان بیستوە، تەنیا ماڵەکۆنەکان نەبێت.

ئەم خواردنە کۆنانە، هەریەکەی جۆرە تام و لەزەتێکی خۆی هەبووە هەریەکەیان جۆرە سوودێکی لێ وەرگیراوە بۆ لەشی مرۆڤ ، ئێستا تەواو کەم بوونەتەوەو هاتۆتە سەر چەند خواردنێکی کەم جۆرەو بەتایبەتی شلەو برنج هەرچەندە برنج سودێکی ئەوتۆی نی یە لەوە زیاتر وورگ گەورە ئەکا، جاران هەفتەی جارێك یان دووجار لێ ئەنرا یان هەینی و هەینی، یان سێ شەممەو هەینی لێ ئەنرا لە ماڵە دەس کورتەکانیشا مانگی جارێك یان ئەم جەژن بۆ ئەو جەژن، بۆیە جاران مرۆڤی تەنگەئەستور کەم بوون و مرۆڤی جاران زوربەیان کەمەربارێك و تەمەن درێژ بوون و کەم نەخۆش ئەکەوتن.

جۆری خواردنەکان:

١ - ترش وتەڵاش (چەوەنەر بەترش):

نیسك و نۆکیان ئەکوڵاندو چەوندەریشیان لە رەنە ئەداو لەگەڵ رۆنا تێیان ئەکرد وەکوو شۆربا وابوو مەزەیەکی ترشیشیان ئەداو ئەخورا، ئەم خواردنە لە زستانا زۆر لێ نراوە.

٢ - قلی زەنێ:

ئەم خواردنە بریتی بووە لە برنج و رۆن و قەیسی و کشمیش و گۆشت، بە چێشتە خۆشەی کۆن بەناوبانگ بوو.

٣ - بێبەرە:

دوو سەلك ترخێنەیان ئەهێناو جوان جوان ئەیان کوڵاندو ئەخورا، هەرکەسێك تووشی هەڵامەت ببوایە، بەم چێشتە چاك ئەبووەوە، وەك دەرمان بەکار هاتوە.

٤ - دانوولە شێخانە:

گەنمە کوتاو لەگەڵ نۆك لێ ئەنراو (گیادانو)یان تێ ئەکرد کە گیایەکی بۆن خۆش بوو، چەند ئێسقانێکیشی تێ ئەکرا ئەم خواردنە بەزۆری لە پایزو زستانا لێ ئەنرا.

٥ - هەرشتە بەترش:

ئەم خواردنە بە هەرشتەو نیسك و چەوەندەرو دۆشاوی تەماتەو رۆن دروست ئەکراو لێ ئەنرا، وە ئەمە خواردنی زۆربەی خەڵکی بووە.

٦ - کەبابی بێوەژن (ترش و پیاز):

پیازو تەماتەیان ئەجنیو ترشی کوتراویان پێوە ئەکردو تیکەڵیان ئەکرد ئەمە بەزۆری خواردنی خەڵکی دەست کورت بوو ئیستا بوە بە جۆرە زەڵاتەیەك.

٧ - گۆشت تەنوری:

کە ماڵێك نانیان بکردایە، شیشێکی درێژ یان ئەهێنا پارچە گۆشتی پل گەورەی پێوە ئەکراو خوێیان پێوە ئەکردو ئەیانخستە ناو تەنورەکەوە تا ئەبرژا.

٨ - پرپوڵە:-

نیسکی خریان ئەکوڵاند و کوزەڵەیان ورد ورد ئەجنیو تێیان ئەکرد، ئاردیان ئەهێنا لەسەر کەوڵی نان بڵاویان ئەکردەوەو وەکو نان تەریان ئەکرد واتە ئاویان لێ ئەپرژان، ئەبووبە وردە هەویری خر خرو ئەیان کردە مەنجەڵێکەوەو تێکەڵیان ئەکرد ئەیان کوڵان ئەم خواردنە هەموو کاتێك تا کوزەڵە دەس بکەوتایە لێ ئەنرا.

٩ - چەن سووتەکە:

چەند سەلکەترخێنەیەکیان ئەهێناو ئەیان کوڵانو ساوەرو دۆشاوی تەماتەی لەگەڵ تی ئەکراو لەگەڵ ئێسقانا ئەگەر ببوایەو نەش بوایە هیچ ئەکوڵێنراو ئەخورا.

١٠ - پییرخەنییلە:

رۆن و پیازی بۆ سوورئەکرێتەوەو دۆشاوی تەماتەی تێ ئەکرێ ئینجا پییرخەنییلە شۆراوەکەی تێ ئەکرێ کە ووردەساوەرە لێی ئەگەڕێن تا ئەکوڵێ و بەگەرمی پێشکەش

ئەکرێ ئەم خواردنە بە پیازەوە خۆشەو خواردنێکی زستانەیە.

١١ - لەپەترشی:

ڕۆن و پیازی بۆ سوورئەکرێتەوەو گۆشت وە یا ئێسقانی تێ ئەکرێ لەگەڵ لەتکەنۆك و کشمیش و دۆشاوی تەماتەو نەعنا لەگەڵ کەمەکێ وردەبرنج، لەباتی گۆشت یان ئێسقان ئەتوانرێ سیی یان جگەری تێبکرێو یان یەکێکیان لەم دوانە، کاتی خۆی ئەمە لە شایی‌یا پێشکەش ئەکرا.

١٢ - ترخێنە:

نیسکی خڕو نۆکی بۆ ئەکوڵێنرێ لەگەڵ چەوەنەری سپی خۆمان کە بۆی لە ڕەنندە ئەدرێ لەگەڵ گۆشت و ئیسقانی گۆشتاویو بەهێنیی لە ڕەنندەدراو یان قاش کراو یان جنراو هەندێ کەیبانوو کفتەی وردیشی بۆ ئەکات لەگەڵ مێوژە سوورکەو کاکڵە گوێزو چەند سەلکە ترخێنەیەك بەوجۆرە ئەکوڵێنرێ تا پێ ئەگات.

ئینجا پلاویکی بەزیرەی بۆ لێ ئەنرێو پێشکەش ئەکرێ. ئەمە بەتایبەتی لەڕۆژی بەفربارینا پێشکەش ئەکرێو یەکێکە لە خواردنە هەرە خۆشەکانی زستان.

١٣ - دۆکولیو: -

ماست جوان خاوئەکرێتەوەو نەعنای ووشك یا تەڕی تێ ئەجنرێو ئەیکوڵێنن تا کوڵێ ئەدا ئینجا برنجی تێ ئەکرێو تێك ئەدرێ لەسەر ئاگرەکە تا ئەکوڵێ و خەست ئەبێتەوە و پێشکەش ئەکرێ ئەمیش دیسان خواردنێکی زستانەی بەلەزەتە.

١٤ - گەنمەکوتاو:

لەپێشا ئیسقان و گوشتەکەی بۆ نیوەکوڵ ئەکرێو دوای ئەمە گەنمەکوتاوەکەی تێ ئەکرێ دوای شتنەوەی، زووزوو تێك ئەدرێ بۆئەوەی بن نەگرێو خەستیش بێتەوە، ئەمیش خواردنێکی زستانەیە. بێ گومان هەموو خواردنێك خوێی تێ ئەکرێ بەگوێرەی خۆی لەگەڵ ڕۆن ئەگەر ئەو خواردنە ڕۆنی بوێ.

١٥ - ماشێنە:

ماشە ڕەشەکە ئەکرێتە ئاو پێش ماوەیەك ئینجا ئەکوڵێنرێو دوای ئەوە ئاوەکەی ئەڕێژرێو ئاوێکی ساردی پیا ئەکرێ بۆئەوەی توێکلەکەی بەربدا، بە کەوگیر توێکلەکەی ئەگیرێو فڕێ ئەدرێو، ئینجا ڕۆن و پیازی بۆ سوورئەکرێتەوەو لەگەڵ

تۆزێ برنجی شۆراوەو پرووشێ خوێ ئەخرێتەوە سەر ئاگر تا ئەکوڵێ و گەڵێ ماڵە دەس ڕۆیشتو گۆشت و ئێسقانیشی تێ ئەکەن.

١٦ ـ پەڵپینە بەترش:

پەڵپینەکە ئەجنرێ دوای شتنەوەو لەگەڵ نیسکی هاڕراو دۆشاوی تەماتەو پرۆشی ترش و خوێ لەگەڵ بەگوێرەی خوێ برنج و ئەیکوڵێنن، ئەمەش خواردنێکی بەلەزەتە.

١٧ ـ سویجگەر بەترش:

سیوجگەرەکە جوان ئەجنرێ و کوڵێکی پێ ئەدرێ و ئاوەکەی ئەڕێژرێ پێی ئەڵێن (زەردکردن) دوایی ڕۆن و پیازو دۆشاوی تەماتەو نەعنای تێ ئەکرێ و هەندێ وردە برنج ، ئەخرێتە سەر ئاگر تا ئەکوڵێ ئینجا پێشکەش ئەکرێ بەگەرمی و ئەم خواردنە جاران بەخێر ئەنێرا بۆ ماڵە دراوسێ.

١٨ ـ لەپە ساوەر:

گۆشت و ئێسقان سوورئەکرێتەوەو دوایی پیازی جنراوی تێ ئەکرێ و ئاوو ساوەرە شۆراوەکەی تێ ئەکرێ لەگەل بەگوێرەی خوێ خوێ و لێ ی ئەوەسترێ تا ئەکوڵێ ئەمەش بە ترشیات و پیازی وشك و سەوزەوە خواردنێکی بەلەزەتی زستانەیە.

١٩ ـ دۆکەشك:

کەشکەکە پێش ماوەیەك ئەکرێتە ئاوو دوایی لە سونیەدا ئەسوو یتەوە تا دۆیەکی خەستی لێ یەتە بەرهەم ئەخرێتە سەر ئاگر تا یەتە کوڵ و بەگوێرەی خوێ برنجی پلاوی تێ ئەکرێ و ئەخرێتە سەر ئاگر تا ئەکوڵێ و ئینجا دوای کوڵان دائەگیرێ و لە قاپــا هەرکــەســە ی بە ئارەزووی خوێ بوی تێ ئـەکـرێ، ئەمـەش خواردنێکی پڕ کالیسیومی زستانەیەو زوریش بەلەزەتە.

٢٠ ـ قاورمەی گۆشت:

لە بەهارا ئەو ماڵەی بیبانویستایە، کارو بەرخییان ئەکڕی و بەخێویان ئەکرد بە پاشەڕۆکی میوە وەك توێکڵە کاڵەك و شووتی لە هاویناو لە دەشت ودەری خۆیان ئەیـان لەوەڕانـدو گەورەیـان ئەکـرد تا کاتی پەلـەو دوایی پایـز، هەندێ ماڵی تریش ئەمەیان نەئەکرد چونکە ئەرکی زۆر بوو خۆشیان دەس ڕۆیو بوون لە کۆتاییی پایزا

یان مەڕیان ئەکری و یان گۆشت.

ڕۆنەکەدا بۆئەوەی هەوای تێ نەچێ و خراپ نەبێ. ئەمە تۆزێکیش سوێرخوێ ... بۆیە زۆر بەلەزەت بوو. لە شوێنێکی فێنك هەڵئەگیراو لە زستانا کەگۆشت کەم ئەبوو لە بازاڕاو خەڵکی لەبەر سەرماو سوڵە ئەوەندە کاسبیان نەئەکرد، وردە وردە لەم قاورمەیە بەڕۆنەکەیەوە دەرئەهات چ لە گۆشت بەگوێرەی ئەو خوارنە تێی ئەکراو چ لە ئێسقان دەرئەهێنراو بەکارئەهات بۆ ئەو خواردنانە ی کە بە قاورمە ئەکران وەك هێلکەو قاورمە بۆسەر قبوڵی ساوەرو هەندێ جار بۆ مزرۆکەو گەلێ خواردنی تر کە بە قاورمە ئەکرا، وەك لەپەساوەرو ئیسقانەپەراسووەکانی بۆ ژێر یاپراخ و بۆ ناو گەنمە کوتاوو گەلی چێشتی‌تر . قاورمە وەك باستورمەیەکی کوردی وابو کەمەبەست لە هەردوکیان لە گۆشت هەڵگرتنە بۆ ماوەیەك.

ئەو خواردنانەی باسمان کردن هەرچەندە زۆر بەکەڵکن لەڕووی خۆراکیەوە بەڵام بەداخەوە باویان نەماوە بەهۆی ئەوەوە کە گوایە ئەمە شتێکی کۆنەو ئێستا سەرودەمی نوێیە. بەڵام ئەم خوارنانەی لەمەودوا باسی ئەکەین هێشتا ماون و کۆن نەبوون و لە زوربەی ماڵاندا لێ ئەنرێن :-

١ - پەردەپلاو
٢ - پلاو
٣ - قوبوولی
٤ - تاس کەبابی
٥ - کفتە
٦ - شلە قاورمە
٧ - یاپراخی تێکەڵ
٨ - یاپراخی گەلامێو
٩ - نیسکێنە
١٠ - سەرووپێ و گیپە
١١ - قوبولی ساوەر
١٢ - سلْقاو
١٣ - سپێناغ و هێلکە
١٤ - شلەی سپێناغ
١٥ - ئاوو گۆشت
١٦ - قاورمەی نۆك
١٧ - کنگری کولاو
١٨ - کنگر ماسی
١٩ - مزرۆکە
٢٠ - قارچك و دوومەلان
٢١ - قەرەخەرمان
٢٢ - خورماوڕۆن
٢٣ - خورماو ڕۆنی بەهێلکە
٢٤ - هێلکەی کولاو

٢٥ ـ هێلکە ورۆن

٢٦ ـ هێلکەو قاورمە

٢٧ ـ هیلکە بەمزرۆکە

٢٨ ـ هێلکەی دەڵەمە

٢٩ ـ هێلکەو سڵقی سوورەوەکراو

٣٠ ـ کەلانەو شلکێنە بە هەنگوین، بەدوشاو، بەشەکر.

جگە لەم خواردنانەی کە باسمان کردن ڕەنگە گەلێك خواردنمان بیرچوبێ‌و یان دەسمان نەکەوتبێ. ئەو شورباو شلانەی کە دروست کراون و ئێستاش دروست ئەکرێ دوور نی‌یە گەلێکی زۆرمان دەس نەکەوتێ وەیا هەر نەمان بیستبێ.(١)

تکای لێ بووردن ئەکەین هەروەها ئەم خواردنانەش دروستکراون و خوراون و ئێستاش لێیان ئەخورێ‌و دروست ئەکرێ ئەمەش ئەوانەیە کە ئێمە دەسمان کەوتوە:

١ ـ پەڵوولە

٢ ـ تۆڵەکە

٣ ـ حەڵوای شەکر

٤ ـ سەمەنی

٥ ـ کولێرە بەرۆن

٦ ـ پەنجەکێشی

٧ ـ کولێرە بەچزڵێك

---

(١) هەندێ لەم خواردنانە تازە چوونەتە ناوڕیزی فوڵکلۆرەوەو نەماون. هەندێکی تریش کە نووسەر لای وایە ماون، هەر بەودەردە چوون. زیندووکردنەوەیان لە زۆر ڕووەوە کەڵکی هەیە هەرچەندە چێشتلێنان بە (کەتەلۆك) زۆر زەحمەتەو جێی شارەزایی ناگرێتەوە، بەڵام خۆزگە یەکێك لە کچە خوێندەوارەکانمان شارەزایی یەکی وای پەیدا ئەکرد وڕیبازێکی بۆ کەتەلۆکی خۆراکی ئێمە دائەناو بڵاوی ئەکردەوە وەکو کەتەلۆکو ڕێبازی گەلانی‌تر.

(ع . م . ر .)

٨ ـ کولێرە ساوەر

٩ ـ مارمارۆکە

١٠ ـ ناوەشکێنە (ناسکەنان)

١١ ـ حەڵوای دۆشاو

١٢ ـ ناوساجی

١٣ ـ کولیچە [illegible]

١٤ ـ خەپلەی ساوەر

١٥ ـ فرنیی

لەزستانیشا شەوان بەدەم یاریکردن و ڕابواردن و شەو بەسەربردن و حیکایەت کرنەوەو ئەم وردە شتانەکراون و ئەخوران:

١ ـ باسووق

٢ ـ سجووق

٣ ـ مێوژ

٤ ـ بادام

٥ ـ نۆکی برژاو

٦ ـ گوێژ

٧ ـ گوێزی سوێر

٨ ـ حەڵوای گەزۆ

٩ ـ خۆشاوی مێوژ و هەرمێ

١٠ ـ مرەبا بە هەموو جۆرە میوەیەك.

تێ بیینی :

زۆر سەیر بوو چونکە جاران چێشتخانە لە حەوشە بوو وە چێشتیش لەسەر ئاگر لێ ئەنراو سەر بەرەڵڵا بوو کە بە گەڕەکێکا بڕوێشتیتایە بە بۆن ئەتزانی چ ماڵێك چییان لێناوە.

❊ ❊ ❊

# کارەساتو بەسەرهاتی شاری سلێمانی

**- ئەزانی -**

لە ڕۆژنامەی (ژین) ژمارە ١٣٧٨ی ١٩٥٨/١/٢٣

لە ساڵی ١٧٨٥ کە برایم پاشای بابان بنچینەی شاری سلێمانی داناوە تا ئەمڕۆ کە ساڵی (١٩٥٧) ی‌زیە چەند کارەساتی گەورەی بەسەردا هاتووە وە هەریەکەی چەند ساڵی بەسەردا تێپەریوە . ئەگەر هەمووی کۆبکەیتەوە بە ئەبجەد ئەکاتە (شاری کولۆلی) = ٦١٣

| کارەسات | مێژووی کارەسات | تا ئەمڕۆ |
|---|---|---|
| نەخۆشی چاوەقوولکە | ١٧٩٥ | ١٦٢ ساڵ |
| ڕوخانی حکومەتی بابان و ئاژاوە | ١٨٥١ | ١٠٦ ساڵ |
| گرانی گەورەو شەڕی فارس و بایزید | ١٨٧٦ | ٨١ ساڵ |
| ڕشانەوە | ١٩٠٤ | ٥٣ ساڵ |
| ئاژاوەی موسڵ | ١٩٠٨ | ٤٩ ساڵ |
| گرانی و لەبرسامردن | ١٩١٨ | ٣٩ ساڵ |
| بەدیل گرتنی شێخ مەحمود | ١٩١٩ | ٣٨ ساڵ |
| بۆمباردومان | ١٩٢٤ | ٣٣ ساڵ |
| ئاژاوەی ئەیلوول | ١٩٣٠ | ٢٧ ساڵ |
| لافاوی پێشوو | ١٩٣٢ | ٢٥ ساڵ |
| لافاوی ئەمجارە | ١٩٥٧ | |

ئەم مێژووی کارەساتانە هەندێکی لە لیٚ‌وەرگری ڕاست وەرم گرتووە، ئەوی تریشی بیرەوەری خۆمە پێشکەشم کرد بە مامۆستای پایەبڵند (ج. بابان). هیوا ئەکەم بۆ ئەو مێژووەی کە بەدەستی‌یەوەیە سوودی لیٚ وەبگریٚ.

مامۆستا نەجمەدین مەلا



## ڕۆژی شەشی ئەیلول،ساڵی ۱۹۳۰
## شەڕی بەر دەرکی سەرا

ئەم ڕووداوە لە ڕۆژی هەینیدا بووە لە سەعات نۆی زەواڵیدا پێش نیوەڕۆ لەسەر هەڵبژاردنی نوێنەری ڕاستەقینەی شاری سلێمانی. میری نەیویست نوێنەری ڕاستەقینە دەرچێت، جەماوەریش بەدەم هاوارەوە شاڵاویان بردە سەر داگیرکەران لەسەرادا کە هەڵبژاردن و هێزی میری لەوێ بوو، بەر بەردو قۆچەقانییان دان، سەری چەند پۆلیسێك و عەسکەریان شکاند، ئەوانیش بەفەرمانی قوماندانی عەسکەری (عەلی ڕەزا بەگ) خەڵکەکەیان دایە بەر دەسرێژی تفەنگ و ڕەشاش بەدەها خەلك شەهیدو بریندار بوون وە لەدواییدا بە سەدان خەڵکی نیشتمان پەروەریان خستە بەندیخانەوە، ڕۆژێ لەپێش هەراکەدا واتە ەی ئەیلول جەماوەر کۆببوونەوە لە بەر دەرکی سەرادا بۆ پروپاگەندە بۆ دەرچوونی نوێنەرانی ڕاستەقینەی میللەت. چەند کەسێك دەوری سەرەکی بینی لە پاڵ پێوەنانی جەماوەر بۆ پشتگیری نوێنەری میللەت و خۆپیشاندان و هاوارکردن. وە هەر لە بەدەرکی سەرا دوو دروشمیان هەڵواسیبوو لە دروشمی یەکەم نوسرابوو:

۱) ڕەوابێ مەتالیبی کورد

۲) بژی عەدالەتی عوسبەتول ئومەم. ناوی چەند کەسێك لەو ڕۆژەدا شەهید کراون:

۱ ـ عەولە سیس : چایچی

۲ ـ ئەلە گون سووتاو : چایچی

۳ ـ حەمە قالەی ئاغال : پانیبەرز دروو برای سەعە شەل

٤ ـ محەی خولە درێژ : کۆپان دروو باوکی حەمە دەمە

٥ ـ ئەحە ڕەشی حەسەنی دەروێش : شیرگەر

٦ - مستەفابەگی فەتاح بەگ : مەلالێ

٧ - سەعەی حەمەی ئامی : حەماڵ

٨ - عەزیزی مامە حەمە : پینەچی

٩ - حەمە چاوشین

١٠ - عەلی سیوجگەر

١١ - ئەحمەد ناوێك : نان فرۆش

١٢ - هەڵۆ بەگ

تێ بینی :

کاك قادری مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسوڵ بۆی گێرامەوە ووتی : لەوکاتەدا من لە خەستەخانەی خوارەوە کەوتبوم لەوێ بە ڕووداوێك لە گەڕەکی خۆمان لە کۆڵان پارچەیە ئاسنی لوولم دۆزی‌یەوە خەریکی ئەوە بووم ناوەکەی هەڵکۆڵم بەدەستما تەقیـەوە مەچـەکی دەستی چەپی بردم، تومـەس ئەم پارچـە ئاسنـە هی کاتی بۆردومانەکەی ئینگلیز بووکە کردی بۆسەر سلێمانی‌و دەورو پشتی، لەکاتی خۆی‌دا نەتەقیووەوو ماوەتەوە بۆ ئەم نەگبەتی‌یە، وتی :
لەوکـاتـەدا لە خەستـەخـانـە کوژراوو برینـد اریـان ئەهێنـا دوایی گوێم لێ بوو ئەیان وت : بیستونۆ (٢٩) کەس کوژراوە بە بێ بریندار ‌.

❊ ❊ ❊

[١] نووسەران وڕوناکبیرانی ئەوسەر دەمەی کوردستان بە شیعرو چیرۆك وپەخشان لەم کارەساتە دواون . مەسەلەکە ئەوەندە گرنگ بووە ئەگەر بمانەوێ ئەو بەرهە مەکاریگەرانە کۆبکەینەوە کتێبێکی گەورەی لێ دەرئەچێت . [نووسەر]

# لافاوی سالی ١٩٣٢

لە سالێ ١٩٣٢زدا لافاوێک رووی‌دا لەسلێمانی کە رێکەوتی مانگی تشرینی دووەمی هەمان سالْ بووە، زیانێکی زۆری لە مالاّن داوەو بازاری پرکردووە لە ئاو، ئەوەی تیابووە نەبۆتە هۆی لەناوچوونی خەلْکی. حەمدی‌ی شاعیر لە قەسیدەیەکدا باسی کارەسات و چۆنێتی ئەم لافاوە ئەکات لە دیوانەکەیدا . بەم شێوەیە دەسپێ ئەکات:

لافاوی سلێمانی

سالْی جارێ هەر ئەبێ ئەم شارە بێتە مەزبەلە /یابە بۆمبا یا بە ئاگر یا بە بارانی پەلْە ئاگرت تێبەربێ گەردوون وا ئەبێ دەورو خولت/ نایەلْی قەت مەزرەعەی ئومێدی کورد بێ دووپەلە

بروانە دیوانی حەمدی چاپی ١٩٥٧ لاپەرە ١.٤-١.٥

× × ×

لافاوی سالْی ١٩٥٧

لە رۆژنامەی (ژین) ژمارە ١٣٦٦ی ١٩٥٧دا وا نوسراوە: «گەورەترین کارەسات بەسەر سلێمانی‌دا دێت لافاوێکی نیوسەعاتی لەناکاو زیانی نزیکە نیو ملیون دینار ئەداو (٣٨ - ٤٠) کەس ئەخاتە ژێر گلْەوە چۆن شەقامەکان بووبوون

به ڕووبـارو لاشـەو دارو بەردو ئوتـومـبـێـلی بەسـەرەوە ئەڕۆیشـتـن. ڕۆژی ١٩٥٧/١٠/١٨ سەعـات چواروده دەقیقـە بوو کە باران دەستی پێ کـرد بەسـەر سلێمـانیدا هەتـا گوێـژە. . دوای ئەوە کردی بە تەرزە کە هەر تەرزەیـەکی وەکـو هێلکەیەك گەورەتر وابوو وە ئەم باران و تەرزەیە هەتا سەعات پێنج چارەکێك کەم مایەوە دوای ئەوە ئەو بارانە کە باریبوو وە هەمووی توایەوە و شار نەیگرتە خۆی.وە بەخوڕم خۆیدا بە سلێمانیدا وە لەپێشەوە لە گەڕەکی مەڵکەندیو پیرمەسوورەوە دەستی پێ کرد وە زێرابەکانی نەیگرتە خۆی وە هەمویان تەقین.

ئینجـا ئاوی لافـاوو ئاوی زێـرابـەکـان دەستیان کردبە خانوو ڕووخاندن وە هەرچیماڵێـك لە ڕێگـای ئاوەکـەدا بوو ڕۆخـاو خەڵکی بوون بەژێـرییـەوە هەتـا هەندێ کەسی هێنا لەگەڵ خۆی بەسەر ئاوکەوە مردبوون.

وە لەبـەر ئەوەی کە هەمـوو خەڵـك لەدەرەوە بوون و لافـاوەکـەش لەنـاکاو هات کەس فریای ئەوە نەکەوت خۆی یان شتومەکی ڕزگار بکات، لەبەرئەوە هەرچی شت هەبوو لەناو ماڵ و شتی ناو دووکان و ئوتومبێل و عەرەبانە ئاوەکە لەگەڵ خۆی بردی وە دووکـان و خانـووی سەرشـەقـامـەکـانی سلێمـانی ئەوەی ڕووخـا ڕووخـا ئەوەیشی نەڕووخا تا نیوەی پڕ بوو لە ئاو وە لەمانە سەرای سلێمانی بوو کە قاتی خوارەوەی پڕبوو بوو لە ئاوو لیتە وە هەروەها قەیسەرییەکانی ناوبازاڕ لە بەر نزمی پڕبوون لە ئاوو تەرزەو لیتاو زیانێکی زۆری لە خاوەن دوکانەکان دا چونکە فریا نەکەوتن کە شتەکانیان لابەرن وە هەتا (سێ) ٣ ڕۆژیش کرێکاری بەلەدییە هەر خەریکی پاك کردنەوەی قەیسەرییەکان بوون.

وە لەکـاتی لافـاوەکـەدا کاربـەدەستـانی لیوا بە سەرۆکایەتی موتەسەریف بەسەرەوە ئەگەڕان، بەڵام زۆریی ئاوەکەو خێرایی ڕێگای کەسی نەئەدا کە بجووڵێنەوەو ئەم ئاوەو هەرچی بە سەرەوە بوو ڕووەو گەڕەکی سەرشەقام ئەڕۆی بەناو شەقامەکاندا، وە لەگـەڕەکی کانێسکـان شیـوی دۆزەخ مینـەش بەتـەواوی هاتبـووەوە کەس نەیئەتوانی خۆی لێدا بەڵام ئەوەی چاك بوو کە ماڵی لە بەردەم دا نەبوو هەردوو سێ ماڵ نەبێت کە زوو ڕزگارکران وە چەند ماڵێکیش پڕبو لە ئاو وە دوایی زانرا ئەو خانوانەی کە ڕووخاون ٧٤ وە نزیکەی ١٠٠ ـ ١٥٠ خانوو ئاویان تێچووە.[١]

ناوی ئەوانەی کە لەم کارەساتەدا کۆچی دواییان کردووە وە خنکاون:

| ناو | تەمەن | گەڕەك |
|---|---|---|
| ١ ـ ڕەشید مەستی | ٨٠ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢ ـ وەستا موحەمەدی خەیات | ٦٠ ساڵ | دەرگەزێن |
| ٣ ـ عەلی تورکە | ٥٠ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٤ـ شێخ عەبدوللای شێخ عومەر | ٣٠ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٥ ـ کامیل مستەفا (قوتابی) | ١٨ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٦ ـ دایکی کامیل | ـــ | مەڵکەندی |
| ٧ ـ مەنیجەی عەلی موحەمەد | ٦٠ ساڵ | سەرشەقام |
| ٨ ـ فاتمە کەریم | ٦٠ ساڵ | سەرشەقام |
| ٩ ـ عەدلە ئەمین | ٥٠ ساڵ | سەرشەقام |
| ١٠ ـ ڕەعنای مەلا عەزیز | ٤٥ ساڵ | سەرشەقام |
| ١١ ـ ئەحمەد ڕەشید | ٤٠ ساڵ | سەرشەقام |
| ١٢ ـ ئاسکۆڵ شێخ موحەمەد | ٣ ساڵ | سەرشەقام |
| ١٣ ـ خەدیجەی فەقێ ڕەحیم | ٣٥ ساڵ | سەرشەقام |
| ١٤ ـ موحەمەد عەلی | ٦ ساڵ | مەڵکەندی |
| ١٥ ـ خۆشناو ڕەشید | ٥ ساڵ | مەڵکەندی |
| ١٦ ـ خەلیل عەلی تورکە | ٣ ساڵ | مەڵکەندی |
| ١٧ ـ سەرکۆ عەلی تورکە | ٣ ساڵ | مەڵکەندی |
| ١٨ ـ عەبدوڵا جەلال | ٣ ساڵ | مەڵکەندی |
| ١٩ ـ سەلاح ئیسماعیل | ٢ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٠ ـ بەکر عەبدوللا | ٢ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢١ ـ یاسین حسێن | ١ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٢ ـ سوعاد حسێن | ١٢ ساڵ | مەڵکەندی |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٣ ـ گێلاس عەلی | ٩ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٤ ـ ئەڵماس عەلی | ٧ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٥ ـ زینەب مەجید | ٧ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٦ ـ لەیلا ڕۆبین | ٦ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٧ ـ سۆزان ڕۆبین | ٤ ساڵ | مەڵکەندی |
| ٢٨ ـ سەبریە مەجید | ٣ ساڵ | سەرشەقام |
| ٢٩ ـ فائیزە ڕەشید | ١ ساڵ | سەرشەقام |
| ٣٠ ـ عائیشە ئەحمەد | ١ ساڵ | سەرشەقام |

بێجگە لەڕۆژنامەی ژین، زۆر شاعیرو نووسەر ئەم کارەساتەیان بە شیعرو نووسین دارشتووە.

ع.م.ر

تێبینی :ـ هەندێ لەو بەیان نامانەی کەلەم بەشەدا بڵاومان کردۆتەوە کە لە ساڵی بۆردوومانی شاری سلێمانیدا لەگەڵ دەروروپشتەکەی کە ئینگلیزەکان لە ئاسمانەوە بە فڕۆکە فڕێیان ئەدایە خوارەوە لەگەل بەیان نامەیەك کەدوای شەری بەردەرکی سەرا واتە دوای شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ کە شێخ مەحموود لەسەر ئەو خوێن ڕشتنە کە میری کردی دژی خەڵکی سلێمانی جارێکیتر ڕاپەڕی لێیان ئە شەری ئاوباریك دا تۆڵەی لێکردنەوە میریش ئەو بەیانەی بۆ دەرکرد.
هەروەها شیعرەکەی مامۆستا (گۆران) بە یادی شەشی ئەیلولەوە لەگەڵ هەڵبەستەکەی (حەمدی صاحبقران)ی شاعیر بەسەر لافاوی ساڵی ١٩٣٢دا ئەخوێننەوە.

## شەهید

« بە یادی شەشی ئەیلوول، شەڕی بەردەکی سەراوە»

هەزارو نۆصەدو سی بوو، شەشی ئەیلوول کە ڕۆژ هەڵهات:
غریوی ویستنی حەق کەوتە ناو شاری سلێمانی؛
( هەڵو بەگ) ئەو جوانەی پڕ دڵی بوو بۆ وەطەن ئاوات،
لەپێش جەمێکەوە تا بەرسەرا ڕووی هەڵمەتی هانی.

لەگەڵ یارانی ئەیوت «ئەی حوکومەت! تا نەکەی تەثبیت
حوقووقی کوردەواری، نایەوێ کورد ئینتخابات.!
ئەوانەی بانگ کران و تۆ بە قووەت دەوریان ئەگریت:
دەنیو قازانج پەرستن، هیچ نەبێ پێیان موبالاتت!

ئەوانە کەی لە میللەت بوون هەتا تەمثیلی ڕەئیی کەن؟
حوکوومەت! ئێمە کوردین، وا ئەڵێن: «نامانەوێ نوواب
کە داوێنی غەرەز بگرن بە هەردوو دەست! وەطەن بەردەن!
نەکەی، مەشروع نییە.. دەرکە لەسەر سەودایی ئینتخاب!..»

ئەمە جوملەی قسەو ئامالی یارانی هەلۆبەگ بوو،
نە نامەشرووعی تیابوو، نە تەجاوز بوو بە ئەمنییەت..
کەچی عەسکەر بە مەترالیۆزەوە بۆ قەتلی عام دەرچوو!
نزیە بەر ئەقەی شەستیر ڕجاو ئامالی میللییەت!

شەقەی شەستیرو قرچەی دەستڕێژو هەڵمەتی‌سونگی
بە خوێنی وردی بێ‌تاوان شەپۆلی خستە سەر جادە:
نەما جوانێ کە سونگی نەیسمیێ صەد کەڕەت سنگی،
نەما پیرێ لە ڕیزی گوللە بووبێ قەلبی ئازادە!..

هەڵۆ بەگ گوللەیی ئەووەڵ لە ڕانی دا، دووەم دەستی:
کە خۆی‌و قەومەکەی وا دی بەچەشنی شێر نرکانی،
پەلاماری کە دا بۆ ضابطێ: یەك زللە خپ خستی..
دەمانچەی سەنگ لە دەستی‌و ئاگری‌دا تاوەکوو توانی...

بەڵام فیشەك نەما، هەر ضابط و یەك دوو نەفەر کەوتن..
لەپاشا عەسکەریش دەستڕێژی لێ کردو بەلاداهات؛
لەسەر دەریایی خوێن بوو کەشتی‌یی عومری بەرەو مردن
ئەچوو، ئەیوت: خوا حافیظ، ئەوا ئەمرم وەطەن! هەیهات،

لە باوەشتا پشووی عومرم نەدی تاوێ بە سەربەستی،
هەتا مردن زڕەی زنجیری دیلی بوو لە گەردنما،
ژیانم عارو ذیللەت بوو لەژێر پێڵاوی دوشمنما،
بە خوێن بێ‌و، گڵ هەڵی‌لووشێ، کە وابێ، هەیکەلی هەستی!..

خواکەی بولبولی باغی سەرا!.. هەرچەندە پاییزە،
بە خوێنی خۆم گوڵت بۆ ئاو ئەدەم، سا بۆم بلاوێنە!
لەگەڵ ئەو جوانە پاکانەی لەدەورم مەیتیان ڕیزە
لە خوێنا وێنە شێواوین، بە دایکمان بناسێنە!..

بڵێ بەو بووکی تازەی یەك شەوەم گەر هاتە سەر نەعشم،
نەڵێ خۆی بۆ وەطەن کوشت و لە ڕێی عەشقی منا نەژیا...
وەظیفەم بوو لەپێناوی وڵاتێکا سەرم بەخشم:
کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوێنی چیاو کەژیا!..

ئەگەر خوای گەورە بەخشی پێت هەتیوێ، پێی‌بڵێ: ڕۆڵە
لە من فرمێسکی ویست باوکت، لە تۆش داوا ئەکا تۆڵە!...

(گۆران) ئەیلوولی ١٩٣٢

## لافاوی سلێمانی

« ئەم هەڵبەستە لەساڵی (١٩٣٢م) ووتراوە بەهۆی لافاوێکەوە کە گەلێ زیانی لە شاری سلێمانی داوە»

ساڵی جارێ هەر ئەبی ئەم شارە بێتە مەزبەلە
یا بە بۆمبا، یا بە ئاگر، یا بە بارانی پەڵە
ئاگرت تێبەربێ گەردوون وا ئەبێ دەوروخوولت
نایەڵی قەت مەزرەعەی ئومێدی کورد بێ دووپەلە
بۆ مەضەڕەت هەر تەنەزولتان کە فەرموو بۆ زەمین
عادەتت وایە کە کوردستان بکەیتە مەرحەلە
بۆچی بوویتە مەسخەرەی ئەرض و سەما ئەی مەملەکەت
بۆچی بوویتە مەعرەضی ئافات و فتنەو وەلوەلە
خەڵقی وەك تینووی بەراون بۆ نمێ باران کەچی
بەو نمە بارانە ئێمەت خستە ئەم مەرگەمەلە
یا بە حاڵی ئێمە گریا گۆیژە فرمێسکی بەخوڕ
هات و لێشاوی سلێمانی کە خستە زەلزەلە
هاژەیی لافاوو گرمەی هەورو چەخماخەی هەوا
لەرزی هێنایە مەلەك ئینسانی خستە هەلهەلە
سەددە هەڵ دەستێ لەبەر لافاوی کوردستان کە بێ
دجلە لێڵ و وێڵ ئەکا شەیتانە دەیخاتە پەلە
موقتەضای خاکە کە هەر شەیئێکی تێدا هەڵ کەوێ
هێندە بەرزو دیارییە وەك دارەکانی سەرکەلە

کوندەبووی نەگبەت وەهای زانی کە ئەیوانی جەمە
ئەم کەلاوانەی کە دی گف بوبوو ئەتووت هۆکەڵە
ئەم برینانە زەمانە هەر دەبێ سارێژی کا
(حەمدی) ئەمما بۆ ئەمەش پێویستە سەعیو حەوسەڵە
(حەمدی صاحبقران)

* * *

(١) بۆ دەقینە ـ فەقێی مزگەوتەکە خۆیو چەند فەقێی مزگەوتی ترو چەند کەسی ناسراوی گەڕەك کۆدەبوونەوەو بە کۆمەڵ و بە زەمزمە بە ماڵانی گەڕەکەوە ئەگەڕان و شتیان کۆدەکردەوە. دیارە ئەم عادەتە لە دەوری داگیرکەری عوسمانییەوە پەیدابووە، پێشتر میرەکانی بابان فەقێیان ئەژیاند.
(ع.م.ر)

(١) باوەڕی موسوڵمانان وایە لەو شەوەدا هەمووساڵێك خوا لە (أم الكتاب) دا تەمەنی خەڵکی سەلەنوێ ئەنووسێتەوە ئەوەی ناوی نەنووسرێتەوە لە ساڵی داهاتوودا دەمرێ. لەناو عەرەبی عێراقدا ئەم شەوە (ليلة المحيا)ی پێدەڵێن، لەم شەوەدا لەم ساڵانی دووایییەدا بە پۆتایی تەقەدەکرا.
(ع.م.ر)

(١) هەروەها بۆ لابردن و نەهێشتنی بەردو لمی گورچیلە.
(ع.م.ر)

(١) لە مۆسکو لە دەرمانخانەکان بۆ ئەو مەبەستە ئەیفرۆشن
(ع.م.ر)

(١) نوســەران و ڕونـاكبیـرانی ئەو سەردەمـەی كوردستـان بە شیعـر و چیـرۆك و پەخشان لەم كارەساتە دواون. مەسەلەكە ئەوەندە گرنگ بووە ئەگەر بانەوێ ئەو بەرهەمە كاریگەرانە كۆبكەینەوە كتێبێكی گەورەی لێ دەرئەچێت.

نووسەر

(١) بێجگە لە ڕۆژنامەی ژین بەڵكو زۆر لە شاعیران و نوسەران ئەم كارەساتەیان بە نووسین و هۆنراوە داڕشتووە

(١) هۆكـەڵ : كوڕەگـەورەی قۆز بە جلی ئاڵ ووالا خۆیـان ئارایـشی ئەدەن بەرامبەر بە دەستگیرانیان بەتایبەتی لەناو جافدا.

(له یادگاری کەریم ئەفەندی غەفوور ئەفەندی ئەحمەد بەگزادە).

«هەندێ یادگار»

نووسەری کتێب دەربارەی ئەم یادگارانەی تۆماری کردووە نووسیوێتی: لە یادگاری کەریم ئەفەندی غەفوور ئەفەندی ئەحمەد بەگزادە (١٩٠٠ ـ ١٩٦٨) کە بە خەتی خۆی نووسراوە ئەم بەشانەمان لێ هەڵبژاردووە هەروەك نووسەر ئیشارەتی ئەوە دەکات کە خاوەن یادگاریا یاداشت باوکی کاك کەمال کەریمی بەڕێوەبەری کۆمپانیای نیشتمانیی تەئمینە لە سلێمانیو ئەم ئەو یادگارانەی لەوەوە دەست کەوتوە.

دیـارە ئەم یاداشتـانـەی کەریم ئەفـەنـدی زۆر فراوان ترەو نووسـەر هەر ئەوەندەی لێ وەرگرتووە کە بە بینینی خۆی پەیوەندی بە باسی کتێبەکەیەوە واتە بە شاری سلێمـانی‌یـەوە هەیـە، هەرچی ئەم بەشـەی یاداشتەکەشە، کە من هەموویم نەدیوە، ئەمە هەندێ ڕاستیمان نیشان ئەدات:

یەکەم: ئەمە یاداشتی کەسێکە کە تەواو لەناو ڕووداودا نەبووە بەڵام لێشی دوور نەبووە. هونەری ئەم لەوەدایە کە دەستی داوەتە قەڵەم و زۆر شتی ئەوتۆی تۆمار کردووە کە نەوەی ئەمڕۆ ئاگایان لێی نی‌یەو زۆر شت بووە بەهۆی ئەوەی کە نەشیان بیستبێ.

دووەم: دەتوانین لەگەڵ زۆر بیرو لێکدانەوەی خاوەن یاداشت دا نەبین، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەو بەو بیرو لێکـدانـەوەیەی جۆری بیرکردنەوەی هاوشان و هاوتەمەنەکانی خۆیمان بۆ دەرئەخات کە ئەمەش شتێکە شایانی تۆمار کردنە بەتایبەتی بۆ نەتەوەیەکی وەك ئێمە کە کەم شتمان تۆمار کراوە، بۆنموونە:

دەتوانین دەربارەی ڕیزکردنی چینەکانی گەل و باس لە ڕەوشت و نەریتی کۆن کردن و پەسەندکردنی چەشنە لێکدانەوەیەکی‌ترمان هەبێ یا لەگەڵیا نەبین، بەڵام

ئەبێ ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە رژێمی سەرمایەداری لە مێژوو و ڕێڕەوی کۆمەڵ دا پلەیەکی پێشکەوتوترە لە پلەی دەرەبەگی بەلام چەشنی دزیو چەوساندنەوەکەی شارراوەترو زۆر دوورترە لە رەوشت و خووو مەردایەتی‌یەوە..
لە لایەکی‌ترەوە هەموو چەشنە کێشەیەکی خوورەوشت و نەریتی کۆمەلایەتی ناچێتە ناو جوغزی ناکۆکی‌ی چینایەتی‌یەوە بەڵکو هەندێکی بریتی‌یە لە ناکۆکی‌و گۆرانی پشتاوپشت کە شتێکی سروشتی‌یەو لە هەموو دەورو رژێمێکدا دیارە.

خاوەن یاداشت هەموو شتی کۆنی لا پەسەندە، ئەمەش بەشێکە لە سروشتی ئادەمیزاد لە پەیوەندی بە یادگاری کۆنەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەوکاتەدا کە خۆی باسی لەش ساغی‌و کەمی نەخۆشی دەکات لە زەمانی زوودا، گورج دێتە سەر باسی رشانەوەکە کە چۆن هەر لە یەك رۆژدا بە سەدان کەسی لە تاقە شارێکی بچووکی وەك سلێمانی‌دا کوشتوە.

نازانم خاوەن یاداشت چەند نزیك بووە لە رووداوەکانی دەوری شێخ مەحموودی مەزنەوە، لەبەرئەوە زانیاری‌یەکانی ئەبێ لەگەڵ یاداشتی رەفیق حیلمی نەمردا بەراورد بکرێن بەتایبەتی کاتی بلاوکردنەوەی هەموو یاداشتەکە کە شایانی بلاوکردنەوەیە هەرچی باسی بۆمباردومان و درەندیی ئیمپریالیزمی ئینگلیزە کە یەکەم بۆمباو فرۆکەی خۆی لە سەری کورددا تاقی کردەوە ئەوە شایەتی‌یەکی بەنرخی هاوولاتی‌یەکی کوردستانەو بایەخی خۆی هەیە.

(ع.م.ر)



خاوەنی یادگار کەریم ئەفەندیی غەفوور

ئەفەندیی ئەحمەد بەگزادە ١٨٨٨ - ١٩٧١

## «ئەتوارو ڕەوشتی میللەتی سلێمانی»

خەڵکی سلێمانی نزیکەی هەشت یەکێکی لە بەگزادەکانی بابان و سادات و ئاغاوات و کاربەدەستی گەورەی میری بوو، هەموو نەجیب و خانەدان و ساحێب مەجلیس و دیــوەخــان بوون، بەڵام حەوت بەشــەکــەی تری کە کاسبکــارو صنعــەتکــارو فەلاح و ڕەنجبــەر بوون و ئەمانەش هەموو ساحێب تەوازوع و ئیکــرام و ئەهلی جومعەو جەماعەت بوون وە لەعاستی غورەباو میوان دا زۆر بەخــزمەت بوون وە هەموویان حەزیان لە سوعبەت و گاڵتەوگەپ ئەکرد لەگەڵ یەکتریدا وە یەکتریان خۆش ئەویست و دنیایان بە پێکەنین و شتی خۆش ئەبردەسەر.

لە هەموو ماڵێکی پیاوە دەوڵەمەندەکاندا لەجیاتی ئەم کورسی‌و مێزەی ئێستا هەیە، فەرشی نایاب و دۆشەك و پشتی بوو، بەردەوام قاوەی حازر لەسەر ئاگر بوو، وە لە هەموو ڕەفەکاندا پارچەیەك کاشی‌و چینی‌و فەخفوری‌و بلوریان تیا دائــەنــرا، وە لە تاقــەکانی خوارەوە تاق پۆشێکی بە ساچاخ و قوزاغە تەرتیب کراوی تیــا ڕائــەخــراو ئەنجا سندوقێکی لەسەر دائەنراو لەسەر سندوقەکەوە بوغچەیەك وە ئەمجا سەرپۆشێکی ئەدرا بەسەرا، لەجیاتی تەباغی چێشتی ئێستا داری سوتاندن، لە جیاتی تەباغی چای ئێستا سەماوەری زەرد کە وەکو ئاڵتوون وابوو یا سەماوەری وەرشاو، کە وەکو زیوو وابوو. لەجیاتی عەلادین لە بەعزێ ماڵا مەقەڵی پڕ لە ئاگری گەشاوە وە لە بەعزێکی‌تردا داری سوتاندن یا سۆپا یا کورە بوو.

بۆ شەوچــەرەی میوانیش غەیری چاو قاوە لەجیاتی ترێ‌و کاڵەك و شووتی ئێستا پرتەقاڵ و هەناری بەغا بوو. وە لە ئێشی هەویر پاقلاوەو برمەو فنجان بڕو چۆرەك و شەکرلەمەو لوقمەقازی‌و خانم بودی‌و وە لە ئەنواعی (ڕەچڵ) مرەباش چوار نەوعی ئەهێنــرایــە مەجلیسەوە وە لە زۆری ماڵەکاندا باسوق و خورماو گوێزو مێوژ دائەنرا.

بۆ نان خواردنیش بەزۆری پلاوو بامیەو دەم پوخت و شێـخ مەحشیو شلە قاورمـەو تاسکـەبـابیو یەغنیوەزیـری بوو وە بۆ دەعـوەتی پیـاوە گەورەکان پەردەپلاوو گیپە چێشتێکی مەقبول بوو، بەلاّم تەنها بۆ قاوەلّتی، بۆ بەرچایی بەزۆری توراغ بوو (توراغ شتێك بوو ماستێکی زۆرخوێی تەواوی پێوە ئەکرا ئەمجا تۆوی شویت و فەریکە قەزوان و گەلاّی خونچەو گوڵەباخی گوڵاوی زۆر تێئـەکراو لەپاش حەل کردنی ئەخرایە ناو کیسەیەکی گەورەوە لەپاش رۆژێك بەونەوعە مانەوەی ئەمجا دەست ئەکرا بە خواردنی لە بەرچاییدا).

وە لەجیاتی ترشیات رەنگاو بوو (رەنگاو شتێك بوو وەك خۆشاوێکی لەبەینی سرکەو دۆشاودا، لە ترێ رەشکە دروست ئەکرا وە ئەخرایە ناو کوپەی گەورەوە وە لە جێگای ساردا دائەنرا بە بێدان هەر ئاو بوو تەنها رەشە هەرمێو هێشوە ترێی بەساغی تێئەکرا)

وەها باو بوو کە چێشت هەر ئێواران لێ ئەنرا، بەلاّم بۆ قاوەلّتی کەم خێزان شتێکی بەسیت، وەکو نیمرووخ یان مێخلەمە یا مزرۆکە یا کەباب بوو وە لە ماڵە فەقـیرەکـان و ئەهـلی لادێشـا ساوەرو دۆینـەو دۆکـەشك و کەلانەو دۆکولّیوو پیرخەنیلەو چەنسووتەکەو ترخێنەو ماشەرەش و شۆربای سائرە بوو.

لەبەینی عالم و جاهیل و خازیل و عادی وە شەریف و دەنیو گەورەو بچوکدا، فەرقـێـکی یـەکـجـار زۆر هـەبـووە، فـەلاحـەکـان چـاویـان لـە تـیـجـارو ئـاغـاو بـەگ نـەئـەکـرد، فـەراش و ژنـی فـەراش چـاویـان

لە کاتب و ژنی کاتب نەئـەکـرد، ئەوانیش چاویـان لە قائمقام و ژنی قائمقام نەئەکردو هەموو کەسێك حەدی خۆی ئەزانی. وە بەقەدەر بەرەی خۆی پێی رائەکێشا زۆر لە شتی عەیب و حەرام و بێشەرعی خۆیان ئەپاراست.

- نیمرووخ: جۆرێکە لە هێلکەو رۆن.
- یەغنی وەزیری: شۆربای کندر.
- ساچاخە : ریشوەدار
- قۆزاخە : گولّنگەدار
- رەچل : هەموجۆر
- فنجان پڕ: کولیچە

ئەو دیانەتەو ئەو ڕەوشتە شیرینە جوانانە کە لەو دایك و باوك و مامۆستاو ئامـیرەکان و دیانەت پەروەرەکان بڵاو ئەکرانەوە کە لە مەرکەزێکی وەکو لیوای سلێمانی‌دا بەغەیری ئەوەی کە لە هەموو مزگەوتێکا لەپاش جەماعەت لە هەموو نوێـژی عەسرێکـا لەلایـەن ئیمام و عالمانی دینەوە بە خوێندنەوەی ئەحادیسی پێغـەمبەرو نەسیحەتێکی زۆری دینی هەبوو وە غەیری ئەو هەموو قوتابخانە غەیـرە ڕەسمیـانـەش کە لە هەمـوو گەڕەکێکـدا هەبوون ئەوەڵ و ئاخریەکەی ئیعدادیەی مولکی‌و ئەوەی‌تریش ڕوشدیەی عەسکەری دوو مەکتەبی ڕەسمی تیا هەبـووە لەو دوو مەکتــەبــەدا جگە لە کاتی نوێژی نیوەڕوان و لە کاتی چوار فەرزەکـانی تردا قوتـابیـان لە مەکتــەبەکاندا نەئەبوون، وە بۆ هەموو نوێژی نیوەڕۆش لە هەردوو مەکتەبەکەدا لەو عالمە دینیە فازیلانەی موعەلیمی دەرسی عەرەبی‌و دین بوون وە لە تەفسیری قورئانی پیرۆزو ئەحادیسی پێغەمبەر دەرس و ووتنـەوەو ئیرشادی دینیان ئەکرد یان مدیر خۆی یاخود یەکێك لەو ئامیرانەی **ساحـب تاج ونەجـمــە بوون وموعـەلـلیم بوون بە شاوڵ هەمـــوو تەلــەبــەکــانی** کۆئەکردەوە، وە ئەیان ناردن بۆ تەهارەت گرتن، ئەمجا موعەللیمەکە لە کەناری ئەو حەوزە گەورەیەی لە حەوشی مەکتەبەکانا بوون، خۆیان لە بەرچاوی قوتابیەکان دەست نوێژێکی شەرعی جوانی ئەشت و ئەیووت بە تەلەبەکان تەماشای من بکـەن، ئەبێت ئێـوەش وەکـو من دەست نوێـژ بشـۆن بەونـەوعە، وە لەپاش دەست نوێژ شتنیان ئەمجا خۆی ئەبوو بە ئیمامیان و پێش نوێژی‌یان بۆ ئەکردن وە قوتابیەکان بەونەوعە لەپشتەوە چاویان لێ ئەکرد، ئەمە قوتابیانی مەکتەبەکان بەم جۆرە بوو، بەڵام لە جهـەتی عەسکەری‌یەوە ئامیرانی تەعلیمی عەسکەری لەدوای تەواو بوونی دەرس ووتنەوە هەموو ئێواران و بەیانیان هەموو جارێ لە **کۆتـایی هەمـوو دەرسێـکـدا ئەمـریـان ئەکرد بە عەسکەرەکان وئەیان ووت پێنج وەقت** نوێژی فەرزبکەن وە دوعا بۆ پادشا بکەن ئەمجا لەڕووی ئەو دەرس و تەربێتە جوانانەوە لە مکاتب جیهەتی عەسکەری‌و قوتابخانەو مزگەوتەکاندا وەکو باس کرا

[١] شاوڵ: فیکە

گەورەو بچوکی فامین و شەرم و ئەدەب لەدەرەجەیەکی وادا بوو کە چۆن ئیتاعەتی دایك و باوك و مامۆستا ئەگیرا.

هەروەها هی هەموو کەسێك ئەگیرا، کە بە تەمەن لە خۆیان گەورەتر بووایە، لەبەر ئەدەب و حەیاو شەرم هیچ کورێك نەئەچووە چایخانەوە چونکە لە چایخانەکەدا پیاوانی لە خۆیان گەورەتری تیا ئەبوو هەروەها لەبەینی موزە ف و کاسبەکان و ئەشراف و ئەرازیل و فەقیرو دەوڵەمەندا زۆر جیاوازی هەبوو. ئەفەندی‌یەکانی مولکی‌و عەسکەری‌یەکە چاکەت و پانتۆڵیان لەبەرئەکرد، پانتۆڵەکانیان بە عەلاگە لەسەر هەردوو شانیەوە هەڵ ئەواسی‌و لە دەرەلنگەکانیشیان لە دیوی ناوەوە بەم بەرو بەوبەردا دوو قۆپچەیان پیادا ئەدروو قایشێکی باریکیش لەژێر قوندەرەکانەوە بەو دوو قوپچەیەوە قایم ئەکران. لەو حاڵەتەدا کە پێوەی ئەرۆیشتن هەروەکو هیچ چرچ و لۆچێکی تیادا نەبێ وەها بوو، دەرئەکەوت کە هەر ئێستا لە ئوتو دراوە هەتا تەنانەت گۆرەویەکانیشیان دەرنەئەکەوت، لەو زەمانی پێشووەدا لە ئەشراف هەرکەسێك غەیری دەم وچاو بەروپشتی دەستی، هەر جێگایەکی تری دەربکەوتایە بە پیاو ی عادی‌و بێ حورمەت ئەدرایە قەڵەم، خۆ یەکجار قیسمی زابتەکان و ئامیرە عەسکەری‌یەکان بەو شەرمو شکۆهو لیباسە کیبارانەوە بە بێ‌ئاوردانەوە بەم لاو ئەولا (ئوین قورمە) عەلامەتی زابتی بەسەر شانیانەوەو قایشێکی بەسورمە چنراو بەناو قەدیانەوە بەستراوە بە

قیسمی ژنانیش بە بێ‌عەباو پەچە وە یا چارشێوو پەچە بە هیچ جۆرێك لە ماڵی خۆیان دەرنەئەچوون وە چارشێو شتێك بوو گەلێ لە عەبا پانترو درێژتر بوو لە رەنگی چەفیەی سورمەدا بوو، هەردووقۆڵیان تێ‌هەڵ ئەکێشاو لە ناوقەدیشیانەوە بە پشتێنێك لە رەنگی خۆی ئەبەسترا، وە پەچەکانیان لە پەچەی ئێستا گەورەترو ئەستوورتر بوو و پێڵاویشیان لە لەرەنگی سوور یان زەرد چەکمە بوو، (چەکمە شتێ بوو وەکو جزمەقووڵ بوو بەڵام دەرکیان گەلێ لە دەمی جزمە پانتر بوو) ئەویش بۆیە ئەوەیان لە پێ ئەکرد کە پیان تێ‌بخستایە هەموو دەرەلنگی پولداش کراسەکانیشیان ئەکەوتە ناویەوە وە باش ئەشارایەوە، ئیتر لەوحاڵەدا هیچ ئیمکان نەبوو کە کەس بتوانێ لەش یا دەم وچاویان یا

لیباسەکانیشیان ببێنێت، قیسمی ژنانیش هەروەها لەو جیهەتەوە بوو نمونەی شەرم و حەیاو هیچ شکی تیادا نییە کە ئەولادی ئەم نەوعە ژن و پیاوانە لەرووی ئەو ئەخلاق و کردەوە شیرینانەی دایك و باوك و تەربییەی ئەو نەوعە مامۆستایانەوە چ لەعاستی دایك و باوك و مامۆستایان وە چ لەعاستی هەموو کەسێك لە خۆیان بە عومر گەورەتر شەرم و ئەدەبەکەیان لە مەرکەزێکی ئەوتۆدا بوو ئەگەر ئەو تەعریفە بخرێتە سەر کاغەزو تازە پێگەیشتووەکانی ئێستا بیبینن بەپێکەنین و قەشمەری سەیری ئەکەن، بەڵام هەر ئەو ئەخلاق و ئەدەب و کردەوە شیرینانە بوو بەهۆی هەرزانیو بەرەکەت و زۆری رزق و فەرەحیو خۆشیو خواردنی هەمووکەس سحی بوو وە لەرقی یەکتری هەموو نەوعە خواردنێکیان نەئەکرد بەسەریەکاو وە لە جل و بەرگ دا لە شەوو رۆژێکدا دوو سێ جار خۆیان نەئەگۆری، لەعەسرەوە هەتا وەختی هەتاو گەرم بوون و چوونە دائیرەو بازارو سەرکارو کاسبی، سبەینێ بە یەك بیجامەی تەنك و یا فانیلەی عەلاگەو قوڵ و شان رووت کردن نەبوو، لە بازار چیان لەبەر بووایە بەدایم هەر ئەوەبوو وە ئەگەر فەسل و مەوسیمێ سەرماو گەرما جل وبەرگیان بگۆریایەو شەوو رۆژ باوە لەسەر یەك سیفەت و یەك تەبیعەت بوو، لەبەرئەوە نەخۆشی یەکجار کەم بوو، هەروەکو نەبووبێ وابوو، چونکە هەموو نەوعە نەخۆشییەکیان لە سەرما یان لە گەرما وەیا لەکاتێکا دوو سێ جار سەرماو گەرما بەسەرا هاتنە بەهۆی دوو سێ جار جل گۆرینەوە وە یاخود خواردنی ساردو گەرم و ئەمانە نەخۆشی پەیدا ئەکات، بە هەمووسلێمانی تەنیا (عەزەی حەکیم باشی)

ناوێك حەکیمی جولەکەو مستەفا ئەفەندی ناوێك دکتۆری عەسکەریو سەلمان ئەفەندی ناوێك جەراحی عەسکەری بوو، بە هەموو قەزای هەڵەبجەو عەشائیری ئەترافەکەی تەنها (حەکیم خوادە) حەکیمێکی جولەکەی ئێرانی تیابوو ئەویش بە ناوی (تەبیب) حەکیمی ماڵی عوسمان پاشابوو لە هەڵەبجە بوو، مەگەر چۆنها لە مانگێکدا یەکێك موراجەعەتی بکردایە لەبەرئەوەی لەو زەمانە کۆنەدا نەخۆشیو برینداری یەکجار کەم بوو، لەبەرئەوەش بوو کە زۆر ئیهتیمام نەئەدرا بە دکتۆرو خەستەخانە.

# « هەرزانی شتوومەك و كەرەسە»

لە زەمـانی پێشوودا پارە بەو كەمیەوە كە هەبوو لەبەر هەرزانی ئەرزاق و هەموو كەرەسەیەك ئەو پارە كەمە ئەوەندە بەقیمەت بوو هەرچەند بەئارەزووی خۆت شتت لێ بكـرِیـایەو مەسرەفی ماڵ و منداڵت بكردایە هەر تەواو نەئەبوو، ماڵێكی ساحێب خێزان بە تەواوی رەفاهیەتەوە رِۆژی بە دوو تارانی كە موعادیل (٥ر٣٧) فلسی ئێستا بوو ئیدارەی ئەكرد.

موتـەسەرِیفێك كە مەعاشەكەی دوو هەزار قرۆش بوو، كە موعادیلی هەژدە دینـارو حەوت سەدو پەنجـا فلسی ئێستـا بوو، كاتبێكی زەبتی مەحكـەمـە مەعـاشەكەی سێسەد قروش بوو كە موعادیلی دوو دینارو هەشت سەد فلسی ئێستا بوو، كرێكارێك دە سەعات زیاتر ئیشی ئەكرد رِۆژانەكەی یەك تارانی بوو كە موعادیلی هەژدە فلس ئێستا بوو.

حەماڵی ووردە حەقەكەی دوو پوول بوو، بەڵام حەماڵی گەورە كۆڵ قورسەكان حەقەكەی چوار پوول بوو، واتە چوار فلسی ئێستا، لەرِووی هەرزانی ئەرزاق و هەموو كەرەسەیەكەوە هەموو كەسێك بەو پارە كەمانەی دەستی ئەكەوت ئەیتوانی لەپاش تەئمینی ژیانی ماڵ و منداڵی، ئەملاكی پێ بكرِێت، چونكە حۆقەیەك گۆشت كە ئەكاتە سێ كیلۆونیو بە دوو تارانی بوو مانای سیوحەوت فلس ونیو، حۆقەیەك رِۆنی خاڵسی مەرِو بزن بە سێ قران بوو كە ئەكاتە پەنجاوشەش فلسی ئێستا.

رِبەی گەنم كە بریتی‌یە لە سی‌ویەك كیلۆو نیو بە دوو تارانی واتە سی‌وحەوت فلس و نیو، سی‌و جگەرێك بە چوار پوول بوو.

ئەو هەرزانی‌و فەرەحی‌و خۆشی‌یەی ئەوسا بوون لام وایە هەمووی لە رِووی ئەو دینداری‌و ئەدەب و گەورەو بچوكی‌و فامینەوە بوو كە هیچ كورِێك جەسارەتی نەئەكرد بەرامبەر باوكی یا مامۆستای یان كەسێكی بەعومر لە خۆی گەورەتر دانیشێت یان بچێتە چاپخانەكانەوە.

## «نەوعی پارەی ڕەواج»

لە ساڵی ١٩٠٠ م لە زەمانی حکومەتی عوسمانیدا لە شاری سلێمانی پارە زۆر کەم بووە هەروەهــا مەعاشیش کەم بوو، وە نەختێ بە نارەحەتی دەست ئەکـەوت وە ئەو پارەیــەی کە هەبــوو لەوانەی حکومەتی عوسمانی هەندێك لە ئاڵتوونی ساغ، وەکو پێنج لیرەیی‌و دوو لیرەو نیوی‌و یەك لیرەیی‌و نیو لیرەیی‌و وە چواریەك لیرەیی بوون وە هەندێك لە زیوی ساغ وەکو مەجیدی کە غازیشی پێ ئەووترا، هەروەها نیو مەجیدی‌و چواریەك مەجیدی‌و وە یەك قرۆشیش هەبووە.
**وە لە مەغـشــووشــە [بیشلغ]یــەعنی پێنــج قرۆش وە دووقرۆش ونیــوی کە قرانی** ڕەشیشیان پێ ئەووترا.

لەکاتێکدا کە سەربەستی بڵاوکرایەوە لە ساڵی ١٩٠٩م دا بوو لە مەسکوکاتی مەعدەن (نیکل) کە جۆرە شتێك بوو وەکو مەعدەنی ١٠ فلسی ئێستا لە (٥) پارەیی‌و (١٠) پارەیی‌و (٤٠) پارەیی‌و جۆرە پارەیەکی تریش لە ووردە بە ناو شارانا بڵاوکرایەوە، یەك لیرە بە (١٠١) قروش ئەچوو کە ئەکاتە (٩٦٠) فلس، وە هەروەها تەفەروعاتەکانی تری هەر بەونیسبەتە بوو، بۆ نمونە یەك مەجیدی بە ١٩ قرۆش ئەچوو وە هەر قرۆشێکیش (٤ر١ / ٩) فلس بوو هەروەها قرۆشێك عیبارەت بوو لە (٤٠) پارە وە لەمیش یەك پولی‌و دوو پول هەبوو وە هەر پولێکی موعادیلی فلسێکە.

وە لە مەسکوکاتی ئێرانی، لە زیوی خالیس جووتە تارانی‌و یەك تارانی هەبوو وە لەمیش یەك پول و دوو پول هەبوو، وە هەر لە زیویش بێچو هەبوو، وە لەبابەت ڕەواجــەوە لە دەوائــیری ڕەسمی‌و بازارو موعـامەلەدا هیچ نەوعە جیاوازی‌یەك لەبــەینی پارەی عوسمــانی‌و ئێرانیــدا نەئەکرا، تەنانەت لە بازاڕدا بۆ کڕین و فرۆشتن و سەوداو موعامەلە.

* * *

# «ڕشانەوەکە»

ڕشانەوە کوشندەکە کە مەشهووری ئافاق بووبوو وە لە ڕەسمیا ناوی (قوولرا) بوو لە ساڵی ۱۹۰۳م.

ئەو عیللەتــە واقیع بوو، یاخوا ئیتر کەس نەیبینێ، ڕۆژ نەبوو سەد هەتا سێسەد کەس پێی نەمرێ، لە کوڕو ژن و پیاو ساغ و سەلیم و مل قەوی، بێ ئەسباب هەر لە خۆیەوە لە پڕ قوڵپێك زەرداو یا ڕەشاو ئەرشایەوە حاڵەن هەردوو چاوی بەقوڵا ئەچوو، زەردو ڕەش هەڵئەگیرسا، لە موودەی (۲۰) دەقیقەدا ئەمرد.

زۆر کەم واقیع ئەبوو کە ئەوەی بەیانی بڕشایەوە بکەوتایە نیوەڕۆ وەیان نیوەڕۆ بڕشایەوە بکەوتایە ئێوارە، زۆری‌وا هەبوو کە کوڕی یا کچی یا باوك و دایکی تووشی ئەو ڕشانەوەیە ئەبوون نەیان ئەوێرا بچن بەلای ئەو مردووەدا وە لەترسی خۆی نەوەك خۆشی توشی ببێــت، هەر ڕەحمی خوایی بوو کە ئەو مردووانــە ئەشۆران و ئەشاررانەوە. ئەهلەکەی سلێمانی ئەوەندەی تریش کەم بوو بووەوە وە هیچ کەسێك زەوقی لەسەر خواردن و خواردنەوەو لەزایزی دنیای نەمابوو. وە تا مودەتێك زك و زاش نەمابوو، وە هەچ کەسێکیش بۆ پارێزگاری خۆی بچووایە بۆ دێ وەیا جێگایەك خەڵقی ئەو جێگایە قبوڵیان نەئەکردن و دەریان ئەکردن، وە پێیــان ئەگــوتن ئێمــەش دووچاری ڕشانەوە مەکەن ئەم غەزەبە (لە الحمد) تەقریبەن هەر یەك مانگ دەوامی کرد وە ئەگەر دەوامی ببوایە بەشەر لە شاری سلێمانیدا نەئەما.

## «ساڵی گرانیەکە»

لە مانگی نیسـانی ١٩١٦ی میـلادی موسـادیفی ساڵی ١٣٣٤ هجـریەوە گرانیەکی زۆر بەشیددەت و کوشندە دەستی پێکرد وە هەتا نیهایەتی کانونی یەکـەمی ساڵی ١٩١٨ی میلادی موسادیفی ساڵی ١٣٣٦ی هیجری کەوا دوو ساڵ و دە مانگ بەتوندی دەوامی کرد وە لەم ماوەیەدا ڕۆژ بەڕۆژ گرانیتر ئەبوو وە نزیکـەی چواریـەکی میللەتەکە لەبرسا مردوون، وە زۆر بەزەحمەت ئەگەر کولێرەیەك کە بە دوو تارانی بوو کە موعادیلی سیوحەوت فلس ونیو بوو دەست کورێکی چالاك بکەوتایە ئەویش عیبارەت بوو لە پەموودانەو کزنو پووشە چەڵتوك ئەگینا گەنمی هەر تیا نەبوو، ئەو کورەش بۆ موحافەزەی نەوەك فەقیرانی برسی بەزۆر کولێرەکـەی لێ بسێنن یا لێی بفرێنن، لەبەرئەوە کولێرەکەی بە هەردوو دەست توند یە سنگیەوە ئەنووسان، هەرچەندە هەچ کەسێکیش لەو کولێرانەی بخواردایە هەر پێی ئەمرد، لەگەڵ ئەوەشدا فەقیرانی برسی لێی کۆئەبوونەوە، پەلامـاریـان ئەداو کورەش کولێرەکـەی لەژێـر سنگیەوە قایم ئەکرد، ئینجا بەونەوعەش هەر کولێرەکەی پێ ڕزگار نەئەکرا وە هەر لێیان زەوت ئەکرد. لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا بەموناسەبەتی ئیعلانی هودنەوە لە حەربی عوزما لە شاری سلێمانیدا غەیری موتەسەریفێك کە ناوی ڕەزابەگ بوو، تورك بوو، وە هەندێك لەو زابتانەش کە لەسەر مەخزەن و شت مابوونەوە، حکومەتێکی ئەوتۆی تیـا نەمـابوو، وە فەلاحەت و زەراعەت نەئەکرا، ئیتر ئەوەندە گرانیەکە زیاترو کوشنـدەتـر بوو وە ڕۆژ نەبـوو لە کۆڵانەکاندا خەڵك لەبرسا نەکەوتبێت و نەمردبێت.

تووی هەورامان بەوشکی حوقەیکەیشتە یەك لیرەی ڕەشادی وە لەباتی شەکر بەکارئەهێنرا چونکە شەکر دەست نەئەکەوت وە بە دیشلەمە چایان پێ نەخواردەوە.

وە زۆری پیاوە گەورەکان فێری قاوە خواردنەوە بووبوون تۆوی کنگرو درکیان ئەبرژان هەندێك لەگەڵ قاوە تێکەڵیان ئەکرد وە هەندێکیش بەتەنها لێیان ئەنا لەجیاتی قاوە ئەیان خواردەوە.

بەڵام چا لەناو قوتودا بە (گەروانکە) لە ئێرانەوە ئەهات بەڵام زۆر بەگران دەست ئەکەوت.

لەگەڵ نەبوونی دەغڵ و دانیشدا حکومەت چەند مەئمورێکی بەناوی مەئموری مبایعەوە تەعین کردبوو کە لە فەلاحەکان هەچ کامیکیان لە نانی خوی کەنم جوی زیادی هەبێ بەسورەتی مبایعە بەو فیئاتەی لە حکومەتدا مۆر بوبوو بۆ ئیعاشەی جیهاتی عەسکەری و مەئموران وەرکری چونکە لەو کرانیەدا لە جیاتی ئەو پارەی غیلای مەعیشەتی ئێستا ئەدرێ ئەوسا لە طەرەف حکومەتی عوسمانیەوە لە گەنم وە رۆن وە برنـج لە مەخـزەنی عەسکـەرییەوە بەنیسبەت مەعاشەوە عەینەن ئەرزاق ئەدرا بەقیمەتێکی زۆر کەم.

زور جار لەناچاریدا فەقیری برسی کوی‌دریژی سەرنەبری وە سیو جکەرەکەی ئەبرژان و ئەیخوارد.

(گەروانکە): بریتی بووە لە قوتوی بچوك چای تیا بوو، دروست کرابوو لە تەنەکە هەر دوو قووتو بریتی بوو لە هۆقەیەکی ئەستەمبووڵ.

«بۆردومانەکە»

لە (٤-٥)ی مایسی ١٩٢٣ کە (کەپتان چایمەن)ی ئینگلیز لە سلێمانی دەرکرا ئەمجا حکومەتی ئینگلیز ویستی بە بۆمباردومان سلێمانی ئیصلاح بکات وە لە پێشا هەتا چەند رۆژێک تەیارەی زۆر بەنەزمی بەسەر شاری سلێمانیدا ئەسوورانەوە، تەنانەت کە خەڵک لە چایخانەکان و بەسەر بازاردا هەڵئەستان وە ئەیانویست رابکەن تەیارەچییەکان لەناو تەیارەکەوە بە دەست ئیشارەتیان ئەکردن کە دابنیشنەوە هیچ ناکەن وە بەم جۆرە هەتا چەند رۆژێک خەڵکی سلێمانیان ئەمین کردەوە، بە هیچ نەوعێک ترسی بومباردومان لە دڵی کەسا نەما.

هەتا رۆژی ١٣ - ١٤ مایسی ١٩٢٣دا لەناکاو بەنزمی تەیارەی زور هاتە سەر شاری سلێمانی وە کتوپڕ دەستیان کرد بە بومباردومان وە یەکەم بۆمبایان کە زۆر گەورەو موسیبەت بوو دای بە ماڵی عارف بەگی عەلافدا وە خانووەکەی بەجارێ داروو خاندو پەرش وبڵاوی کردەوە، وە هەچ ژن و پیاو منداڵ و هەرچ روح لەبەریکی تیدابوو بەساغی دەرنەچوو وە هەموو بووبوون بەژێر خانووە کەوە، وە وا دەرکەوت ئەو بۆمبایانە کە زۆر موهیم بوو بەخسوسی بۆ خانووەکەی شێخ مەحمود یان بەردابۆوەو بە قەزاو قەدەر بەرماڵی عارف بەگ کەوتبوو چونکە شێخ مەحمود، لەو تەئریخەدا گواستبویەوە خانوەکەی عیزەت بەگی عوسمان پاشای جاف کە لە نزیک خانووەکەی عارف بەگەوە بوو، بەڵام بومباکانیتری گەرچی لە هەندێک خانووی عادیش نەختێک پێ لێ روخاوە بە پارچەی ئەو بۆمبایانەی کە ئەتەقینەوە بەعزێکەس بریندار بووبوون، ئیتر کە خەڵکی سلێمانی ئەمەیان بینی هەموو رۆژێک پێش ئەوەی دنیا رووناک ببێتەوە بە گەورەو بچوک و ژن و پیاو منداڵەوە رایان ئەکرد بۆ ژێر پردەکان و ناوچەی دەشتاییو

سەرقەبران و جێگاکانیتر کە دوور بوو وە خۆیان ئەشاردەوە وە هەتا ڕۆژئاوا نەبووایە وە دنیا تاریك نەبووایە نەیان ئەویرا بگەڕێنەوە ناو شارو ماڵەکانی خۆیان، وە هەروەکو سەراو حکومەت نەمابوو بازارو دوکان و کەسایەتیش نەمابوو شێخ مەحمودیش وەکو ئەو عالەمە ئەچوە دەرەوە، وە بەزۆری لە تەکیەکەی شێخ مارف دائەنیشت کە نزیك سەرقەبران بوو لەپاش چەند ڕۆژێك تەیارە زۆر بەبەرزیەوە هاتە سەر شاری سلێمانی وە هەروەکو کوللە چۆن بەری ئاسمان بگرێت بەو نەوعە بەیان نامەی زۆری بڵاوکردەوە کە لە شاردا خانوو نەمابوو دووسێیەك نەکەوتبێتە ناو حەوشەکەی وە لەو بەیان نامەیەدا نووسرابوو لە بەغدا فلان پاشا قەراریداوە کە لە دوو سبحەیەوە سێ ڕۆژ لەسەریەك جێگای شێخ مەحمود بومباردومان ئەکرێ ئەمجا ئەی ئەهلی سلێمانی وا ئاگادارتان ئەکەم ئاگاتان لە خۆتان بێت وە ئەوانەی شتی باش و خۆشەویستی هەیە لە مودەتی ئەم دوو ڕۆژەدا لە جێگای باش قایمی بکات] ئیتر هەر لەدوای ئەم بەیان نامەیە خەڵکی سلێمانی بەجارێ بە ئەشیاو خاوو خێزانەوە هیجرەتیان کرد بۆ دێهاتەکانی دەوروپشتی سلێمانی وە یەك ماڵە لادێ نەمابوو کە ٤ ـ ٥ماڵی لە ئەهلی سلێمانی تیا نەبوبێت وە زۆر بەئیحترامەوە خزمەتیان ئەکردن وە ئەوەی شتەکەی ئاسان کردبوو ئەوەبوو کە لە هاوینا بوو وە هەمووکەس ئەیتوانی لە سەربان و بەردەرگاو دەشت بنوێت.

بۆمباکانی بۆمباردومانی ئەمجارە وەك هینەکانی پێشو گەورە نەبووبوون نەوعە شتێ بوون وەك چراقوتیلکە نەوتەکانی لادێ بەسەرهەچ خانوو سەربانیکا بکەوتایە وەك میزراح لەعاستی خۆی ئەخولایەوە هەتا بانەکەی کون ئەکرد وە ئەگەیشتە سەر زەل و گەلاکەی ئنجا ئاگری تێبەرئەداو ئەیسوتان وە هەچ کەسێك بچووبایە بۆ ئاگر کوژانەوەی خانووەکەی تەیارە چیەکان ئەیاندایە بەر گوللەی ڕەشاش.

(تەشکیلاتی نەفسی شاری سلێمانی لەتەرەف شێخ مەحموودی حوکمدارەوە)

لە ڕۆژی ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ م دا کە مێجەر نۆیلی حاکمی

سیاسی گەیشتە سلێمانیو بەدوای ووتار خوێندنا کەوە شێخ مەحموود کرا بە حوکمداری کوردستان وە دەستیکرد بە تەشکیلات بۆ شارەکە، شێخ قادری برای دانــرا بۆ سەرلەشکرێتی (رەئیس ئەرکانی جەیش)وە شێخ حەمەغەریبی زاوای کرا بە وەزیری داخلیە وە لە میللەتی نەسرانی خواجە کەریم عەلەکە بوو بە وەزیری مالیە وە سەیید ئەحمەدی شێخ محەمەدی شێخ عەبدول رەحیم کە ناسرابوو بە سەید ئەحمەدی دان زێڕ بوو بە مودیری ئەمنیەتی عام (مدیر عام للشرطة) وە حاجی سەید حەسەن کە مامی خۆی بوو بوو حاکمیەتی مەحکەمەو حاجی ئاغـای حەســەن ئاغـای تفەنگچی باشی (طابور آغاسی‌ی ژاندرمە) وە مستەفا ئەفەندی ... ئەحمەد ئەفەندی حاجی مەحمود ئاغا کە باوکی فایق هوشیـاری حاکم بوو وە مستــەفا ئەفەندی حاجی ئیبراهیم ئاغا کە لە ساڵی ١٩٥٩دا لە مودیـریـەتی مالی قەزائی مەرکـەزدا تەقاویت کرا وە لە تایەفەی فەرخەش عومەرئاغا ناوێك کە خزمی ئەو تاهیر ئەفەندی محەمەد ئەفەندی کەریم ئاغایە بوو لەگەڵ سەید ئەحمەدی دان زێڕو ئەو جمعیەتەی چووبوونە کفری مێجەر نویلی حاکمی سیاسیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆ سلێمانی، ئەمانە هەموو بە قۆمیسەری لەژێر ئەمرو نەزارەی مودیری ئەمینەتی عامدا بوون ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی ئەرازی کە مەشهوورە بە حەمدی شاعیر بوو بە وەزیری گومرگ و رێـژی تەعینی کردن وە هەموو موستەخدەم و موەزەفەکانی زەمانی حکومەتی عوسمـانی هە تا نیهایەتی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ موەقەتەن هەر بەو مەعـاشــەی کە بووبـویـان لەســەر وەزیـفــەکـانــی خـویـانــیـانـە هێشتنــەوە، وە هەر لەوڕۆژەدا لەدوای تەواو بوونی خوتبەکەی مێجەرنوێل ناردی بەدوای هەمــوو موختــاری گەڕەکـەکاندا وە بانگی کردنە لای خۆی وە لە هەموو گەڕەکێکدا چەند پیرەمێردو پیرێژن و تەقاعدو ئیفلیج و گۆج و کوێرو فەقیرو لێقەوماو هەیە ناونیشانی وەرگرتن وە لە کۆتایی هەموو مانگێکدا لە بەردەمی دائیرەی سیاسیدا کە لەدواییدا کرا بە مەکتەبی فەیسەڵیە هەموویانی کۆئەکردەوە، بەناوی مەعاشەوە پارەی ئەدانێ وە هەتاوەکو نیهایەتی کانوونی دووەمی ١٩١٩ واتە دوو مانگ و دوانزە ڕۆژ بەوبەوعە دەوامی کرد.

تێبینی:

ـــــــــ:ـ خاوەنی ئەم یاداشتە کەریم ئەفەندی غەفوور ئەفەندی ئەحمەد بەگزادە لە ساڵی ١٨٨٧ز لەدایك بووە، وە لە ساڵی ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کردووە.

وە خوێندەوارێکی ئەو سەردەمە بوە، لە زەمانی عوسمانیدا نەرمانبەر بووە.

شایانی بادسە ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٠٠دا کە هۆشی کردوەتەوە تا ساڵی ١٩٦٨ ئەو کەشکۆڵەی کە بۆی بەجێهێشتوین کە دەربارەی مێژوو و ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو رۆشنبیریو کارەسات و بەسەرهاتی ئەم شارەی بۆ تۆمار کردوین رۆژ بەرۆژ بەمێژوو بە سەعات کە خۆی لەگەڵیا ژیاوە، ئەو بەسەرهاتانەی بە چاوی خۆی دیوە کە بایەخێکی زۆری هەیە بۆ ئەم رۆژە. وە کەڵکێکی زۆری لێ ئەبینین، کە ئەو پیاوە لەو سەردەمەدا بیری لەوە کردوەتەوە کە رۆژێك ئەبێت سوودی لێ وەرگیرێ.

خۆزگە هەموو نووسەرێك لەکاتی خۆیدا ئەم لایەنانەی سەر بە شارەکەی تۆمار ئەکرد وەك ئەم کابرایە کە نووسەریش نەبوو کۆی کردۆتەوە لەکاتی خۆیدا، ئێستا کە ئێمەش وەك میللەتانی تر کتێبخانەی کوردیمانی پێ دەوڵەمەند ئەبوو، وە جێی شانازیش بوو، نەوەی داهاتوش کەڵکێکی زۆریان لێ وەرئەگرت، لە گلەییش بەدوورئەبوون.



# سەربازی بێناو

ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوول
لە سلێمانی مات و مەلوول
سەربازێکی بێپارەو پوول
خوێن گەرمێکی ئازاو عەجوول
ئەخولایەوە وەك گەردەلوول

بەدوای مەرگا هەرای ئەکرد
شالاوی بۆ دوژمن ئەبرد
لەپڕ کوژرا من نالێم مرد
کوژرا بۆ تۆ، بۆ گەلی کورد
هەموو دوژمن باسیان ئەکرد

بە جوانترین ناوونیشان
فیداکاری بۆ نیشتمان
لەپێناوی گەل و ژیان
گیانی پاکی چوو بۆ ئاسمان
بوو بە پێشەنگ بۆ شەهیدان

ئەیوت: بڵێن بە منالەکان
بە نەوەی نوێی وەرزێرەکان
لەرووی زەوی هەموو جیهان
لە گشت ڕەنگ و توخمی ئینسان
هەر کورد ماوە بە بێ کیان

(قادر برسی)

## ● «بە بیرەوەریی من»

نووسینی: مام برایم

بە بیرەوەری من سلێمانی تەنیا پێنج گەڕەکی گەورە بوو (سەرشەقام، دەرگەزێن، گۆیژە، کانێسکان، مەڵکەندی).

ئەوسا شەقام نەبوو نە قیرتاو کراوو نە قیرتاو نەکراو، جگە لە چەند کۆڵانێکی فراوان، هەموو کۆڵانەکان تەنگەبەر بوون وە لە چەند شوێنێکیش دا (چوخم) هەبوو وەك چوخمەکەی سابونکەران و دەرگەزێن کە ئێستا ماون. شیوەکان سەریان نەگیرابوو، کۆڵانەکان لە هاوینا تەپ وتۆزو لە زستانا هەر قوڕو چلپاو بوون. ئەوسا (کارەبا» نەبوو بەڵام شارەوانی لەسەر سیلەکان شەو چرای دائەگیرسان. ئەوسا پرۆژەی ئاو نەبوو، هەر گەڕەکەو لە چەند کانیو کارێزێکەوە ئاویان ئەبرد وە گەلێ ماڵیش بیریان هەڵ ئەکەند.

لەبیرمە کە تازە چا داهاتبوو، لە قاوەخانەکان دا قاوەمان ئەخواردەوەو نێرگەلەمان ئەکێشا، زۆر کەس چای نەئەخواردەوە ئەیانوت: بۆ چاڵی لێ دێت. ئەوسا بەیانیان ئیمە نیسکێنەو دۆشاوی رەش و ئەم چەشنە خواردنانەمان ئەخوارد. بە بیرەوەری من بامێ هەر هەبووە، بەڵام تەماتە نەبوو بامێمان بە زەردەچەوە لێئەنا وە هەروەها تاسکەبابێیش کاتێ کە تەماتە داهات زۆر کەس نەیان ئەخوارد. بە بیرەوەری، من لێرە هیچ قوتابخانەیەك نەبوو، یەك قوتابخانەی لەشکری نەبێت خوێندن تەنیا لە مزگەوتەکان و حوجرەکاندا هەبوو وە بەدەگمەن هەبوو کە بزانێ بەکوردی بنوسێو بخوێنێتەوە، بە تورکیو فارسی و عەرەبی گەلێ کەس هەبوون کە نامەیان پێ ئەنووسی،

جگە لەوەش کە هەر بەم زمانانە ئەیان خوێند. بەڵێ ئەوسا شارەکەمان لە گەلێ رووەوە دواکەوتوو بوو، بەڵام ئێستا لەزۆر رووەوە پێشکەوتوو و رازاوەیە، وە هۆی حەسانەوەو کات بەسەربردن زۆرە بەڵام داخەکەم ئێستە:

ئەگەرچی خوێندەواری زۆرە، بەڵام وەفاداری کەمە. شەقامەکان پاکن، بەڵام زۆر دڵ پیسن. خواردنی خۆش و هۆی حەسانەوە هەیە، دەرامەت کزەو دەردی دەرون زۆرە.

ئەوسا «دراوسێتێ» پیرۆزتر بوو، هاورێیەتی بەهێزتر بوو، پیاوەتی باوی بوو، بەڵام داخەکەم ئێستە (پارە) جێی بە زۆر سروشتی پاك و رەوشتی بەرز لێژ کردووە. ئەوسا بەخۆراکی کەم لەگەڵ سەربەرزییا بوایە دائەکەوتین بەڵام ئێستە هەڵپە زۆرە، چاو تێر نابێ، دڵ رەقترە، بەزەیی کەم.

سەرچاوە:

گۆڤاری سلێمانی (بڵاوکراوەی شارەوانیی سلێمانی)، ژمارە (٢) ساڵی ١٩٦٨..

❊ ❊ ❊



# بو خلقی لوای سلیمانی

# واطر[redacted]مجاوره



یان شاریك د[redacted]ات بشیخ محمود
افندی یان پیاو[redacted]چ وقتیك ببیت)
او شاره یان او د[redacted]رجب عین معامله
دهبیت وك لشا[redacted]سلیمانی لی هاتوه
وبسری گوت[redacted]یا بوی همو كس
اعلان كرا .

بۆ همو ضابطەکان وعسکرەکانی لوی سلیمانی

معلومەکە لەایوە دیارە کەایستا ایشی شیخ محمود تواوە وفائیدەی نیە بوایوە مدتیکی تر لای او بمینن بەکیشتنی اماعلانە ایوە ابی درحال بۆلای اوقوماندانی عسکری قوەئی دولتی کە نزیکترە بین واثبات وجود بکن اوانەی کەدرحال دین عفوابن واوانەی مسلح دین هراووقتە معاشی مانگیك وراگرن ولەادارەیی تازەلەسلیمانی قید ابن

مشاور کرکوك ــ ۳۱ مارت ۱۹۲۳

# اعلان

---

## برای عموم اهالی از طرف قومندان کل قوای دولت فخیمه

---

در این وقت محضا تأمین اسایش واستراحت عامه حکومت می خواهد حرکات عسکری بنماید ودر این حرکات حکومت در فکر انتقام از حرکات سابق بهیچ کس نیست هر کس که این دفعه بحکومت مقاومت بنماید فقط اورا دشمن خواهد دانست واورا تنبیه خواهد کرد لهذا هر کس که سلامتی خودرا آرزو دارد از مفسدین یکه درداخل حدود ولایة موصل مشغول افساد هستند کناره کیری نمایند وهرکس راکه قوماندان کل دعوت نمایند لازمست بدون خوف وتلاش فی الفور حاضر بحضور شان بشود والا اورا دشمن دانسته معاملهٔ دشمن با او جاری خواهد شد

بغداد ۲۸ مارت ۱۹۲۳

# اعلان رسمي

قرارمان دا كه لهم روژانه دا قوتيكي عسكريه بنيرينه سلماني بو تنظيم أدارهء مملكت وترتيب امور قضا ونواحي. أشرآف مملكت، روءساى عشاير، مأمورين حكومت، [illegible] وبه دليكى صاف وصادق دخالت وتسليم به قومندان أو عسكره بين، كه اكاته سليماني.

خبر دارتان ده‌كين آى خلقينه كه اكر ايوه مخالفت ومقابلهء عسكركه نكهن أوآن به هيچ كلوه جى دخلى ايوه نا كهن وضررتان لى نادهن وهيچ اذيتيكتان پي ناكه يين. فقط أو كسانه كه مقابله بكهن عسكر تعقيب وتأديب اوان واتباعيان ده‌كات.

وأكرر [illegible] ايقاظنامه يه [illegible] دشمنانه مقابلهء عسكركه‌مان بكه‌ن وتفنك بو عسكر وطياره بهاويژن أوسا مسؤليت كوره أكه ويته سرأو كسانه كه مسبب بن وعسكر دست ده‌كات به تعقيب وتأديبيان.

باش قومندان قوات هوائيه وعساكر بريهء اردوى برطانياى كوره له عراقداء
« آى روايس مارشال » فريق اول
آردوى هوائى.

CPSI ..115 ..17..1,000..2-5-23.

# بیاننامه بو کوردهکانی لوای سلیمانی

---

به پی اتفاقنامه یك كه له سال ١٩٢٧ دا امضای کردوه شیخ محمود تعهدی کرد بو که له دنی یکدا له خارج حدود عراق دا اقامت بکا و به بی اذنی حکومت داخلی عراق نه بیتـه‌وه و به هیچ وسیله یك له له لوای سلیمانی و نه له هیچ جیگایکی تری عراق دا مداخله اداره حکومت عراق نکا .

شیخ محمود ام شرطانه‌ی ئمو شکاندوه و هر چند امری پی کراوه که خاکی عراق بجی بهیلی اطاعت اوامرانه‌ی نکردوه که درلعرجی رلم چند هفته رابوردوه دا له مناطق لوای سلیمانی دا دستی کردوه به سورانه‌وه و لو ئناتشبثی کردوه که له ضد حکومت شورش برپا بکا .

لبراوه امری پی کراوه فوراً خاکی عراق بجی بهیلی وا اکر اطاعت ام امره نکا له حق خوی واتباعی اجراآت لازمه اتخاذ اکری .

بناء علیه وا اخطارتان اکه ین که هر کس پنا بدا به شیخ محمود واتباعی و یا معاونتیان بکا خوی توشی جزای شدید اکا .

٢٠ / ١٠ / ١٩٣٠

## أ - وەرزش لە شارەکەمانا -

جووڵانــەوەی وەرزش بە بیرەوەری چەنــد کەســێــکــی شارەزا لە زەمــانــی عوسمانی‌یەکانەوە هەبووە[1] لە شارەکەمانا بەتایبەتی لە قوتابخانەکاندا.

وەك: یاری (جـومنـاستیك)و (سویدی) و (توپی‌پێ) بە میزەڵان پەڕۆیان تێوە ئەپێچاو بەنیان تێوە کرێ ئەداو قوتابیان و منداڵان یاری‌یان پێ ئەکرد.

مامۆستای وەرزشی ئەو سەردەمە (محەمەد زەکی)ی خوشکەزای (رەشید کابان) بوو. لە زەمانی داگیرکەری ئینگلیزدا لە ساڵی ١٩١٩ تا ١٩٢٢ جووڵانەوەیەکی نوێ هاتە پێشەوە لەناو قوتابیانی (مەکتەبی نموونەی سەعادەت)دا کە لەو سەردەمەدا تاقە قوتابخانە بوو.

لە حەوشی مەکتــەبــەدا کەشوێنی (قشلەی عەسکەری تورك) بوو لەناو خۆیانا یاری‌یان ئەکرد بە تۆپی لاستیك و چەرم. بۆیەکەم جار تۆپەکە تۆپی ئینگلیزەکان بوو لە مەعاریفەوە بۆیان ئەهات جاروبار لەگەڵ (لیڤی‌یەکان) سەربازی ئینگلیزەکان لە دەشتی تەیارەخانەکە یاری‌یان ئەکرد بە سەرپەرشتی‌ی مامۆستا:

١ ـ شێــخ ئەورەحمان ئەفەندی. ٢ ـ ئەحمەدی عەزیز ئاغا. ئەو قوتابی‌یانەی کە ئەوکاتەدا بەشیداری یاریی تۆپیان ئەکرد:

١ ـ تاهیر یەجیا بەگ ـ مامۆستای وەرزش

٢ ـ قادراغای حاجی مەلا سەعید ـ مەللاك

٣ ـ غەفووری سەعید ئەفەندی ـ مووچەخۆر

٤ ـ شێخ کەریم باراوی ـ مامۆستا

٥ ـ ئەحمەدی قازی ـ مامۆستا

٦ ـ قالەی محێدین ـ سەرباز

٧ ـ جەمال مەجید سەلیم ـ مامۆستا

٨ ـ سالّح عەلی ـ مامۆستای وەرزش و دیدەوان

٩ ـ ئەحمەدی سالّح ئەفەندی ـ معاونی پۆلیس و چەند قوتابی‌یەکی‌تر.

........

(١) لە دەوری بابانیشدا میستەر ڕیچ باسی گەلێك چالاکی وەرزش ئەکات.

(ع.م.ر)

وە هەروەها (نمایشی گشتی) (استعراض عام) هەر قوتابی‌یانی نموونەی سەعادەت سالّی ١٩٢٠ ـ ١٩٢١ لە تووی مەلیك بۆ یەکەم جار بە سەرپەرشتی کاپتان (هۆلّد) کە ئەفسەرێکی ئینگلیز بوو دەرسی ئینگلیزی پێ ئەووتن.

یاری‌یەکانی نمایشەکە:

١ ـ سواری

٢ ـ راکردن

٣ ـ جل لەبەرکردن بەخێرایی

٤ ـ کورسی کورسی

٥ ـ کەوچك و هێلکە

٦ ـ گۆرانی‌و هەلّپەرکێ‌و دەهۆلّ و زورنا. وە هەروەها لەو سالّەدا لە حەوشی مەکتەبەکەدا یاری کۆلارەی بە قوتابی‌یەکان ئەکرد بۆ جوانترین و باشترین کۆلارە کە هەلّیان ئەدا وە بە دەها کۆلارەی ڕەنگاوڕەنگ بەئاسمانەوە دیمەنێکی جوان بوو.

تێبینی:

ـــــــ وەرزش هەموو جۆرەکانی کە بە ڕێك وپێکی دەستی پێ‌کردبێت لەسەر یاسای وەرزشی‌و تیپی قوتابی‌یان یاری‌زانی چاك پەیدا بووبێ جل وبەرگی تایبەتی‌ی خۆیان بووبێت لە سالّی ١٩٣١ دەستی پێ‌کرد چونکە وەکو نەزانن لە سالّی ١٩١٤ لە سەرەتای شەڕی جیهانی یەکەم تا شەڕی بەردەرکی سەرا سالّی ١٩٣٠ ئەم شارە

تووشی ناخۆشیو نارەحەتیو تەنگوچەڵەمە بوو لەبەرئەوە ماوەی ئەوە نەبوو کە وەرزش بە ڕێکوپێکی دروست بێت هەروەها یاری (ڤالی بۆل)و (باسکت بۆڵ) هەر لەم ساڵەدا دەستی پێ‌کرد وە زۆر جار قوتابی‌یانی شارەکەمان بەشداری‌یان کردووە لەگەڵ تیپی تۆپی شارەکانی‌ترو گشتی لە بەغداو کەرکووك بۆنموونە لە ساڵی ۱۹۲۳ ـ ۱۹۲٤ سلێمانی بەشداری‌ی نمایشی گشتی‌ی کرد کە هەموو شارەکانی عێراق بەشداری‌یان کرد لەو ساڵەدا سلێمانی یەکەمی وەرگرت لە ڕاکردنی (٤٠٠) مەترو دووەمی بەدەست هێنا لە هەڵدانی (ڕم) لەلایەن قوتابی (عەبدول ڕەحمان موفتی)یەوەو چەند مەدالیایەکی تریشیان وەرگرت. هەروەها لە ساڵی ۱۹۳۲دا تیپی تۆپی پێ‌ی قوتابی‌یانی سلێمانی چوون بۆ کەرکووك لەگەڵ تیپی کەرکووك یاری‌یان کرد، لەئەنجامدا سلێمانی دوو گۆڵی کرد بەرامبەر بە یەك گۆڵ، هەروەها ساڵی ۱۹۳۷ ـ ۱۹۳۸ سلێمانی بەشداری کرد لە کەرکووك لە نمایشی گشتی‌و یاری تۆپی پێ‌دا لەنێوان شارەکانی باکووری عێراق داو لە ئەنجامدا سلێمانی لە چەند یاری‌یەکدا یەکەمی‌و دووەمی بەدەست هێنا وەك ڕاکردنی (۲۰۰)م و هەڵدانی (ڕم) لەلایەن قوتابی (ئەورەحمان موفتی)یەوە کە تائێستا ئەو وێنانەی لاماوە وە هەروەها سلێمانی لە یاری تۆپی پێ‌دا بەر (هەولێر) کەوت و لەئەنجامدا سلێمانی بردی‌یەوە.

وە لە ساڵی ۱۹٤٥دا تیپی قوتابی‌یانی سانەوی سلێمانی چوون بۆ کەرکووك لەگەڵ تیپی قوتابی‌یانی سانەوی کەرکووکدا یاری‌یان کرد لە تۆپی پێ‌دا. لەئەنجامدا سلێمانی بردی‌یەوە دوو گۆڵ بەرامبەر بە یەك گۆڵ.

## ا دیدەوانی (کەشافە)

لە زەمانی عوسمانیدا لە قوتابخانەی (ئەعدادی‌یەی موڵکی) مەشقیان بە قوتابی‌یان دەکرد و بە چەکەوە وە جلی قاوەیی‌یان لەبەر ئەکرد ئەوسا پێیان ئەووت (ئیزچی) مانای (فتوة) پاشان لە شەڕی جیهانی یەکەمەوە نەما بەهۆی تەنگوچەڵەمەی شەڕو تا هاتنی ئینگلیزو داگیرکردنی وڵات و شەڕی شێخ مەحموودی نەمر لەگەڵ ئینگلیزو بوردومانی سلێمانی‌و دەوروپشتی، تا ساڵی ١٩٢٤ کە دوپیا هاتە سلێمانی بو یەکەم جار بەلام لە ساڵی (١٩٢٥)دا دەوامی قوتابخانەکان بە رێکوپێکی کرایەوە لەم ساڵەدا (دیدەوانی) دروست بووە بە هاتدانی مامۆستا (عەبدولواحید نوری)و مامۆستا (مستەفا سائیب)و بەسەرپەرشتی مامۆستا (فوئاد رەشید).

دیدەوانی ئەکریت بەم بەشانەی خوارەوە:

١ ـ کوڕان:

لە پۆلی یەکەم تا پۆلی چوارەم پێیان ئەووترێت (بێچووەشێر ـ ئەشبال).

وە لە پۆلی پێنجەم و شەشەم پێیان ئەوترێت (دیدەوان ـ کەشافە) و ە لە ناوەندیدا پێیان ئەووترێت (فتوة).

شێوەی جلەکانیان پانتۆڵی خاکی کوڕان کورت یان درێژ لەگەڵ کراسێکی خاکی‌و سدارەی خاکی‌و پێلاوەکانیان قاوەیی.

کچان:

پێیان ئەووترێت (رابەر) - (مرشدات) جلەکانیان تەنوورەی نیلی وە کاسکێتی نیلی وە کراسێکی خاکی و گۆرەوی یەکانیان زەیتوونی ئیجا مامۆستای وەرزش لە هەر پۆلێك چەند قوتابی یەکی هەڵئەبژاردو ئەیکردن بە

دیدەوان لە هەفتەیەکدا دوو جار (دووشەممان و پێنج شەممان) لە یاریگای قوتابخانەکەدا وەیان لە دەشت مەشقیان پێ ئەکردن وە زۆر جار بە تەپڵ و مۆزیقە ئەگەران بەناو شاردا ئەمانیش وەکو سەرباز چەند کەسێك لەپێشەوە بە تەپڵ و مۆزیقەوە ئەرۆیشتن، وە هەندێ جار رۆژانی پێنج شەممەو هەینی ئەچوون بۆ دەرەوەی شار وە لەسەرچنارو قلیاسان و زۆر شوێنیتر ئەمانەوە پێیان ئەووت (موخەیەمی کەشفی، چادرگا).

تێبینی: زۆر سالانی ئەو سەردەمە نمایشی گشتی وە (چادرگای دیدەوانی (مخیم كشفي) ئەکرا لە بەغداد هەموو قوتابیانی شارەکان بەشداری یان ئەکرد لە گۆرەپانی (کەشافە) کۆئەبوونەوە بۆ ماوەی چەند رۆژێك و چادریان دا ئەکوتاو خواردنیان لەوێ دروست ئەکردو جلی کەشافەیان لەبەرئەکردو مەشقیان پێ ئەکردن بە سەرپەرشتی مامۆستای وەرزش، ئەویش لەوێ چەند قوتابی یەکی چالاك و وریای بەسەرەوە دائەنان تا رۆژی نمایشی گشتی کە هەموو قوتابیانی شارەکان لە یاریگای (کەشافە) بەمەشق ئەرۆیشتن و ئالای ئەو شارە لەپێش قوتابی یانەوە وە لەدوای مامۆستاوە هەڵیان ئەگرت.

لە ساڵی ١٩٣٣ - ١٩٣٤ سلێمانی بەشداری کرد بە سەرپەرشتی مامۆستای وەرزش (شاکیر سەید حەکیم) وە لەو نمایشە لەبەر ئەوەی سلێمانی یەکەم دەرچوو لە رێکوپێکی و پاکو تەمیزی دا وە لە جل لەبەرکردندا وە لەورۆژەدا بەیداخی شەرەفیان دا بە سلێمانی و هەڵیان کرد بە سەرپەرشتی (فازیل جەمالی) کە لەو کاتەدا لەلایەن وەزارەتی زانیاری یەوە دانرابوو بۆ سەرپەرشتی. ئەو شوێنانەی کە لە شارەکەمانا یاری تۆپی پێی تێدا ئەکرا:

١ - یاریگای دەشتی تەیارەخانەکە شوێن گەرەکی شۆرش (عەقاری).

٢ - یاریگای باخی پوورە بەگی (شوێن ئاشی ئەلەکتریکەکە) لە گەرەکی گۆیژە.

٣ ـ یاریگای بەردەمی گردی سەیوان (دەشتی فەقێیان).
٤ ـ یاریگای قوتابخانەی سانەوی دوایی بوو بە قوتابخای غازی سەرەتایی پشتی خەستەخانەی جمهوری.
٥ ـ یاریگای سانەوی کورانی سلێمانی.
٦ ـ یاریگای زانیاری خوار سانەوی کوران.

وە هەروەها (ڤالی بۆڵ)و (باسکت بۆڵ) لە گشت قوتابخانەکاندا دەکرا.
ئەو مامـۆستایانەی کە زۆر خزمەتی وەرزشیان کردووە لە ساڵی ١٩٣٠ تا ١٩٦٠ ئەمانە بوون:

١ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی یەکەم (شاکیر سەید حەکیم)
٢ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی دووەم (نووری حاجی ساڵح ئاغا)
٣ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی خالیدیـیە (تاهیر یەحیا بەگ، بابان)
٤ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی فەیسەڵیـیە (جەلال محەمەد سەیفوڵڵا)
٥ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی فەیسەڵیـیە (حسین ساڵح ئاغا غەفوور)
٦ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی ئەیوبیـیە (عوسمان عارف دەباغچی)
٧ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی فەیسەڵیـیە (ساڵح عەلی ساڵح)
٨ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی غازی (عەزیز محەمەد ڕەشید)
٩ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی مەڵکەندی (عومەر محەمەد ئەمین)
١٠ ـ مامۆستای وەرزشی مەکتەبی گۆیژە (قادر خەلیل حسەین)

سەرچاوەی ئەم بەشە:ـ
١ ـ مامۆستا فوئاد ڕەشید بەکر
٢ ـ مامۆستا ساڵح عەلی ساڵح
٣ ـ مامۆستا جەلالی ئەمین بەگ
٤ ـ عەبدول ڕەحمان موفتی



## نمایشی گشتی (استعراض عام)

جاران پاش ئەوەی بەهار ئەهات دنیا تەشقی ئەشکاو قوتابخانەکان ڕۆژێکیان تەرخـان ئەکـرد بۆ نمـایشی گشتی لەنێـوان قوتـابخـانەکاندا سەرەتایی ناوەندی سانـەوی، ئنجـا پێش ئەم ڕۆژە هەموو قوتابخانەکان خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ ئەو یاری‌یانەی کە لەوڕۆژەدا ئەکران وەکو:-
١ - ڕاکردنی ١٠٠م ٢ - بازی بەرز ٣ - ڕاکردنی ٤٠٠ م ٤ - یەك باز ٥ - سـێ‌بـاز ٦ - بازدان بە دار (زانە) ٧ - هەڵدانی سقل ٨ - ڕاکردنی ناوگوێنی ٩ - ٨٠٠ م ١٠ - هەڵدانی ڕم ١١ - هەڵدانی قورس (قرص) ١٢ - یاری مۆز ١٣ - ڕاکردنی ١٥٠٠ م ١٤ - ڕاکردنی دووپشکی ١٥ - ڕاکردنی بەرید ١٦ - یاری کەوچك و هێلکە ١٧ - پێش کەوتن بە سواری کەر - ١٨ - پێشکەوتن بە پاسکیل ١٩ - هەرەم ٢٠ - گوریس **کێشەکی (جرّ الحبل) ٣١ - ٢٠٠م.**

هەر لەم ڕۆژەدا هەر قوتابخانەیەك لە قوتابخانەکەی خۆیەوە قوتابیەکانیان ڕیز ئەکـردو دوو قوتابی هەریەکەیان بەیداخێکی لەپێشەوە هەڵئەگرت بەیاخێکیان هی عێراق و ئەوەی‌تـریـان نیشـانـەی قوتـابخـانەکەی بوو ئەڕۆیشتن بەرەو دەشتی (تەیارەخانەکە) (گەرەکی شۆڕش) بە تەپڵ و مۆزیقاوە تا ئەگەیشتنە ئەوێ ئنجا هەر قوتـابخـانـەیەك شوێنی دیاری کراوی هەبوو لێی ئەوەستان وە لەلایەکەوە چەند خێمـەیەك هەڵدراو بوو بۆ (موتەسەریف)و میوانەکانی وە ئەوانی تریش بەدەوری گۆرەپانەکەدا ئەوەستان هەروەها خەڵکی شارەکە ژن و پیاو ئەهاتن بۆ سەیرو ژنەکان لە لایـەکی جیـاوازەوە دوور لەپیـاوەکان دائەنیشتن ئنجا (ساڵحە فەنی) (صالح **عەلی** ) کە لەوکاتەدا سەرپەرشتی‌کەری وەرزش و دیدەوانی بوو بە بۆری‌یەکی قەوان هاواری ئەکرد لە یاری‌کەرەکان کە ئامادە بن بۆ دەست پێکردنی یاریەکان وە

هەروەهــا قوتــابخــانەكان هاواری قوتابیانی خۆی ئەكرد كە بەشداری یاریەكانی دەكرد. وە بەم جۆرە یاری‌یەكان تەواو ئەكران ئنجا دوای هەموو یاری‌یەك یەكەم و دووەم و سێیــەم ریـزئەبوون دەچوونە لای خێمەكەی موتەسەریفەوە بۆ وەرگرتنی خەلات وە لەپــاش تەواوبــوونی گشت یاریــەكــان ئەو قوتابخانانەی كە بەیەكەم و دووەم و سێیەم دەرئەچوون خەلاتی تایبەتیان وەرئەگرت كاسی زیوی گەورە بوو، وە ئەو قوتابخانەیەی كە بە یەكەم دەرئەچوو قوتابیەكی یاری‌زانی باش ئەخرایە سەر شان و كاسە گەورەكەی دەدرایە دەست و هەموو قوتابیانی قوتابخانەكە لەدوایەوە هاواریان ئەكرد [هەمبوڵ هەمبوڵی خۆمانە، كاسەی زیویش هی خۆمانە] بەچەپڵە رێزان بەرەو ناوشار دەچوونەوە دوایی بلاوەیان لێ دەكرد.

تێبینی: ـ نمــایشی گشتی بۆ یەكــەم جاز بەریكــوپێكی پێكیــان هێنابێ قوتابیانی مەكتەبی یەكەم پێكیان هێنا لە ساڵی ١٩٣١ ـ ١٩٣٢ز لە یاریگای قوتابخانەكە كە شوێنی قوتــابخانەی (فەیسەڵیە) جاران بوو بە سەرپەرشتی مامۆستای وەرزش (شاكیر سەید حەكیم).

سەرچاوە:
١ ـ مامۆستا ساڵح عەلی ساڵح چاودێری وەرزش لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردە.
٢ ـ عەزیز محمەد رەشید مامۆستای وەرزش.

## یاریزانەکانی تۆپێ پێ
## لە ساڵی ١٩٣٠یەوە بۆ ١٩٦٠:-

یەکەم تیپ کە دامەزرا دوای شەڕی بەردەرکی سەرا ساڵی ١٩٣٠ لە قوتابخانەی ناوەندی لە مەکتەبی یەکەم کە قوتابخانەی (فەیسەڵیە) بوو بە سەرپەرشتی مامۆستای وەرزش (شاکیر سەید حەکیم)

ناوی یاریزانەکان

١ ـ محەمەد عەلی جەمیل سائیب ـ باڵیۆز لە کابول ـ لە بۆمبای کوژرا
٢ ـ جەمال حاجی برایم ئاغا ـ تاجر
٣ ـ قەدری تۆفیق فکرەت ـ ئەفسەر
٤ ـ بەدیع نەزهەت ـ معاونی پۆلیس
٥ ـ شێخ قادری سەی عومەر ـ کاتبی ناحیە
٦ ـ حسەینی میرزا ساڵح ـ مووچەخۆر لە شارەوانی
٧ ـ عەزیزی میرزا ساڵح بەڕێوەبەری قوتابخانە
٨ ـ حسێنی کەریم بەگ ـ مووچەخۆر لە مالیە
٩ ـ حامید قادر سەعید ـ ئەفسەر
١٠ ـ بەهجەت عەونی ـ ئەفسەر
١١ ـ جەلال ئەمین بەگ ـ ئەفسەر
١٢ ـ تۆفیقە رەش ـ معاونی پۆلیس (گۆڵچی)
١٣ ـ رۆستەم بەگەی ئەفراسیاو بەگ ـ ئەفسەر (گۆڵچی)

ئەم یاریزانانــەی سەرەوە یەکـەم تیپ بوون کە دامـەزراون وە لە ساڵی ۱۹۳۲زدا چوون بۆ کەرکـووك بۆ یاری لەگـەڵ تیپی تۆپی پێی (کـەرکووك) لەئەنجامدا سلێمانی بردیەوە بە ۲ گۆڵ بەرامبەر بە یەك گۆڵ. وە ئەو وێنەیەش وێنەی تیپەکەی سەرەوەیە پاشان هەندێ یاریزانی تریش پەیدابوون وەکو:

۱ ـ عبدولرەحمان موفتی ـ ئەفسەر

۲ ـ مەحموود خەفاف ـ ـ ئەفسەر

۳ ـ عەبدوڵڵابەگی حەمەعەلی بەگ ـ ئەفسەر

٤ ـ ئەحمەد بەگی مستەفا بەگ ـ ئەفسەر

٥ ـ حەمە ساڵح ژاژڵەیی ـ سەرۆکی شارەوانی (گۆڵچی)

٦ ـ خالید شەفیق بەگ ـ مامۆستا

۷ ـ جیهان بەخش ـ مامۆستا

۸ ـ ئیبراهیم فەتاح هەرمنی ـ مووچەخۆر

۹ ـ شەوکەت دەروێش ئەفەندی ـ نائیب زابت

۱۰ ـ حەمەی ساڵح فەندی ـ مووچەخۆر

ئەم ۱۰ قوتابیەی سەرەوە لەگەڵ (۳) یاری زانیتر بە سەرپەرشتی مامۆستای وەرزش داود ئەفـەندی ساڵی ۱۹۳۷ ـ ۱۹۳۸ بەشداریان کرد لە کەرکووك لەنێوان شارەکانی باکووری عێراق وە سلێمانی بەر هەولێر کەوتبوو لەئەنجامدا سلێمـانی بردوویـەتیـەوە وە ئەم وێنـەیـەمـان لە یاری زانی ئەو تیپـە کاك (عەبدولرەحمان موفتی) وەرگرت، وە ئەم یاریزانانەش لەو کاتەدا یارییان ئەکرد ساڵانی ۱۹۳۰ ـ ۱۹٤۰:

۱ ـ عەتای کاکە حەمە ـ ئەفسەر

۲ ـ نەجیب ئەسکەندەر ئەلەکە ـ ئەفسەر

۳ ـ عومەر سوران ـ کاسب

٤ ـ قالەی حەمەوبەگ ـ مووچەخۆر

٥ ـ مەولود مارف ـ مووچەخۆر

٦ ـ ئەنودر حەمە ئاغا ـ مامۆستای سانەوی

۷ ـ مەحمووی تۆفیق شلك ـ مووچەخۆر (گوڵچی)

٨ ـ سەعید شەفیق ـ بەڕێوەبەری تاپۆ
٩ ـ عەلی قادر ـ برین پێچ
١٠ ـ ڕەئووف قەرەنی ـ ئەفسەر
١١ ـ ڕەزا سەعید ـ بەڕێوەبەری گشتی لە کشتوکاڵ
١٢ ـ عەلی حاجی مەلا خالید ـ ئەفسەر
١٣ ـ عەلی حاجی محەمەد خاڵە ـ ئەفسەر
١٤ ـ عومەر حاجی فەتاح حەڵواچی ـ بەڕێوەبەری ئیعاشە (پارێزەر)
١٥ ـ حەسەن حسێن ـ بەڕێوەبەری کشتوکاڵ
١٦ ـ ئەحمەد محەمەد ـ مووچەخۆر
١٧ ـ ڕەئووفی شێخ ساڵح ـ مامۆستا
١٨ ـ عەلی ئەمین ـ مووچەخۆر
١٩ ـ ئەحمەد مەحموود بەگی جەڕڕاح ـ مووچەخۆر
٢٠ ـ تۆفیقی کەریم ئاغا ـ بازرگان
٢١ ـ ڕەئووفی سەعە دەلاك ـ پۆلیس
٢٢ ـ مستەفا ڕەشید چاوشین ـ مووچەخۆر
٢٣ ـ ڕەزا فەتاح ـ مووچەخۆر
٢٤ ـ محەمەد قودسی ـ ئەفسەر (گۆڵچی)
٢٥ ـ حەسەن ڕەشید ـ مامۆستا (گۆڵچی)
٢٦ ـ عەبدولوەهاب ڕەشید ـ (گۆڵچی)
٢٧ ـ پوتروس ئەسکەندەر ئەلەکە ـ بەڕێوەبەری کشتوکاڵ لە بەکر جۆ
٢٨ ـ کەمال ڕەشید ئەفەندی سەعاتچی ـ مووچەخۆر لە ئینحیسار
٢٩ ـ عەزیز عەبدوڵڵا ـ پارێزەر
٣٠ ـ فارس خوارەحم ـ برین پێچ
٣١ ـ حەسەن ساڵح سەعید سلێمانی جەژنی ـ چەخماخساز
٣٢ ـ عەبەی مامە ـ مووچەخۆر لە سەرچنار
٣٣ ـ مستەفای حەمەی مەلا ـ برین پێچ
٣٤ ـ ئەحمەد ڕەشید فەتاح ـ مووچەخۆر لە ئینحیسار

## تیپی تۆپی پێی ئەهاڵ لە ساڵی ۱۹۳۰ ـ ۱۹٤۰

١ ـ تاهیر یەحیا بەگ ـ مامۆستای وەرزش
٢ ـ خەمۆ ـ ئۆتومبێلچی
٣ ـ یووسفە سوور ـ ئۆتومبێلچی
٤ ـ کارنیکە سوور ـ کارەباچی
٥ ـ ئەنترانیک ـ کارەباچی
٦ ـ ئەحمەدی میرزا کەریم ـ قائیمقام
٧ ـ حەمەی ساڵح ئەفەندی ـ مووچەخۆر
٨ ـ حسێنی ساڵح ئاغا ـ مامۆستای وەرزش
٩ ـ عوسمانی حاجی عارف دەباغچی ـ مامۆستای وەرزش
١٠ ـ مەتی خۆشابا ـ میکانیك
١١ ـ شێخ قادری سەید عومەر ـ کاتبی ناحیە
١٢ ـ حەمید (جگەسیر) ـ گوڵچی
١٣ ـ ئەسکەندەر ئەلەکسەندەریان ـ ئەجزاچی
١٤ ـ دیکران ئەلەکیسەندەریان ـ رادیۆ فرۆش
١٦ ـ کەریم سوۆفی سالم ـ برنج فرۆش

١٦ ـ [illegible]

## تیپی تۆپی پێی قوتابیانی ساڵی ۱۹٤۰ ـ ۱۹۵۰

١ ـ عەلی ئەحمەد تەها ـ بەڕێوەبەری زەریبەی دەخل
٢ ـ غەفوور تاهیر خاڵەلە ـ مامۆستای وەرزش
٣ ـ ئەمین مەولود ـ بەڕێوەبەری ئینحیسار
٤ ـ عومەر محەمەد ئەمین ـ مامۆستای وەرزش

٥ ـ عومەری محەی قازی ـ مووچەخۆر
٦ ـ کەمال میرزا کەریم ـ پارێزەر
٧ ـ کەمال میران ـ ئەفسەر
٨ ـ عەلی فەقێ مەحموود ـ مووچەخۆر
٩ ـ حەسەن فەرەج ـ بەقاڵی ووشکە
١٠ ـ حەمەئەمین حاجی سلۆ ـ بەقاڵی ووشکە
١١ ـ عوسمان سابیر ـ ئەفسەر
١٢ ـ عەبدوڵڵا کەریم چاوشین ـ مووچەخۆر
١٣ ـ ئیسماعیل حاجی عەبدولوەفا ـ مووچەخۆر
١٤ ـ کەمال حەمدی ـ مووچەخۆر
١٥ ـ رەزا شێخ محەمەد گولانی ـ مودیری پۆلیس (گۆڵچی)
١٦ ـ خەلیل ئەسکەندەر ـ مووچەخۆر
١٧ ـ عەبدولرەحمان حاجی عەبدوڵڵا ـ کاسب
١٨ ـ عومەری عەبدولرحمانی خامە ـ کاسب
١٩ ـ سوورێن ـ ئەجزاچی
٢٠ ـ عەزیز محەمەد رەشید ـ مامۆستای وەرزش
٢١ ـ قادر خەلیل ـ مامۆستای وەرزش
٢٢ ـ عەباس شەرعی ـ بازرگان
٢٣ ـ عومەری مەحموود میرزا ـ مامۆستا
٢٤ ـ حەمە فەرەج ساڵح ـ مامۆستای وەرزش
٢٥ ـ عومەر سدیق شاوەیس ـ مووچەخۆر
٢٦ ـ ئیبراهیم حاجی عەلی ـ مامۆستا
٢٧ ـ کەمال مەولوود ـ کاسب
٢٨ ـ فەیزوڵڵا ئەحمەد بابان ـ حاکم
٢٩ ـ نووری سەعید ـ مامۆستا
٣٠ ـ ئەمین شەوکەت ـ مقاول (گۆڵچی)
**٣١ ـ عەبدوڵڵا میرزا مارف ـ مامۆستا**

٣٢ ـ محەمەد سەعید ناسر ـ مامۆستا
٣٣ ـ عومەر حاجی مستەفا ـ مامۆستا

## یاریزانەکانی تۆپی پێی ئەهالی سالی ١٩٤٠ ـ ١٩٥٠

١ ـ حەمە ئەمین ئەگلی ـ کاسب
٢ ـ خالە حەمە ـ کەوش دروو
٣ ـ جەمال ئەستەموولی ـ خەیات
٤ ـ عەبە ناوساجی ـ بەقال
٥ ـ بەکر ئەحمەد ـ کەبابچی
٦ ـ عومەر ئەبوشوارب ـ ئوتومبێلچی لە ئەشغال
٧ ـ مەولووی چایچی ـ چایچی
٨ ـ ئەحمەد حەمدی ـ کەبابچی
٩ ـ ڕەئووف مەلا محەمەد ـ توتنچی
١٠ ـ مچە کوێر ـ ئوتومبێلچی
١١ ـ عەلی مەلا کەریم ـ بەرگدروو
١٢ ـ ڕەئووف مەجید حاجی عارف ـ دەباغچی
١٣ ـ حەمە گەلین ـ پۆلیس
١٤ ـ ئەحمەد سەلیم ـ مووچەخۆر
١٥ ـ ووسەینەلی ـ کاسب
١٦ ـ عەبدوللا حاجی قادر ـ عارەبانچی
١٧ ـ کەریم شەمسوللا ـ دەستگیر ـ عارەقی نەعنا (گولچی)
١٨ ـ غەفووری بایز ـ جامباز
١٩ ـ عارف حاجی بارام ـ بەفرکێش و بەردکێشی مەلکەندی
٢٠ ـ عەبە کۆڕنال ـ کەوش دروو

## تیپی قوتابیان لە تۆپی پێدا سالی ١٩٥٠ ـ ١٩٦٠

١ ـ تالیب شێخ عەلی ـ مووچەخۆر
٢ ـ یاسین حەمە سالّح ـ مامۆستا
٣ ـ ڕەفعەتی مەلا عبدولرەحمان ـ ماموستا
٤ ـ مەلا قادر سەعید ـ ماموستا
٥ ـ حەمەی فەتاح ـ ماموستا
٦ ـ عومەر عەزیز ئیسماعیل ـ ماموستا
٧ ـ مەحموود سابونچی ـ ماموستا
٨ ـ شەوکەتی حاجی عەلی ـ ماموستا
٩ ـ قادر کەریم (قالەڕەش) ـ ماموستا
١٠ ـ عەبدولرەحمان قەدری ـ ماموستا
١١ ـ کەریم عەبدوڵلا ـ ماموستا
١٢ ـ ئەحەسوور ـ ماموستا
١٣ ـ حەمە کاکە ـ ماموستا
١٤ ـ عارف حەسەن ـ ماموستا (گوڵچی)
١٥ ـ عەلی ئەحمەد حەمامچی ـ ماموستا
١٦ ـ ئەحمەدی کاکەحەمە ـ ماموستا
١٧ ـ عومەر محێدین ـ حاکم
١٨ ـ عەونی سابیر ـ موچەخۆر
١٩ ـ ئەحمەد سالّح ـ ماموستا
٢٠ ـ عومەر نوری کەرکووکی ـ موچەخۆر
٢١ ـ عومەر نەمەڵی ـ موچەخۆر
٢٢ ـ عەبدولی سووران ـ موچەخۆر
٢٣ ـ بەهادین جەلال کابان ـ موچەخۆر
٢٤ ـ جەمال موفتی ـ موچەخۆر
٢٥ ـ فەرهاد میرزا ئەحمەد ـ دوکتور لە زانکۆ

٢٦ ـ تەها ئەحمەد تەها ـ بەڕێوەبەری ژووری بازرگانی
٢٧ ـ ڕەزاق تاهیر ـ کرێکار لە کارگەی جگەرە
٢٨ ـ فایەق تاهیر ـ مووچەخۆر
٢٩ ـ عوسمان شێخ محەمەدی بەنا ـ مووچەخۆر (گۆڵچی)
٣٠ ـ ئەکرەم مەحموود ئەحەرەش ـ مووچەخۆر
٣١ ـ مستەفای حاجی قادر ـ مامۆستا
٣٢ ـ فەرەج ئەحمەد ـ مامۆستا
٣٣ ـ نامق محی‌الدین ـ مامۆستا
٣٤ ـ کەماله سوور ـ مامۆستا
٣٥ ـ ئیسماعیل عەبدوڵلا ـ مفوض کۆچی دوایی کردوه
٣٦ ـ عومەری حەمەعەلیە کوردە ـ معاونی پۆلیس (خانەنشین)
٣٧ ـ ڕەفیق احمد بەگ ـ موچەخۆر لە بەلەدیە کۆچی دوایی کردوە
٣٨ ـ جەمال سووران ـ ئەفسەر
٣٩ ـ هیوا موفتی ـ ئەفسەر
٤٠ ـ عەلی صالح سەعید ـ بەڕێوەبەری (ئەجهیزەی دەقیقە)
٤١ ـ لەتیف شەرعی ـ لە کارگەی جگەرە
٤٢ ـ عەلی صاڵح غەفور ـ قوتابی
٤٣ ـ عبدالرزاق حاجی کەریم ـ لەئیدارەی محەلی [گۆڵچی]
٤٤ ـ دکتۆر فوئاد مەجید فەرەج ـ لێپرسراوی توتن پاکردنەوە

## تیپی تۆپی پێی ئەهالی ساڵی ١٩٥٠ ـ ١٩٦٠

١ ـ عەلی ئیسماعیل ـ مووچەخۆر (گۆڵچی)
٢ ـ سەعدی مەحموود بەگ ـ لە کارگەی جگەرە
٣ ـ عەلی ئەحمەد تەها ـ مووچەخۆر
٤ ـ عوسمان محەمەد، (پیاوە بچکۆلەکە) ـ مووچەخۆر
٥ ـ عەبدوڵلا حەمەئەمین ـ قەساب

٦ ـ کەریم ئەحمەد هۆمەر ـ قەساب

٧ ـ نووری بەدەوی ـ مووچەخۆر

٨ ـ نەجمەدین حاجی صالح (نەجمەسوور) ـ کوورەچی

٩ ـ جەمشید فوئاد رەشید ـ مووچەخۆر

١٠ ـ قادر رەشید ناسکە ـ ئوتومبێلچی

١١ ـ ئەحمەدی کاکەحەمە ـ مامۆستا

١٢ ـ جەمیل نوری مەدفەعی ـ کاسب

١٣ ـ تۆما میشۆ ـ مووچەخۆر

١٤ ـ عومەری فاتە ـ قەساب

١٥ ـ ساڵحەسوور ـ بەنا

١٦ ـ یۆنان بابا (برای عەموبابا)

١٧ ـ کەریم ئاغا ـ مووچەخۆر

١٨ ـ خەسرەو عارف نەجیب ـ کاسب

١٩ ـ موعتەسەم فەتحی ـ برین پێچ

٢٠ ـ عەبەدرکە ـ کرێکار (گۆڵچی)

٢١ ـ فەرەجی شیرین ـ قەساب

٢٢ ـ جەلال داعوری ـ کاسب

٢٣ ـ عارف حاجی ئەمین ـ موختاری مەڵکەندی

٢٤ ـ کەریم سەعید محەمەد ـ خەیات

تێبینی

ـــــــــ: ـ هەندێ لەم یاریزانانەی لە تیپەکانی قوتابخانەکانداو هەندێ لەم یاریزانانەی لە تیپەکانی ئەهالیدا هەبوو، هەموو ساڵێك تیپی هەڵبژاردەی سلێمانییان پێك هێناو، وە هەندێ یاری زان لەو ساڵانەدا کە نوسراون لە ساڵانی تریشدا بەردەوام بون، هەروەها پێڵاوی یاری ئەو سەردەمە زۆر قورس بوو، بزمار قاچی یاریزانی کون ئەکرد، وە تۆپی ئەوکاتە چەرم بوو کە تەر ببوایە زۆر قورس ئەبو، لە سەر لێدانا سەری یاریزانی ئازار ئەدا، ئەو تۆپە زمانیشی

هەبو بە پەمپ هەوای تیٚئەکراو ئەخرایە ژێر چەرمەکەوە بە قەیتان توند ئەکرا دووبارە لەسەر لیٚداندا ئەو قەیتان و زمانە بەر سەر بکەوتایە یاریزانی تەواو ئازار ئەدا.

لە ناوەراستی پەنجاکـان و بەدواوە جولانەوەیەکی وەرزش بەتایبەتی یاری تۆپی پێ پەیـدابـوو، یانەی وەرزشی سلیٚمانی لە ساڵی ١٩٥٦ بۆ یەکەم جار بەئیجازە کرایەوە. بێجگە لە تیپی قوتابیان و ئەهالیو تیپی هەڵبژاردەی سلیٚمانی کە بە ریٚك وپیٚکیو جل وبەرگ و قۆنەرەو لەسەر یاسای وەرزش لە ساڵی ١٩٣١ دەستی پیٚکراوە بەڵام لەم ساڵانەدا تیپی چاك لە گەرەکەکاندا پیٚك هات هەموو جێنیشتـەو کەرەسـەی یاریو ساحـەی خۆیـان و سەرپـەرشتیـارو سەرۆك و راهێنەری تیپان هەبوو، زۆر جار ئەم تیپانە لەبەینی خۆیانداو لەگەڵ تیپەکانی شارەکانیتردا یارییان ئەکرد وە دەست کەوتی باشیان ئەهێنا وە زۆرکەس لە گەرەکەکاندا یارمەتیان ئەدان وە زۆر جاریش لەگەڵیاندا ئەچون بۆ ئەو شارانە بۆ پاڵ پشتیـان، ئەو سەردەمـە ئەو گەنجـانە بەهۆی ئەو تیپانە کە بوون بە یاریزان، وەزۆر لە گەنجی گەرەك و دەستـەکوری گەرەك بەهۆی بونی یانەی وەرزش زۆر لە سورانـەوە دوورئـەکەوتنەوە، هەر رۆژێك بیان ووتایە ئەمرۆ لە دەشتی تەیارەخانەکە یان یاریٚگای پەروەردە یارییە شارەکە ئەو رۆژە بە گەورەو بچـوك رویان ئەکردە ئەوێ لەبەرئەوەی جێگا نەئەما هەندێ ئوتومبیلچی پاص قەمـەرەو لۆرییان ئەهێناو عەرەبانچیەکانیش عەرەبانەی خۆیان ئەهێنا. خەڵك بێجگە لە دیواری یاریگاکە ئەچونە سەر ئەم ئوتومبیل و عەرەبانانە بۆ سەیرکردن تەنانەت ئافرەتیش ئەوساکە بەعەباوە ئەهاتن بۆ سەیرکردن، خەڵکەکە هاواریان ئەکرد بۆ یاریزانەکان یاریی جوان بکەن و گۆڵ بکەن، کە یاریش تەواو ئەبوو بەبیٚئەوەی هیچ ناخۆشییەك رووبدات بلاوەی پیٚئەکرا.. ئەم تیپانە کە دروست بوون لە گەرەکـەکـاندا تیپی یەکەم و تیپی دووەمیان هەبووە کە تیپی دووەم دەستە بوون منالٚ تر بوون بۆئەوەی ئەوانیش وردە وردە ببن بە تیپی سەرەکی دوای ئەوە ئەوانیش پیٚئـەگـەیشتن و تیپیتـریـان دائـەمـەزران ئیٚمـە ناوی ئەوتیپانەمان نووسیوە کەلەو سەردەمەدا لە گەرەکەکاندا پیٚك ئەهاتن، بێجگە لەم تیپـانـە دوو تیپیتـر هەبـوون یەکێ بە ناوی کانیئاسکان و یەکێ بە ناوی

مەڵکەندی لەبەرئەوەی ئەوانەی لەم دوو تیپەدا یارییان کردوە لە لیستەی ناوەکانیتردا ناویان هاتووە بە پێویستمان ئەزانی ناویان دووبارە بکەینەوە. لەبەرئەوەی زۆربەی یاری زانەکانیان لە تیپی چوارباخ و دەرگەزێن و یانەی وەرزشی سلێمانی یارییان ئەکرد.

سەرچاوەی ئەم بەشە: ـ لە زۆربەی سەرۆکی تیپەکان و یاریزانەکان وەرگیراوە.



## تیپی (برسی) لە ١٩٥٧/٤/١٦ دامەزراوە

| | |
|---|---|
| لێپرسراوی تیپ | قادر برسی لەبەدالەی شارەوانی |
| ڕاهێنەری تیپ | مامۆستا سالار عبدالکریم |
| ناوی یاریزان | ئیشەکەی |
| ١ ـ سالار عبدالکریم | مامۆستا، ڕاهێنەری تیپ |
| ٢ ـ عیزەت عەبدوڵلا نصرالله | مامۆستا |
| ٣ ـ فەوزی مەلا مەحموود | مامۆستا |
| ٤ ـ غەفور سەعید محەمەد | مەساح لە شارەوانی |
| ٥ ـ نەجمەدین حەسەن موراد | بەنا، کۆچی دوایی کردوە |
| ٦ ـ فایەق حەسەن موراد | لە شارەوانی |
| ٧ ـ عومەری مچەی ڕەعنا | بەقاڵ |
| ٨ ـ عەباسی مچەی ڕەعنا | بەقاڵ، کۆچی دوایی کردوە |
| ٩ ـ عومەری عەلی نەجار | دارتاش |
| ١٠ ـ عوسمانی عەلی نەجار | لە تاپۆفەرمانبەرە |
| ١١ ـ بهاءالدین عەلی صالح ڕەشە | عەقیدی خانەنشین |
| ١٢ ـ عوسمان صالح شەیدایی | لە کارەبا |

| | |
|---|---|
| ١٣ ـ حامید عەبە ڕەش | لە کارگەی سەرچنار |
| ١٤ ـ عوسمان عەزیز | مودەریس |
| ١٥ ـ کەریم ئەحمەد بارام | ماموستا |
| ١٦ ـ ئیسماعیل وەستائەحمەد دارتاش | کرێکار، کۆچی دوایی کردوە |
| ١٧ ـ لەتیف حسەین ئەفەندی | مودەریس |
| ١٨ ـ نصرالدین عەلی عوسمان | معاونی پۆلیس |
| ١٩ ـ حسەین شاخی | خەیات |
| ٢٠ ـ لەتیف شێخ محەمەد | لە پەروەردە |
| ٢١ ـ حەمە ڕەئوف قادر شاسوار | لە ئەورزدی |
| ٢٢ ـ ڕەئوف صدیق مەحموود ئاغا | کاسب |
| ٢٣ ـ عەلی مامە | لە ئەفریقی |
| ٢٤ ـ عوسمانی مام ئەحمەد | بەنا |
| ٢٥ ـ یاسینە ڕەش | قوتابی، کۆچی دوایی کردوە |
| ٢٦ ـ قادر کەریم (قالەڕەش) | ماموستا،گۆلچی |

تێ بینی: ئەم تیپە سەر بە گەڕەکی مەڵکەندی بوو، وە لە گۆرەپانی (ساحە)ی بەردەم شەخسەکەی شێخ جافر، شوێنی زراعەی ئێستا، یاری ئەکرد.



تیپی (هێرش) ساڵی ١٩٥٧ بەرەسمی ئیجازەی وەرگرت، بەڵام بە چەند ساڵێك لەوەوپێش پێك هاتبوو. ناوی تیپەکەش خوالێخۆشبو شاعیر ڕەمزی مەلا مارف ئەم ناوەی بۆدۆزییەوە.

| ناوی یاری زان | ئیشەکەی |
|---|---|
| ١ ـ مەحمود محەمەد صابونچی | ماموستا، سەرۆکی تیپ |
| ٢ ـ صاڵحە سوور | بەنا، کۆچی دوایی کردوە |
| ٣ ـ کەریم حاجی فەرەج ئاغا | مەساح |

| | |
|---|---|
| ٤ ـ نەجم الدین زەین الدین | لیوا روکنی موتقاعید |
| ٥ ـ حەمە عەتا رەشید | مامۆستا |
| ـ عەبدول رەحمان محەمەد (داعوری) | لە ئیدارە محەلی |
| ٧ ـ حەمەی حاجی صالّح | خاوەنی گازینۆی جمهوری، کۆچی دوایی کردوە |
| ٨ ـ مستەفا رەحیم عەلی | وەکیلی ئەفریقی |
| ٩ ـ فوئاد ئیبراهیم | فەرمانبەر لە کارگەی جگەرە |
| ١٠ ـ ئەکرەم غەفور | مامۆستا |
| ١١ ـ جەلال میرزا عەبدوڵلا | فەرمانبەر لە ئیشغال |
| ١٢ ـ جەمالی خانم | نائب ضابط |
| ١٣ ـ ئیبراهیم تۆفیق حەسەنە قوچ | برین پێچ |
| ١٤ ـ عەلی مەعصوم | کاسب |
| ١٥ ـ حەمەی حاجی فەرەج ئاغا | لە کارگەی جگەرە |
| ١٦ ـ کامیل وەستا ئەحمەدی بەنا | **مودەریس** |
| ١٧ ـ تەیمور ئیبراهیم صاحبقران | ئەندازیار |
| ١٨ ـ عوسمان صالّح سەعید | ئەفسەر، گۆڵچی کۆچی دوایی کردوە |
| ١٩ ـ عوسمان محمد موراد | پزیشك، گۆڵچی |

تێبینی: ـ ئەم تیپە لە گۆرەپانی (ساحە)ی سەرو سانەوی کچان، شوێنی خانوەکانی ئیدارەی مەحەلی، یاری‌یان ئەکرد، ئەم تیپە سەر بە گەرەکی گۆیژە بوو.



تیپی (سەیوان) ساڵی ١٩٥٤ تا ساڵی ١٩٥٦ بەردەوام بو تا یانەی وەرزشی سلێمانی لەو ساڵەدا دامەزرا یاری زانەکان چونە ئەو یانەیە.

سەرۆکی تیپ ـ ـ ئەحمەدی کاکە حەمە

ڕاهێنەری تیپ ـ مامۆستا عەزیز محەمەد ڕەشید
لێپرسراوی تیپ ـ حسەڕەشی خەیات
ناوی یاریزان ـ ئیشەکەی

| | |
|---|---|
| ١ ـ ئەحمەدی کاکەحەمە | مامۆستا |
| ٢ ـ عوسمان محەمەد (پیاوەبچکۆڵەکە) | لە مەلاریا |
| ٣ ـ یاسین حەمەصاڵح | مامۆستا، کۆچی دوایی کردوە |
| ٤ ـ شەوکەتی حاجی عەلی | مامۆستا |
| ٥ ـ ڕەفعەتی مەلا | مامۆستا |
| ٦ ـ مەلا قادر سەعید | مامۆستا |
| ٧ ـ حەمەی فەتاح | مامۆستا |
| ٨ ـ عەبدوڵلا حاجی قادر | مامۆستا |
| ٩ ـ عومەر نەمەلی | لە کارگەی سەرچنار، کۆچی دوایی کردوە |
| ١٠ ـ کەمال عەزیز میراو | مامۆستا |
| ١١ ـ عارف حەسەن | مامۆستا، گوڵچی |

تێبینی: ـ ئەم تیپە لە گۆڕەپانی (ساحە)ی بەردەم سەرقەبرانی گردی شێخ ئەولاو گۆڕەپانی دەشتی تەیارەخانەکە یارییان ئەکرد. ئەم تیپە سەر بە گەڕەکی دەرگەزێن بو.



تیپی (خەبات) ساڵی ١٩٥٧ دامەزراوە سەرۆکی تیپ و ڕاهێنەر مامۆستا حەمەصاڵح

| ناوی یاریزان | ئیشەکەی |
|---|---|
| ١ ـ یاسین حەمەصاڵح | مامۆستا |

| | |
|---|---|
| ٢ ـ عومەر ڕەزا | لە مەڵبەندی لاوان |
| ٣ ـ بلە قاسم | مامۆستا |
| ٤ ـ عومەری حەمەڕەش | لە کارگەی جگەرە |
| ٥ ـ ئەکرەم عارف قەرەچەتانی | قوتابی کۆچی دوایی کردوە |
| ٦ ـ عوسمان ئەحمەد (عوسیل) | مامۆستا |
| ٧ ـ صلاح محەمەد کەریم | مامۆستا |
| ٨ ـ حەمەغەریب عەزیز | قوتابی، کۆچی دوایی کردوە |
| ٩ ـ غەریب لەتیف | قوتابی، کۆچی دوایی کردوە |
| ١٠ ـ هادی مەلا سەلام | فەرمانبەر |
| ١١ ـ ئەنوەر سەیعەلی | پایسکیلچی |
| ١٢ ـ مەحمود مەلا ڕەحیم | مورشید زراعی. گۆڵچی |
| ١٣ ـ لەتیف شەشۆ | بیتاقەفرۆش. گۆڵچی |

تێبینی: ـ ئەم تیپە سەر بە گەڕەکی چوارباخ بووە. لە گۆڕەپانی (ساحە)ی سانەوی کوران یارییان ئەکرد.



تیپی (ئاکۆ) ساڵی ١٩٥٩

| | |
|---|---|
| سەرۆکی تیپ | فەردیدون فەقێ ڕەشید |
| ڕاهێنەری تیپ | حەمەپشکە |
| ناوی یاریزان | ئیشەکەی |
| ١ ـ فەرەیدون فەقێ ڕەشید | وەکیلی ئەفریقی (ئەم سیانە بران) |
| ٢ ـ فاروق فەقێ ڕەشید | وەکیلی ئەفریقی |
| ٣ ـ فەهمی فەقێ ڕەشید | لە کارگەی جگەرە |
| ٤ ـ حسەین قەدری | بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە لە هەولێر |
| ٥ ـ کەمال توفیق | عەقید (خانەنشین) |

| | |
|---|---|
| ٦ ـ هنوده | خەڵکی ناصریە بو |
| ٧ ـ محەمەد ئەحمەد موراد | |
| (حەمە حموص) | لە کوژاندنەوەی ئاگر |
| ٨ ـ عەبدوڵڵا ئەحمەد (کۆرنال) | مامۆستا |
| ٩ ـ وەهبی رەشید | مامۆستا |
| ١٠ ـ کەریم عەلی گەراج | لە کارگەی جگەرە |
| ١١ ـ جەلال ئیبراهیم بەلوعەچی | لە کارگەی جگەرە |
| ١٢ ـ عوسمان فەتاح هەرمەنی | بەقاڵ |
| ١٣ ـ غەریب لەتیف | قوتابی،کۆچی دوایی کردوە |
| ١٤ ـ عەلی لەتیف | مامۆستا [بران] |
| ١٥ ـ گوروون (دەرویش) | کاسب،گوڵچی،کۆچی دوایی کردوە |

تێ بینی:

ــــــــ: ـ ئەم تیپـە سەر بە گەرەکی چوارباخ بو لە گۆرەپانی (ساحە)ی سانەوی کوران یاریان ئەکرد.



تیپی (هیوا) ساڵی ١٩٥٧ دامەزراوە

دامەزرێنەرو راهێنەرو سەروکی تیپ مامۆستا حەمەکاکە بووە

| یاریزان | ئیشەکەی |
|---|---|
| ١ ـ حەمەکاکە | مامۆستا |
| ٢ ـ عومەر رۆستەم | فرۆشیاری کەلوپەلی وەرزشی |
| ٣ ـ کەمال حسەین صاڵح قەمە | سەرپەرشتیاری پەروەردە |
| ٤ ـ جەلالی مینا | مامۆستا |
| ٥ ـ جەبار عەبدول عەزیز | مامۆستا |
| ٦ ـ ئەنوەر قادر | مامۆستای وەرزش |

| | |
|---|---|
| ٧ ـ ئەنوەر بەکر | مامۆستا |
| ٨ ـ ئیسماعیل عارف | برین پێچ |
| ٩ ـ یاسین مستەفا | فەرمانبەر لە لاوان |
| ١٠ ـ ئەحەی صاڵح قەمە | فەرمانبەر |
| ١١ ـ عەزیز صاڵح | فەرمانبەر لە کارگەی جگەرە |
| ١٢ ـ جەمال رەشید | مامۆستا |
| ١٣ ـ رەزاق عارف | لە سینەمای دڵشاد |
| ١٤ ـ ئەحمەد عارف | کاسب |
| ١٥ ـ حەمەی مامەلی | کاسب، گۆڵچی |

تێبینی

ـــــــــ شوێنی یاری کردنیان لە گۆرەپانی (ساحە)ی سانەوی کوران و یاریگای پەروەردەو دەشتی تەیارە خانەکە بو، ئەم تیپە سەر بە گەرەکی چوارباخ لقی قەسابەکان بو، لەپێش ئەم تیپەدا تیپێك هەبوو ساڵی ١٩٥٤ بە ناوی تیپی گەرەکی قەسابەکان.

تیپی (ئاسۆ) ساڵی ١٩٥٧ز دامەزراوە سەر بە یانەی وەرزش بووە سەروکی تیپەکە مامۆستا ئەنوەر ئەحمەد فەتاح بوو کە بە (ئەنوەر چاوشین) ناسراوە.

راهێنەری تیپ: کەمال سەلیم میران بوو

| ناوی یاریزان | ئیشەکەی |
|---|---|
| ١ ـ ئەنوەر چاوشین | مامۆستا ـ سەروکی تیپ |
| ٢ ـ کەمال سەلیم میران | قوتابی، کۆچی دوایی کردوە |
| ٣ ـ ئەکرەمی مەحمودی ئەحەرەش | لە کارەبا |
| ٤ ـ لەتیفی مەحمودی ئەحەرەش | قوتابی، کۆچی دوایی کردوە |
| ٥ ـ صاڵح محەمەد ئەمین | مامۆستا |

| | |
|---|---|
| ٦ ـ محەمەد تەها وەستا فەرەج | مامۆستا. کۆچی دوایی کردوە |
| ٧ ـ حەسەن حاجی حەمە پەکۆل | لە شارەوانی |
| ٨ ـ کەمال عەبدوڵڵا | ئەندازیار |
| ٩ ـ محەمەد سەعید نادر | مامۆستا |
| ١٠ ـ عەلی عەبدوڵڵا | کەبابچی |
| ١١ ـ کەمال عەلی ڕەشید | لە کارگەی جگەرە |
| ١٢ ـ عوسمان ئەحمەد | بەرگ دروو |
| ١٣ ـ عەزیز ئەنوەر | کاسب |
| ١٤ ـ کەمال ڕەئوف | لە کارگەی جگەرە |
| ١٥ ـ هۆگر موفتی | لە کارگەی جگەرە |
| ١٦ ـ عوسمان ئەحمەد(پەستەك) | لە بەرید |
| ١٧ ـ تایەر عەبدوڵڵا صاڵح | خاوەن پێشانگای ئوتومبیل |
| ١٨ ـ لەتیف ئەمین مەحموود | پزیشك، سەروکی یانەی وەرزشی سلێمانی |
| ١٩ ـ بورهان عومەر | لە خەستەخانە؛ گوڵچی. |

تێبینی

ـــــــــ: ئەم تیپە سەر بە گەڕەکی (کانی ئاسکان) بووە لە گۆڕەپانی (ساحە)ی دەشتی تەیارەخانەکە یاریان ئەکرد.



تیپی (ئەزمر) ساڵی ١٩٥٧ دامەزراوە.

سەروکی تیپ و ڕاهێنەری: نوری بەدەوی

| ناوی یاری زان | ئیشەکەی |
|---|---|
| ١ ـ حسەین ئیبراهیم دەرویش | **معاون محافظ** |
| ٢ ـ ڕەزاقە سوور | فەرمانبەر لە کارگەی جگەرە |
| ٣ ـ فایەقە سوور فەرمانبەر لە کارگەی چیمەنتۆ | |

| | |
|---|---|
| ٤ ـ معتصم فەتحی | لە کارگەی جگەرە |
| ٥ ـ جەمالی عەلی باپیر | قوتابی، کۆچی دوایی کردوە |
| ٦ ـ قالەی شەریفە کوردە | ئەفسەر، کۆچی دوایی کردوە |
| ٧ ـ کەمالە سوور | مامۆستا |
| ٨ ـ صاڵحی عەیلە | مامۆستا |
| ٩ ـ حەمە صالح محەمەدئەمین | فەرمانبەر لە خەزێنە |
| ١٠ ـ جەلالە چاوشین | لە ئیشغال، کۆچی دوایی کردوە |
| ١١ ـ غەریب زێوەر | خاوەن کتێبخانەی بێکەس |
| ١٢ ـ جەلال کەریم پەری | خەیات |
| ١٣ ـ حیکمەتی مەلا ئەحمەد | لە کارگەی جگەرە |
| ١٤ ـ عوسمانی شێخ محەمەدی بەنا | لە کارگەی جگەرە، گۆڵچی |

تێبینی:

______: شوێنی یاریکردنیان لە گۆڕەپانی (ساحە)ی بەردەم شەخسەکەی شێخ جافرو دەشتی تەیارەخانەکە بوو. ئەم تیپە سەر بە گەڕەکی کانیئاسکان لقی شێخ جافر بووە.



لە گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)دا ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٦٠ لە لاپەرە ـ ٢٦ ـ دا ئەم باسە وەرزشییە نوسراوە.

وەرزش

ئەم پرسیارانەی خوارەوەمان لە یانەی وەرزشی سلێمانی کرد. وا وەڵامەکانیان پێشکەش ئەکەین و زۆر سوپاسیان ئەکەین.

١ ـ یانەی وەرزشی سلێمانی چۆن پێك هات؟

٢ ـ چەند تیپی (تۆپی پێ) لە شارەکەماندا هەیە؟

٣ ـ دەنگوباسی وەرزش لەم ماوەیەی دواییدا چیە؟
٤ ـ چ پرۆژەیەکیان بەدەستەوەیە؟
٥ ـ دەربارەی قورسایی هەڵگرتن، یانە، چی کردووە؟
٦ ـ تا ئەمڕۆ یاری توپی پێ لەگەڵ تیپی تۆپی پێی شوێناندا کراوەو ئەنجامی یارییەکان چیبوون؟

---

وەڵامی یانە بۆ گۆڤاری ڕۆژی نوێ:

ئەوا بەکورتی وەڵامی پرسیارەکانتان ئەدەینەوە هیواداریین هەمیشە لە ڕیزی پێشەوەدا بن بۆ خزمەتی وەرزش.

١ ـ کە داوای دامەزراندنی یانەی وەرزشی سلێمانی کرا داواکە ئەمانەی خوارەوە ئیمزایان کردووە بە بەرواری ١٩٥٦/٩/٣

سالح عەلی ـ چاودێری وەرزش لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردە

خەلیل ئیبراهیم ـ مەئمووری ئەملاکی سلێمانی

سەعید شەفیق ـ مامۆستای وەرزش

ئەحمەد زرنگ ـ پارێزەر

عەزیز محەمەد ڕەشید ـ مامۆستای وەرزش

عومەر محەمەد ئەمین ـ مامۆستای وەرزش

دیکران ئەلەکسەندەریان ـ رادیۆ فرۆش

ئیسماعیل عەبدولوەفا ـ خاوەنی کۆگای پرشنگ

حسە ڕەش ـ بەرگدروو

نامیق قەزاز ـ پارێزەر

وە بەگوێرەی نامەی وەزارەتی ناخۆیی ژمارە ١٢٣٦٠ بەرواری ٩٥٦/٩/١٧ ڕێگە درا بە یانە ئیش بکات.

٢ ـ تیپی فوتبۆڵ: ئەوانەی کە ناویان هەیە زۆرن بەلام ئەو تیپانەی کە پەیوەندییان بە یانەوە هەیەو چالاکییان نوواندوە ئەمانەن:

ئەزمر، خەبات، ئاکۆ، هیوا، ئاسۆ، برسی.

٣ ـ یەکێتی تۆپی پێی ناوەند: بڕیاریدا کە هەموو شارەکانی عێراق لەناو

خۆیاندا یاری بکەن وە بۆ ئەمە عیراق کراوە بە پێنج بەشەوە هەر بەشەی تیپێکی بەهێزی تیایە کە لەمەوپێش ناوی دەرکردووە لە یاری فوتبۆڵدا وەکو: بەسرە، کەرکووك، موسڵ، تیپی عەسکەری عیراقی وە تیپی ئەهلی بەغدا، وە لەم خولانەدا سلێمانی بەر موسڵ و هەولێر کەوتبوو ئەوەبوو رۆژی ١٩٦٠/٢/٢٧ لە هەولێر لەگەڵ هەولێردا یاریکردو هیچ لایەك گۆڵی نەکرد، وە رۆژی ١٩٦٠/٢/٢٩ یاری کرد لە موسڵ لەگەڵ موسڵ دیسان هیچ لایەك گۆڵی نەکرد وە رۆژی ١٩٦٠/٣/٦ موسڵ هات بۆ سلێمانی وە یاریەکەی بردەوە بە دوو گۆڵ بەرامبەر بە گۆڵێك وە لەوەپێش موسڵ لە هەولێریشی بردبوّوە بە پێنج گۆڵ بەرامبەر بەگۆڵێك، وە بەگوێرەی خاڵ (نقطة) موسڵ بە براوە ئەژمێررێت لەم سێ شارەدا وە ئەچێت بۆ بەغداد بۆ یاری کردن لەگەڵ ئەو چوار تیپەی کە ئەمێنێتەوە.

٤ ـ لەم کاتەدا یانە دوو پرۆژەی بەدەستەوەیە یەکەم دامەزراندنی دوو تیپی منالآن (ناشیء)وە سەرپەرشتی کردنیان بۆ پێگەیاندنی یاریکەری فوتبۆل بۆ دوواڕۆژ. دووەم دروست کردنی نیشتەجێیەك بۆیانە کە یاریگای تۆپی فرۆکەو تۆپی سەبەتەی تێدا بێت لەگەڵ حەوزێکی مەلەکردن، وە بێگومان ئەمەش پێك نایەت ئەگەر هاوولاتیان و کاربەدەستان دەستی یارمەتیمان بۆ درێژنەکەن.

٥ ـ باشترین یاریزانی ئاسن لە یانەکەماندا کاك ئیسماعیل ئیبراهیمە کە (عەتار)ە لە قەیسەری نەقیب وە فێرکەری تیپی ئاسنە وە قورسایی خۆی سووکە (وزن الخفيف)وە ئەتوانێت ٩٢ بە فراندن (خطف) وە ٨٨ کغم بە پاڵەپەستۆ (ضغط) وە ١١٨ کغم بە (نەتر) هەڵگریت وە هیوای زۆری لێ ئەکرێت کە پێشتر کەوێت.

٦ ـ تا ئەمرۆ یانەی وەرزشی سلێمانی گەلێ یاری فوتبۆڵی کردووە، بەڵام ئەو یارییانەی کە گرنگ بووبن ئەمانەن:

| رۆژی یاری | ئەو تیپەی یاری لەگەڵ کردووە | یانە | تیپی بەرامبەر | شوێنی یاری |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٧/٣/٢٧ | شەریکەی بیتون و منیرباد | ٧ | ١ | سلێمانی |
| ٩٥٧/٤/١٢ | تیپی خانەقین | ٥ | ٤ | سلێمانی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤/٩٥٧ | تیپی شەریکەی دوکان | ٦ | ٠ | سلێمانی |
| ١٧/٥/٩٥٧ | بروسکەی هەولێر | ٣ | ٦ | سلێمانی |
| ١/٧/١٩٥٧ | کەوکەبی زەرقا | ٥ | ٠ | سلێمانی |
| ٩/٨/٩٥٧ | یەکێتی خانەقین ئەهلی | ٦ | ٤ | خانەقین |
| ١٦/٨/٩٥٧ | شوعلەی کەرکوک | ٥ | ١ | سلێمانی |
| ١٢/٩/٩٥٧ | شوعلەی فەیلی بەغا | ٣ | ٣ | سلێمانی |
| ٢١/٩/٩٥٧ | یەکێتی شێخلی بەغا | ٤ | ٢ | سلێمانی |
| ٢٣/٩/٩٥٧ | بروسکەی هەولێر | ٥ | ٠ | هەولێر |
| ٢٩/٤/٩٥٨ | تیپی فەیلی | ١ | ٢ | بەغدا |
| ١٣/٦/٩٥٨ | شەریکەی نەوتی خانەقین | ٢ | ١ | سلێمانی |
| ٢٠/٦/٩٥٨ | سەلاحەدین هەولێر | ١ | ١ | سلێمانی |
| ٢٣/٨/٩٥٨ | تیپی فەیلی بەغا | ٤ | ٥ | سلێمانی |
| ٢٩/١/٩٥٩ | لیوای پیادەی چوارەم | ٢ | ١ | سلێمانی |
| ١٨/٢/٩٥٩ | کۆماری جەزائیر | ١ | ٨ | سلێمانی |
| ٢/٥/٩٥٩ | ئاسووری کەرکووک | ٢ | ٤ | سلێمانی |
| ٣/٧/٩٥٩ | نەهرێنی کەرکووک | ٤ | ١ | سلێمانی |
| ٤/١٠/٩٥٩ | ئەلوەندی خانەقین | ٢ | ٢ | سلێمانی |
| ٢٠/١١/٩٥٩ | نیقابەی کرێکارانی نەوتی کەرکووک | ١ | ٥ | سلێمانی |
| ١٥/١/١٩٦٠ | نیقابەی کرێکارانی نەوتی کەرکووک | ٢ | ٣ | سلێمانی |
| ١٢/٢/٩٦٠ | شەریکەی نەوتی کەرکووک | ٥ | ٠ | سلێمانی |
| ٢٧/٢/٩٦٠ | هەڵبژێراوی هەولێر | ٠ | ٠ | هەولێر |
| ٢٩/٢/٩٦٠ | هەڵبژێراوی موسڵ | ٠ | ٠ | موسڵ |
| ٦/٣/٩٦٠ | هەڵبژێراوی موسڵ | ١ | ٢ | سلێمانی |

بەمەدا دەرئەکەوێت کە یانە تا ئەمرۆ (٧٧) گۆڵی کردووە وە (٥٦) گۆڵی کراوە وە (١٢) یاری بردۆتەوەو (٨) یاری دۆراندووە وە لە (٥) یاریدا وەك یەك بووە.

عەلی ئەحمەد تەها

سکرتێری یانەی وەرزشی سلێمانی

# یاریی ئاسن

یاریی ئاسن چۆن هاتە شارەکەمانەوە لەسەر یاسای تازەی وەرزش:

کاکـە حەمەی میرزا سەعیدی مەلا عەباس لە حەپسخانەی (کوت) حەپس دەبێت لە ساڵی ١٩٤٨دا لەگەڵ یەکێك لە پاڵەوانەکانی عێراق لە یاری ئاسندا کە ناوی (جەعفەر ئەبولعیس) بوو لەوەوە فێری یاریی ئاسن هەڵگرتن بوو وە لە ساڵی ١٩٥٠دا کاتێك بەرئەبێت خولیای یاریی ئاسن دەکەوێتە مێشکیەوە وە کە ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی لە ماڵی خۆیاندا دەست ئەکات بە یاریی ئاسن وە هەر لەوکاتەدا لە سەرکارێز چەند لاوێکی تازە پێگەیشتوو یاری ئاسن ئەکەن وەك:

١ ـ حەمە ڕەشیدی ئەحە شانە (نانەوا)

٢ ـ تۆفیقی حاجی باقی (چایچی)

٣ ـ کەریمی مام ئەورەحمان **(تەنەکەچی)**

٤ ـ جەلالی وەستا محێدین (تەنەکەچی)

ئەم چوار لاوە سەرتای یاری ئاسنیان ئەبێت وە کاکەحەمە پەیوەندی‌یان پێوە ئەکات و یاری‌یان لە گەڵا ئەکات، لە پێشا کەرەسەی یاری ئاسن نەبوو تەنها بە شەفتی بۆری‌و وە فلنجەو دیشلی ئۆتومبێلیان پێوە ئەکردو یاری‌یان پێ‌ئەکرد، هەر لەم ساڵەدا چوون بۆ بەغداد بۆ یانەی سیحەو قووە (صحة و القوة) چوون بۆلای سەرۆکی یانە کە (ناسر غافقی) بوو کە پاڵەوانی ئاسنی عێراق بوو دیسان پاڵەوانی زۆرانبـازی بوو کە چاویـان بە یانـەی بەغـا کەوت ئەمانیش زیاتر خۆیـان ئامـادە کرد بۆ پەرەسەندنی یاری ئاسن لە سلێمانی کە گەڕانەوە بۆ سلێمانی وە یەکەم کەس کە پەیوەندی‌یان پێوە کرد مامۆستا (ساڵح عەلی) بوو بۆ ئەم مەبەستە بۆئەوەی جێگایان بۆ پەیدا بکات و یارمەتیان بدات لەوکاتەدا

شەوی سەری ساڵی قوتابخانەکان بوو قوتابخانەی (عاری) بو سەرین بە نیشتەجێ وە لە یاریگاکەیدا یارییان ئەکرد وە خۆشی سەرپەرشتی ئەکردن وە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو پێشکەوتن ئەرۆیشتن وە زۆر لاویتر چوونە ناویانەوە وەکو ئەمانەی خوارەوە کە بۆ یاری ئاسن و جومناستیك بەشدارییان کرد:

| | | |
|---|---|---|
| ١ ـ عەبەی رەحە | ئوتومبێلچی | یاری ئاسن |
| ٢ ـ شێخ کەریم یاراوی | مامۆستا | جوانی لەش و جومناستیك |
| ٣ ـ عومەر نەمەڵی | قوتابی | جومناستیك و فوتبۆڵ |
| ٤ ـ کورکێن کریکۆر | قوتابی | جومناستیك |
| ٥ ـ جەمیل نوری عەلی | قوتابی | جومناستیك و فوتبۆڵ |
| ٦ ـ ئەحمەدی کاکەحەمە | قوتابی | فێرکەری یاری فوتبول |
| ٧ ـ رەفیق سەید فەتحوڵلا | قوتابی | جومناستیك |

هەر لەم ساڵەدا تیپی فوتبۆڵی تێدا دامەزرا لەگەڵ یاری جومناستیك چوون بۆ بەغدا جلوبەرگی فوتبۆڵ و تاقمی یاری ئاسنیان کری وە زۆر بەرێکوپێکی یارییەکان ئەکراو زۆر لە لاوانی شارەکە هاتنە پاڵیان هەر لەم کاتەدا لە حامیەی سلێمانی فەسیلێك هەبوو هەموو جۆرە یارییەکیان ئەکرد بە سەرپەرشتی مولازم (جەلال ئەحمەد فەهمی) کە خەڵکی شارەکە بوو وە لاوێکی ناسراوو یاریزان بوو هەمووجار ئەو سەربازانەی ئەهێنا بۆ یاریگاکەی ئەوێ بۆئەوەی یارمەتی ئەو کۆمەڵە بدات زیاتر پێشکەون وە لە ساڵی ١٩٥١دا کە قوتابخانە کرایەوە چوونە ماڵی (سەید نووری سەید ئەحمەدی بابا رەسووڵ) لە کۆڵانەکەی بەرامبەر مزگەوتەکەی (سەیدحەسەن) لە سابوونکەران وە لێرە بریاریان دا کە زیاتر پەرەی پێ بسێنن و بیکەن بە یانەیەکی (یاسایی) کە میری بریاری لەسەر بدات وە ئەم شتانەی لای خوارەوە پەیداکەن کە پەیوەندی هەیە بە وەرزشەوە وەك:
١ ـ مێزی بیلاردۆ ٢ ـ سپرینگ ٣ ـ کەرەسەی جومناستیك ٤ ـ مێزی تێنس.

لەم کاتەدا چەند یاریزانێکی ئاسن پەیدابوون وەك ئەم یاریزانانە:

١ ـ مەحموود چاومار (تەنەکەچی)
٢ ـ غەفوور فەرەج (قوتابی)
٣ ـ ئەحمەدی تەنەکەچی (تەنەکەچی)
٤ ـ ئیسماعیل ئیبراهیم (سمەپاڵەوان) (کاسب)

وە چەند کەسێکی تریش.

لەم کاتەدا ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکە گەیشتە ١٨٠٠ ئەندام هەر لەم ساڵەدا پەیوەندی‌یان بەست بەچەند کەسێکی‌ترەوە کە بیکەن بە (یانە) وە داوای ئیجازە لە میری بکەن وە بریاریان دا دەستەی دامەزرێنەری یانە لەم چەند کەسەی خوارەوە پێك بێت:

١ ـ ساڵح عەلی ساڵح سەرۆك
٢ ـ نووری ئەمین بەگ جێگری سەرۆك
٣ ـ حەمەی میرزا سەعید بەرێوەبەری یانە
٤ ـ فوئاد مەجید بەگ سکرتێر
٥ ـ رفێق سەید فەتحوڵلا ژمێریار
٦ ـ ئەحمەدی کاکەحەمە فێرکەری فوتبۆڵ
٧ ـ کەریمی مام ئەورەحمان فێرکەری ئاسن

وە دەستیان کرد بە نووسینی یاسای ناوخۆیی (النظام الداخلی)و پێشکەشی میری‌یان کرد بەڵام میری رێگەی نەدان.

وە هەر لە ساڵی ١٩٥١دا ویستیان بن بە لقی یانەی (صحة وقوة)ی بەغا و ە چوون بۆ بەغا پەیوەندی‌یان بە (ناسر غافقی) سەرۆکی یانەکەوە کرد ئەویش بریاری لەسەر دا کە بن بە لقی ئەوان وە هەر لەوێ پێشنیارێکیان دا بە وەزارەتی ناوخۆ بۆ ئەو مەبەستە وە گەرانەوە بۆ سلێمانی وە پارچەیەك نووسینیان

هەڵواسی بە بەر ماڵەکەدا بە ناوی یانەی (صحة وقوة) پاش ماوەیەك ناصر غافقی هات بۆ سلێمانی بۆ یانەکە وە بەوبۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورەیان گێڕاو زۆر کەس بانگکرا وە بلیت دابەش کرا بەسەر خەڵکەکەدا وە هەموو جۆرە پیشاندانێکی جووڵانەوەی وەرزشی دەست پێکرا وە ناسر غافقیو گشت خەڵکەکە بەدڵیان بوو وە ئەوەندەیتر لاوی شارەکە چوونە ئەو یانەیەوە وە زۆر لاوی دوورخستەوە لە قومارکردن و عارەق خواردنەوەو زۆر شتیتر کە زیانی بە لاوان ئەگەیاند وە بەهۆی ئەم یانەیەوە گیانی برایەتیو هاورێیەتیو یەکتری ناسین پەیدابوو وە بۆیە میری پێی ناخۆش بوو تا لە ساڵی ١٩٥٢دا ئێوارەیەك

معاونی پۆلیس و چەند پۆلیسێك بە موسەللەحەیەك چونە سەر یانەکە وە بەزۆردایان خست وە خەڵکی شارەکە زۆر زۆریان پێ ناخۆش بوو وە ناچار بوون کە لاوە وەرزشکارەکان ئاسن بکرن و لە ماڵی خۆیاندا یاریبکەن.

تێبینی:

ـــــــــ: ئەندامانی یانە مانگی (٢٥٠) فلس مانگانەیان ئەدا بەڵام پارە لە قوتابی نەئەسێنرا وە هەروەها چەند کەسێك لەو ماوەیەدا یارمەتی یانەیان ئەدا بە پارەو زۆر شتیتر وەکو:

١ ـ قادراغای حاجی مەلا محێدین
٢ ـ دوکتۆر کەمال عەبدوڵلا ناجی
٣ ـ وەستا محێدین تەنەکەچی
٤ ـ ئەحەی سەعە بانەیی
٥ ـ حەمەی سەید ئیبراهیم
٦ ـ بابارسول سەید نووری، خاوەن خانووەکە
٧ ـ خەلیل ئیبراهیم (معاونی تەسویە)
٨ ـ ئەحمەدی وەستا مەحمووی دەلاك

وە چەند کەسێکی تریش.

تێبینی:

ـــــــ: یاری پاڵەوانبازیو میلبازی لە شارەکەمانا هەر لە زەمانی عوسمانلیەوە هەبووە لەماڵێکا ئەیانکرد لە سەرکارێز لای ماڵی (مەلا عەلی سەرکارێز) پێیان ئەووت (زۆر خانە) وە لەم ماڵەدا یاری زۆرانبازی میلبازی تێدا ئەکرا وە یەکێك لەو پاڵەوانانە کە ناوی (ئەورەحمانی خامە) بوو پێش بیرکردنەوە لەم کتێبە بە ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی کرد تاوەکو لێمان بپرسیایە کە هاوەڵەکانیتری کێ بوون و چۆن یارییان کردووەو گەلێ پرسیاریتر، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٦ ـ ١٩٤٧ زۆرخانە کرایەوە لە شوێنی چایخانەی ساڵحی وەستا بستە تەنیشت سینەمای رەشید وە خەڵك ئەچوون بۆ تەماشاکردن و چاخواردنەوە وە ئەوانەی بەشدارییان کردبوو ئەمانەن:

١ ـ عەبوودی پاڵەوان: قۆریو شووشەی شکاوی چاك ئەکردەوەو ئەگەڕا.
٢ ـ خاڵە رەجەب : قسەخۆش و نوکتەزانی بەناوبانگ.
٣ ـ رەحمەتوڵڵا
٤ ـ عیزەدین : دانیشتووی شاری کەرکووك بوو.

❊ ❊ ❊



تایەربەگی یەحیا بەگ ١٩١١ - ١٩٧٩



عەزیز محەمەد ڕەشید



عەلی ئەحمەدی تەها



ساڵح عەلی ١٩١٢ - ١٩٨٦



وەفـدی عێـراقی لە ئەڵمـانیا ساڵی ١٩٣٨ ، لەم کاتەدا هیتلەر وتار ئەخوێنەوە ،

تایەری یەحیا بەگ لە سلێمانییەوە چووە .



وەفدەکەی عێراق لەبەرلین ـ ١٩٣٨



کەشافەی قوتابخانەی دووەم - ١٩٣١





کەشافەکانی قوتابخانەی فەیسەڵی یە



نمایشتێ گشتێ ساڵی ١٩٤٩



کۆمەڵی پێشکەوتنی سلێمانی - ١٩٣٤



یاری کەری ئاسن عەبەی ڕەحە



کومەڵی یاری‌زان لەسەرشانی عەبەی ڕەحە




سمەپاڵەوان کوڕەزازای ئەحەی کرنوو «دوووەم کەس»



نمایشتی گشتی ساڵی ١٩٤٩ لەدەشتی تەیاری خانەکە



تیپی قوتابیانی سلێمانی - ١٩٣١



یاری زانان کە بەشداربوون لە یاریی کەرکووك ١٩٣٧



هەڵبژاردەی سانەویی شەو ـ ١٩٥٣



یاری تۆپی پێ لەنێوان تیپی ئەهالیو سوپا ـ ١٩٥٤



تیپی ئەزمەڕ ١٩٥٥ دامەزراوە



تۆپی سەبەتە ـ سانەویی ڕۆژو شەو ـ ١٩٥٦؛



تیپی ئاسۆ



هەڵبژاردەی سلێمانی ـ ١٩٥٨



تیپی ئاكۆ



هەڵبژاردەیی تۆپی پێی
سلێمانی وجزائر ساڵی ١٩٥٩



مەلە لەژێر پردەکەی قلیاسان ـ ١٩٥٣

## (جووڵانەوەی هونەری لە شارەکەمانا)

نووســەر زۆربــاشیی کردووە کە هەنــدێ لاپەڕەیتری ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەتنوگرافیی شاری لەژێر باسی جووڵانەوەی هونەرییا تۆمارکردووە. ئەم بابەتانە ئەگەر دووریش بن هەر لە جەمسەریکەوە ئەچنەوە سەر بابەتی جیهانی هونەر.

نووســەر ئەوڕۆژەوە کە فریــا کەوتووە مێژووی ئەم بابەتانەی تۆمارکردووە. هەرچەندە زۆر لایەنیان هەر لە سەرەتای دروستبوونی شارەوە هەبوون. بۆنموونە باسی مۆسیقــاو مۆسیقــاژەن تەنیــا لە شەست ساڵێك لەمەوبەرەوە باس کراوە ئەکاتێکا کە (مستەر ریچ) هەر لە ڕۆژانی بابانەوە باس لە مۆسیقاژەنەکانی بەغدا ئەکــات (بــڕوانــە پێشەکی ئەم کتێبە). لەلایەکیتریشەوە هەندێ بابەت (وەك سینــەمــا) هەر لە سەرەتــاوە باس کرا. بەگشتی ئەم تومــارەش مێژووی ئەم ساڵانەی بەباشی بۆ چەرخی ئایندە پاراستووەو کەرەسەی بۆ پسپۆڕان کۆکردۆتەوە.

## (سەیران)

لە بڵاوکراوەکانی شارەوانی (سلەیمانی)

ساڵی ١٩٦٨ ـ ژمارە (٩) لاپەرە (٢٤)

رۆژی (١٦)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٢)ز رێکەوتی یەك شەممە لەلایەن دانیشتوانی گەرەکی (دەرگەزێن)ەوە سەیرانێك رێك خرا، پاشای ئەو سەیرانە (سەعی دەوڵەت) بوو، سەدری ئەعزەم (رەشی حاجی فەتاح)و نازری حەربیە (حەمەنەجیبی حاجی مەحمود)و نازری خاریجیە (فەرەجی حەمەی سمایل)و نازری مالیە (ئەحمەدی دایەنەکە) شابەندریش (ئەورەحمانی خامە) بوون. بەییاخ و تەپڵ و دوو بزن و حوشترێك و دوو کەس کڵاودارایی رێك خرابوو، پاشا پەنجا نەفەر عەسکەری پیادەو دە نەفەر سوارەو چوار نەفەریش حەربەدار بە جلی سوورەوە لەگەڵیا بوون بە رێك وپێکی بە ناوشارا رویشتوون تا بەرسەراو لەوێ رەسمیان گرتووە (خۆزگە ئەو رەسمەمان دەست ئەکەوت) دوای ئەوە بە هەموو بازار بۆلای (ئاشی بیبیەکانی قرگە) لەوێ حەوت چادری گەورەو دەوارێکیان هەڵداوە بۆ ئەهالی، (١٠) ئەشراف و گەلێك مەئموورانیان بۆ ئەو رۆژەوەو رۆژی دوایی دەعوەت کردوە، شابەندەر زۆر زەبرو زەنگی خۆی نواندووە بۆ هەمووکەسێ، شاربەدەکردن و جەرییمەو فەلاقەو لەکۆت دان لای شابەندەر زیاتر بو، ئەمەش کە ئەکرا تەنیا بۆ خۆشییو پێکەنیین بووە بە بێغەرەز وە ئەم بەزمە تا رۆژی سێشەممەی خایاندوە.

## (سەیرانی قەسابەکان)

ڕۆژنامەی (ژیان) ژمارە (١١٤)
ڕۆژی ١٧/٥/١٩٢٨ز

ڕۆژی دووشــەممــەی (٧/٥/١٩٢٨)ز بە سورەتێکی مونتەزەم لە مەعیەت ڕەئیسا بە ناوشار گەران، لەدوای زیارەتی مەقامی حکومەت حەرەکەتیان کرد بۆ **سەرچنـار، لەوێ دەدوانـزە خێـوەت و ڕەشمـاڵیان هەڵدابوو، سەیرانەکە هەتا ڕۆژی** پێنج شەممە پاش نیوەڕۆ دەوامی کرد.

وە لەو موددەیەدا عومومی ڕوئەسای دەوائیرو هەموو ئەهالی سلەیمانی تاقم بەتاقم دەعوەتیان کردن

تێبینی:

---

شایـانی باســە کە (ســەعـوّلی خەلفـە کەریم)و (حەمەی عەزەی قەساب) هەرکـەسێ ئیتـاعـەتی ڕەئیسی نەکـردایە سزایان لێئەسەند بە پارە، پارەکەش بۆئەوەی خزمەتی قوتابی مەکتەبی زانستی پێبکەن، بەم جۆرە بەسزادانی خەڵك (١٧٠) سەدوحەفتا ڕووپیەیان کۆکردەوەو تەسلیمی هەیئەتی تەعلیمی مەکتەبەکە کرد.

هەروەهـا (فـەرەج کوردی) بەڕێوەبەری سەیرانەکە بوو وە بەزۆری ئەوەی سەرپەرشتی سەیرانەکەی ئەکرد جگە لەو سێ کەسە کە لەسەرەوە باسمان کردن. وە ئەمانەش بەشداری‌یان لە سەرپەرشتیا کردووە:

١ ـ (عەلی برزوو)
٢ ـ (حەمەد میینی عەبەی ئایشەخان)
٣ ـ (عەزیزی عارفی ئەمینە بچکۆل)
٤ ـ (وەستا گوورروونی کەبابچی).

وە لەم سەیرانەدا تەمسیلێکی گەورەی خۆشیان پێشکەش کردووە.

سەیرانی قەسابەکان لە سەرچنار ساڵی ١٩٢٨ حەوت شەوو حەوت ڕۆژی خایاند، ئەم لیژنەیەی خوارەوە ئیجازەیان لە موتەسەریف ئەحمەد ئەفەنی هەولێری (ئەحمەد عوسمان) وەرگرت، هەر ئەم لیژنەیە لە سەیرانەکەدا ئەمریان دەرئەکردو سزای خەڵکیان ئەدا:

١ ـ صاڵحی ڕەشە
٢ ـ حاجی محی‌الدین باوکی حاجی دەروێش
٣ ـ حەمەی عەزەی چەکوش
٤ ـ سەعۆلی خەلفە کەریم
٥ ـ حەمە ئەفەنی صاڵحی ڕەشە
٦ ـ مەحمود ئەفەنی صاڵحی ڕەشە

ئەم لیژنەیە خوارەوە سەرپەرشتی سەیرانەکەیان ئەکرد:

١ ـ حاجی کۆڵەك
٢ ـ عەبەی حاجی
٣ ـ حەمەی ماڵە
٤ ـ فەرەجی ماڵە
٥ ـ حەمومینی عەبەی ئایشەخان
٦ ـ ڕەشەی یارە
٧ ـ فەرەجی سمایل کۆیی
٨ ـ ڕەشەی مەلا ئەحمەد
٩ ـ عەبەی قالەی مریەم
١٠ ـ حاجی ئەحە کریس

ئەوانەی دەوری تەمسیلی پاشایان ئەبینی ئەمانە بوون:

ئەکتەرەکان:

١ ـ فەرەج کوردی دەوری پاشا بە جلوبەرگی حاجی مستەفا پاشاوە کاتێ کە لە سوپای عوسمانی لەبەری ئەکرد.

٢ ـ مەلا محی‌الدین ماستاو دەوری قازی بە جلوبەرگی قازی‌یەوە.

٣ ـ ئەحەی حەمە عەزیز پێستی بزنیان کەوڵ کردبوو لەگەڵ سەرو کەلەکەیدا لەبەری‌کردبوو.
٤ ـ ئەحەی حەمە گوێچکە پێستی بزنیان کەوڵ کردبو لەگەڵ سەرو کەلەکەیدا لەبەری‌کردبو.

دوو گایان ئەهێنا لەنزیك یەکترەوەو جلەویان کردبون و تەختەیان خستبوە سەر پشتی هەردوو گاکە ئەم دووانە ئەچونە سەر پشتی گاکان هەڵئەپەرین.

٥ـ بابا خولە پێستی گای لە شان ئەکرد وەکو عەبا سوری‌ئەدا **٦ ـ عارف فیتك**

ئەم دوو زاتە دەنگ خۆشەش بە گۆرانی سەیرانەکەیان خۆش کردبوو:

١ ـ مەلا ئەحمەدی دیلان.
٢ ـ حاجی مەلا فەرەجی بەقاڵ.

ئەم دووانەش بە دەهۆڵ و زورنا سەیرانەکەیان گەرم کردبو:

١ ـ میرزا محەمەد.
٢ ـ عەبەی سەی‌زادە.

تێبینی: ـ لەم سەیرانە گەورەیەدا گۆرانی ، هەڵپەرکێ، رمبازی، یاری‌کردن، تەمسیـل ئەکرا، لەم سەیرانەدا ئەوەی نەهاتایە بۆ سەیرانەکە چوار جەندرمە بەسواری‌یەوە ئەچون بۆ ناوشار زەلامەکەیان ئەهێنا جەزایان ئەدا بە پارە یان ئەیـان خستـە ناو ئاوەکـەوە بۆنمـونە حەمەی ئەورەحمان ئاغا لە سەیرانەکە دواکەوتبو ٣٠٠ روپیە جەزایان لێ سەند.

لەم سەیـرانـەدا خەڵکیـان زۆر بانگ کردبو لە میری‌و لە ئەهالی، لە میری موتەسەریف، مودیری پۆلیس، ئامر حامیە، رەئیسی بەلەدیە، قازی، حاکم، قائمقام.

میوانی ناوشار بۆنمونە وەك:ـ

١ ـ حاجی تۆفیق (پیرەمێرد) لەم سەیرانەدا شیعری «کەدەڵێن»ی هەڵبەست و بوو بە گۆرانی، مەلاکەریم ئەم گۆرانی‌یەی تۆمارکرد.
٢ ـ حاجی مەلا محی‌الدین

٣ ـ حاجی برایم ئاغا
٤ ـ حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلیزادە
٥ ـ غەفور ئاغای حاجی ئەولا
٦ ـ حەمەی ئەورەحمان ئاغا
٧ ـ توفیق قەزاز
٨ ـ مەحمود ئەفەنی رەسام
٩ ـ یەحیا ئەفەنی رەسام

لە چوارتاو سورداش و قەرەداغ و هەڵەبجەوە ئەهاتن وەك حامید بەگی جاف، لەم سەیرانەدا زیاتر لە پەنجا چادری عەسکەری‌یان داکوتابو لە حامیە وەریان گرتبو زیاتر لە ٢٠٠ حەیوان سەربڕرابو زیاتر لە ٣٠ فەردە گونیەی خەت سوور برنج و ٦٠ سینی پاقلاوە، هەمەجۆر خواردن، لەم سەیرانەدا چەند ژنێکی کەسوکاری خۆیان بردوە بۆ چێشت لێنان.

سەرچاوەی ئەم بەشە: عەلی صالح رەشە کە خۆی یەکێك بووە لەوانەی لەو سەیرانەدا بەشداری‌یان کردووە.

## (سەیرانی دارتاشەکان)

لە رۆژی (٢١)ی مایسی ساڵی (١٩٤٦)ز دارتاشەکانی سلەیمانی سەیرانێکی ریك وپێکیان لە (قەڵاچوالان) کرد کە دوو شەوو دوو رۆژی خایاندوە، جگە لە دارتاشەکان میوانێکی زۆریشیان بانگ کردبوو، وە بە هەموویان ئەگەیشتنە دەوری سەد کەسێك.

وە ئەم ماوەی سەیرانە هەموو خەریکی خۆشی‌و گۆرانی‌و گاڵتەوگەپ و تەمسیل کردنوو یاری‌کردن بوون بێ‌ئەوەی هیچ کەسێك دڵی لە هیچ کەسێك زویر بووبێت، سەرپەشتی‌کەری ئەم سەیرانەش (حەمەسەعی جەعفەری دارتاش و وەستاورەحمانی وەستا خۆرۆون) بوون، هەروەها دوو ژنیشیان لەگەڵ

خۆیان بردبوو بۆ چێشت لێنان.

لەم سەیرانەدا تەمسیلێك پێشکەش کرا بە ناوی (پاشا)وە (حەمەسەعی جەعفەری دارتاش) دەوری پاشای بینیوەو جلی تایبەتی پاشایی لەبەرکردوەو پشتوێنی سووروو کڵاوی گوڵنکەداری لەسەر کردووەو قایشی ڕاست وچەپ نیشانی کردوە بە بەرۆکی‌یەوەو ئەم پاشایە فەرمانی دەرئەکردە سزای خەڵکی ئەداو پەیڕەوی فەرمانەکانی ئەکرا.

ئەوانە بەشداری ئەم تەمسیلەیان کردووە ئەمانە بوون:

| | |
|---|---|
| ١ ـ حەمەسەعی جەعفەری دارتاش | لە دەوری (پاشا)دا |
| ٢ ـ ئەورەحمانی وەستا گووروون | لە وەزیری دەستەڕاستا |
| ٣ ـ ئەحەرەشی مەلا برایم | لە وەزیری دەستە چەپا |
| ٤ ـ عەلی حەمەبۆر | لە سەگی پاشادا |
| ٥ ـ مەلا کەریمی شووشە | لە دەم ڕاستی پاشا |
| ٦ ـ عەبەی عەلیەفەنی | لە دەم ڕاستی پاشا |
| ٧ ـ ئەحمەدی | لە پاسەوانی پاشا |
| ٨ ـ فەرەجی قالە پەڕۆ | لە پاسەوانی پاشا |
| ٩ ـ عەبەی حاجی حەملان | لە پاسەوانی پاشا |

جگە لە تەمسیل و یاری‌و پێکەنیین چەند گۆرانی‌یەکی خۆشیش بە دەنگە زوڵالەکەی کاك ڕەشی (ڕەشۆل عەبدوڵڵا) پێشکەش کراوەو هەروەها (مەحمودی حەمەکلەیلێ) ش بەشداری کردوە لە گۆرانی‌وتنا.

هەندێ لەو دارتاشانەی بەشداریی ئەم سەیرانەیان کردووە ئەمانە بوون.

١ ـ ڕەشۆکاو

٢ ـ ئەحمەدی حاجی محەمەد

٣ ـ فەرەجی ئەمینی حەسەن

٤ ـ عەلی دایی

٥ ـ حاجی حسەینی یابوو

٦ ـ عەلی وەستا بستە

٧ ـ کەریمی دارسەلییم

٨ ـ کەریم لادێیی

هەروەها هەندێ لەو میوانانەی بانگ کرابوون ئەمانەبوون.

١ ـ مەلا کەریمی گەچ فرۆش.

٢ ـ مەلا عیزەتی گەچ فرۆش.

٣ ـ حاجی ساڵحی شووشە.

٤ ـ ئەحمەد سامی.

## (سەیرانی بەناکان)

لە ساڵی (١٩٤٧)ی ز بەنـاکانی سلەیمانی هەستان بە سەیرانێکی جوان و قەشـەنـگ و ڕێـك وپێك بۆ (تابیین)، ئەم سەیرانە بە قسەی خۆش و نوکتەو گاڵتەوگەپ و تەمسییل کردن و گۆرانیو هەڵپەرکێ براوەتەسەر.

ئەمە یەکێ بووە لەو سەیرانانەی کە بەسەرهاتەکان و پروگرامەکە بۆ خۆشیو نوکتە ئەگێڕرایەوەو باس ئەکرا.

ئەوانەی کە سەرپەرشتی ئەم سەیرانەیان کردووە ئەمانە بوون.

١ ـ حاجی بارام.

٢ ـ وەستا عەزیزی ئیسماعیل.

٣ ـ وەستا مارفە درێژ.

٤ ـ وەستا ئەمیینی وەستا حەسەن.

٥ ـ وەستا کەریم چاوشیین.

هەر لەم سەیرانەدا تەمسیلێك کراو ئەوانەی بەشداری‌یان کردووە ئەمانە بوون.

١ ـ مەولوی برای خاڵە ڕەجەب ـ لە دەوری پاشادا.

٢ ـ وەستا مارفە درێژ لەدەوری وەزیر.

٣ ـ حەمەی ئاڵتوون لە دەوری وەزیر.

٤ ـ حاجی بارام لە دەوری قازی.

٥ ـ فەتاحی چایچی سەرۆك پاسەوان.

٦ ـ سەعەی شییو لە دەوری جارچی.

لەم سەیرانەدا شایەرو دەنگ خۆشی بەناوبانگ (غەفور ـ گەرگەر) چەند کۆرێکی گۆرانی گێراوە.

## (سەیرانی بازرگان و بەرگ درووەکان)

ڕۆژانی ڕابوردوو وا باوبوو لە بەهارا جگە لە خێزانی گەرەك و دەرو دراوسێ کە بە کۆمەڵ سەیرانیان ئەکرد، گوزەرەکانی ناوبازاریش و قەیسەری‌یەکان سەیرانیان ڕیك ئەخست و بەم جۆرە بەهاریان ئەبردە سەر.

لە ڕۆژی (٣)ی مایسی ساڵی (١٩٤٥)ز خاوەن دووکانەکانی قەیسەری (وەسمان پاشا) کە زوربەیان بازرگان و بەرگ درووبوون، سەیرانێکیان ڕیك خست بۆ (سەرچنار) ئەمەش بە یەکێ لەو سەیرانانە ئەژمێررێ کە نموونەی یەك دڵی‌و دڵپاکی ئەو خەڵکەی ئەوسای سلەیمانی بوو کە ڕۆژێکی وایان بە قسەی خۆش و سەرگوزەشتە گێرانەوەو پێکەنین و گۆرانی‌و خواردنی خۆش و بەلەزەت ئەبردەسەر لەو سەیرانەشا چەند وێنەیەکی جوانی پڕ یادگاریان گرتوە.

ئەوانەی بەشداری ئەم سەیرانە خۆشەیان کردووە ئەمانە بوون:

١ ـ حاجی کەریمی قالەی قجوول.

٢ ـ حاجی ڕەفیق.

٣ ـ وەستا کاکی مەحمودئاغا.

٤ ـ وەستا غەفووری سەعەی لێفەدروو.

٥ ـ غەریبی حاجی سالحی زەریفێ.
٦ ـ وەستا سەعی مەکینەچی.
٧ ـ خوولەی وەستا سەعی مەکیینەچی.
٨ ـ حاجیساڵحی مەحمود.
٩ ـ وەستا عەبدوڵڵای لێفەدروو.
١٠ ـ ئەحمەد هوشیار.
١١ ـ شێخ ئەحمەدی حاجی شێخ مستەفا.
١٢ ـ شێخ عوومەری حاجی شێخ مستەفا.
١٣ ـ برایمی وەستا ڕەشی.
١٤ ـ مستەفای حاجی مەلا مارف.
١٥ ـ لەتیفی حاجی ساڵحی زەریفێ.
١٦ ـ عەبەی حاجی پەتول.
١٧ ـ فەرەیدونی حاجی کەریم.
١٨ ـ برایمی حاجی عەلی غەوواس.
١٩ ـ غەریبی سەیعەلی بەقاڵ.
٢٠ ـ عەباسی قالەی مچیل.
٢١ ـ عەبدول و عومەری حاجیلەی شەربەتچی.
٢٢ ـ حسەینی عارفی هەلوو.
٢٣ ـ حسەینی حاجی عەبە جەدید.
٢٤ ـ عەبدوولی حاجی شێخ عارف.

چایچییەکەی ئەوسای قەیسەری نەقیب و چەندکەسێکیتریش بەشداری ئەم سەیرانەیان کردووە.

*** 

## (تیاترۆ خانەکانی سلەیمانی)

لە ساڵی (١٩٢٧)ز کە زەمانی ئینگلیزەکانیان پێئەوت لە دەشتی (ئەحمەدی ساغا) کە ئێستا شوێنی گەراجی (ئەسحابەسپی)یە سێ ئافرەتی تورك گۆرانییان ئەوت و سەمایان ئەکرد. ئەو ئافرەتانە یەکێکیان ناوی (یولدز) بوو دوەمیان ناوی (لوتفیە)و سێیەمیان

(لویزە) بوو، دوو پیاویشیان لەگەڵ بوو یەکێکیان ناوی (نوباربەگ) بوو کە ئەرمەنی بوو، مێردی (لویزە) بوو قانوونی لێئەداو لەکاتی خۆیشیا قانون ژەنی سوڵتان (عەبدول حەمید)بوە، پیاوەکەی تریشیان ناوی (بارام)بووە کە ئیشی ئەوەبوو خەڵك بێنێتە پێکەنین و تەنافبازیش بوە.

ئەم کۆمەڵە لە تورکیاوە هاتبوون. ئەم تیاترۆخانەیە یەك هاوینی خایاندوە.

لە ساڵی (١٩٣٠)ز (لە باخی میللی) حەوشی سەرا چەند تەمسیلێك پێشکەش کراوە، ئەمانەبوون.

١ ـ (في سبيل التاج).

٢ ـ (سەلاحەدیین).

٣ ـ (مەدحەت پاشا).

٤ ـ (مەلیکی فەرەنسا).

ئەو ئەکتەرانەی لەم شانۆییانەدا بەشدارییان کردووە ئەمانە بوون:

١ ـ هونەروەری بەناوبانگی عێراقی ـ حەقی شبلی.

٢ ـ هونەروەری میسری بەناوبانگ ـ بەشارە واکیم.

لە کاتی پشوودان و پەردەی تەمسیلەکانا. چەند تیاترۆیەك ئەهاتن و دەسیان ئەکرد بە گۆرانیوتن و سەماکردن.

ئەوانەی لەم بارەیەوە بەشداری‌یان ئەکرد بە تیاترۆکان ئەمانە بوون:
١ - (ماریا یەعقووب) گۆرانی ئەوت.
٢ - (ماریا سەمعاون) گۆرانی ئەوت.
٣ - (مارسێل) سەمای ئەکرد.

ئەم کۆمەڵە هەندێکیان لە ئوتێلەکەی رەمزی ئەفەنی لە سابونکەران کە بەرانبەری گەرماوی موفتی بوو دابەزیبوون و هەندێکیان لە ئوتێلەکەی حاجی برایم ئاغا دابەزیبوون کە ئەکەوێتە دەس پێکردنی شەقامی سابونکەران لە بەردەرکی سەراوە بە دەستە راستا بەرامبەر گەراجی عەبدە.

ئەم کۆمەڵە ئافرەتێکی پیریان لەگەڵا بوو کە خزمەتی تیپەکەی کردوە ناوی (زەنووبە) بووە، زۆر حەزی لە (کۆنکەن) کردن بووە، گەلێ جار ئەو گەنجانەی کە هاتووچۆی تیاترۆخانەکەیان ئەکرد بەرۆژ ئەچوون بۆلای (زەنووبە) دائەنیشتن و کونکەنیان لەگەڵا ئەکرد. ئەم تیاترۆخانەیەش یەك هاوینی خایاند.

لە ساڵی (١٩٣١)ز کۆمەڵێك تیاترۆ هاتوون بۆ سلەیمانی‌و لە ئوتێلەکەی (حاجی برایماغا) دابەزیبوون کە ناوی (ئوتێل سەعادە) بوو. بریتی‌بوون لە سێ ئافرەت و پیاو کە ئەمانە بوون.
١ - (تەتۆ) ئەم ئافرەتە خەڵکی (پشتکۆ) بوو بەکوردی بە شێوەی فەیلی گۆرانی ئەوت و سەماشی ئەکرد.
٢ - (سەدیقەتول مەلایا) - گۆرانی بێژ بوو.
٣ - (عەفیفە ئەسکەندەر) - ئافرەتێکی تازە پێگەیشتوو بو هەرەتی جوانی بوو - ئەمیش گۆرانی‌بێژ بوو.
٤ - (ئەسکەندەر) - کەمانجەژەن بوو.
٥ - (حسقێل) - دومبوگی لێئەدا.

لە ساڵی (١٩٣٤ - ١٩٣٥)ز تیپێکی تیاترۆ هاتبوون بۆ سلەیمانی‌و ئاهەنگیان ئەگێرا بە گۆرانی‌وتن و سەماکردن، شوێنی گێرانی ئاهەنگەکانیان جێگای ئێستای (سینەمای سیروان) بوو کە ئەوکاتە کەلاوە بوو، بە حەسیر دیواریان

بۆ ئەکرد وە ـیان رازانەوە، ئەو تیپەش بریتیبوون لەمانە.

١ ـ (مارسێل) ـ سەماکەر بوو.

٢ ـ (ماردۆخ) ـ دوومبگچی بوو.

٣ ـ (نازدارو ئەسمەر فەرهاد) ئەم دوانەش ئافرەت بوون و جوولەکە بوون و گۆرانی (نـەجیبە یار نەجیبە)یان ئەوت بە دووقۆلی، ئەم دوانە لە ئیستگەی کوردیش گۆرانی بێژ بوون.

٤ ـ (مامۆستا عەلی مەردان) هەرچەندە لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا نەبوو لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەوانە لە ئیستگەی کوردی ئیشیان ئەکرد، جارجار بەهۆی دۆستایەتی فرمانەوە ئەهات لەگەڵیاناو بە چەند گۆرانییەك بەشدارییی ئەکردن.

## (شانۆ لە سلەیمانیدا)

- لە ساڵی (١٩٢٥)ز چیرۆکی (قارەمانی کورد) پێشکەش کراوە لە ماڵی (بەهێ) خانی دایکی (شێخ باباعەلی شیخ مەحمود).
- لە ساڵی (١٩٢٦)ز لەلایەن قوتابیانی قوتابخانەی یەکەمەوە چیرۆکی (نەتیجەی سەفاهەت - زولم و ئیستیبداد) هەر لە ماڵی (بەهێخان)دا پێشکەش کراوەو هەروەها چیرۆکی (حوجرە) کە چیروکێکی پێکەنیناوی (هەزەلی) بوو لە هەمان ماڵا پیشکەش کرا ئەم ماڵە شوێنەکەی نزیکی مزگەوتی گەورە بوو.
- لە ساڵی (١٩٢٧)ز چیرۆکی (نیرۆن) لەلایەن قوتابیانی قوتابخانەی (زانستی)یەوە لە سابوونکەران پێشکەش کرا.
- لە ساڵی (١٩٣١ - ١٩٣٢)ز چیرۆکی (خوسرەوو شیرین) لەلایەن چەند ئەکتەرێکەوە پێشکەش کرا.
- لە ساڵی (١٩٣٦)ز چیرۆکی (فاڵچی) لەلایەن قوتابیانی قوتابخانەی (فەیسەڵیە)وە کە قوتابخانەیەکی سەرەتایی بوو هەر لە هۆڵی قوتابخانەکەدا پێشکەش کرا، ئەم قوتابخانەیە لە بەردەرکی سەرا بوو لە جێگای ( بازاڕی عەسری) ئیستا.
- لە ساڵی (١٩٣٤)ز چیرۆکی (شێرۆو نازەنین) پێشکەش کرا، لە شوێنی (سینەمای سەلاحەدین)و چایخانەی (حەمەرەق) کە ئێستا چێشتخانەی (حاجی فەتاحە)، ئەم چیرۆکە لە نووسینی شاعیری نەمر أ.ب. هەوری بوو هەر بە سەرپەرشتی (پیرەمێرد) لەلایەن قوتابیانی (قوتابخانەی زانستی)یەوە پێشکەش کرا سوودەکەی کرا بە (٤) چوار ژوور لە شوێنی (قوتابخانەی گویژەی کوڕان و لە ساڵی (١٩٣٥) قوتابخانەی زانستی گوێزرایەوە بۆ ئەم شوێنە.
- لە ساڵی (١٩٣٥)ز چیرۆکی (مەم و زین) پێشکەش کرا لە ئوتێلەکەی (حاجی برایماغا) کە ئەم ئوتێلە چونکە (قالە چاو جوان) گرتبووی بەکرێ پییان ئەوت (ئوتێلی قالە چاوجوان).

ئەم چیرۆکـە بە سەرپـەرشتی کردنی (شێـخ حەسەنی شێخ حەمەمارف) پێشکەش کرا لەلایەن چەند ئەکتەرێکەوە.
- لە ساڵی (١٩٣٥)ز چیرۆکی (سوپایی دلێر) یان سەربازی ئازا - (الجندی الباسل) لەلایەن تیپی قوتابیانەوە پێشکەش کرا.
- لە ساڵی (١٩٤١)ز چیرۆکی (بـازرگانی ڤینیسیا) کە (ڤینیسیا) شارێکە لە (ئیتالیا)و (بوندوقیە)شی پێ‌ئەڵێن کە لە نووسینی نووسەری بەناوبانگی ئینگلیز (شکسبیر)ە لە قوتابخانەی (خالدیە) پێشکەش کرا لە دەرهێنانی (تەلعەت موبارەك).
- لە ساڵی (١٩٤٦)ز لە قوتابخانەی گوێژەی سەرەتایی کوران لە ئامادەکردن و دەرهێنـانی (رفیق چالاك) چیرۆکی (لەرێی نیشتمـانا) پێشکەش کرا، ئەمەش سوودەکـەی تەرخان کرا بۆ ئاربووکردنی بوومە لەرزەکەی پێنجوین کە هەمان ساڵ رووی‌داو بوە هۆی ماڵ ویران کردنی گەلێك لە دانیشتوانی (پێنجوین).
- لە ساڵی (١٩٤٨)ز (تێکـۆشـانی رەنجـدەران) کە لە چیرۆکی (کـەردلۆتی مەنووچەر) وەرگیرابوو لەگەڵ چیرۆکی (هجرة الیهود)، کە ئەم دوو چیرۆکە لە نووسینی (برایم ئەحمەد)ی پارێزەرن، لە قوتابخانەی (غازی) کوران پێشکەش کراو ماوەیـەکی زۆری خایاند کە بریتی‌بوو لە (١٥) پانزە رۆژ دوایی میری دەستی بەسەرا گرت و هەندێکیش لە ئەکتەرەکان گیران و خرانە حەپس خانەوە.
- لە ساڵی (١٩٤٩)ز چیرۆکی (هـاملێت) پێشکەش کرا لەلایەن قوتابییانی سانـەوی رۆژەوە، ئەوەی دەوری سەرەکی بینیبـوو (هاملێت) (قادر دیلانی) هونـەرەوەر بوو، ئەم چیرۆکـە یەکێکـە لەچـیرۆکـە هەرە بەرزو بەناوبانگەکانی نوسەری ئینگلیز (شێکسبیر).
- لە ساڵی (١٩٥٢)ز چیرۆکی (کچ و بێوەژن) پێشکەش کرا کە لە نووسینی بەرێز (رەوف یەحیا) یەو ماموٚستا (ئەنوەر تووفی) دەری‌هێنابوو.
- لە ساڵی (١٩٥٢)ز چیرۆکی (بـوونـە خەلیفـە بەخەیاڵ) لەلایەن قوتابیانی سانەوی شەوەوە پێشکەش کرا.
- لە ساڵی (١٩٥٣)ز چیرۆکی (کۆڵۆلان - البؤساء) لە نووسینی چیرۆك نووسی بەنـاوبـانگی رووسی فیکتـۆر هۆگۆ و ئامادەکردنی (کامەران موکری) لەلایەن

قوتابیانی سانەوی شەوەوە پێشکەش کرا.

- لە ساڵی (١٩٥٤)ز چیرۆکی (جـەنابی موفەتیش) لەگەڵ چیرۆکی (بروسکەو شیرین) پێکـەوە لەسـەر شانـوی هۆڵی قوتـابخـانـەی سانـەوی ڕۆژ لەلایەن قوتابخانەی سانەوی شەوەوە پێشکەش کرا.

- لە ساڵی (١٩٥٥)ز چیرۆکی (عوتەیل ـ ئوتیلۆ) لە نووسینی چیرۆك نووسی بە ناوبانگی ئینگلیز (شیکسبیر)و گۆڕینی (نووری وەشتی) لە دەرهێنانی مامۆستا (ئەنوەر تووفی) لەلایەن قوتابیانی سانەوی شەوەوە پێشکەش کرا.

- لە ساڵی (١٩٥٦)ز چیرۆکی (دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە) لە مەهرەجانی سانـەوی لەگـەڵ چیرۆکی (عـەلە ورگـەی شوتیدز) لە ئامادەکردنی (نووری وەشتی) لەسەر شانۆی هاوینەی سانەوی کوڕان پێشکەش کراو لەم ئاهەنگەدا (حەسەن زیرەك) بە چەند گۆرانییەك بەشداریکردووە.

- لە ساڵی (١٩٥٧) چیرۆکی (پیسکەی تەرپییر) کە لە چیرۆکی البخیل ی مۆلێرەوە بە دەسکارییەوە وەرگێڕاوە لەلایەن (ڕەفیق چالاك)ەوە لەلایەن (کۆمەڵی هونەرە جوانەکان)ەوە لە دەرهێنانی (ڕەفیق چالاك) کە خۆی دەوری سەرەکی تیا ئەبینی پیشکەش کرا.

- لە ساڵی (١٩٥٩)ز چیرۆکی (شـەوی کۆتـایی) لەلایـەن تیپی (لاوان)ەوە پێشکەش کرا لە هۆڵی سانەوی کوڕان.

- لە ساڵی (١٩٦٠)ز چیرۆکی (تاوانێك لە ئاسمانا) ـ جریمة في السماء ـ لە نووسینی (تەها بابان) پێشکەش کرا.

- لە ساڵی (١٩٦٠)ز چیرۆکی (زێـڕین) لە نووسینی (ئـەمـین میرزا کەریم) پێشکەش کرا.

- لە ساڵی (١٩٦٠)ز دووبارە چیرۆکی (ئەمرئەکەی بەگم ـ تأمربیگ) لە نووسینی (یـوسف العـانی)و وەرگـێڕانی (ئـەمین میرزا کەریم) پێشکەش کرا، لە هۆڵی سانەوی سلەیمانی کوڕان.

له ڕۆژنامەی (ژین)ەوە ساڵی (١٩٥٧)ز

ژمارە (١٣٣٤) لاپەڕە (١)، (٨)

تەمسیل لە قوتابخانە سەرەتایییەکانی کچان و کوڕان لە مارتی ساڵی (١٩٥٧)ز بەم جۆرە بوو:

فەیسەلیەی کوڕان، ژیانی خێزانی لادێ - ٢٢،٢٣/٣/١٩٥٧ز

سەلاحەدینی کوڕان، دەس پاکی - ٢٢،٢٣/٣/١٩٥٧ز

کانێسکانی کوڕان، تا عەلە نەکەم وە ئەفەنی وازی لێ نایەرم - ٢٢،٢٣/٣/١٩٥٧ز

سەرشەقامی کوڕان، ئازاری ژیان - ٢٢،٢٣/٣/١٩٥٧ز

ئەم چیرۆك پێشکەش کردنانە ڕۆژێ بۆ ژنان و ڕۆژێ بۆ پیاوان بووە.

سدیقەی کچان، بوونە خەلیفە بە خەیاڵ - ٢٤،٢٥/٣/١٩٥٧ز

موختەلیتەی کچان، کچە پاشاو حەوت کورتە باڵا - ٢٤،٢٥/٣/١٩٥٧ز

تا جی کچان، کچە پاشاو حەوت کورتە باڵا - ٢٤،٢٥/٣/١٩٥٧ز

ڕەوزەی کچان، درۆزن هەر جارێ ناشتا ئەکا - ٢٤،٢٥/٣/١٩٥٧ز

مەڵکەنی کچان، شەونم و شای پەرییان - ٢٤،٢٥/٣/١٩٥٧ز

ئەمانەش ڕۆژێ بۆ ژنان و ڕۆژێ بۆ پیاوان بووە.

ئەیووبیەی کوڕان، منم پێش مەرگە - ٢٦،٢٧/٣/١٩٥٧ز

خالیدییەی کوڕان، دەس پاکی هۆی کامەرانییە - ٢٦،٢٧/٣/١٩٥٧ز

ئەمیر عەبدول ئیلاهی کوڕان، یارمەتی هەژار - ٢٦،٢٧/٣/١٩٥٧ز

ئەمانەش ڕۆژێ بۆ ژنان و ڕۆژێ بۆ پیاوان بووە.

زەهرای کچان، هێزی تاریکی - ٢٨،٢٩/٣/١٩٥٧ز

عیراقی‌یەی کچان، پیرەزینی هەزار - ١٨/١٦/١/١٦٥٧ز

مەلیکە عالیەی کچان، ئوپەریتی وەرزی ساڵ - ٢٨،٢٩/٣/١٩٥٧ز

گۆیژەی کچان. ڕاست گۆیی‌و خویندەواری - پەیژەی ڕزگاری - ٢٨،٢٩/٣/١٩٥٧ز

دووبارە ڕۆژێ بۆ ژنان و ڕۆژێ بۆ پیاوان بووە.

مەڵکەنی کوران، خۆم بە خۆمم کرد - ٣٠،٣١/٣/١٩٥٧ز

گۆیژەی کوران، مێشك لەناو قەفەزی تاوان باری‌یا - ٣٠،٣١/٣/١٩٥٧ز

غازی کوران، پەروەردەکردنی منال - لە سێ جێگا ٣٠،٣١/٣/١٩٥٧ز

ئەمانەش ڕۆژێ بۆ ژنان و ڕۆژێ بۆ پیاوان پێشکەش کراوە.

یەکەم چیرۆکی تەمسیلی لەلایەن قوتابیانی کچانەوە پێشکەش کرابێ، لە ساڵی (١٩٢٨)ز بوو، لە حەوشی قوتابخانەکەدا کە قوتابخانەکە ئەوسا بەرامبەر ماڵی شێـخ قادری حەفیید بوو تەنیشت مزگەوتی گەورە. ئەم چیرۆکە لە نوسیین و ئامادە کردن و دەرهێنانی (شێخ نووری شێخ ساڵح) بوو.

١ - بەیجەی محیّدینەفەنی لە دەوری (دایك)دا

٢ - مەسییلە لە دەوری دوکتورەدا

٣ - شەفیقــە سەعی لەگـەڵ (حـەپسـەخـانی) خیـزانی (جـەمیـل سائیب) سەرپەرشتی تەمسیلەکەیان کردوەو خەڵکی‌تریش بەشداری‌یان کردووە.

* * *

# (سینەما لە سلەیمانیا)

١ ـ سینەمای سەلاحەدین:

---

یەکەم سینەما کە لە سلەیمانیا کرایەوە، (سینەمای سەلاحەدین)بوو، وە لەشوێنی چایخانەکەی (حەمەرەقا بوو) کە ئیستا چیشتخانەی (حاجی فەتاحە) لەتەنیشت سینەمای (سیروان)ی ئیستاوە.

سینــەمای ئێستای سیروان و چایخانەکەی ئەوسای حەمەرەق بەزستان لە چایخانەکەداو بەهاوین لە شوینی سینەمای ئیستای سیروان ئیشی ئەکرد چونکە ئەوکاتە شوێنی سینەمای سیروان کەلاوە بوو.

(سینەمای سەلاحەدین) خاوەنەکەی (رەمزی قەزازو عومەر قەزاز بوون)، ئەم سینــەمــایە لە ساڵی (١٩٤٢)ز دانراو تا ساڵی (١٩٤٥)ز هەر لەم دوو شوێنەدا بوو.

یەکەم فیلم کە لەم سینەمایەدا ئیشیکرد فیلمی (گەڕانەوەی فرانك جێمس) بوو کە فیلمیکی ئەمەریکی بوو لە نواندنی (هەنری فوندا) جا لەبەرئەوەی کە یەك مەکینەی هەبوو سینەماکە ئەبوایە بۆ پشووی مەکینەکەو گۆڕینی بەکرەی

---

١ ـ دیارە نووسەر لە هەمووکەس زیاتر ئاگاداری مێژووی سینەما دامەزراندنە لە سلەیمانیا، بەڵام ئەم مێژووە هەر سینەمای جێگیرو دامەزراوی گرتۆتەوە، لەکاتێکا کە سینەما بەشێوەی کاتیی لەزۆر زووەوە جاروبار ئەهاتە شارەوە. لە کۆتایی ساڵی سییەکانا سینەمای بێدەنگ ماوەیە لە چایخانەکەی (ساڵحی وەستا بستە) ئیشی ئەکرد، هەروەك لە رۆژانی جەنگی دووەمی جیهانا سینەمای فیلمی جەنــگ* رۆژ،ناڕۆژێ لە دەشتێکی قەراخ شار یان لە شوێنێکی پانی ناوشارا لەلایەن دەسگای پروپاکاندەی ئینگلیزەکانەوە ئییش پێئەکرا . (ع.م.ر)

* * *

فیلمەکە لە ناوەڕاستی ئیش کردنا پشوویەك ببوایە، وە بۆئەوەی خەڵکی بێ‌تاقەت نەبن لەم بەینەدا (کەریم کابان) گورانی پیشکەش ئەکرد.

هەروەها ئەم فیلمانەش لەو سینەمایەدا پێشکەش کراون:

١ - ڕەفیق نەبا فیلمیکی ڕووسی‌بوو

٢ - فرزەندی وەتەن هیندی

٣ - جەنگڵ پرنیس فیلمێکی هیندی

٤ - لم و خوین فیلمیکی ئەمریکی بوو لە نواندنی (تیرون پارەوەرو ریتا هیوارس).

ئەوانەی لەم سینەمایەدا ئیشیان ئەکرد ئەمانە بوون:

١ - (حەمادە): پیاوێکی عەرەب بوو، مەکینەچی بوو، خەڵکی بەغا بوو.

٢ -(ساڵح قەزازو غەفوور قەزاز) دوو برا بوون خزمی ڕەمزی قەزازو عومەر قەزاز بوون.

٣ - (سیرۆپ)، ئەرمەنی بوو بلیتی ئەفرۆشت.

٤ - (خاچادۆر): ئەمیش هەر ئەرمەنی بوو بلییتی ئەفرۆشت.

لە ساڵی (١٩٤٦)ز ئەم سینەمایە گوێزرایەوە بۆ ماڵی (ڕەمزی قەزاز) تا ساڵی (١٩٤٩)ز لە سابوونکەران، ئەم سینەمایە هەرچەند لەوکاتەدا ناوی (سینەمای سەلاحەدین) بوو کەچی هەر بە سینەمای (ڕەمزی) بەناوبانگ تر بوو، ئەم سینەمایە هاوینە بوو.

ئەمەش ناوی هەندێ لەو فیلمانەیە کە لەم شوێنە نوێیە پێشکەش کراون:

١ - (لەیلا بینتول ئەعنیا) بوو لە نواندنی (ئەنور وەجدی‌و لەیلا موراد)

٢ - (خەنجەر والی)· فیلمێکی هیندی بوو

٣ - (چاپوك والی) فیلمیکی هیندی بوو

٤ - (عەنتەر والی) فیلمێکی هیندی بوو

٥ - (بەهادور) فیلمیکی هیندی بوو

٦ - (قیسمەت) فیلمێکی هیندی بوو

بەم جۆرە ئەم سینەمایە بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٤٩):

سینەمای گوێژە:

ئەم سینـەمـایـە لە ساڵی (١٩٤٩)ز کرایەوەو خاوەنەکانی (ئەسکەندەری ئەجزاچیو ئەمیناغای حاجی مەلا محێدین) بوون. شوێنەکەی لەجێی (بازاڕی زێـوەر)ی ئێستـا بوو بەرامبـەر بە قوتابخانەی گوێژەی کوڕان و موڵکەکە هی بەلەدیـە بوو، ئەم سینـەمـایـە سینەمایەکی هاوینە بوو. یەکەم فیلم کە لەم سینەمایەدا پیشان درا فیلمی (ئوغنیەت شەهرەزاد)بوو.

هەروەها هەندی فیلمی تریش کە ناوەکانیمان دەس کەوتوەو لەم سینەمایەدا پیشان دراون ئەمانە بوون.

١ ـ ستصبح الارض حمراء: فیلمێکی ئەڵمانی سیاسی بوو هەروایەکەم شەو دوو جار پیشان دراو دارو بەرد بەرنەنەکەوت و هەر هەمان شەو دوای ئەو دوو جار پشاندانە میری قەدەغەی کرد .

٢ ـ (عەلی باباو چل دز) لە نواندنی (تونی کیرتس) فلمیکی ئەمریکی بوو

٣ ـ (حەرام زادە) لە نواندنی (ئیڤون ساسۆن) فلمێکی ئیتالی بوو

٤ ـ (سەیبوونی ئەغەنی) لە نواندنی (سەباح) فلمیکی میسری بوو

٥ ـ (لەهالیبۆ) لە نواندنی (نەعییمە عاکیف) فلمێکی میسری بوو

٦ ـ (ئەمیر ئەرسەڵانی ڕومی) لە نواندنی (بانو دل کەش) فلمیکی فارسی بوو

٧ ـ (ژان دارك) لە نواندنی (ئەنکرید بێرکومان) فلمیکی ئەمریکی بوو

٨ ـ (مەشخەل و تییر) لە نواندنی (بیرت لانگستەر) فلمێکی ئەمریکی بوو

ئەوانەی لەم سینەمایەدا ئیشیان ئەکرد ئەمانە بوون:

١ ـ غەفوور ڕەشید داراغا ـ بەڕێوەبەری سینەما بوو.

٢ ـ ئەنترانیك ـ مەکینەچی.

٣ ـ ئەدوارد شەرام ـ یاریدەدەری مەکینەچی بوو.

٤ ـ سیرۆب ـ بلیت دڕین بوو لە بەردەرگای (٩٠) فلسی کە باشترین شوین بوو دوای (لۆجەکان).

٥ ـ درکە (دەریاویش) کوڕیکی گاوڕ بوو ـ لە بەرقاپی (٤٠) فلسی.

٦ ـ حەمە فەرەج: بلییت فرۆش بوو.
٧ ـ ئاڵتون (ئەنتوان) کوڕێکی گاور بوو ئەمیش بە هەموو جۆرە ئیشێ هەڵ ئەساو ناو هۆڵەکەی ئەبردبەڕێوەو کارەبا چاك کەر بوو.
٨ ـ عەبدوڵڵا کەریم ـ بلییت دڕێنی بەرقاپی (٧٠) فلسی بوو.
٩ ـ عوسمان کەریم ـ یاریدەدەری مەکیینەچی بوو.
١٠ ـ قادر هەورامی ـ مەکیینەچی کارەبا بوو.
١١ ـ کەریم هەورامی ـ حەرەس بوو بە شەوان.
ـ حانووتی ئەم سیینەمایە جەمال بەشییرو تۆما گرتبویان. ئەم سیینەمایە تا ساڵی (١٩٦٠)ی خایاندو دوای ئەمە بەلەدیە ڕووخاندیو کرا بەم بازاڕی (زێوەرە)ی ئێستا.
١٢ ـ خولە تەڕەزان ـ تەختەگێڕ.

تێبینی: ـ ئەم سینەمایە دوای ئەسکەندەری ئەجزاچیو ـ ئەمیناغای حاجی مەلا محی‌الدین تا داخرا کەوتە دەست کەریماغای خەیات و قادری حاجی حسەین و ئەحمەدی میرزا غەفوور.

## (سیینەمای ڕەشیید)

ئەم سیینەمایە لە ساڵی (١٩٤٨)ز دەس کرا بە دروستکردنیو لە ساڵی (١٩٥٠)ز تەواوبوووو دەسیکرد بە ئیش کردن. کاتی خۆی شوێنی ئەم سیینەمایە خەڵوزی تیا ئەفرۆشراو چوار دەورەکەی دووکانی کۆن بوون موڵکەکەی هی کوڕانی (ساڵحی ڕەشەیە).

ئەوانەی سیینەماکەیان گرتەدەس ئەمانە بوون:
١ ـ ئیبراهیم مەعرووف.
٢ ـ جەمیلی سەعی بەگ.
٣ ـ ئەحمەدی مستەفا بەگ.

٤ ـ عومەر فەزاز.

یەکەم فیلم کە لەم سینەمایەدا پیشان درا فیلمی (غەرام و ئینتقام)بو نواندنی (ئەسمەهان و یوسف وەهبی‌و ئەنوەر وە.ـی).

ئەوی ئەبێ لەبیرنەکرێ لەکاتی رۆژانی ئەم فیلمەدا (ئەورەحمانی لێفەدروو)ی تیا کوژرا.

لە ساڵی (١٩٥٦)ز ئەم سینەمایە کەوتە ە دەست خاوەن موڵکەکەی کە کورانی (ساڵحی رەشە)ن. ئەمانیش لەوک تەدا توانیان سینەماکە پەردەو مەکینەکەی بکەن بە (سکۆب)و یەکەم فیلم ە (سکۆب)و رەنگاورەنگ بوو لەم ساڵەدا پیشان درا کە فیلمی (سوارەکانی ەوری مێزی خر) بوو لە نواندنی (رۆبەرت تایلەرو ئاڤاگادنەر)، کاتی پێشکەش کردنی ئەم فیلمە رێکەوتی جەژنی قوربانی ئەو ساڵە بوو .

لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکان و سەرەتای ساڵانی شەستا دووفیلمی فارسی پیشان درا کە (سکۆب و رەنگاورەنگ) ـو، ئەو کاتەئەو جۆرە فیلمانە خەڵکی زۆریان پێ خۆش بوو، یەکەمیان (سوارەکانی کوردستان)و دوەمیشیان (حەسەن کەچەڵ) بەڵام فیلمی دووە رەش و سپی بوو، تەرجومەی کوردیان لەسەر چاپ کرابوون لەبێرووت لە لایەن رەفیق چالاکەوە کرابوون بەکوردی ئەوانەی لەم سینەمایەدا ئیشیان ک.وە ئەوکاتە ئەمانە بوون:

١ ـ عەلی ساڵح رەشە ٢ ـ عەزیز سالح رەشە ٣ ـ ئەکرەم ساڵح رەشە.

٤ ـ جەمیل سەعید بەگ. ئەمانە خاوەنی سینەماکە بوون و بەرێوەیان ئەبرد

هەروەها (عومەر عارف، عوسمان عارف و سەلاح حیکمەت کە مەکینەچی بوو، لەدواییشا عەلی حیکمەتی برای بوو بە مەکینەچی‌و عەلی فەوتاوو نامیق نووری‌و ئەحمەد رەشید فەتاح و فەرەجی عومەری ملۆزم و حەمەی عەلی گەنجۆو عەبە عیفریت و عەبدوڵڵا رەش یدو چەمال جەلال و حەمەعەلی عارف وە سادقیش تەختەگیر بوو)، ئەمانە هەر یەکەیان ئیشێکی سینەماکەی گرتبوە دەس.

لەپێشا (عەلی عارف) د ووتەکەی بەکرێ گرتبوو لەدواییا کەوتە دەس (حەمە ساڵح دیلان).

ئەم سینەمایە تائێستە لەکارایەو بەدەس خاوەنەکانی خۆیەوەیەتی.

تێبینی: - ئەوکاتە باو کە فلیمی تازە ئەکورا شەو فلیمە تازەکە نیشی ئەکرد. هەر سینـەمایەك تەختەگێرێکی هەبو ئەم تەختەگێرە وێنەی فلیمەکەی دائەکوتا بەو تەختەیەدا کە درووست کرابوو بەئەندازەی وێنەکە لە ناوەراستی تەختەکەشەوە دەسکێکی لە دار وەك کلکە خاکەناز پیا دائەکوترا بۆ ئەو تەختەگێرە دەستی پێوە ئەگرت و ئەیخستـە سەر شانی بەناو بازار، ئەگەراو هاواری ئەکرد لە فلان سینەما ئیش ئەکات. زۆر جار وێنەی فلیمەکە ئەکرا بە (کلێشە) لەگەڵ هەندێ پیروپاگەندە بۆ فلیمەکە ئەیان نارد بۆ چاپخانەو چاپ ئەکرا تەختەگێرەکە لەگەڵ ئەو تەختەیەی بەشانیەوە بو لەناو بازار بڵاویئەکردەوە زۆرجاریش لە رۆژنامەی ژیندا بڵاوئەکرایەوە. هەروەها باو بوو ئەو عەسرەی کە ئەو شەوە فلیمی تازە ئیشی ئەکرد ئەو تەختەگێرە. عەرەبانەیەکی بەکرێ ئەگرت لەتەنیشت عەرەبانچیەکەوە دائـەنیشت تەختـەکـەی ئەگـرت بەد ست و شانیەوە لەگەڵ دەهۆڵ و زوورنا سەعاتێك بەناو شارا ئەگەران مناڵانیش دوای ئەکەوتن بۆ خۆشیو دیعایە گرتنەوە تا ئەهاتنەوە بەر سینەماکە ئەوشەوە ـ لەسەربانی سینەماکە دەهۆڵ و زوورنا لێئەدرا، بەڵام لەپێشا لە بەردەم سە ەمای سەلاحەدین لە سابون کەران لەگەڵ دەهۆڵ و زوورناکەدا دەست ئەگیرا ئەبوو بە هەڵپەرکێ.

(سە ینەمای سیروان)

لە ساڵی (١٩٥٦)ز سیینـە مای سیروان هەر لەم شوێنـەی ئێستای خۆیا کرایەوە، بەڵام ئەوکاتە سیینەمایەکی هاوینە بوو، ئەمە دووەم سیینەما بوو کە بتوانێ فیلمی (سکۆب) پیشان بدا.

لە ساڵی (١٩٥٨)ز سیینەماکە کرا بە سیینەمایەکی زستانە.

ئەوەش لەیـادنـەکەین سیینەما هاوینەکەی یەکەم فیلم کە لێی پیشان درا فیلمی (سوارەکانی ئەرجەشین) بو لە نواندنی (رۆری کاڵهن و جێن بیتەرز).

بەڵام کە کرا بە زستانە یەکەم فیلم کە پیشان درا فیلمی (دوپشك) بوو لە نواندنی (روپەرت میتشام ، وە ئەو کەسانەی کە لەم سیینەمایەدا کاریان ئەکرد ئەمانە بوون:

ئەوانــەی سینـەمـاکـەیـان بەکرێگرتبوو (برایمی مەلا مارف و ئیسماعیل عەبدوڵڵاو ئەحمەدی مستەفابەگ) بوون کە خۆیان سەرپەرشتی بەڕیوەبردنیان ئەکـرد، هەروەها (سەلاح حیکمەت و عارف - کە پێیئەوترا - عارەو سدیق ئەبـووشـوارب و عومـەر ڕەشییدو حسەینی عەبەدەلاك و بەکری مام برایم وە خولەی مەلاژن ئەوکاتە تەختەگێری ئەم سینەمایە بووە، ئەحمەدی عەبە دەلاك حانووتەکەی بەکرێگرتبوو. ئەم سینەمایەش تائێستا لەکارایە.



## أ (مۆسیقا)

یەکەم تیپی مۆسیقا لە ساڵی (١٩٢٦)ز دامەزرا.

ئەوکاتە ئالەتی مۆسیقا بریتی بوو لە (١٦) شانزە پارچە کە بە پارەی ئەو چیرۆکە تەمسیلی‌یەی پێشکەش کرا لەلایەن قوتابیانی مەکتەبی یەکەمەوە لە ماڵی شێـخ باباعەلی کرا، ئەمەش ناوی ئەوکەسانەن کە بەشداری‌یان کردووە لەو تیپپەدا لەگەڵ ناوی ئالەتەکانا:ـ

| | |
|---|---|
| ١ ـ شاکیر فەتاح | کلارنێت |
| ٢ ـ ساڵح عەلی | ترامپێت |
| ٣ ـ جەمالی حەجی سەلیماغا | ترامپێت |
| ٤ ـ عەلی قەفتان | ترامپێت |
| ٥ ـ دکتۆر عەبدول ڕەحمان عەبدوڵڵا | ترامپێت |
| ٦ ـ فەهمی قەفتان | ترامپێت |
| ٧ ـ کەمالی ڕەشی‌یەفەنی سەعاتچی | ترامپێت |
| ٨ ـ توفیقە ڕەش | بوری |
| ٩ ـ حەجی ڕەشی بەکرەفەنی | هۆرن |
| ١٠ ـ جەلالی حەجی سەلیماغا | دەهۆڵ |
| ١١ ـ حسەینی میرزا ساڵح | ترامپێت |
| ١٢ ـ ئەحمەدی میرزا عارف | هۆرن |

| | |
|---|---|
| ١٣ ـ فوئاد سالح [illegible] | [illegible] |
| ١٤ ـ رەحیم عەبدول كەریم | كلارنیت |
| ١٥ ـ پەتروس ئەسكەندەر | ترامپێت |
| ١٦ ـ شەوكەت محەمەد | دەف |
| ١٧ ـ جەلال حەمدی | بلوێر |
| ١٨ ـ عەلی عارفاغا | دەف |

ئەمە لەكاتی ئیستیعرازو كەشافەو وەرزش و ئاهەنگی قوتابیانا بەكارنەهێنرا بەسەرپەرشتی مامۆستا عەبدول واحید نووریو مامۆستا فوئاد رەشید بەكر.

ئەمەش ناوی ئەو ئەندامانەن كە بەشداری‌یان كردووە لە دەورەی مۆسیقای ساڵی (١٩٤٧)ز:

١ ـ بەهجەت رەشید.

٢ ـ قادر دیلان.

٣ ـ روبێن ئوفیك.

٤ ـ شەماڵ سائیب.

٥ ـ شێخ رەزای شێخ محەمەدی گوڵانی.

٦ ـ سەركییس كیغام.

٧ ـ عەبدوەڵڵا جاف.

٨ ـ عەبدوڵڵا میدیا.

٩ ـ ئەحمەدی حەمەی لەیلێ.

١٠ ـ ئەحمەد زرنگ.

١١ ـ غەریب میرزا كەریم.

١٢ ـ جەمال فەتاح.

١٣ ـ مەحمودی حەمەی لەیلێ.

١٤ ـ نووری عەنبەر.

١٥ ـ عەلی ئیحسان.

١٦ ـ حەمە ساڵح.

١٧ ـ منالێکی ماموستا پەرترۆس.

١٨ ـ جەمال ئەحمەد.

١٩ ـ کەمال ئەحمەد.

٢٠ ـ جەمال عەبدوڵڵا.

٢١ ـ تۆفیق حەسەن دەولەت.

ئەمەش ناوی ئەو مامۆستایانەن کە لە بەغاوە هاتبوون ئەو دەورە موسیقی‌یەیان کردبووەوە دەرسیان تیا ئەوتەوە:

| | |
|---|---|
| ١ ـ حەنا بەتروس | دەرسی ئالەتە هەوایی‌یەکانی ئەوتەوە |
| ٢ ـ غانم حەداد | دەرسی کەمانجە |
| ٣ ـ جەمیل بەشیر | دەرسی کەمانجە |
| ٤ ـ سالم حسەین | دەرسی قانوون |
| ٥ ـ یەعقوب (یەعگوب) | دەرسی عوود |
| ٦ ـ حەقی | دەرسی نای |
| ٧ ـ شواع | دەرسی کەمانجە |
| ٨ ـ مونیر | دەرسی کلارنێت |

## (تیپی مۆسیقای مەولەوی)

● ئەم تیپە لە ساڵی ١٩٥٥ز لە شاری سلەیمانی دامەزرا کە پێك هاتبوو لە کۆمەڵێك هونەروەران و مۆسیقا شو ناسان و ئەوانەی بە دوای هونەری کوردی‌یا ئەکەران، ئەوانەش بریتی بوون لەم هونەروەرانە:

١ ـ هونەروەر قادر دیلان.

٢ ـ هونەروەر ولیەم یوحەنا.

٣ ـ هونەروەر نەجات عەبدد.

٤ ـ هونەرودر بەهجەت ڕەشید.
٥ ـ هونەرودر حاتەم سەعید.
٦ ـ هونەرودر ئومید مەدحەت موبارەك.
٧ ـ هونەرودر هادی عەنبەر.
٨ ـ هونەرودر سەردار ڕەمزی فەتاح.
٩ ـ هونەرودر حەمە فەرەج.
١٠ ـ هونەرودر ساجید ڕەفیق.
١١ ـ هونەرودر نووری بەدەوی.
١٢ ـ هونەرودر قادر کوردی.
١٣ ـ هونەرودر حازم حەداد.

ئەم کۆمـەڵە یەکەم تیپ بوون لە هەموو کوردستانا کە توانیان موسیقای کوردی بە شێوەیەکی ڕێك وپێك بیووژێننەوەو توانیان کە گەلێ ئاهەنگ لە هەموو ناوچەکانی کوردستانا بگێڕن و ڕەسەنی مۆسیقای کوردی بگەشێننەوەو بیخەنە بەرچاو، هەروەهـا گەلێ لە دەنـگ خوشـانی ولاتـەکـەمـان بەشـداری‌یـان لە ئاهەنگەکانی ئەم تیپەدا کردووە، وە لەوانەیَ کە لە دەنگ خۆشیا زۆر بەناوبانگ بوون ئەمانەن:
١ ـ هونەرودر کاك ڕەشید (ڕەشۆل عەبدوڵلا).
٢ ـ هونەرودر کاکەحەمەی بەکر.
٣ ـ هونەرودر شەماڵ سائیب.
٤ ـ هونەرودر حەسەن زیرەك.
٥ ـ هونەرودر باکووری.
٦ ـ هونەرودر سیوە.
٧ ـ هونەرودر تایەر تۆفیق.
٨ ـ هونەرودر ڕەسووڵ گەردی.
٩ ـ هونەرودر ئیبراهیم محەمەد.
١٠ ـ هونەرودر فوئاد ئەحمەد.

١١ ـ هونەرومەر قادر كابان.

١٢ ـ هونەرومەر عوسمان عەلی.

١٣ ـ هونەرومەر مامۆستای مەقام و گۆرانی عەلی مەردان.

١٤ ـ هونەرەومەر عوسمان سابوونچی.

١٥ ـ هونەرومەر حەمەی ماملێ.

١٦ ـ هونەرومەر عومەر رەزا.

١٧ ـ هونەرومەر قادری حاجی حسەین.

١٨ ـ هونەرومەر رەفیق چالاك.

١٩ ـ فەرەجی حاجی رەشی. وە گەڵێ لە دەنگ خۆشانیتر.

هەروەها ئەم تیپە توانیویەتی گەڵێ ئاهەنگی خۆش خۆش بگێرێ بەتایبەتی لە جەژنی نەورۆزاو گەڵێ ئاهەنگی تریان گێراوە لە قوتابخانەو باخچەی ساواکاناو زۆر جار ئاهەنگیان گیراوە بۆ یارمەتی هەژاران. بۆنمونە، دوای لافاوەکەی شاری سلەیمانی کە لە ساڵی (١٩٥٧)ز رویدا، هەستان بە گیرانی ئاهەنگێکی گەورە کە لە شاری (هەولێر)و کۆیەدا بۆ چەندرۆژێ گیرایان و پارەیەکی باشیان کۆکردەوە بۆ لێقەوماوانی لافاوەکە. هەروەها ئەم تیپە توانیویەتی ئاهەنگی گەورەو جوان بگێرێ لە هەموو ناوچەکانی کوردستانا.. وەك هەولێرو کۆیەو دوکان و دەربەندیخان و چوارتاو هەڵەبجەو تەوێڵەو بیارەو گەڵێ جێگایتر. هەروەها توانیویانە گەڵێك ئاهەنگ سازبکەن لە بەغاو گەڵێ گورانیو مۆسیقایان لە ئیستگەی رادیۆ تۆمار کردوەو توانیویانە کە گۆرانیو مۆسیقای رەسەنی کوردی بە گوێی خەڵکی دەرەوەی کوردستان ئاشنا بکەن. جگە لەمەش ئەم تیپە گەڵێ جار دەورەی کردوتەوە لەسلەیمانیا بو فیرکردنی قوتابیان و ئەوانەی حەز لە گۆرانیو مۆسیقا ئەکەن بەشێوەیەکی عیلمی راست.

(کۆمەڵی هونەرە جوانەکان لە سلەیمانی)

هەڵبژاردنی کۆمیتەکان و دەستەی بەڕێوەبردنی ئەم کومەڵە لە ڕۆژی ٥/٧/١٩٥٧ز بوو، ئەویش بەم جورە بوو:

١ ـ کومیتەی نواندن (شانۆ):

أ ـ ڕەفیق چالاك.

ب ـ نووری وەشتی.

جـ ـ ڕەوف یەحیا.

د ـ تەها خەلیل.

هـ ـ نامیق محیَدین.

٢ ـ کومییتەی مۆسیقاو گۆرانی:

أ ـ قادر دیلان.

ب ـ ولیەم یوحەننا.

جـ ـ بەهجەت ڕشیید.

د ـ نەجات عەبدە.

هـ ـ حاتەم سەعیید.

و ـ هادی عەنبەر.

٣ ـ کومییتەی نیگار وهەڵکۆڵیین:

ا ـ جەمال بەختیار.

ب ـ خالید سەعید.

جـ ـ ئازاد شەوقی.

د ـ شێخ مستەفای شێخ ئەحمەدی بەرزنجی.

هـ ـ سەی موحسین سەیسەمیین.

٤ ـ کۆمییتەی ئەدەب:

أ ـ حەمە ساڵح دیلان.
ب ـ مستەفا ساڵح کەریم.

دەستەی بەڕێوەبەریش بریتی بوون لەمانە:

١ ـ ڕەفیق چالاك ـ سەرۆك.
٢ ـ ڕەوف یەحیا ـ سکرتێر.
٣ ـ بەهجەت ڕەشیید ـ ئەمینی سنووق.
٤ ـ نامیق محیّدین ـ موحاسیب.
٥ ـ جەمال بەختیار ـ ئەندام.
٦ ـ خالید سەعی ـ ئەندام.
٧ ـ نووری وەشتی ـ ئەندام.
٨ ـ ولیەم یوحەنا ـ جێگر.

هەروەها تیپی مۆسیقای مەولەوی بوون بە بەشێلەم کۆمەڵەو شوێنەکەیان لە جێگای باخچەی ساوایان بوو کە بەرامبەری مزگەوتی گەورەیە.

(هەندێ لە هونەروەرانی بەناوبانگ)

ئەو زەمانە باوبوو لە کوردستان بەگشتی وە لە سلێمانی بەتایبەتی زۆربەی خەڵك سەبیلیان ئەکێشا چونکە ئەوسا پاکەت و دارجگەرەی بێگانە نەبوو، توتنی خۆماڵی هەبوو چەند هونەرمەندێ هەبوون لە سلێمانی وەستا بوون لە دروست کردنی سەبیل لە دار، بۆ جوانی چۆلەکەو باڵندەیان لەسەر سەبیلەکە دروست ئەکرد. هەندێ لەو هونەرمەندانە ئەم وەستایانەی خوارەوەن:ـ

١ ـ دەروێش ئەحمەدی سەبیل: سەبیلی بە قالْب و تێرۆك دروست ئەکرد لە ماڵی خۆیدا لە گەڕەکی چوارباخ یەکەم وەستای سەبیل بوە لە زەمانی عوسمانیدا.

٢ ـ وەستا حسەینی سەبیل: ئەم وەستایە بێجگە لە سەبیل شەکرشکێن و ـ قەڵەم بڕیشی دروست ئەکرد. دووکانەکەی لە ناو بازاڕ تەنیشت وەستا حەمەی لەیلێی شیرگەردا بوو.

٣ ـ ڕەحیمی سەبیل: لە قورەسوور سەبیل و باڵندەو شمشاڵ و فیکەی دروست ئەکرد. دووکانەکەی لە سابون کەران حوار چوحمەکە ئەشوێنی سمایلی سەبیل دا بوو پێش ئەوەی ئەم بێتە ناوی.

٤ ـ سمایلی سەبیل: ئەمیش لە قورەسوور سەبیل و باڵندەو شمشاڵ و فیکەی دروست ئەکرد. دووکانەکەی لەپێشا لەخوار پیرمەسوور بەرامبەر ماڵی ئوسوواغا بوو دوایی گواستیەوە شوێنی ڕەحیمی سەبیل لە سابون کەران.

٥ ـ عەبەپوشێ: لە تەلی ئەستوور قەمەرەو لۆری درووست ئەکرد بە گەورەیی ئەوەندەی منال تیادائەنیشت زۆر ڕێك وپێك و جوان دەسکیشی هەبوو بەلای ڕاست و چەپا ئەسوورایەوە لە ماڵی خۆیدا لەپشتی مزگەوتی شێخەلی خوار ماڵی توفیق قەزاز.

٦ ـ هونەرەوەر بەرێز ـ حەسەن فەلاح ـ وێنەکێش.

٧ ـ هونەرەوەر بەرێز شێخ مستەفا بەرزنجی ـ وینەکیش و پەیکەرتاش و مۆمیاگەر.

٨ ـ هونەرەوەر بەرێز خالید سەعی ـ وینەکیش.

٩ ـ هونەرەوەر بەرێز جەمال بەختیار ـ وێنەکێش و خۆش نووس.

١٠ ـ هونەرەوەر بەرێز عەبدوڵڵا سالار وێنەکێش و خۆش نووس.

١١ ـ هونەرەوەر بەرێز سەی موحسین خوش نووس.

١٢ ـ هونەرەوەر بەرێز حەمە فەرەج خۆش نووس.

١٣ ـ هونەرەوەر بەرێز فەتاح مام کەریم وێنەکێش.

١٤ ـ هونەرەوەر بەرێز حەمەئەمین سۆفی هەموو جۆرە گوڵێکی درووست ئەکرد بە کاغەزی ڕەنگاورەنگ (کریپ پیپەر) ئەگەر لەباخا لەتەنیشت گوڵی سروشتی‌یەوە دات بنایە بەئاسان نەئەتوانرا جیابکرێتەوە لە دوورەوە.

(فۆلکلۆری سازو گۆرانی)

ئەمە دوو بەشە:

١ ـ ئامێرەکانی ساز.

٢ ـ ئاوازەكان.

١ ـ ئامێرەكانی ساز ئەمانەن:

**[شمشاڵ] یا لوولك. ئەمە لە قامیش، زەردە، داری بەلاڵوك، فافون دروست ئەكری،** ئەمانەش بە فوو پیاكردن لێئەدرین بێئەوەی فیكەی هەبی.

(تووتەك): ئەمە وەك شمشماڵ وایە بەلاّم فیكەی هەیە، پێی ئەوترێ بوێرە كەتە. لە داری هیندستان وەیا لە قامیشی سورقاوشان دروست ئەكری.

(زوورنـا): لە دار دروست ئەكـرێ، سەرێكی پانی وەك رەحەتی هەیە. خۆی فیقەنەی هەیە بۆ دەنگ دەرهێنان پێشی ئەوترێ (پیكە) لەگەڵ ئەمەشا هەندێكیان دوو پییكەی هەیە.

(باڵەبان): ئامێرێكی سازە، شێوەی دروست كردنی: دارێكی ناو بۆشی كون كونە كە وەكـو شمشمـاڵە لە ناوەراستی خوارویـا قامیشێكی كورتی پێـوەیـە بە سەرەكەیتری قامیشەكەوە هەمانەیەك چەسپ كراوە، تا هەمانەكە پر ئەبێ فووی پیـا ئەكـرێ، كە پربوو ئینجا هەوای ناو هەمانەكە بەناو دارە كوناوییەكەدا ئەروات، ساز ژەنـەكـەش بەپـەنجـە بە گرتنـو بەردانی كونی باڵەبانەكە ئاواز دەریـەنێ، وە بونەوەی بای هەمانەكە دەرنەچیت رێگریك (سەممام) لە كونی قامیشی فوتێكردنەكەوە چەسپ كراوە.

(تەپڵ): بنەكەی لە زەرد یا لە مس دروست ئەكرێو پێستی خاو بەدەمەكەیدا ئەگیرێو بە دوو قامیش لێئەدرێ، چەشنێكیتری هەیە بریتییە لە دوو تەپڵی بچووك كە بەیەكەوەن پێیئەوترێ تەپڵی سواری.

(دوردگ): ئەمیش جۆرە تەپڵێكە.

(دەهـۆڵ): كەمـەیـەكی قووڵی دارینـە، پێستی خاو گیراوە بە هەردوو روویا، دیوێكی بە كوڵە گۆچان، دیوەكەیتری بە شوڵێكی باریكی تایبەتی لێئەدرێ.

(كەرەنا): لە دارێكی یەك پارچە دررووست ئەكری، دەنگەكەی گرە بو ئاگاداری جەنـگ بەكـارئـەهێنـرێ. ئێستاش بۆری جەنگی سووپایی كە لە زەردو مس دررووست ئەكری هەر لەسەر ئەو شیوەیە دانراوە.

٢ ـ ئاوازەكان:

ئاوازە كوردییەكان دوو جورن، ترازوودارو بێترازوو،

١ ـ ترازوودار: ئەمیش سێ چەشنە:

ا ـ بەستە: ئەمییش خاوی هەیەو کورجی هەیە.

خاو: وەکو

ئەرێ هۆ لەیلی      باوانم لەیلی
کوشتەی خاڵی تۆم      بۆ وا بێمەیلی

---

خاوەر خاوەر خاوەر      شەکری لەپاڵ سەماوەر

---

نازدارەی نازەنیینێ      قەدباریکەی لیمۆ رەنگ
یارەکەم هەر تۆی      دڵەکەت نەبێ تەنگ

---

چاورەشە کاڵی بەکاڵت قەسەم
بە جووتێ لیمۆی بن باڵت بەستەم

---

هەی بەلارو بەلارو بەلارەوە      تو سەری باوکت وەرە ماڵەوە.

گورج: وەکوو:

ئای شیرینێ خانم      کچەکە تۆی باوانم
گەر کابرا لێیداوی      من ماڵی وێرانم

---

خر بیژەنە ژیناگە      وەك کاڵە کۆن گەیناگە.

ب ـ هەڵپەرکێ: ئەو ئاوازانەن کە لە زەماوەندا لەسەری هەڵ ئەپەڕن لەسەر بنچیینەی (دوردك) ـ تیمپۆ ـ دانراوە وەك (گوڵ شێنی، کەمەرە لەرزێن، رۆینە، شێخانی، هەڵپەڕینی گەورە).

جـ ـ ئاوازی بێدەنگ: ئەو ئاوازانەی کە بە ساز لێنەدرین.

وەکو: سەحەری، چەمەری، یاریایە.

٢ ـ بێتەرازوو: ئەو ئاوازانەن کە هەموو مەقامەکان ئەکرنەوە، ئەمیش دوو بەشە:ـ

أ ـ پەیـژە گەورە: (پلە گەورە) وەکو مەقامی (ئەڵڵاوەیسیو ئەڵوەن و سەهەرو
ـەیاحنی و چوارگاو پینج گا).
ب ـ پەیـژە پچـووك: وەکـوو (قـەتارو لاوك و حەیران و ئایئایو خورشیدیو
هیجرانیو سیاچەمانەو نیوەشەویو عەبدالیو خەلیلوی مەترانوو بەیاتی کوردو
قەتاری سنە (دەشتی).

سەرچاوە:
١ ـ لە کتێبی (سـەرنجێـك لە دەروازەی فۆڵکلۆری کوردەوە) بڵاوکـراوەکانی
نەقابەی مامۆستایان ساڵی ١٩٦٠.
٢ ـ لە نوسینەوەی ئاوازەکانا هونەروەر (قادر دیلان )

❊ ❊ ❊



● شانۆگەریی لەڕێی نیشتماندا ـ ساڵی ١٩٤٦



● هونەرمەندی خۆشنووس سەید مۆحسین
١٩٢١ - ١٩٧٧



● حەممومین سۆفی، گوڵ درووست کەر بە
کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ



● دەورەی فێربوونی مۆسیقا - ١٩٤٧



● هونەرمەند ڕەفیق چالاك ١٩٢٥ - ١٩٧٣



● سمایلی سەبیل درووست کەری باڵندە لە قوڕەسوور



● قوتابیانی سانەویی شەو ساڵی ١٩٥٤ لە دوای پێشکەش کردنی شانۆگەریی جەنابی موفەتیش و بروسکەو شیرین

## ا پرۆژەی ئاوو ئەلەکتریك

لە گۆڤاری بڵاوکراوەی شارەوانیی (سلێمانی) ژمارە (٢) ساڵی ١٩٦٨ لاپەرە (١١) دا نوسراوە:

«لە ساڵی ١٩٣٠ لە گەرەکی گۆیژە لە شوێنێکا کە پێیان ئەوت (باخی پورە بەگی) بۆ یەکەمجار لەلایەن لیژنەی ئاوو کارەبا مەکینەی کارەبا دامەزرا. ئەم پرۆژەیەش لە سەرەتاوە بچووك بوو بریتیبوو لە دوو مەکینەی کارەبا کە هەریەکەیان هێزی ٢٥ کیلۆوات بوو وە لە جۆری (دی، سی) بوو تەنانەت کۆڵەکەی گلۆپی شەقامەکانی ناو شار لە دار بوو وە بەمە زوربەی شاری سلیمانی رووناك کردبوەوە چونکە ئەوسا شارەکە بچووك بوو وە بەم شیوەیە فراوان نەبووبوو..

### پرۆژی ئاو

پرۆژەی ئاو هەر لەگەڵ پرۆژەی کارەبادا بریاری لەسەر دراوە وە هەر لەو ساڵەدا واتە ساڵی ١٩٣٠ دامەزرا، بەڵام بەشێوەیەکی بچووك و سەرەتایی لە ساڵی ١٩٣٤دا نەختێ زیاتر پەرەیسەند وە گەرەکەکان توانیان بەتەواوی سوودی لێ وەربگرن چونکە لەوەوپێش ئەو ماڵانە ئاویان لە کارێزەکانەوە بۆ ئەهات ئەویش بەهۆی گونجەوە رائەکێشرا بۆ ناوماڵەکەو حەوزی بۆ ئەکرا وە ئاوکێش بە پارە ئەیان برد بۆ ماڵەکانی گەرەك، وە ئاوکێشانەیان وەرئەگرت، ئەمانە هەمووی ئافرەت بوون، هەروەها خاوەنی کاریزە سەرەکییەکە کە ئاوەکەی رائەکێشرا بۆ ئەم حەوزانە پارەی لە خاوەنی حەوزەکە وەرئەگرت لەنێوانی ٣ روپیە هەتاکو ٥ روپیە، ئەمەش پێیان ئەوت حەوزانە. ئەم ئاوکێشانە بەردەوام بوو هەتا ساڵانی ١٩٥٠ وە دوای ئەوە وردە وردە کەمی کرد هەتاکو نەما.



# ناوی شەقامەکانی شاری سلێمانی

١ ـ شەقامی مەولەوی: لە بەردوکانی حسێن حاجی وەلی‌تا بەرماڵی موتەسەریف چوارباخ.

٢ ـ شەقـامی سابونکەران: لە بەر دوکانی جەرجیس تا ماڵی ڕەشیدی کەریم هەیەر، گۆیژە.

٣ ـ شەقامی سەیوان: لە بەردەمی گەراجی سەرقەبرانەوە تا ماڵی فەقێ ڕەشید قەشان /چوارباخ.

٤ ـ شەقامی ئەمین زەکی: لە خەستەخانەی سەرشەقام تا ماڵی صدیق عەباس/ کانیسکان.

٥ ـ شەقامی سەربەستی: لە باخچەیٰ گشتی تا بەنزینخانە/ کانێسکان.

٦ ـ شەقامی سەلاحەدین: لە حامیە تا ماڵی شێخ ڕەئوفی حەفید/ کانێسکان.

٧ ـ شەقامی کاك ئەحمەدی شێخ: لە مزگەوتی گەورە تا ماڵی زێوەر ئەفەندی/ کانێسکان.

٨ ـ شەقامی پیرەسوور: لە سەراوە تا ماڵی عەبدوڵای ساڵح قیروان/ مەڵکەندی.

٩ ـ شەقامی کاوە: لە سجنەوە تا ماڵی تۆفیق ئەفەندی.

١٠ ـ شەقامی مەڵکەندی: لە ماڵی حاجی ئەمین تا ماڵی قازی شێخ محەمەدی خاڵ.

١١ ـ شەقامی بابان: لە ماڵی عومەربەگی ساحێبقران تا سەرکارێز.

١٢ ـ شەقامی پیرەمێرد: لە ماڵی ڕەشید حەمەئەمین تا پشتی سەدەکە.

١٣ ـ شەقامی نالی: لە ماڵی بارام تا گەراجی ئەسحابەسپی.

١٤ ـ شەقامی سەرشەقام: لە بەر مەخفەری سەرشەقام تا کارێزەکەی سەرشەقام.

١٥ ـ شەقامی بێکەس: لە ماڵی تۆفیق ئەفەندی تا ڕێگای قەرەداخ/ جادەی تازە.

١٦ ـ شەقامی زێوەر: لە مودیریەی ئینحیـــرەوە تا مزگەوتی عەبدوڵلا لوتفی.

١٧ ـ شەقامی کانێسکان: لە ماڵی حەسەن ڕەفعەت تا ماڵی فوئاد مەستی.

١٨ ـ شەقامی جەمهوری: لە خانوەکانی عەقاری تا مەتاری کۆن.

تێ بینی:

ـــــــ: ـ ئەدوای شۆڕشی چواردەی تەموز شەقامەکان ئەم ناوانەیاین لێنرا.

سەرچاوە:

ڕۆژنامەی ژین ژمارە ١٤١٧ ساڵی (٣٣) ١٣/١١/٩٥٨

* * *

# چاوەشەکانی شارەوانی

ئەم چاوەشانە سەر بە شارەوانی بوون وە پاك و تەمیزی ناوبازارو گەرەکانیان پێسپێررا بوو، وە هەر چاوەشێك چەند کرێکارێکی لەگەڵ دا بوو بۆ گسك دان و پاك کردنەوە. وە هەر ماڵە تەنەکەیەك خۆڵی لە بەر دەرگا دانابوو، وە ئەم کرێکارانە هەر تاقمە چەند گوێ درێژێکیان پێبوو بۆ گواستنەوەی خۆڵ وە ئەیانبرد بۆ قەراغ شار وە فرێیان ئەدا وە جارو بار چاوەشەکان ئەیان سوتاند، ئەم چاوەشانە هەموو جلی تایبەتی‌یان لەبەردا بوو چاکەت و پانتوڵ و سدارە، وە نیشانەی بەلەدی‌یە لە شێوەی ئەستێرەدا ئەیانکرد بە سنگیانەوە، لەو چاوەشانە:

١ ـ مەجولی خامە سنەیی.
٢ ـ عەبەی فاتەی خولە درێژ برای (عیزەت تۆپچی).
٣ ـ حەمەی پوتی.
٤ ـ حەمە ئەمین باوکی عەلی شێر.
٥ ـ عارف خومەیس.
٦ ـ رەشەی عاسەی جومعە.
٧ ـ عارف هەلو.
٨ ـ حەمەوبەگ (میران).
٩ ـ خەلیل حسین (کەسوك).
١٠ ـ مەحموودی عەبدوڵڵا ئەفەندی.
١١ ـ عیزەتی ئەمینی ئاشچی.
١٢ ـ سەعەی ئامە درێژ.

١٣ ـ عەلی ئاغای ڕەشید ئاغا.

١٤ ـ کەریم بەگ.

١٥ ـ **عەمور بەگ**.

١٦ ـ خلەی عاسە.

١٧ ـ کاکی ئاغا.

١٨ ـ کەریمەڕەش.

١٩ ـ حەمەی حاجی‌قادر.

٢٠ ـ عەبەسوور.

٢١ ـ ئەحەی شیخ سەمەد.

٢٢ ـ عومەر سەعید.

٢٣ ـ ئەحەی عارف هەلو

٢٤ ـ سابیری فەقێ کەریم.

٢٥ ـ ئەحەی مەلا توفیق.

٢٦ ـ عوسمان شێخ عەلی.

٢٧ ـ مەحوودی ڕەشەی خلەی بلە.

تێبینی:

ـــــــ: لە سلێمـانی بە موراقیبی شارەوانی دەوتـرا چاوەش، بەڵام لە هەنـدێ شوێنیتر وەك هەولێرو کەرکوك کەششافیان پێ‌دەوت.

# پۆلیسی پیادەو سوارە

پۆلیسی پیادە زەمانی ئینگلیز ساڵی ١٩٢٠ قەیدکران مانگی بە ٢٠ ڕوپیە واتە ٥٠٠ر١ دینارو نیوێ بۆ ئاسایشی ناوشار.

پۆلیسی سوارە زەمانی ئینگلیز ساڵی ١٩٢١ قەیداکران مانگی بە ٤٠ ڕوپیە = ٠٠٠ر٣ سێ دینـار بەڵام پۆلیسی سوارە ئەوەی توانـای ئەوەی هەبوبێ کە ئەسپی خۆی هەبێ ١٠ ڕوپیەی مەسرەفی ئەسپەکەشیان ئەدایە، بەڵام ئەوەی توانـای ئەسپ کڕینی نەبـوو ئەسپـەکەی لە میری وەرئەگرت، ئەوەی مەعاشی ئەسپەکەی نەبو پێیان ئەوتن (ئەسکەندرون)، پۆلیسی سوارە بۆیە مەعاشەکەی زۆرتر بوو چونکە ئەچون بۆ ناوچەکانی دەوروپشتی شار ئەرك و شـەرەشـەقیان زیاتر بوو لە پۆلیسی پیادە کە لەناو شارو ماڵ و مناڵی خۆیدا بوون، ئەم پۆلیسی سوارانـە لە ناوچـەکـانی دەرەوە مەخفەریان بو کردبونەوە، لە دژی پیاوکوژو خراپ و دزو درۆزن کوڕی ئازا نەبوایە نەیئەتوانی ببێ بە پۆلیسی سوارە.

میری هەر لە ناوچەی یەکێکی ئەکرد بە ئامیر مەخفەر بەڵام حوکمی حاکمێکی نەکردو کونی کونداری دەرئەهێنا، پیاو خراپیان ئەهێنا لەدەرەوە ئەواتەی میری داوای کردبون یان لەدەست میری ڕایان کردبو بە پاشکۆی ئەسپەکانیانەوە بە مشکیو پشتێنـەکەی خۆیانەوە ئەیان بەستنەوەو وەکو فلیمی (کاوبۆی) بەرەو شار ئەیان هێنان، بەڵام زۆرجار کوڕی ئازایان لێ هەڵئەکەوتن دەرەقەتیان نەئەهاتن.

تێبینی: ـ کاتی خۆی کە پۆلیسیان قەید ئەکرد ئەبوایە خەڵکی شارو بنەماڵە بوایە. پاش ئەرزوحاڵ و مۆری موختار ئەبوایە هەیئەتی ئیختیاری محەلە بریاری لەسەر ئەم شەخسە بدایە کە ئینسانێکی پاکە، پاش ئەوەی یەکێکی دەوڵەمەند کە جێی باوەڕ بیت ئەبو بە کەفیلی پانزە دینار. لە سییەکاندا بو بە ٣٥ دینار، دوای ئەوە ئەنـدامانی بەلەدیەو سەرۆکی شارەوانیش بڕیاریان لەسەر بدایەو ئەیاننارد بو مودیری پولیس ئەویش ناودکانی ئەنارد بو موتەسەریف بو ئیمز ئەمجا وەرئەگیرا.

زۆری خەڵکی ئەو سەردەمە ئەگێڕنەوە وا باو بوە ئەوانەی کە بون بە پۆلیس لەبـەرئـەوەی بوون بە مەعـاش خۆر داوای کچێکیان بکردایە زوو ئەیاندانێ. خەڵکی پێیان ئەوتن ڕێوی هاتووە بەرەو پیریەوەو کچی جوانیان ئەبوو بە نسیب.

سەرچاوە : ـ

١ ـ لە سجلی شارەوانی کۆنەوە.

٢ ـ حەمەی مەلای دەنگ گەورەکە کاتی خۆی پۆلیسی سوارە بووە. ساڵی ١٩٠٠ لەدایك بووە.

٣ ـ قادری مەلا عەلی حاجی گورون کاتی خۆی پۆلیسی سوارەبووە ساڵی ١٩٠٢ لەدایك بووە.

# ناوی هەندێ لەو پۆلیسانە

١ ـ حەمە ئەمین بانی شاری ، دوو خەت، خولەپیزە کوشتی لە ساڵی ١٩٤٧دا. خولە لەسەرنەوە یاخی بوو.

٢ ـ باباشێخ قەرەداغی، سێخەت و تاج.

٣ ـ حسین ئەسعەد، سێخەت و تاج.

٤ ـ حامید ئەسعەد، سێخەت و تاج.

٥ ـ عەبدوڵڵا مارف، سێخەت و تاج.

٦ ـ حەمەسوری مەلا موحەمەدی دەنگ گەورە: سێ خەت و تاج.

٧ ـ حەمەبچکۆلی مەلا موحەممەدی دەنگ گەورە: سێ خەت و تاج، «ئەم دوانە برا بوون».

٨ ـ موحەمەد جەبار: سێ خەت و تاج.

٩ ـ ڕەزا کویی: سێ خەت و تاج.

١٠ ـ کەریم کۆیی ، برای بوو: سێ خەت و تاج.

١١ ـ حەمە تەورویزی: سێ خەت و تاج.

١٢ ـ نادر کۆیی: سێ خەت و تاج.

١٣ ـ میرزا حەبیب: سێ خەت و تاج.

١٤ ـ عەلی مارف چوارتایی: سێ خەت و تاج.

١٥ ـ سەید ڕەشیدی جەباری: سێ خەت.

١٦ ـ قالە کوردە: سێ خەت.

١٧ ـ ئەحمەد ڕوستەم: سێ خەت.

١٨ ـ شێخ قادری موحەمەد: سێ خەت.

١٩ ـ فەرەج چاوشین: سێ خەت.

٢٠ ـ عارف ئەمین: سێ خەت.

٢١ ـ حەمە عەلی کانیهەمزەیی: دوو خەت.

٢٢ ـ عیزەت وەلی: دوو خەت.

٢٣ ـ شێخ سالح قزلەری: دوو خەت.

**٢٤ ـ شیخ محەمەدی مستەفا دوو خەت**

٢٥ ـ مەجیدی قالەی شاسوار: دوو خەت.

٢٦ ـ عەبەی قالەی شاسوار: دوو خەت.

٢٧ ـ غەریبی مامەخەلانی: یەك خەت.

٢٨ ـ عەبەی شەمام: یەك خەت.

٢٩ ـ حەمەی رەشیدی یالانقۆزی: یەك خەت.

٣٠ ـ عەبە نازی: یەك خەت.

٣١ ـ خولە پێنجوێنی: یەك خەت.

٣٢ ـ عەلی کانیدرکەیی: یەك خەت.

سەرچاوە:

١ ـ هەندێ سجلی کۆن.

٢ ـ بۆلیسی سوارە عەبەی قالەی شاسوار.

تێبینی: هەندی پۆلیسی سوارەش هەبوون لە ناوشار سەر بە کومرك بوون ب رۆژو بە شەو ئەچوون بۆ دەورییە بۆ دەوروپشتی شار، بۆ دۆزینەوەی قاچاخ چیەکان ئەگەران مەڵبەندی ئەم پۆلیسە سوارانە لە ناوشار پێیان ئەووت (تاوڵەی سواری) شوێنی خۆیان و ئەسپەکانیان بوو.

شوێنەکەیان پشتی ماڵی موتەسەریفی جاران شوێنی بەریدەکەو مزگەوتی مەولەوی بوو.

* * *

## ناوی نۆبەچییەکان (مرور)

١ ـ ئیبراهیم دەروێش سێ خەت

٢ ـ مەحموود عێراقی سێ خەت

٣ ـ تۆفیقی حەسەنە قووچ دوو خەت

٤ ـ شێخ ئەحمەد عومەر یەك خەت

٥ ـ حەمە فەرەج سێ خەت

٦ ـ شێخ ئەحمەدی خاڵە شێخ یەك خەت

٧ ـ عەفووری قالە شەوقە دوو خەت

٨ ـ حەسەن ساقی سێ خەت

٩ ـ حەمە كەورە یەك حەت

١٠ ـ حەمە كاكە یەك خەت

١١ ـ مچە بەردەرزەردی بی حەت

١٢ ـ ئەحمەدی ئەمین مێتو یەك خەت

١٣ ـ ئەمینی ساڵح نەریمان دوو خەت

١٤ ـ كەریم رەحیم (كەریمە سوور) یەك خەت

١٥ ـ قادر حەمە ئەمین دوو خەت

١٦ ـ عەریب ئیسماعیل یەك خەت

١٧ ـ شێخ غەریب یەك خەت

١٨ ـ بلەی نەولێ یەك خەت

١٩ ـ تۆفیقی حەمەی مەلا سێ خەت و تاج

سەرچاوە:

١ ـ شێخ ئەحمەدی خاڵە شێخ

٢ ـ توفیقی حەمەی مەلا

تێبینی

ـــــــ: بۆ یەكـەم جار لە ساڵی ١٩٣٩ز شارەوانی دوو چەتـری نۆبـەچی دروست كرد یەكێ لە بەردەركی سەرا ئەوی‌تـریان لە بەر ئەسحابە سپی بۆ شوێنی وەستـانی نۆبـەچی (مرور) وە هەر لەو ساڵەدا ئەو دوو نۆبەچی‌یەی لەسەرەوە نووسراون بوی دانران.

* * *

ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی بەپێی گەڕەکەکانی، لە سجلی سەرژمێری دانیشتوان ساڵی ١٩٤٧ وەرگیراوە:

| ناوی گەڕەکەکان | جۆر | ژمارەی دانیشتوان |
| --- | --- | --- |
| مەڵکەندی | نێرینە | ٣٤٩٩ |
| | مێیینە | ٣٤٠١ |
| گۆیژە | نێرینە | ٣٣٣٩ |
| | مێیینە | ٣٦٦٨ |
| چوارباخ | نێرینە | ١٩١٨ |
| | مێیینە | ١٩٨١ |
| دەرگەزێن | نێرینە | ١١٦٣ |
| | مێیینە | ١٢٦٣ |
| سەرشەقام | نێرینە | ٢٣٦٤ |
| | مێینە | ٢٥١٣ |
| کانێسکان | نێرینە | ٣٠٨١ |
| | مێیینە | ٣٠٧٢ |
| جوولەکان | نێرینە | ١٤٤٨ |
| | مێینە | ٧٦٥ |
| کۆی گەڕەکەکان | نێرینە | ١٦٨١٢ |
| | مینە | ١٦٦٦٣ |
| ژمارەی گشتی ناوشاری سلێمانی | نێرینەو مێینە | ٣٣٤٧٥ |

دابەشکردنی دانیشتوانی شاری سلێمانی بەپێی گەرەکەکانی لە سجلی سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧ وەرگیراوە.....

| ناوی گەرەکەکان | جۆر | ژمارەی دانیشتوان |
|---|---|---|
| مەڵکەندی | نێرینە | ٥٣٨٣ |
| | مێینە | ٤٠٩٨ |
| گۆیژە | نێرینە | ٥٢٥٤ |
| | مێینە | ٤٩٧١ |
| چوارباغ | نێرینە | ٤٠٦٢ |
| | مێینە | ٣٨١٩ |
| دەرگەزێن | نێرینە | ١٤٥٧ |
| | مێینە | ١٣٨٤ |
| سەرشەقام | نێرینە | ٤٢١٣ |
| | مێینە | ٣٨٨٥ |
| كانێسكان | **مێینە** | ٥٢ ٧٩ |
| | مێینە | ٤٥٠٧ |
| کۆی گەرەکەکان | نێرینە | ٢٥٦٤٨ |
| | مێینە | ٢٢١٦٤ |
| (کۆی گشتیناوشاری سلێمانی | | ٤٨٨١٢ |
| کوی کشتی پاریزکای سلیمانی نیرینە | | ١٥٨٦٢٤ |
| بە قەزاو ناحیەکانیەوە) | مێینە | ١٤٦٨٩٥ |
| کۆی گشتی | | ٣٠٥٥١٩ |

* * *

# بۆ یەکەم جار لە سلێمانی

١ ـ یەکەم دەستگای سینەما کە بە پیل ئیشی ئەکرد لە ساڵی ١٩١٠ی زایینی هاتە سلێمانی‌یەوە لە خانی شێخ ئەحمەد دامەزرا لەنزیك (تووی قۆجە)، خەڵك بە شەو ئەچوون بۆ سەیری کە ئەکەوێتە کۆتایی شەقامی سابونکەران.

٢ ـ یەکەم سندوقی گۆرانی (گرام) حاجی عەبدوڵڵا عەزیزو حاجی ئەمینی کاکەحەمە بە بازرگانی لە مۆسکۆوە هەریەکی سندوقێك لەگەڵ چەند قەوانێکیان هێنا لە ساڵی ١٩٠٨ی زایینی‌دا.

٣ ـ یەکەم چرای لۆکس ئەمینی مەلا برایمی چایچی ناردی لە ئەستەموولەوە چرایەکی بۆ هات ساڵی ١٩١٢ی زایینی.

٤ ـ یەکەم کارەبای دەستی کە بە پیل ئیشی ئەکرد واتە (لایت) مەلا حەسەن کوری مەلا قادری بیارە لە ساڵی ١٩١٢ دانەیەکی لە ئەستەموولەوە هێنا.

٥ ـ یەکەم فرۆکە لە ساڵی ١٩١٦دا ئەفسەرێکی ئەڵەمانی هێنایە سلێمانی کەوتە شیوی (دۆزەخ مینە) فرۆکەکە شکاو فرۆکەوانە مرد.

٦ ـ یەکەم ئوتومبێل **لە ساڵی** ١٩١٦دا خەلیل پاشا والی بەغدا پێی‌هات بۆ سلێمانی، وە لە ماڵی حاجی مەلا سەعید میوان بوو.

٧ ـ یەکەم دەستگای چاپ لە ساڵی ١٩٢٠دا مێجەرسۆن هێنایە سلێمانی‌یەوە.

٨ ـ یەکەم پایسکیل عەونی ئەفەندی حاجی گورون لە ساڵی ١٩٢٤زدا هێنایە سلێمانی‌یەوە.

٩ ـ کارەبا، شارەوانی‌ی سلێمانی هێنای لە ساڵی ١٩٢٩دا کەوتە ئیش کردن.

١٠ ـ یەکەم دەستگای (تەلگراف) لە ساڵی ١٨٩٧ی زایینی‌دا لە سلێمانی دانرا وە (موجریم ئەفەندی) ئیشی لەسەر کرد.

١١ ـ یەکەم ئاشی ئاگر لە ساڵی ١٩٢٦ز برازاکەی خواجە کەریم عەلەکە هێنایە سلێمانی‌یەوە.

١٢ ـ لە ساڵی ١٩٠٠ زایینی‌دا\قادر ئەفەندی گەورە عەرەبانەیەکی دروست کرد کە بە وڵاخ ڕائەکێشرا.

١٣ ـ یەکەم پزیشك کە خەڵکی سلێمانی بووە بێن باشی دوکتۆر حسێن ئەفەندی باباجان کە لە ساڵی ١٢٦٨ هـ لە سلێمانی لەدایك بووە لە (کولیەی توببی)ی ئەستەمووڵ خوێندویەتی وە بووە بە پزیشك لە سوپای عوسمانلی‌دا، ئەمیش کوری میرزا بەدیعە کە ناسراوە بە دوکتور میرزا بەدیع باباجان. حسێن ئەفەندی لە ساڵی ١٣٤٢ هـ لە کەرکوکەوە بەسواری ئێستر دێت بۆ سلێمانی وە کە ئەگاتە پردەکەی قلیاسان، ئێسترەکە هەڵ ئەتیزێنێو ئەیخاتە خوارەوە هەر لەوێدا ئەمری خوا بەجێ‌دێنێت.

١٤ ـ یەکەم شەقام و یەکەم باخچەی گشتی بەیەکەوە دروست کران لە ساڵی ١٩٣٨ لەلایەن شارەوانی‌ی سلێمانی‌یەوە، وە ئێستا پێی ئەوترێ شەقامی مەولەوی لە زەمانی مەحمود ئەفەندی قادر ئاغادا، وە یەکەم باخەوان کە دەستی‌کرد بە دارناشتن، ئەورەحمانی باخەوان بوو، وە شەقامی مەولەوی لەپێش شۆڕشی چواردەی تەموز پێیان ئەووت (جادەی تازە).

١٥ ـ یەکەم کارگە، کارگەی مستەفا بەگ لە ساڵی ١٩٢٧ ـ ١٩٢٨ ئەمەش کارگەی سۆدەو سیفۆن و لیمۆ بوو کە پێیان ئەوت (ناملێت) وە شوێنەکەی هەر شوێنی قاپی‌ی سینەمای سیروانی ئێستا بوو لەکاتی خۆی‌دا کەلاوە بووە.

١٦ ـ یەکەم سینەما، سینەمای سەلاحەدین بوو لە شوێنی چایخانەی حەمەرەق کە لە ساڵی ١٩٤٢دا دامەزراوە.

١٧ ـ یەکەم کارگەی سەهۆڵ، کارگەی قەندیل کە لە ساڵی ١٩٥٨ دامەزراوە کە لە بەردەم گردی مشیرئاوا بوو وە خاوەنەکەی (گەرەبێت نعلبندیان) بوو.

١٨ ـ یەکەم کتێبی کوردی «دیوانی مەولانا خالید» بووە لە ساڵی ١٨٤٤ز لە ئەستەمووڵ چاپ کراوە.

١٩ - یەکەم کەس ماتۆرسکیلی هێناوەتە سلێمانی ڕەشید ئەفەندی حاجی برایم ئاغا برای خاڵە مچە کە ئەفسەرێکی عوسمانی بوو لە کۆتایی ساڵی بیستەکاندا هاتەوە سلێمانی بە پایسکیل، لە سەرەتای سییەکاندا ماتۆریشی هێنایە سلێمانی.
٢٠ - یەکەم تەلەفۆن تەلەفۆنی ژمارە (١)ی چاپخانەکەی پیرەمێرد بوو.
٢١ - یەکەم ئۆتومبێل ژمارە (١) ئۆتومبیلەکەی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود بوو.
٢٢ - یەکەم بەڕێوەبەرو پێشکەش کەری بەرنامەی کوردی کە ئێستگەی بەشی کوردی کرایەوە لە بەغدا ساڵی ١٩٣٩ کامیلی کاکە ئەمین بوو.
٢٣ - یەکەم کەس لەناو مەلاکاندا فێستی سووری لەسەرکرد مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوڵ (صەفوەت) بووە.
٢٤ - یەکەم فرۆکەچی لە سوپای عوسمانیدا ملازم اول (فایەقی کاکە ئەمین) لە ساڵی ١٩١٤ لە ئەستەموول بووە بە ملازم ثانی، بەشداری شەری کردوە لە شەری (چەنەقەلعە) بریندار بووە، دوایی چووەتە مەدرسەی طەیران لە (سیسە فانوس)وە دەرچووە بە فرۆکەچی وە تەعین بووە، لە فەوجی دووەمی (ئیکنجی هجوم) بەشداری شەری بەناوبانگی کردوە لە ڕۆمانیاو بۆخارست وە بریندار کراوە وە وسامی وەرگرتووە بووە بە ملازم اول فرۆکەچی، کە جەنگی جیهانی یەکەم تەواو بو هاتەوە بۆ خاکەکەی خۆی لە سلێمانی، لە ساڵی ١٩٢٢ لە سوپاکەی حکومەتی کوردستاندا بو بە یاوەری سەرەك سوپا پایە بەرز ساڵح زەکی صاحبقران، دوایی کە دەوڵەتی عێراق دروست بوو چووە سوپای عێراق تا ڕوتبەی گەیشتە عقید ئەمجا خانەنشین کرا. لە (مشاهیر الالویة العراقیة) عبدالمجید فهمی حسن ساڵی ١٩٤٦.
٢٥ - یەکەم برین پێنج حەمەوەفای شاعیر دەورەی دیوە لە بەغدا. بەشداری کردوە لە شەری شێخ مەحمودا دژی ئینگلیز.
٢٦ - یەکەم کەس مامۆستا مەلا سەعید کابان کەدەستورێکی بۆ زمانی کوردی داناوە بە ناوی (مختصری صرف و نەحوی کوردی) لە ساڵی

١٩٢٨ چاپ کراوە. بێجگە لەمەش چەند پەڕاوێکیتری بۆ قوتابیان داناوە، یان گۆڕیویەتە سەر زمانی کوردی.

٢٧ ـ دامەزراندی یەکەم دائیرەی ئەوقاف لە ساڵی ١٩١٧ بووە.

٢٨ ـ یەکەم جار دامەزراندی دیدەوانی (کەشافە) لە ساڵی ١٩٠٨ دامەزراوە.

٢٩ ـ یەکەم کەس خاوەنی ئوتومبیلی خۆی بوو شێخ مەحمودی نەمر بوو.

٣٠ ـ یەکەم خۆپیشاندانی سیاسی بە دوو دروشمەوە لە پێنجی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لە بەردەرکی سەرا کە یەکەمیان لەسەری نوسرابو (ڕەوا بێ مەطلەبی کورد) دووەمیان لە سەری نوسرابو (بژی عەدالەتی عوصبەت الامم). یەکەم کەس جگە لە مەئمورەکان لە ئەهلیدا چاکەت و پانتۆڵی لەبەرکرد لە سلێمانیدا توفیق قەزاز بو.

(لە ڕشتەی مرواریەوە بەرگی هەشتەم).

٣١ ـ یەکەم پاسکیلخانە ساڵی ١٩٣٥ ـ ١٩٣٦ دامەزرا لە سابونکەران بەرامبەر ماڵی یەکتابەگ خاوەنەکەی سەی هادیبو.

سەرچاوە.

ــــــ: گۆڤاری شەفەق ژمارە ـ ١١ ـ ساڵی ١٩٦١ کۆکردنەوەی نەجمەدین مەلا تا خاڵی ـ ١٢ ـ وە بەشەکەیتری خۆم کۆم کردۆتەوە.

* * *



● نۆبەچی تۆفیقی حەمەی مەلا



● بلەی ئەولێ



● یۆحەنا خەنانیشۆ «پۆلیس»



● عارفی خومەیس، چاوەشی بەلەدییە



● عەبدوڵلا قادر شاسوار ١٩٢٤ - ١٩٨٤



● خەلیل چاوەش، ئەحەی عارفی هەل لو،
عومەر سەعید



● عارفی هەلو



● خەلیل حسەین کەسۆڵ «خەلیل چاوەش»
١٨٧٢ - ١٩٧٢

# ئایا ئەزانی؟

٤ - جاران بۆ ڕەمەزان و بەجەژن کردن لە سلێمانی لەجیاتی ئەوەی خەڵك خۆیان بۆ مانگ بگەڕێن چاوەڕێی گڵەزەردە بوون، لەوێلە بورجەکەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە، کە ڕوانگەیەکی فەلەکیی بەرزی ڕۆژی خۆی بوو مانگ ئەبینرا ئاگر لەسەر شاخەکە ئەکرایەوە، ئیتر لە سلێمانی قازی بێشایەت دەیکرد بە ڕەمەزان یا بە جەژن.

تەماشا کردنی مانگ لە گڵەزەردە

SGPB-449-7E/-100 Pads 7-9-25

FROM — من — G. F. 11. اورنيك عام (١١)

To — الى : جناب مدیر سرچنار — No. ٤٨٩/١٩ رقم

Dated the 192

التاريخ الموافق ١٠/٤/٦ ١٩٢

Memorandum. مذكرة

لطفاً اشکن به اهالی گلە زردە کە بە مقدار روزی کسمە ٤٦ ساعت وقت ایاری بیچە سرش خە کو بە تقت ترصد هلال بصان بکن و اگر هلالیان دی گوت رست یکی آگری گورە بکنە رە کە علامت دیتی گوتنی هلال بـ ، کداز رست یکی ژوسی معتبریان بنیرنە لای جناب قاضی افندی شهادت بدن هلال بدان

صورتی بو معلومات بو جناب فضیلتماب قاضی افندی . فرمانی ١٠/٦

٢ ـ لە زەمانی عوسانیدا موچەخۆرو قوتابی فێستی سووریان لەسەر ئەکرد، وە لە زەمانی ئینگلیز بەدواوەو دامەزراندی دەوڵەتی عێراق موچەخۆر چاکەت و پانتۆڵ و سدارەی رەشیان لەسەر ئەکرد، وە قوتابی تاك تاك چاکەت و پانتۆڵیان لەبەردابوو، ئەوانە سدارەیان لەسەر ئەکرد ئەوانیتر هەموو بە جل وبەرگی کوردی، زۆری کەواو سەڵتەیان لەبەرئەکرد یان عەزیزیو چاکەت، بەڵام هەموویان سەرو پێچیان ئەبەست. ٣٠ بەدواوە وردە وە قوتابیش بە سەری رووتی ئەچوون بۆ قوتابخانە.

٣ ـ لەو زەمانەدا سمێڵی زل باوی بووە، وە کەسیش لەم شارەدا بێسمێڵ نەبووە، ئەگەر کۆستە نەبووبێ وە مووی سمێڵیش سوێنی گەورەیان بوو وەك ئەڵێن (بە سمێڵی مەردانەت قەستەم).

٤ ـ سلێمانی تا ساڵی ١٩٦٠، یەکەم کەس کە شەبەقی لە ماڵ ئەهاتەدەری، دەرگای هەموو ماڵێك لەسەر پشت بوو تا دوا کەس شەو درەنگ کە لەدەرەوە ئەهاتنەوە ماڵەوە ئنجا قاپی دائەخرا. وە بەم رۆژگارە دراوسێی ماڵ هەر هاتوچۆی یەکتریان ئەکرد بۆ یارمەتیو پێویستی ناوماڵ و سەرزانی یەکترو کات بردنە سەر.

هەموو مزگەوتێکیش لەم شارەدا ساڵ دوانزەی مانگ قاپیی لەسەر پشت بوو، ئەگەر فەقیرێك یان غەریبێك جێگای نەبوایە شەو مزگەوت ماڵی خۆی بوو، وە هەموو مزگەوتێکیش دوو دەرگای هەبوو

لەم شارەدا، واتە لە دوو کۆڵانەوە هاتو چۆیان لێ دەکرد، هەروەها دوکاندارەکان لە کاتی قاوڵتی واتە نان خواردنی نیوەرۆ یان ئیشێکیان بوبێت پەردەیەکی بچوکیان ئەگێرا بە بەردەمی دوکانەکەیانداو دوکانەکەیان بەجێئەهێشت.

٥ ـ لە کاتی خۆیدا هەموو دوکانێك لەم شارەدا دەرابەی تەختە بوو کە دارتاش سێ جۆری دروست ئەکرد.

أ ـ دەرابەی دووکانی بەقاڵ و سەوزەفرۆش ـ هتد... ئەم جۆرە لە ناوەراستەوە بۆ سەرەوە بە ... قەد هەڵئەدرایەوە لە سەرەوە شیشێکی کورت بەئەلقەیەکا

ئەکرا بۆ ڕاگرتنی، وە لە ناوەڕاستیشەوە بۆ خوارەوە دائەدرایەوە بە دوو قەد بۆئەوەی سەبەتەوشتی بخرێتە سەر.

ب - دەرابەی دووکانی بازرگان و خەیات و عەتار.. هتد، ئەم جۆرە بریتی بوو لە دوو پارچە لە ناوەڕاستەوە کە ئەکرایەوە لایەکی بەلای چەپا بە دوو پارچە قەد ئەکرا، لاکەی‌تری بە لای ڕاستدا بە دوو پارچەقەد ئەکراوبە بزمارو پەت بەدیوارەوە قایم ئەکران .

جـ جۆری سێیەم کە بەزۆری لە قەیسەری‌یەکان بەکارئەهات، ئەم جۆرەیان شەش پارچە بوو، هەر پارچەی مەترێك دوو دوو لەسەریەك، واتە سیان لەسەرەوەو سیان لەخوارەوە لە سکەی تەختە هەڵکێشرابون، لەپێشدا سیانی سەرەوە بەرزئەکرایەوە بۆ بنمیچەکە دوایی سیانەکەی ژێریشەوە بەرزئەکرایەوە بۆ بنمیچەکە ئیتر دەرابەکە دیار نەئەما. وە ئاسنگەریش شیش و ئەڵقەی بۆ دروست ئەکرد بۆ جێگەی قفڵ، وە قفڵ و و کلیلەکەش لای چەخماخساز دروست ئەکرا، تا ساڵی ۱۹۳۸ کە یەکەم جادە کرایەوە جادەی تازە (مەولەوی) ئەمجا دەرابەی لەوح کەوتە شارەوە ئێستا تاك تاك دەرابەی تەختە ماوە لە چەند شوێنێك کە بەپەنجە ئەژمێرێ.

**٦- تا کۆتایی پەنجاکان هەمەجۆریاری‌کردن وشەرە کەڵەشێر وشەرە کەوو-** شەرە سەگ و سەگ بازی‌و کۆتربازی لە گەڕەکەکاندا باوی بوو وە لە زۆر ماڵاندا هەمەجۆرێ ئاژەڵ و باڵندەیان ڕائەگرت. ئەوکاتە کوڕی گەڕەك کەم کەم لە گەڕەکی خۆی دوورئەکەوتەوە چونکە. باوك و دایك ڕێگایان نەئەدان بە ئارەزوی خۆیان ئەم لاو ئەولا بکەن، چایخانەش جێگەی دانیشتی پیاو بوو، کەلاوە لە گەڕەکەکاندا جێگاو بنکەی کوڕی گەڕەك بوو وە لە هەموو گەڕەکێکدا ڕاوچی هەبون کە ئەسپی چاك و تولەو تانجی‌و تفەنگی تاپریان هەبوو کە پاییزان و جارجار لە زستاندا کاتی بەفربارین وە بەزۆری لە سەرەتای بەهاردا ئەچوون بۆ شوێنی دوور بۆ ڕاو.

٧ - زوربەی خەڵك لەم شارەدا تفەنگ و خەنجەریان هەبوو، تفەنگ و دەمانچەکەیان بە کیف و قایشەوە بەئاشکرا لە ماڵاندا بەدیواردا هەڵ ئەواسی، زۆرکەسیش دەمانچەو خەنجەری لەخۆی ئەبەست و لە ناوشاردا پێوەی ئەگەڕا

بێئەوەی کەسێك لێی بپرسێتەوە، زۆریشی پاصی چەکیان هەبو کە دەریان هێنابو بۆ چەکەکەیان لەلایەن میرییەوە، شایانی باسە ئەم هەموو چەکەش هەبوو چونکە دنیا ئاسایش بوو، شارەکەش بێگانەی تیا نەبوو هیچ شتێك ڕووینەئەدا.
هەر لەو سەردەمەدا تا سەرەتای ساڵی پەنجاکان لە دوکانێکی گەورەدا بەرامبەر مەکتەبی فەیصەڵیە کە خاوەنەکەی حاجی عەزیز بەگی حاجی فەرەج بەگ بو بێجگە لە پێویستی مەکتەب دەفتەرو قەڵەم و کامێراو شتیتر، پێشانگایەکی گەورەی دانابو پڕ بو لە هەمەجۆر مارکە لە دەمانچەو تفەنگی تاپرو فیشەك لە جامخانەکەدا. ئەم کابرایە ئیجازەی لە مودیری پۆلیس وەرئەگرت پاش ئەوەی وەزارەتی ناوخۆ بڕیاری لەسەرئەدا. ئەم دووکانەی ساڵی ١٩٦٢ چوڵ کرد شەوکەتی کوری کردی بە ئەجزاخانە (صیدلیە)ی شەوکەت.
٨ ـ لە زەمانی عوسمانی کاتی حوکمی سوڵتان ڕەشاد ڕابەر (پۆستەچی) لە سلێمانیەوە کە نامەیان ئەنارد بۆ ئەستەمبوڵ یان لە ئەستەمبوڵەوە بۆ سلێمانی ئەو ڕابەرە پۆستەی بەسواری ئەسپ ئەبرد تا چەمچەماڵ وە لەوێوە چی هەبو پۆستە بەسواری ئەیهێنایەوە، ئەو پۆستەچییەش ناوی پەتولە کۆیری شانەگەر بو خەڵکی سلێمانیوماڵیان لە گەڕەکی مەڵکەندی لای پیرەمەسوور بو، دوایی زەمانی ئینگلیز صاڵحی ئاغا بو بە ڕابەر لەنێوان سلێمانیو چەمچەماڵ تا ئۆتومبیل پەیدابو لە شارەکەماندا.
٩ ـ لە کاتی خۆیدا پێش ئەوەی کارەبا بێتە سلێمانی چرایان بەکارئەهێنا، دوو جۆر چرا هەبو جۆرێك بلورێکی درێژی ئەکرا بەسەرا لەلایەکەوە ئاوێنەی پێوە نەبو لەباتی بلور شوشە بو ئەم لاو ئەولای تەنەکە بو لە سەرەوە دەسکی تەلی هەبو بۆ هەڵگرتن لە خواریشەوە جێگەی هەبو تەلیك بو دەستت پیا ئەنا بۆئەوەی هەڵبرێو بە شقارتە دایگیرسێنی. ئەم چرایانە ئەخرانە سەر کورسیەکی بچکۆلەی تایبەتی، زۆر جار (قوتیلە) یان بەکارهێنا بۆ حەوشەو ئاودەست کە دروستیان ئەکرد لای تەنەکەچی، لە تەنەکە بەقەد پەرداخێکی بچوك دەسکێکی بچکۆلەی پێوەبو بۆ هەڵگرتن کونێکی لە ناوەراستدا هەبو پەتێکی ئەستوری خری تێخرابو، نەوتیان تێئەکردو بەکاریان ئەهێنا، ئەوکاتە جادە نەبو لە بەردەرکی سەراو چەند کۆلانێك داری سپی خریان چەقاندبو چرایان پیا هەڵواسیبوو لە

جۆری دووەم ئێــواران لەلایــەن (چــراچــی) یەوە کە سەر بە بەلەدیــە بو دایئــەگــیرسان وە مەلا بانگدان بەتاریك و رونی کە حەس حەس لە ناوبازار ئەرۆشتنەوە ئەوان ئەیان کوژاندەوە. دوایی وردە وردە لۆکس پەیدابوو بەزۆری لە چایخــانەو حەمامەکاندا بەکاریان ئەهێنا، وردە وردە کە زۆر بوو کەوتیشە مالآن. تا کارەبا پەیدابو کەوتە مالآن و کۆلآن بەلآم لەپێشا هەموو مالێك کارەبای نەبــو یان ئەو مەکینــەیــە بەشی نەئــەکرد زوو زوو ئەکوژایەوە لەبەرئەوە هەر بەکارئەهات تا سالی ١٩٥٦ مەکینە کۆنەکەیان لابرد مەکینەی گەورەی تازەیان هێنا جۆری (ئای سی) لە شوێنی مەخزەنی بەلەدیە نزیك مزگەوتی پیرەمەگرون. هەروەها لە زەمانی عوسمانیەوە مۆم هەر بەکارهاتوەو لە سلێمانیش دروستیان ئەکرد لە پیو.

١٠ ـ حەس حەس و حەس حەس باشی (پــاســەوان و پاسەوان باشی) لەکاتی خۆیدا ناوی ئەو حەس حەسانەی کە ناونوس ئەکران لەلایەن بەلەدیەوە موچەیان بۆ ئەبــرینەوە. ئەبوایە مرۆڤێکی چاپوك و لایەق و ناسراوو باوەر پێکراو بونایە لەسەر سکالآکەیان هەیئەتی ئیختیاری گەرەك و موختار مۆریان بکردایە پاش لێکــۆلێنــەوئەبوایە کۆمەلی ئەندامانی بەلەدیەو رەئیسی بەلەدیە ئیمزایان لەسەر ئەکردو دوایی مودیری پولیس بریاری لەسەر ئەداو ئەینارد بۆ موتەسەریف بۆ بریارو ئیمزاکردنی.

هەروەها میری یەکێکی ئەکرد بە حەس حەس باشی کە سەرپەرشتیان بکات ئەبــوایــە پیــاوێکی ئازاو ناودارو جێی رێــزی خەلکی شارەکــە بوایــە. ئەم حەس حەســانە پاش ئیشوکاری خۆیان ئێواران بە سەرپەرشتی حەس حەس باشی چەکیــان لە (تــاولەی سواری) وەرئەگرت کە ئێستاکە شوێنی (مزگەوتی مەولەوی‌و بەریدو تەلەفۆناتە) چونکە ئەو شوێنە بنکەی پۆلیسی سوارە بو کە سەر بە پۆلیسخــانــە بو ئەم حەســانــە بە بەرگی کوردیەوەو بەچەکەوە شەو ئەگەران بە ناوبازار لە دژی دزو درۆزن و پیاو خراپ، وە بە شاوە (فیکە) لێدان یەکتری‌یان ئاگادار ئەکرد، ئەمەش ناوی حەس حەس باشی‌یەکان (سەرەك پاسەوانەکان):

١ ـ حاجی حسەین ئاغا		زەمانی عوسمانی
٢ ـ فەتاحی سەعە گۆج		زەمانی ئینگلیز
٣ ـ ئوسو ئاغا		زەمانی دەوڵەتی عێراق
٤ ـ کەریمی کاکەزاڵ		زەمانی دەوڵەتی عێراق

تێبینی: لە ساڵی ١٩٣٩دا حەس حەسێك موچەکەی مانگی دینارو نیوێ بوو، حەس حەس باشی مانگی پێنج دیناری وەرئەگرت.
هەرچی پۆلیس بوو ئەوە بە کۆڵانەکانا ئەگەران.
(لە سجلی کۆنی شارەوانییەوە ساڵی ١٩٣٩).

١١ ـ (بانگوش) جاران بانگوش ئەگێرا بە ساڵانە لە وەرزی پاییزدا بۆ زستان کە باران دەستیپێئەکرد سەربانیان بە باگردێن و گوریس ئەگێرا جارجار تۆزی کاشیان پێوە ئەکرد، چونکە ئەو سەردەمە هیچ ماڵێك سەربانی کۆنکرێتی نەبووە هەمووی دارەڕاو قامیش و زەلی ئەخرایە سەرو گڵی پاکیان ئەکرد بەسەرا جوان ڕێکیان ئەخست دوای ئەوە بە گڵی سوور قوریان ئەگرتەوە کایان تێکەڵ ئەکرد جوان سەربانیان پێ سواغ ئەدا هەرچەند ساڵێك تێپەرێ بەسەریا جارێکیتر لە پاییزدا سواغیان ئەدایەوە، لە کاتی باران باریندا پێش ئەوەی بانگوش بیگێرێ لە بنمیچەکەوە لە چەند شوێنێکەوە دڵۆپەی ئەکرد ئەو شوێنانە حاجەتیان لێدا ئەنا بۆ ئەوەی ئەو فەرش و بەڕەو نوێنانە تەڕ نەبێت تا بانگوش ئەیگێڕاو باران خۆشی ئەکردەوە، هەروەها بۆ بینای میریش ساڵانە بانگوشیان بۆ ئەگرت، ئەم پیشەیەش ئێستاش بەردەوامە ئێمە بۆ دواڕۆژ ئەمە ئەخەینە بەرچاو.

١٢ ـ (چوخم) لە هەندێ گەڕەکدا لە کۆڵانێکدا بۆ کۆڵانێکیتر واتە لەبەینی هەردوو کۆڵانەکە ماڵێك یەك ژوری دروست ئەکرد لە ماڵەکەی خۆیەوە بۆئەبەوبەری ماڵەکەیتر لە سەربانەوە هەردوو ماڵەکە بەیەکەوە ئەنوسان و لەژێرەوە خەڵك لەم کۆڵانەوە ئەچون بۆ کۆڵانەکەیتر ئەبو بە شوێنی هاتوچۆی خەڵك پێیان ئەووت چوخمی فلانە شوێن، وەکو لەخواردوە نوسراوە:

أ ـ چوخمەکەیسابونکەران: بەرامبەر حەوزەکەی سابونکەران لای ماڵی حاجی

کەریمی شمقار.
ب ـ چوخمەکەی لای ماڵی کەریمی قالەی قجول: بەرامبەر ماڵی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ (حەمدی) شاعیر خوار مزگەوتی حاجی حان.
جـ ـ چوخمەکەی قاوەخانەی سەرچیمەن: گەرەکی گۆیژە لای ماڵی حاجی تۆفیقی تازە دەوڵەمەند.
د ـ چوخمی دەرگەزێن: لای ماڵی حاجی ئەحمەدی پیرۆز.
هـ ـ چوخمەکەی سەرشەقام: لای ماڵی حەمەسەعیدی عەبدوڵلائاغا، ئەم چوخمە تائێستاش ماوە.
١٣ ـ (جلوس) بەبـۆنەی جەژنەکان وەك جەژنی لەداایك بونی پێغەمبەر (د)و جەژنی رەمەزان و قوربان و جەژنی لەدایك بونی مەلیك و چوونە سەر تەختی پاشایی‌و رۆژی سوپا، چەند رۆژێك لەوەپێش بەلەدیە خۆی ئامادە ئەکرد بە هەڵواسینی بەیاخ و گڵۆپی خڕی رەنگاورەنگ بۆ ئەو شەوە، لە بەردەرکی سەرادا دەهۆڵ و زورنا ئامادە ئەکرا پیاوان هەڵئەپەرین وەستا علی جاسوس کەبابچی ئەو سەرچـۆپیەکەی ئەگرت چونکە پیاوێکی بەزەوق بوو، دووکانەکەشی لەوێدا بوو، ژنـان و منالانیش سەیریان ئەکرد وە هەر لەو ئاهەنگەدا هەمو ساڵێك تۆفیقی دەلاڵ کە لە گەراجـی خاڵە عەبـدە بوو، بۆ ئەوشـــەوە فیشـــەکـــە شێتـــەی دروست ئەکـردو دایئـەگیرساندو هەڵیئەدا بەئاسمانداو پریشکی بلاوئەبوەوە، بەم جۆرە ئەو شەوە کاتێکی خۆشیان ئەبردە سەر، ئەم پیشەیە لەدوای شەری بەردەرکی سەرا دەستی‌پێ‌کـرد تا سەرەتای سالانی پەنجاکان. دوای ئەوە تا کۆتایی پەنجاکان بەس بەیاخ و گڵۆپیان هەڵئەدواسی. لەپێش ئەوەدا لە زەمانی عوسمانیدا بەبۆنەی لەدایك بوئی سوڵتان و چونە سەر تەختی سوڵتانی ئەوشەوە لەسەر گردی دەبۆی قشڵەی عەسکەری تورك کە گردێکی زۆر گەورەو پان بو بەیـاخی تورکیـان ئەچـەقـانـدو مۆسیقـای عەسکـەری لێئـەدراو شاپلیتەیان دائـەگـیرسـانـدو دەهۆڵ و زورنا لێئەدراو دەست ئەکرا بە هەڵپەرکێ شاپلیتە بریتی‌بو لە دارێکی خرو باریك لە شێوەی کلکە خاکەناز لە سەرێکی دارەکەوە قتویەك یان پارچە تەنەکەیەکیان لێ قایم ئەکردو پەرۆیان تێئەکردو نەوتیان ئەکرد بەسەراو بە شقارتە دایان ئەگیرساند.

[١] لە تەمسیلێکی قوتابخانەی زانستیدا رۆڵی جاسووسی بینی ئیتر ئەوە بوو بە ناو بۆی.

١٤ ـ له سالآنی ١٩٤٢ ـ ١٩٤٣ له سلێمانی ئیستگەیەکی ناوچەیی کرایەوە له دوکـانـێـکی گەورەدا له بەردەرکی سەرا تەنیشت حاجی عەلی جاسـوسی کەبابچی، خەڵکی سلێمانی ژن و پیاو گەورەو بچوك بۆ گوێگرتنی ئەو ئیستگەیە شەو ئەهـاتنـە بەردەرکی سەرا لەم بەرو ئەوبـەری جادەکـە لای چەتـری نۆبەچییەکە دائەنیشتن بۆ ئەوەی گوێ بگرن.

له پرۆگـرامی ئەو ئیستگـەیـە، ئیستگـەکە بریتیبو له ئیمپلیفایەریك و چەند موکەبەرەیەکی دەنگ کە لەسەر چەتری نۆبەچییەکە دامەزرابو. پرۆگرامەکەش یەکێك ،دەنگ وباسی شەڕی جیهانی دووەمی بڵاوئەکردەوە، وە گۆرانی کوردیان لەسەر سندوقی قەوان لێئەدا وەك گۆرانییەکانی حەمدیە فەنیو مەلاکەریم و رەشۆل عەبدوڵڵاو دایکی جەمال وە چەند دەنگ خۆشێك ئەهاتن لەوێ گۆرانیان ئەوت وەك تالب مەجید (تەلێ)و کەریم شایەرو کەریم کابان کە پرۆرامەکە تەواو ئەبو خەڵکەکە بلآوەیان لێئەکرد، چونکە ئەوکاتە رادیۆ نەبو تاکە نەبێ له هەندێ ماڵی دەوڵەمەندا هەبووە.

جاروباریش له بەغاوە ئەهاتن سینەمای دەستییان بەهۆی بەرێوەبەری ئەم ئیستگەیەوە له هەندێ شوێنی نزیك بەردەرکی سەرا له شوێنێکی دەشتاییەکی بچکـۆلە مەکینـەو پەردەیـان دائـەمـەزرانـد لەبەرئەوەی ئەو شوێنانە خەڵکی زۆرئـەگـرێت شەو خەڵکی لێی کۆئەبونەوەو فلیمی وەسایقی شەڕی جیهانی بەینی ئینگلیزو ئەڵمانی پیشانی ئەو خەڵکە ئەدا. ئەو فلیمانەکە پیشان ئەدران لەکـاتی شەڕی جیهانی دووەمدا دیعایە بوون بۆ ئینگلیز، ئەو شوێنانەی کە فلیمی لێ پیشان ئەدرا بەزۆری خوار ماڵی توفیق قەزاز شوێنی حەمامی سەرچنار جارجاریش شوێنی مەکتەبی غازی جاران چونکە ساحەیەکی گەورەی لێبو ئەو **ئیستگەیە گواستیانەوە کوڵانی سەرو گەراجی حەمەی فەرەجەفەنی تا ساڵی ١٩٤٨ سووتانیان.**

١٥ ـ (مینۆرسکی) له ساڵی ١٩٣٤دا بۆ بەشداری له جەژنی هەزارەی فیردەوسی له ئێران، هاتە سلێمانیو سەری له چاپخانەی (ژیان)داو داوای پیرەمێرد کرد نمـونـەی شیعـری چەنـد شاعیرێکی کوردی نوێی بۆ کۆبکاتەوە شیعری گۆران و بێکـەس و میرزا مارف و بیخودو سەعید ناکامی دایە. (مینورسکی)

گەڕۆك بوو لە لەندەن دائەنیشت لەئەصڵدا ڕوسی بو.
١٦ - پاش هاتنی دەوڵەتی عێراق ٢ تۆپی زەمانی عوسمانی کە وەختی خۆی لە قشڵەی عەسکەری تورك بەجێمابو پاکیان کردبۆوەو هێنابویان لەناو حەوشی سەرا بەردەم بیناکە لەنزیك یەکەوە دایان نابون، مناڵان ئەچون بۆ سەیری وە هەر لەو زەمانەدا ژنە جولە‌کە ئەهاتن منڵی ساوایان ئەهێنا لەگەڵ خۆیان دوو ژنــە جولەکە لەمدیوو ئەودیوی تۆپەکە رائەوەستان ئەو منڵەیان ٣ جار ئەدایە دەست ئەچونە لای تۆپەکەیتریش

٣ جار مناڵەکەیان ئەدایەوە دەست یەکتری بەدەم دۆعاکردنەوە. بەم دەستورە بۆ نیازی دڵی خۆیان.

ئەم دوو تۆپە تا سەرەتای ساڵانی پەنجاکان هەر لەوێ مابون دوایی بردیانن بۆ بەغا لە بەردەم (وەزاررەتی دیفاع) دایان نان.

١٧ ـ لە سەرەتای ساڵی چلەکان حاجی لەق لەقێکی شەلی گەورە لەناو حەوشی سەرا بو، مناڵان، ئەچون یارییان لەگەڵ ئەکرد، لەناو حەوشەکەدا کە پڕ بو لە داری میوە وەك داری سێوو قەیسیو هەنجیرو هەنارو داریتر.

ئەم حاجی لەق لەقــە چونکــە یانــەی عەسکــەری لەنــاو حەوشــەکەدا بوو خواردنیان ئەدایە بۆ ماوەی چوار پێنج ساڵێك مایەوە ناوی لە شارا دەرکردبوو بە حاجی لەقەلەقەکەی ناوسەرا.

هەروەهــا لەو سەردەمــەدا دوو سەگی ئینگلیــزی ناویان دەرکردبو.لە ناوشــار یەکێکیان سەگەکەی باباعلی شێخ مەحمودی گەورە بو، کە زۆر جار ئەیخستە ناو ئوتومبیلەکەیەوە بۆ گەڕان و بۆ ڕاو ئەیبرد لەگەڵ خۆی ئەویتریان سەگەکەی یەحیا فەنی رەسام**ئەم** سەگەی لەگەڵ خۆیدا ئەیگێڕاو زۆرجار ئەیبرد بۆ بازاڕ زەمیلەیەکی لە مل ئەکردو گۆشت و سەوزەی تێئەکرد، سەگەکە بەتەنیا ئەیبردەوە بۆ ماڵەوە بەرامبەر مەکتەبی غازی زۆرجاریش لەگەڵ خۆی ئەیبرد بۆ ڕاو، هەروەها لە سەرەتای ساڵی پەنجاکاندا میرزا حسەین توتیەکی گەورەی لەناو قەفــەزێکدا لە ژورسەری خۆیەوە هەڵواسیبو لە ئوتێلەکەی بەرامبەر مەکتەبی

فەیسەڵیە زۆر خەڵك ئەچون بۆ سەیری تورەیان ئەکردو یاری‌یان لەگەڵ ئەکرد.

هەروەها نەجمەدین مەلا پشیلەیەکی هەبو نازناوی (خولە) بو هەندێ شەو کە نەجمەندین مەلا زۆر خەیاڵ ئەبو بەدزیەوە پێکێکی دەرخواردی پیشیلەکەی ئەدا، کاتێ قوتابیان کە دەچونە لای بۆ خوێندن کە دەیان بینی پشیلەکە لە ڕۆشتندا ئەم لاو ئەولا ئەکات واتە خەیاڵ دەبو قوتابیەکان دەیان وت مامۆستا خولە بۆ وادەروا ئەویش ئەیوت ڕۆڵەکانم ئەوە (دی‌دی‌تی) خواردوە وازی لێبێنن.

تا جارێك خولە ئۆتۆمبیل کردی بەژێرەوە، پشیلەکە تۆپی دوایی مامۆستا تەعزێشی بۆ دانا.

نەجمەدین مەلا لە ژیانیدا هەر پشیلەی ڕاگرتوەو لەگەڵ پشیلەدا ژیاوە، دواییش کە مرد پشیلەکان دەم ولوتیان خوارد، ڕاستە کە ئەڵێن پشیلە بێ‌سفەتە.

ئەم جۆرە شتانە یادگاری ئەوکاتانەن کە خەڵکی ئەو زەمانە بەو شتانەوە خۆیان خەریك ئەکرد.

١٨ ـ لە سەردەمی پێشودا کە کچێکیان ئەدا بە شوو بەس ئەیان دا بە کوری شارەکە هەتا ئەکەر لە گەرەکێکەوە ئەگەر کچیان بدیایە کوری گەرەکێکی‌تر کورانی گەرەك پێیان ناخۆش بوو لەبەرئەوە کە بوکیان ئەبرد بۆ گەرەکێکی‌تر، چەند تفەنگ چی‌یەك بەسواری ئەسپ بوکیان ئەبرد بۆ گەرەکەکەی‌تر، لەبەرئەوە زوربەی خەڵکی کۆنی شاری سلێمانی خزمایەتیان هەیە لەبەر ژن و ژن خوازی، ئەوەش هۆی ئەوە بو کە خەڵکی شاری‌سلێمانی یەکێتی‌و یارمەتی‌و ڕێزی گەورەو بچوکی هەیە لەبەینیاندا هەر ئەوەش بوو کە خراپەو دزی‌و کوشتن زۆر بەدکمەن ڕوویدات.

١٩ ـ حەماڵی شارەزا: لەو سەردەمەدا شار بچکۆلە بو خەڵکی هەموو یەکتریان ئەناسی، یەکێك بی‌ویستایە بچێت بۆ ناوبازار بەتایبەتی بۆ بەرمەیانی بەلەدیەکە بۆ کرینی گۆشت و سەوزەو میوە، کۆمەڵێك حەماڵ هەبوون یەکی زەمیلەیەکی گەورەیان بەقوڵەوە بو، یەکێکیان بدیایە بیان زانیایە بۆ شت کرین هاتووە چەند حەماڵێك لەمانە دوای ئەکەوتن ئەیان وت کاکە حەماڵی شارەزات ناوێ ئەویش یەکێکی ناسیاوی خۆی هەڵئەبژارد لەگەڵ خویا ئەیبرد بۆلای قەساب و سەوزە فرۆش و میوەفرۆش زەمیلەکەی پرئەکردو ١٠ یان ٢٠ فلسی ئەدایە، حەماڵەکە

خۆی ماڵەکە شارەزابو ئەیبردەوە بۆ ئەو ماڵە، ئەگەر شارەزا نەبوایە ناونیشانی ئەدایەو ئەیبردەوە، ئەم حەمالانە تا کۆتایی پەنجاکان هەر بەردەوام بوون.

٢٠ ـ لە سلێمانی (شركة الشمال التجارية والزراعية المحدودة) لە ١٩٤٤/٦/٦ دامــەزراوە، سەرمــایــەی سەدهــەزار دینــار بو. ئەم کۆمپــانیــایە دامەزرا بۆ دابــەش کردنی ئازوقەو قوماش و هێنانی ئامێری زراعەت بۆ کێلانی زەوی لە شارەزور کە تایبەت بو بە کۆمپانیایەکە. لە ساڵی ١٩٤٦ سەرمایەکەی بو بە ١٥٠ هەزار دینار دابەش کرابو بە ١٥٠٠ سەهم هەر سەهمی بە ١٠٠ دینار .

ئەم کۆمپانیایە لقی هەبو لە بەغاو موصل، تەلەفۆنی کۆمپانیا ژمارە (٧٤) بو سەرۆکی کۆمپانیا حاجی برایم ئاغاو بەڕێوەبەری جەلالی حاجی سەعید ئاغا بو.

سەرچاوە: ـ (مشاهير الالوية العراقية) ساڵی ١٩٤٦.

٢١ ـ ئەو زەمانە وا باوبو هەر لە زەمانی عوسمانییەوە کاتی بەربانگ تۆپیان ئاگر ئەدا لە قشلەی عەسکەری لەدوای ئەوان لە باخی میللی تۆپیان ئاگر ئەدا کە باخێك بو بەرامبەر مزگەوتی گەورە، لە ساڵی ١٩٤٥دا لە رەمەزان دا یەکەم ئێوارە کاتی بەربانگ کە چاوەڕوانی تەقینی تۆپەکە بوون و خەڵك لێی کۆئەبونەوە وە بەتایبەتی منالان، لەکاتی تەقینی تۆپەکەدا لولەکەی دەرچو وە تۆپەکە لەوێدا تەقیەوە پارچەکانی بڵاوبۆەو چوار منالی بریندار کرد، لەوانە خوشك و برایەك کە سەبــریو عوسمانیان ناو بو کچ و کوری حاجی رەشید ئاغای چاوبر بوون، سەبری مەچەکی پەڕیو ئێستا ژنی ماڵەوەیە وە عوسمانیش دوو پەنجەی قرتا ئێستا ئوتومبیلچی پاسی گواستنەوەی ناوشارە هەروەها حەماڵێك و منالێکی گاور بریندار بوون وە توپچیەکەش عەریف حسەین حەمەسوور بوو کە خۆی ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە، لەپێش عەریف حسەین دا حاجی سەعید تۆپچی بو ماڵیــان لە بازارە بچکۆلە بو لە کانی ئاسکان لەپێش ئەویشدا صالح ئاغا بو ئەویش ماڵیان لە کانێسکان بو.

٢٢ ـ کەنیســـەی گاوران ساڵی ١٨٦٢ز دروســت کراوە لە گەڕەکی گاوران

ئیستاکەش هەر ماوە لە شوێنی خۆیدا.

٢٣ ـ چارشێوو پەچە (عەباو پەچە)ی ژنان لە کوردستاندا بەگشتیو لە سلێمانی بەتایبەتی لە زەمانی سوڵتان ڕەشادا پەیدابوو.

سوڵتان ڕەشاد + یوم الفساد

یەکەم جار حوکمی نالە پێپان بوو، دووەم عەباو بەچەی داهانی.

٢٤ ـ بە بیرەوەری خەڵکی ئەو زەمانە بەفرە زۆرەکەی سلێمانی لە ١٩٣٢/٢/٢٥دا باری.

٢٥ ـ هاتنی سمایل خانی شوکاك (سمکۆ) بۆ سلێمانی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ سەردانی شێخ مەحمودو پشتگیری کردنی لە ١٩٢٣/٢/٢٣دا بو.

٢٦ ـ لە ساڵی ١٩٥٤ لەسەر بڕیاری شارەوانی گەز بو بە مەتر وە حۆقە بو بە کیلۆ.

٢٧ ـ کارگەی چیمەنتۆ لە ساڵی ١٩٥٤دا دامەزرا.

٢٨ ـ بانقی ڕافیدەین لە دووشەمەی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٤دا کرایەوە لە شوێنی کتێبخانەی زێوەرو دوکانی شێخە صاڵح.

٢٩ ـ کۆمەڵی ساوایان، هیلالی ئەحمەرو موکافەحەی سیل لە ساڵی ١٩٥٥ دا لە مانگی تشرینی دووەمدا پێك هاتووە ئەمانەی خوارەوە دەستەی بەڕێوەبەری بوون:

| | |
|---|---|
| ١ ـ دکتۆر جەمال ڕەشید | سەرۆك |
| ٢ ـ فائق هوشیار | نائیبی سەرۆك |
| ٣ ـ دکتۆر کەمال عەبدوڵلا | سکرتێر |
| ٤ ـ جەلالی حاجی سەعید ئاغا | ئەمین سندوق |
| ٥ ـ پارێزەر قادر مستەفا | موراقیبی حسابات |
| ٦ ـ ئیسماعیل قیردار | ئەندام |
| ٧ ـ قادر ئاغای حاجی مەلاسەعید | ئەندام |

٨ ـ حاجی برایم ئاغا ئەندام

٩ ـ مەلا حسەین حاجی مارف ئەندام

٣٠ ـ خەڵوز بردن بۆ بەغا: لە سەردەمی پێشودا ڕێگاوبان وەکو ئێستا نەبوەو هۆی بردنی شت بۆ بەغا نەبو، کە پەیدابو لە شارەکەماندا ئەوەندە ئۆتومبیل نەبو بەتایبەتی لۆری، چەند کەسێك هەبوون خەڵوزیان ئەکری ئەیان برد بۆ بەغا بەهۆی ئاوی دوکانەوە، لەوێ چوار پێنج کەسی خەڵکی ئەو ناوچەیە هەبوون لەگەڵیاندا ڕێك کەوتبون هەر جارەی هەزار گونیەی خەت سووریان لێرەوە بۆ ئەبردن بۆ دوکان ئەوانیش (کەڵەك) ێکی گەورەیان دروست ئەکرد واتە (کەشتی)یەکی بچکۆلە، سپی داریان ئەهێنا لەیەکیان ئەبەست ژێری پەنجا (کوننە)ی گائاوس فویان تێئەکردو لەژێر دارەکانەوە قایم ئەکرا ٥٠٠ گونیەیان ئەهێنا پریان ئەکرد لە خەڵوز جوان دەمی گونیەکەیان ئەبەست، ئەم خەڵۆزەیان ئەهێنا لە دێهاتی دەوروبەری دوکان ئەمجا فەردەکانیان جوان یەك لەسەر یەك سەفتە ئەکردو بە گوریس باش ئەیان بەست تەنورێکیان ئەهێنا ئەیان خستە ناوەڕاستی سەربارەکە بۆ نان دروست کردن بۆ ڕێگا دوای ئەوە زەخیرەو تروتفاقیان ئامادە ئەکردو سەرو سەوڵیان ئەگرت بەدەستەوەو ئەکەوتنە ڕێ شەوڕۆژ مەگەر بۆ پێویستیەك لە ڕێگا لەنگەریان ئەگرت، یەکێك لە خۆیان ئەچو بۆ تەماشا کردنی (کوننە)کان لەترسی خراپ بونیان، لە ڕێگا نوستنیان بە نۆرە بو. بەم جۆرە بە ١٥ ڕۆژ تا ئەگەیشتنە بەغا ڕۆشتنیان بەم جۆرە بووە لە دوکانەوە بۆ تەق تەق لەوێوە بۆ ئاڵتون کۆپری ئەمجا بۆ دبس لەوێوە بەنزیك حەویجەدا تێئەپەری بۆ دێی زاب دوای ئەوە ئەو ئاوە ئەچێتە ڕوباری دیجلە ئەمجا بەناو بێجیدا ئەڕوات بۆ تکریت لەوێوە بۆ سامەڕا دوایی ئەوە بۆ بەلەد ئەمجا بۆ ناو بەغا بۆ شوێنی دیاری کراویان لە گوێ ڕوباری دیجلە پشتی خەستەخانەی مەلیکی (باب المعظم) کە ئێستاکە (مدینة الطب)ە لەوێ لەنگەریان ئەگرت و ئەوەستان و کەڵەکەکەیان ڕائەگرت، لەوێ دووکەس خەڵکی سلێمانی کە خاوەنی خەڵۆزەکە بون چاوەڕێی ئەوانیان ئەکرد چونکە ئەیان زانی. بە ١٥ ڕۆژ ئەگەن، ئەگەر ڕێبکەوتایە خاوەن خەڵوز لەوێ نەبوایە، یەك دوانێکیان شوێنی

خاوەن خەڵوزەکەیان ئەزانی ئەچون پێیان ڕائەگەیاندن کەوا خەڵوزەکەیان گەیشتووە ئەوانیش لۆرییان ئەبرد، لەوێ خەڵوزەکەیان دائەگرت و کەڵەکیان هەڵئەوەشان و دارەکانیان لەوێدا ئەفرۆشت کوننەکانیان فش ئەکردەوە، خەڵوزیان بارئەکردو ئەیان گواستەوە بۆ گەراجی صابونچی لە (مەیدان) ئەوانیش بە شەمەنەفەر ئەگەرانەوە تا کەرکوك لەوێوە بە ئوتومبیل بۆ سلێمانیو لەوێوە بۆ دوکان ئەگەرانەوە.

ئەو دووکەسە فەردەی خەڵوزیان لێ ئوکرین بە ٨٠٠ فلس، چوارسەد فلسی خەڵوزەکەو چوارسەد فلسی هەقی گواستنەوەی لە دوکانەوە بۆ بەغا. ئەوانیش بەم شێوەیەی خوارەوە لەو گەراجە بە کیلۆئەیان فرۆشت:

أ - گەورەکەی کیلۆی بە ٥٠ فلس

ب - ناونجیەکەی کیلۆی بە ٢٥ فلس

جـ - خاکەکەی کیلۆی بە ١٥ فلس

د - کۆتەرەی دارەکەی کیلۆی بە ١٥ فلس

تێبینی:

ـــــــــ: ئەم خەڵوزە لەوێ بەکارئەهات بۆ کەبابچیو سویجگەرچیو لوقنتەچی، بەوجۆرە ئەهات بۆ بەغا تا ساڵی ١٩٤٥ ئەمجا ئەوەندە لۆری کەوتە شارەکەمانەوە کە بتوانێ لەوێشەوە ئەو خەڵوزە بگوێزنەوە بۆ بەغا.

ئەو دووکەسەی ئەو خەڵوزەیان ئەکریو ئەفرۆشتەوە لە بەغا یەکەمیان حاجی برایم قادر کە لە (سەفەربەلك)ەوە لە بەغا دائەنیشت وە خەریکی ئەو پیشەیە بو وە بەردەوام بو تا ساڵی پەنجاکان و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردوە، دووەمیان عوسمانی سالەسوور برای عەلی دەدە بوو.

سەرچاوە: - عوسمانی سالەسوور کە خۆی ئەو پیشەیەی کردوە لە ساڵی ١٩٤١ تا ١٩٤٥ ئەمجا گەرایەوە بۆ سلێمانی

٣١ - کاتی خۆی بە سلێمانی ووتراوە شاری گوڵ عومەر یان گوڵ عەنبەر، کە ئەمە زۆرجار ناوی هەموو ناوچەکەش بووە واتە لە کەرکوکەوە تا هەورامان وولاتی گوڵ عومەری پێوتراوە، هەروەك خاکی (شارەزوور)یش بەرامبەر بەو ناوە بووە.

٣٢ - تا کۆتـایی پەنجاکان خەڵکی ناوچەی دەوروبەری سلێمانی کە ئەهاتنە ناوشـار بە جل وبـەرگ و قسەکردنیاندا ئەزانران خەڵکی ناوچەیەکن وەك ئەم ناوچانەی خوارەوە لەگەڵ جل وبەرگیاندا:

أ - ناوچەی شارباژێر: - رانکو چۆغە. لە زستاندا لەژێر چۆغەوە مرادخانیان لەبـەرئـەکرد لەگەل کڵاوو مشکی رەش و سپی‌و جامانەو پەستەك و پشتێن و گۆرەوی پوزەوانەو کەوش لە زستاناو جارجار لە هاویندا کڵاشیان لەپێئەکرد. لەدوای شەری جیهانی دووەمەوە جاش کەوشیش پەیدابو لەپێیان ئەکرد.

ب - پشدەر: - رانکو چۆغە، لە زستاندا لەژێر چۆغەوە مرادخانیان لەبەرئەکردو شەرواڵ و مراخـانی‌و کڵاوو چیتیـان ئەبـەست بۆ سەرو پێـچ ریشـوودار، پشتێنەکەشیان لە چیت ئەبەست ئەڵقاو ئەڵق لە زستاندا کەوشیان لەپێئەکردو لە هاویندا کڵاش.

جـ - بازیان: - رانکو چۆغە، لە زستاندا لەژێر چۆغەوە مرادخانیان لەبەر ئەکردو شەرواڵ و مرادخانی‌و پشتێن و کڵاو مشکی. رەش و سپی‌و جامانەو لە زستانا کەوشیان لەپێئەکرد لە هاویندا کڵاش.

د - قەرەداغ: - کەواو سەڵتەو پشتێن و کڵاوو مشکی رەش و سپی‌و جامانەو دەرپێی کوردی، لە زستاندا کەوشیان لەپێئەکردو لە هاویندا کڵاش.

هـ - شارەزوور: - کەواو سەڵتەو پشتێن و دەرپێی کوردی لە قوماش و کڵاوو مشکی مۆرو رەش و سپی جارجار تێکەڵ ئەیان پێچاو ئەبەست و لە زستاندا کەوشیان لەپێئەکردوو لە هاویندا کڵاش.

و - هەڵەبجـە: کەواو سەڵتـەو پشتـێن و کڵاوو مشکی مۆرو رەش و سپی‌و جامـانـەو عەلیخـانی‌و جارجار مشکی مۆرۆ رەش و سپی‌یان تێکەڵ ئەپێچاو ئەبـەست دەرپێی کوردی لەبلوری لەژێـر کەواوە کەوشیـان لە زستـانـدا لەپێدەکرد لە هاوینیشدا کڵاش.

بەڵام بەگزادەکان کەوای تاقەی گوڵ بێچوو کوجەرات و شیعری‌و شیرداغیان لەبـەرئەکردو چەفتەی مەلیکی سوورمەی گوڵنکەدارو مشکی مۆریان ئەبەست دوایی قۆندەرەی یارم پۆتین (لاپچین) داهات لەپێیان ئەکرد.

س - هەورامان تا دەوروپشتی هەڵەبجە: - رانکوچۆغە، پشتێن و لە زستاندا.

لەژێر چۆغەوە مرادخانیان لەبەرئەکردو کڵاوو مشکی مۆرو کوڵەباڵ و، لەزستاندا کەوشیان لەپێئەکردو لە هاویندا کڵاش.

ص - پێنجوین: - رانکوچۆغە، لە زستانـدا لەژێر چۆغەکەوە مرادخانیان لەبـەرئـەکردو شەرواڵ و مرادخانی پشتێن و کڵاوو مشکی رەش وسپی، وە لە زستاندا کەوشیان لەپێئەکرد لە هاویندا کڵاش.

تێبینی: - هەموو خەڵکی ئەم ناوچانە بەدرێژایی ساڵ دەرپێی کوردی وەکو شەرواڵ، لەژێرەوە کراسی فەقیانەداریان لەبەرئەکردو فەقیانەکەیان لەسەر سەڵتەو چۆغـەو مراخانی ئەبەست و زوربەی خەنجەریان بە لاقەدا ئەکردو تەزبیحی کارەبایان لە دەسکەکەی ئەپێچا، لە زستاندا لە ناوچەی خۆیاندا کاڵەو پیتاویان لەپێئەکرد. بەڵام مشکی زۆرتر بەکارئەهات لە جامانە، مشکی هەر لە ئێرانەوە ئەهـات. چونکـە نزیك بوو بەڵام جامانە لەکاتی خۆیدا لە شامەوە لە رێگەی موسڵەوە هاتووە.

٣٣ - ئەمین زەکی بەگ: ١٨٨٠ - ١٩٤٨/٧/٩ز پایەبەرزو مێژوونوسی گەورەی کورد، مامۆستا ئەمین زەکی جگە لەو فەرمانە بەرزانەی کە پێیدراوە لە دەوڵەتی عوسمانیدا وەکو ئەوەی ماوەیەك بوو بە یاریدەدەری مستەفا کەمال (ئەتاتورك) کە ئەوکاتە فەرماندەی سوپای حەوتەمی عوسمانی بوو لە سوریا، وە لە دەوڵەتی عێراقدا بێجگە لە (ئامیر کولیەی عەسکەری) ساڵی ١٩٢٤ لە بەغا، بۆ یەکەم جار بەپێی فەرمانێکی تایبەتی رۆژی ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٢٥ بووە بە وەزیر لە دووەم وەزارەتی عەبـدول محسن سەعـدوندا کە لە ٢٦ی حوزەیرانی هەر ئەوساڵەدا دامەزرابو، لەوساوە تا رۆژی نۆی شوباتی ١٩٤٢ز مامۆستا ئەمین زەکی یانزە جار بوە بە وەزیر هەروەها جگە لە زمانیزگ ماکی خۆی، ئینگلیزیو فەرەنسیو ئەڵمانیو تورکیو فارسیو عەرەبی چاك زانیوە.

سەرچاوە:

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژ وو، ل ١٥٥ ، ١٥٦

٣٤ - ناوی ئەو شوێنانەی کە بە شتی تایبەتی خۆیان بەناوبانگن:

برنجی بازیان و بانیخێڵان - پیازی عەوالان - ماستی خەراجیان پەنیری

یاخیان ـ گوێزی هەورامان ـ تەرتووی ولیان ـ کاڵەکی مەرەنگیو شەمەو وێڵەکەو قەڵاچـوالان ـ شووتــی گەرمەدێ ـ ترێی خەمــزەو قوولەرەش ـ خەیــاری سورقاوشان ـ ترۆزی خەرابەو ئابڵاخ ـ هەنجیری هەناران ـ باسووقی چنگیان ـ نیسك و نۆکی مۆریاس ـ ترشی سەفرەو زەرروون ـ تووری مەولانا ـ ناسکە هەرمێی وەراس ـ رۆنی قاین جە و سەراو ـ رێواسی کەلیخان ـ هەلووژە رەشەی چنگیان خەڵووزی چوخماخ ـ گۆزەو دیزەی بێورێ ـ مانگای مالوان ـ رێوی قەمچۆغە ـ دووپشکی عەربەت.

٣٥ ـ ئەم گەرەکانە، هەر گەرەکەی بەشتێکەوە ناوبانگی هەبوو:

أ ـ مەڵکەندی: بە بەفری گۆیژەو بەردی مەڵکەندیو مەرومالات.

ب ـ گۆیژە: بە سابوون و کفتەی سابونکەران.

حـ : دەرگەزێن: بە کلاوچنین.

د ـ سەرشەقام و چوارباخ: بە ولاخ داری.

هـ ـ کانی ئاسکان: بە کلاش چنین.

٣٦ ـ ئایا ئەزانی: ـ لە شوباتی ١٩٨٣ز ئەوراقی بەلەدیە کە چەند تەنێك ئەبوو کە ئەوراقی کاتی عوسمــانیو کاتی شێــخ مەحمــوودو دەوڵەتی عێراق بوو لە تانجەرۆ سووتاندیان وە بە شۆفل خۆڵیان کرد بەسەریا دوایی کە پێمان زانی لەگــەڵ مامــۆستــا عەبدول رەقیب و مامۆستا ئەحمەد حسەین کە لە تانجەرۆ ئەویش بەهــۆی قوتابیەکانیەوە پێیزانیو خەبەرمان زانی دوایی بە سێ قۆڵی چووین بۆ تانجەرۆ هەندێ ئەوراقمان لەژێر خۆڵ دەرهێنا، هەندێ کورتە هەواڵ لە هەندێ لەو ئەوراقانە بۆ نمونە بلاوئەکەینەوە، کەوابێ ئەتوانین بڵێین لە سجلی کۆنی شارەوانییەوە ساڵی ١٩٣٩ لەگەڵ هەندێ دەستکاریدا:

أ ـ لەو سەردەمەدا خەڵکی دەرەوەی وولات وە لە شارەکانیتری ناوخۆ ئەهاتن بۆ سلێمانی یان رێیان ئەکەوتە ئێرە یان دەرەوەی وولات ئەهاتنەوە لە ئەسارەت ئەو سەردەمە پارە کەم بووەو پارەیان پێ نەماوە پێی بگەرێنەوە، پەنایان ئەبرد بۆ موتەسەریف و بەلەدیە ئەوانیش ئەیان زانی کە فەقیرحاڵن بە پارە یارمەتیان ئەدان، بۆنمونە ناوی چەند کەسێك:ـ

١ ـ مەحەمەد صالح لە هەیئەتی اسلامیەی دیمەشق و سوریا بۆ ئیلقای وەعظ و خطبە ممالیك ئەگەڕێو هاتووە بۆ سلێمانی بۆ گەڕانەوە ٨٠٠ فلسی بۆ سەرف کرا.

٢ ـ حاجی محەمەدی بەلخی خەڵکی مەکە بۆ گەڕانەوەی تا کەرکوك ١٥٠ فلسی بۆ سەرف کرا.

٣ ـ عبدالکریم احمد الله علی خەڵکی فەڵەستین بۆ گەڕانەوەی ٥٠٠ فلسی بۆ سەرف کرا.

٤ ـ ابـراهیم السیـد عیسی المصری سائـح وە مراجعەتی کە (مقام متصرف واقع)بوە بەلەدیە قەراری دا دینارێکی بۆ سەرف بکەن.

٥ ـ لە موراجـەعـەت محمد حەمەد کە خەڵکی ڕەواندزە فەقیرەحاڵە ئەیەوێت بگەڕێتەوە هەتا کەرکوك ١٥٠ فلسیان بۆسەرف کرد.

٦ ـ لە تەحریراتی مودیری شورطەی سلێمانییەوە بۆ بەلەدیە کە ئیبراهیم کوڕی کەریم خەڵکی سلێمانییە لە سەفەربەرەوە ئەسیر بوە، تازە هاتۆتەوەو کەسی نییە پێویستی بە یارمەتی ئەکا بەلەدیە قەراری دەرکرد کە ٥٠٠ فلسی بدرێتی بۆ جارێك.

ب ـ زۆر قوتابی فەقیرحاڵ کە نەیان ئەتوانی دوای تەواوبونی مەکتەبی سانەوی یان متـوسـطە لە بەغا بخوێنن، کەسوکاریان ئەرزوحاڵیان ئەدا بەلەدیە پاش شەهادەی هەیئەتی ئیختیاری مەحەلە، کەئەمە ئیمکانی خوێندنی نییە بەلەدیە بە قەراری مەجلیس مەعـاشی بۆ ئەبـڕێتـەوە بۆئـەوەی خوێندنەکەی لە کیس نەچێت، یان قوتـابییـە هەژارەکانی ناوشار بە هەمان دەستور بەلەدیە پارەی ئەدانێ بۆ جل وبەرگ و پێویستی مەکتەب وە لەو سجلانە ناوی زۆر قوتابی تیا هاتووە، یان یەکێ نەخۆشییەکی بوایە کە چاری نەکرایە لێرە یان یەکێك سەگی هار بیگرتایەو فەقیرحاڵ بوایە لەسەر حیسابی بەلەدیە ڕەوانەی بەغا ئەکرا.

ج ـ هەر لە زووەو ناوشاری سلێمانی بە پاکو تەمیزی ناوبانگی دەرکردبو، بۆ کۆکردنەوەی خۆڵ لە کۆڵانان و ناوبازارو شەقامەکان بەلەدیە ساڵانە ئیعلانی ئەکرد ئەیدا بە ئیجاری ساڵانە بە کەسێکی باوەڕپێکراو وە بە کەمترین نرخ، ئەوانیش چەند کەرێکیان تەرخان ئەکرد شەڵتەیان لەسەر پشتی کەرەکە دائەنا

وەکـو دوو گونیـە کە لایـەکی دەمی گونیـەکـەیـان پێکەوە ئەدرو بۆئەوەی لە هەردووﻻوە خـۆڵـی تـێبـکـەن، ئیـجـارەی مانـگـانـە بە ١٦ دینار برایەوە لەسەر سووران حەسەن قەرەنی مانگ بە مانگ بۆ ماوەی ساڵێك.

د ـ ساڵانی سییەکان رەئیسی بەلەدیەو موﻻحیزی فەنی ئەگەران بۆ تەفتیش بە ناو شارا. نوسراوە، ئوجـرەتی عەرەبـانـە کە رەئیسی بەلەدیـە سواری بوە بۆ تەفـتیش و موراقـەبـەی شەقـامـەکـان و قەراغ شار لە ١٩٣٩/٢/٢٧ تا ١٩٣٩/٣/٢٣ مەجلیسی بەلەدیە قەراریدا کە ٨٠٠ فلس لە فەصلی ٢ مادە یەك لە صندوقی بەلەدیە بۆ عەرەبانچی عەلی بەگی فەیض الله بەگ سەرف بکرێت.

لەپێش ئوتـومبیـل و عەرەبـانـە موتەسـەریف و رەئیسی بەلەدیە ئەگەران بە سواری ئەسپ بە ناوشارا.

هـ ـ ئەوکاتەش ئوتومبیل و عەرەبانە ئەبوایە ئیجازەیان لە مودیری شرطەوە بۆ دەرئـەچـو بەنیسبـەت ئوتـومبیلەوە بەلەدیە نرخی ئوجرەتی خصوصی بۆ یەك کیلۆمەترو ئوجرەتی لۆری بۆ یەك تەن و یەك کیلومەتر بۆ ئەو شوێنانەی دەرەوەی شار بە جەدوەل نرخیان بۆ دائەناو ئەیان زانی ئەو شوێنانە چەند کیلومەتر دورن لە شارەوە، هەروەها بۆ عەرەبانەش ئوجرەتیان چەند دانرابو لە بەردەرکی سەراوە تا گەرەکەکان، بۆنمونە لە بەردەرکی سەراوە تا مەڵکەندی عانەیەك واتە چوار فلس، ئوجرەتی ئوتومبیل خصوصی بۆ یەك کیلۆمەتر ١٢ فلس لۆری ١٠ فلس.

و ـ هەرچ منالێکی شیرەخۆرە فرێبدرایەو کەس هەڵینەگرتایەوە بەلەدیە ئەیدا بە دایەن بە مانگانە پارەی ئەدا بەو دایەنە کە شیری بداتێو بەخێوی بکات.

س ـ بۆ یەکەم جار چەتری نۆبەچی وەستانی نۆبەچی (مرور) لە ساڵی ١٩٣٩ لە بەردەرکی سەراو ئەسحابەسپی دروست کرا لە تەرەف بەلەدیەوە چەترەکە بە قاڵبی تەختە کرابو، ئەورەحمانی وەستا گورونی دارتاش دروستی ئەکرد.

دوای ئەوە لە سەرەتای چلەکاندا دوو چەتری کەیان دروست کرد یەکێ لە بەر ماڵی موتـەسـەریف دا. دوای ئەوە یەکێکیتـر لە ناوەراستی شەقـامی تازە (مەولەوی) بەرامبەر بیناکەی تۆفیق قەزاز دروست کرا دوای ئەوە لە سەرەتای پەنجاکان دوو چەتریتردروست کرا یەکێ لە بەر خانەقا ئەوەیتریان لە کۆتایی

شەقامی کانیئاسکان.

ص - جادەی بەردەرکی سەرا تاکوتایی خەستەخانەی سەرەوە ساڵی ١٩٣٩ دەست پێکرا.

ل - ساڵی ١٩٣٩ وەصی عبدالاله هات بۆ سلێمانی لە نادی موظفین زیافەت کرا لەسەر بەلەدیە.

م - نەمامەکانی قەراغ شەقامی تازە (مەولەوی) لەگەڵ تەواوبوونی شەقامەکە ساڵی ١٩٣٩ نێژراون.

ن - ئەم هەواڵەش لە بەڵگەنـامەیەکی بەلەدیەوە دەقاودەق وەك خۆی بڵاوی ئەکەینەوە لەخوارەوە:

٣٧ - سنووری شاری سلێمانیی کۆن بە ماڵەکانیدا:

(رۆژهەڵات)

ماڵی حاجی ئەمینی حاجی کەریمی مەڵکەندی

(لە مەڵکەندی)

ماڵی عەزمیبەگی بابان

(سەرکارێز)

(رۆژئاوا)

ماڵی مەجید ئەفەندیی

(کانێسکان)

ماڵی مەلا ساڵحی کوردە

(سەرشەقام)

بەوبەرەوە کۆتایی گەڕەکی چوارباخ

ماڵی ساڵحی دەوڵەت بەرامبەر

بە ماڵی مەلا ساڵحی کوردە

# پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ئیدیوم

نووسەر لەناو بابەتی فۆلکلۆری دەمی « سەرزاری»دا لای داوە بە لای پەندی پێشینـان و « ووتـەی جێگـر لە نێـوان گفتـوگـۆدا» لێرەدا سێ چەشنە بابەتی تێکەڵ کردووە، کە بریتین لە پەنـدی پێشینـان و قسـەی نەستـەق و ئیـدیـۆم لەڕاستیدا من هێشتا لە سەر ئەو ڕایەم کە لە چاپی دووەمی « ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی»دا دەرمبـڕیـووە، ئەویش ئەوەیـە کە جیـاکـردنـەوەی تەواوی ئەم سێ چەشنە بەرهەمە تەنـانـەت بۆ پسپـۆڕەکـانیش زۆر زەحمـەتـە چ ڕای بۆ کۆکەرەوە. چونکە ئەم سێ چەشنە بەرهەمە زۆر چوون بەناو یەکدا. ئەوەش کە لێرەدا کۆکراوەتەوەو خراوەتە ژێر ئەم دوو ناونیشانەوە لە هەر سێ بابەتەکەی تێدایەو دیسان کەرەسەیە بۆ زانایان و پسپۆڕان.

ڕەنگە زۆر لەم پەندو قسەو ئیدیۆمانە لەمەوپێش لەناو ئەو کتێب و ناملیکانەدا کە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ئیدیۆمیان تێدا بڵاوکراوەتەوە تۆمار کرابن، بەڵام بایەخی ئەم تۆمار کردنەی ناو ئەم کتێبە، بۆ کۆن تومار کراوەکانیش و بۆ تازەکانیش لەوەدایـە کە ئەمـانـە بەرهـەمی سەر بەشـاری سلێمـانین یا ئەو پەندو قسەو ئیدیۆمە کوردیـیە گشتییـانـەن کە لەم شارەدا باوو بڵاون، لەکـاتێکـدا کە ئەوانەی پێشوو بەرهەمی سەر بە هەموو کوردەوارین. لێرەشدا ئاشکرایە کە ئەم تۆمارکردنە بناغەی بەراوردی تایبەتیو گشتیی ئەم بابەت و مەیدانە بۆ لێکۆڵەرەوەکان، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە زۆر شارەزای شاری سلێمانی نین دادەمەزرێت.

« ع . م . ر»

## « پەندی پێشینان »

### پێشینان وتویانە

١ ـ قسە هەزارە دوانی بەکارە.
٢ ـ نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەساب.
٣ ـ موویەك لە بەراز بێتەوە باشترە.
٤ ـ کەر لەکوێ کەوتووە کونە لەکوێ دڕاوە.
٥ ـ پشیلە لێرە نی‌یە مشکان تلیلیانە.
٦ ـ کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە.
٧ ـ دۆم بێت و کلاش بۆ خۆی بکات.
٨ ـ حوکمی حاکم پرسینەوەی نی‌یە.
٩ ـ کای کۆن بە با ئەکات.
١٠ ـ ئەم ئاشە لە میزن بێت هەر ئەمیزێ.
١١ ـ یەك جار بە زستان ئەوترێت ساردە.
١٢ ـ بەهارێ بەفر بباری تا پوپەی دارێ ناگاتە ئێوارێ.
١٣ ـ بۆ مشتەی ناو هەمانەکە ئەگری.
١٤ ـ گەری بارە ترێ ئەکات.
١٥ ـ ڕیوی لە کونی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەر ئەبێت.
١٦ ـ ڕێوی تا قەواڵەی خۆی خوێندەوە پێستیان گوروو.
١٧ ـ بەرە لای تەنکیەوە ئەدرێت.
١٨ ـ وەك فێرم ئەکەیت تیریشم کە.
١٩ ـ بەریش نی‌یە بەئیشە.
٢٠ ـ هەرچی سمێڵی سور بوو هەمزاغا نی‌یە.

٢١ ـ سەد ڕەحمەت لە کفن دز.
٢٢ ـ سەگ بە مانگەشەو بوەڕێت سوودی نی‌یە.
٢٣ ـ قنگی ڕەش و سپی لەبوارا دەر ئەکەویت.
٢٤ ـ بێ عاریان خستە دەریاوە ووتی تەڕ تەڕ نەباشەت.
٢٥ ـ خزمی خەزوری سەپانی ماڵی شێخە.
٢٦ ـ کنرو ماست بۆ وەعدەی خۆی.
٢٧ ـ قسە نە لە شێت، نە لە منال ناگیرێ.
٢٨ ـ زۆری پێ‌یەو کەمی دەرئەخات.
٢٩ ـ وای لە قوونێ، وای لە دوشاوێ.
٣٠ ـ لە هەموو هەورێك باران ناباریت.
٣١ ـ کەم و پوخت نەك زۆرو بۆر.
٣٢ ـ بنیادەم گا نی‌یە هەر لە پێستێکا بێت.
٣٣ ـ ئەم بایە لەم کونەوە بێت ئەمە هەر حاڵمان ئەبێت.
٣٤ ـ خۆ سێبەری بن ئەشکەوت نی‌یە.
٣٥ ـ ماسی لە بەحرا سەوا ناکرێ.
٣٦ ـ هەزار گوناهو یەك تۆبە.
٣٧ ـ هەرچی لە مشك بێت جەواڵ ئەدڕێ.
٣٨ ـ تری خۆی‌و گوێزەر لێك ناکاتەوە.
٣٩ ـ دار هەڵ برە سەگی دز دیارە.
٤٠ ـ ماڵی قەڵب سەرو سەکوتی ساحێبی ئەگرێتەوە.
٤١ ـ سەگی هار چل شەوی عەمرە .
٤٢ ـ نە دار بێت و نە پەردو لەعنەت بێت لە هەر دوو.
٤٣ ـ ڕێوی نە ئەچوو بە کونەوە هەژگێکی ئەبەست بەگونەوە.
٤٤ ـ تف هەڵدەیت بۆ ئاسمان ڕووی خۆت ئەگرێتەوە.
٤٥ ـ لە هەزار ئاوی داوە قولەپێ‌ی تەڕ نەبووە.
٤٦ ـ ئەم ماستە بێ موو نی‌یە.

٤٧ ـ دارێکی بەدەستەوەیە هەر دوو سەری گواوی‌یە.
٤٨ ـ لە کاتی ڕاوا گووی دێت.
٤٩ ـ چی کەرەکە بەریتە لای بارەکە چی بارەکە بەریتە لای کەرەکە.
٥٠ ـ قەرز کۆن ئەبێت بەڵام نافەوتێت.
٥١ ـ بارە گوێزی لێ بنێت خڕەی نایەت.
٥٢ ـ شەریکی‌و خەریکی.
٥٣ ـ کاڵەك بە ئەژنوی خۆی ئەشکێنێ.
٥٤ ـ خوا کە دایتێ ناڵێ کوڕی کێیت.
٥٥ ـ پیری ئاخر شەر.
٥٦ ـ نە پێڵاوی تەنگ، نە خانەی بەجەنگ
٥٧ ـ تا بەد نەبینیت بەدخانە بەیان ناکەیت.
٥٨ ـ خوا غەزەب لە بزن بگرێت نانی شوان ئەخوات.
٥٩ ـ ئەڵێی نانی بەساجا سووتاوە.
٦٠ ـ ئەڵێی کێچەو لەگوێی گادا نوستوە.
٦١ ـ ئەڵێی ئاگری بن کایە.
٦٢ ـ حەمام بە تڕ گەرم نابی.
٦٣ ـ لە کێویان پرسی بۆچی ئەوەندە بەرزی ووتی لە بەردەمم بپرسن.
٦٤ ـماڵی خۆنەخۆر بۆ چەکمەبۆر.
٦٥ ـ لە دەرگای کەس مەدە تا لە دەرگات نەدەن.
٦٦ ـ کێ کردی‌و کێ خواردی.
٦٧ ـ سنگ شێری ماکەر پشت.
٦٨ ـ کوێرە چیت ئەوێت دوو چاوی ساغ.
٦٩ ـ خەنجەر لە کا ئەدات.
٧٠ ـ گوریس بە یەك لانە نا گاتەوە ئینجا نۆرەی دوولانەیە.
٧١ ـ ئەگەر نەم دیایە دایکت ئەمردم لەعەزرەت باوکت.
٧٢ ـ پیازی عەولانە خواردنی هەیەو بردنی نی‌یە.

٧٣ ـ مانگا بەدزی کەڵ ئەگرێو بەئاشکرا ئەزێت..
٧٤ ـ مزگەوت ڕوخاوە میحرابی ماوە.
٧٥ ـ دەست بگرە بە کڵاوی خۆتەوە با نەیبات.
٧٦ ـ پارە وەك چڵکی دەست وایە.
٧٧ ـ ئەگەر مار قاچی هەبوایە ئینسان باڵی پەیدا ئەکرد.
٧٨ ـ ئەڵێی کەڵەشێری سەر بارەدارە.
٧٩ ـ بە خەڵك سەگ ئەوەڕێ، بە ئێمەش پشیلەی ناتەواو.
٨٠ ـ دوای کڵاوی بابردوو کەوتووە.
٨١ ـ بوو بە هات هاتەکەی ڕۆم.
٨٢ ـ بە کەر ناوێرێ بە کورتان ڕەپەڕەپیەتی.
٨٣ ـ شەق ئەزانێ قوناغ لەکوێیە.
٨٤ ـ تڕ بێت و بەردەم ڕەشەبا بکەوێت.
٨٥ ـ هەمەوەنگ نەگبەتیت بێ ئەحەی ڕابێ تاقیب کەرت بێ.
٨٦ ـ نە سەلکی سیری نە قنچکی پیازی.
٨٧ ـ بۆ کێچێ گایەك مردار ئەکاتەوە.
٨٨ ـ قەزای دیزە کەوت لە گۆزە.
٨٩ ـ مانگا مردوو دۆ برا..
٩٠ ـ ماری مار خۆریش هەیە.
٩١ ـ دەست بشکێت جێی خوی ناگرێتەوە.
٩٢ ـ زاڵم زەواڵی بۆ پەیدا ئەبێت.
٩٣ ـ ڕۆنی خۆی ئەدات لە سمێڵی خۆی.
٩٤ ـ ژنیش هەیەو ژانیش هەیە.
٩٥ ـ ئەگەر کەوچکت نی‌یە بۆ گوو ئەخۆیت.
٩٦ ـ دەستی لە بنی هەمانەکە گیر بوو.
٩٧ ـ سەگ بەسفەتە پشیلە لەسەر باوەشان.
٩٨ ـ توشی گون ڕەشی خۆی بوو.

٩٩ ـ هاوڕێی خراپ ڕەنگی نەگری خووی ئەگری.

١٠٠ ـ مەقاش نیم پشکۆم پێ بگری.

١٠١ ـ سەری لەبەر هەتاو سپی نەکردووە.

١٠٢ ـ پیاو پارە پەیدا ئەکات پارە پیاو پەیدا ناکات.

١٠٣ ـ بانێکەو دوو هەوا.

١٠٤ ـ لە نالْیش ئەداو لە بزماریش.

١٠٥ ـ چی بچێنیت ئەوە ئەدروویتەوە.

١٠٦ ـ کچی خۆم ناکەم بەقوربانی کوڕی خەڵکی.

١٠٧ ـ دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.

١٠٨ ـ تێر ئاگای لە برسی نی‌یە.

١٠٩ ـ چولەکە خۆت چیت و گۆشتاوت چی‌یە.

١١٠ ـ لە کانی‌یەك ئاوت خواردەوە بەردی تێ‌مەخە.

١١١ ـ ئاو ئەڕوات بەڵام زیخ هەر ئەمێنێت.

١١٢ ـ بە قسەی خۆش مار لە کون دێتە دەرەوە.

١١٣ ـ مریشك هێلکەش ئەکات و ڕیقنەش ئەکات.

١١٤ ـ بەری ڕۆژ بەبێژنگ ناگیرێ.

١١٥ ـ ئاسمان کۆڵەکەی ئەوێت.

١١٦ ـ خوا غەزەب لە مێرووله بگرێت باڵی لێ پەیدا ئەکات.

١١٧ ـ بەرد لە جێگای خۆیدا سەنگینە.

١١٨ ـ سەفەرو معاملە سەنگی مەحەکە.

١١٩ ـ لە جێی سنگان قوزەڵقورتە.

١٢٠ ـ دەرزی‌یەك بکە بە خۆتا ئینجا سوژنێك بکە بەخەڵکا.

١٢١ ـ بە گەورەیی فێری پلاوخواردن بێت دەست بۆ لووتی ئەبات.

١٢٢ ـ قەدری زێڕ لای زەڕەنگەرە.

١٢٣ ـ خوا تا کێو نەبینێت بەفری تێ‌ناکات.

١٢٤ ـ بەردێك نەزان بیخاتە گۆمەوە بە هەزار زانا دەرنایەتەوە.

١٢٥ ـ گۆم تا قوڵ بێت مەلەی خۆشە.
١٢٦ ـ ئەم هەویرە ئاو زۆر ئەبات.
١٢٧ ـ بەرخی نێر بۆ سەربرینە.
١٢٨ ـ لە کەری تۆپیوو ئەگەڕێت ناڵی بکێشێ.
١٢٩ ـ کەری دێز حەز بە تۆپینی خۆیو زەرەی ساحێبی ئەکات.
١٣٠ ـ قسەم حەقە بۆیە رەقە.
١٣١ ـ گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕ وێتەوە.
١٣٢ ـ ئیشی ئەمرۆ مەخەرە سبەینێ.
١٣٣ ـ هەڵەشەو پەلەپەلی پەشیمانی لەدووایە.
١٣٤ ـ تفەنگ بە تاریکەشەوەوە مەنێ.
١٣٥ ـ برامان برایی کیسەمان جیایی.
١٣٦ ـ تۆبەی گورگ مەرگە.
١٣٧ ـ چەم بێ چەقەڵ نابێ.
١٣٨ ـ مانگەشەو سەر لە ئێوارەوە دیارە.
١٣٩ ـ دەستێ حاکم ببڕی خوێنی نی‌یە.
١٤٠ ـ دۆستم ئەوکەسەیە ئەمگرێنێ دوژمنم ئەوکەسەیە ئەم کەنێنێ.
١٤١ ـ چاکە بکەو بیدە بەدەم ئاوەوە.
١٤٢ ـ لەئێستریان پرسی باوکت کێ‌یە ووتی خاڵم ئەسپە.
١٤٣ ـ خواله سوڵتان محمود گەورەترە.
١٤٤ ـ خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردووە.
١٤٥ ـ گەورە ئاو ئەڕژێو بچووك پێ‌ی لێ‌ئەخات.
١٤٦ ـ پارە بدەی مەلا لە مزگەوت دەرئەکەی.
١٤٧ ـ سیروان لێدەم ئەمبەی لێت نەدەم هەر ئەمبەی.
١٤٨ ـ لە ئێستر دابەزی سواری کەر بوو.
١٤٩ ـ کەرە مەمرە بەهارە کورتانت بۆ دێ لەو شارە.
١٥٠ ـ کە بەرد لە جێ‌ی خۆی هەڵکەندرا جێ‌ی خۆی ناگرێتەوە.

١٥١ ـ تف كه رۆكرا هەڵ ناگیرێتەوه.
١٥٢ ـ له بێخەبەران كەشكەك سڵاوات
١٥٣ ـ ئەوەی بۆ گووكەر هەڵ ئەكەوێ بۆ ڕاوكەر هەڵناكەوێ.
١٥٤ ـ شەل نی‌یەو پای شكاوه.
١٥٥ ـ بۆیه پێت ئەڵێم خاڵه چۆلەكەم بۆ بگریت.
١٥٦ ـ ئەڵێی ئەسپێی كراسەكۆنی.
١٥٧ ـ به كەریان ووت ماریفەت بنوێنه، كلكی هەڵبڕی ترێكی لێ دا.
١٥٨ ـ كەر چووه بەغدا بوو به ئێستر.
١٥٩ ـ من ئەڵێم نێره ئەو ئەڵێ بیدۆشه.
١٦٠ ـ مەیموون خۆی زۆر جوانه ئاوڵەیشی دەردا.
١٦١ ـ له ئاوی خوڕ مەترسه، له ئاوی مەنگ بترسه.
١٦٢ ـ بۆ چاكه بگەڕێ له خەڵكا بۆ خراپه له خۆتا.
١٦٣ ـ ماڵی خۆت توند بگره كەس بەدز دامەنێ.
١٦٤ ـ كوتەك له به هەشتەوه هاتووه.
١٦٥ ـ قەل به قەلی ووت ڕووت ڕەش بێت.
١٦٦ ـ ڕێسەكەمان بۆوه به خوری.
١٦٧ ـ من ڕازی تۆ ڕازی داری به قنگی قازی.
١٦٨ ـ چەپڵه به دەستێك لێ نادرێ.
١٦٩ ـ ئاش له خەیاڵێك و ئاشەوان له خەیاڵێك.
١٧٠ ـ كایەكه هی خوت نی‌یه كایەنەكه هی خۆته.
١٧١ ـ هەرچی بەتەمای دراوسێ‌بێ بێ‌شێو سەر ئەنێتەوه.
١٧٢ ـ مەل به باڵێك نافرێ.
١٧٣ ـ ماڵی سپی بۆ ڕۆژی رەش.
١٧٤ ـ برا لەپشت برا بێت مەگەر قەزا لای خوا بێت.
١٧٥ ـ تەیری گول عاشق به داری ژەقنەبووته.
١٧٦ ـ سەگ به زەبری كلكی ئێسقان ئەشكێنێ.

١٧٧ ـ سەگ لە قەسابخانە نەمرێ عەمری بەزایە ئەچێت.

١٧٨ ـ ئاسنی سارد بەفوو نەرم نابێت.

١٧٩ ـ ئەوی بترسێ ناخەلەسێ.

١٨٠ ـ بەندە بێعەیب نابێ.

١٨١ ـ زمان بوەستێ سەر رەحەتە.

١٨٢ ـ زۆر ووتن قورئان خۆشە.

١٨٣ ـ تا ماڵ وەستابێ مزگەوت حەرامە.

١٨٤ ـ خێر بۆ خوێش نەك بۆ دەروێش.

١٨٥ ـ پاروو لە دەم داکەوێت بۆ کۆش باشە.

١٨٦ ـ گۆشتی گونی خۆت بخۆ منەتی قەساب هەڵمەگرە.

١٨٧ ـ خزم گۆشتت بخوات ئیسقانت ناشکێنێ.

١٨٨ ـ سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار.

١٨٩ ـ سوار بوون عەیبێو دابەزین دوو عەیب.

١٩٠ ـ بۆ ڕیش چوو سمێلیشێ نایەبان.

١٩١ ـ یەکێك چاڵ هەڵکەنێ بۆ خەڵك خۆی تێئەکەوێ.

١٩٢ ـ کە خۆری دایم خۆر بە.

١٩٣ ـ سیر بخۆو زورنا لێیە.

١٩٤ ـ بەقەد بەڕەی خۆت پێ ڕاکێشە.

١٩٥ ـ مریشك لاسایی قازی کردەوە قنگی دڕا.

١٩٦ ـ جام ئەڵێت بشکێم و نەزرنگێم.

١٩٧ ـ بە دەستی خۆت سەرت نەخورێنی بە هیچ دەستێ خوروی ناشکێ.

١٩٨ ـ بوکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو تۆ گوێت لێبێ.

١٩٩ ـ نە شیش بسووتێ نە کەباب.

٢٠٠ ـ گەزی چیو جاوی چی.

٢٠١ ـ زلی بێهونەرە.

٢٠٢ ـ بە قسە نییە بە کردەوەیە.

٢٠٣ ـ ئەگەر كوڵ نیت دڕكیش مەبە.

٢٠٤ ـ تەماع قنگی پیاو ئەدڕی،

٢٠٥ ـ تۆ بە عەقل و من بە مەعریفەت.

٢٠٦ ـ هەژاری سەر ڕاست شەریكی دەولەمەندە.

٢٠٧ ـ ئاوی ئاموون و توونی بابا چیت.

٢٠٨ ـ ژن گوێی لێبگرە بەلام بە قسەی مەكە.

٢٠٩ ـ پیریو هەزار عەیب.

٢١٠ ـ خۆ ماست نی‌یە بە لێوەوە دیار بێت.

٢١١ ـ ئیمرۆ لە ئێوەو سبەینێ لە ئێمە.

٢١٢ ـ دنیا تا سەر بۆ كەس نابێ.

٢١٣ ـ ئاو لە شوێنێكا زۆر ماوە بۆگەن ئەكات.

٢١٤ ـ دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.

٢١٥ ـ هەموو جارێك گۆزە بە ساغی لە كانی ناگەڕێتەوە.

٢١٦ ـ دوژمنی خۆی بە شەكر ئەخنكێنێ.

٢١٧ ـ لەگەڵ گورگ شایی ئەكا، لەگەڵ مەڕ شین.

٢١٨ ـ كە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە.

٢١٩ ـ شەڕی خۆترێن مەكە.

٢٢٠ ـ شەریكی دزوو هاوڕێی كاروانە.

٢٢١ ـ ئاشتی دوای شەڕ خۆشە.

٢٢٢ مێشوولە كۆمەڵ بێ فیل یخ ئەدات.

٢٢٣ ـ بۆ دۆستایەتی هەزار كەمە، بۆ دوژمنایەتی یەكێك زۆرە.

٢٢٤ ـ ئازا جارێك ئەمرێت، ترسنۆك ساتی سەد جار.

٢٢٥ ـ سووك بڕوو سەلامەت وەرەوە.

٢٢٦ ـ سەد بەرتیل قەرزێك نابژێرێ.

٢٢٧ ـ سەرچوپی بدەیتە دەست سەگ بولای سەبەتەی نانی ڕائەكێشێ.

٢٢٨ ـ سەگی سپی بو بارخانەی نوكە زەرەرە.

٢٢٩ ـ شوان تا دانیشی کێەڕ بێ دوور ئەکەویتەوە.

٢٣٠ ـ شەر بە چەك و مامەلە بە پارە.

٢٣١ ـ شەڕ لە بەتالی چاکترە.

٢٣٢ ـ زەرەر لە نیوەی بگەڕیتەوە چاکترە.

**٢٣٣ ـ کاسە پڕ بوو لێی ئەڕژێ.**

٢٣٤ ـ کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە.

٢٣٥ ـ کردن هەتا مردن.

٢٣٦ ـ کە پیاو لەدوای کەرەوە ڕۆیی ئەبێ بۆنی تەرسی بکا.

٢٣٧ ـ کەر بارەکەی لە تفەنگ بێ گورگ هەر ئەیخوا.

٢٣٨ ـ کەڵەشێریش نەبێت ڕۆژ هەر ئەبێتەوە.

٢٣٩ ـ کە شیرت وەشان ئەبێ قەڵغانت پێ بێ.

٢٤٠ ـ کەڵەشیر لە ناوەختا بخوێنێ سەری خۆی ئەخوات.

٢٤١ ـ کەم بخۆو مەچۆرە سەر حەکیم.

٢٤٢ ـ گا لە گاگەل بەجێبمێنێ ، شاخی خۆی ئەشکێنێ.

٢٤٣ ـ گرێی دەست مەخەرە دان.

٢٤٤ ـ گورك کە پیر بوو ئەبێت بە مەسخەرەی سەگەل.

٢٤٥ ـ مەردی ووشیار، دەست بە کونێکا ناکا دوو جار.

٢٤٦ ـ هەر عەقڵە لە خەساری.

٢٤٧ ـ ئەگەر سەگ نەبێ گورگ ئەتخوا.

٢٤٨ ـ ئەوی بچێتە شاری کوێران ئەبێ دەست بە چاوەوە بگرێ.

٢٤٩ ـ ئەوی لەنزیك کوورەوە بێت پریشکی لێ ئەکەوێ.

٢٥٠ ـ بە درێژی خۆتا ئەڕوانی بەپانی خەلکیشا بڕوانە.

٢٥١ ـ خلیسکان تۆڵەی پەلەکەرە.

٢٥٢ ـ دار کرمی لە خۆی نەبێ هەزار ساڵ ئەژی.

٢٥٣ ـ درۆزن هەر جارێك ناشتا ئەکات.

٢٥٤ ـ دوو شووتی بە دەستێك هەڵناگیرێ.

٢٥٥ ـ دەریا بە دەمی سەگ پیسس نابێت.

٢٥٦ ـ دەستێك نەتوانم بیبڕم ماچی ئەکەم.
٢٥٧ ـ دەستی کەس پشتی کەس ناخورێنێ.
٢٥٨ ـ ڕازت لای یەکێك دانێو پرست لای هەزار.
٢٥٩ ـ فرۆشتن لە خواستن باشترە .
٢٦٠ ـ گەوهەر لەناو قوڕا وون نابێت.
٢٦١ ـ لەگوڵیان پرسی زۆر گەشی ووتی باخەوانەکەم مەردە.
٢٦٢ ـ خوێ ڕیشی نیيە بە کۆستە پێئەکەنێ.
٢٦٣ ـ دایکی دز یا سنگ ئەخوا یان سنگ ئەکوتێ.
٢٦٤ ـ شێر بت شکێنێ نەك ڕێوی بت خوات.
٢٦٥ ـ سەرت بدۆڕێنەو قسە مەدۆڕێنە.
٢٦٦ ـ بزن بۆ شەوێك جێی خوێ خۆش ئەکات.
٢٦٧ ـ ئەم نانە بەو ڕۆنە.
٢٦٨ ـ پا دار بگرەو بێپا ماڵی خۆمانە.
٢٦٩ ـ نە بای دیوەو نە باران.
٢٧٠ ـ کەر بە پارەی بەفر بکڕێ ئەبێ لە ئاوا بخنکێ.
٢٧١ ـ ناوی گەورەو دێی وێران.
٢٧٢ ـ عوزر لە قەباعەت خراپترە.
٢٧٣ ـ لە هەموو دیزەیەکا ئەسکوێیە.
٢٧٤ ـ هەردووکیان جاشی ماکەرێکن.
٢٧٥ ـ من پیادە ئەو سوارە.
٢٧٦ ـ تەنیایی هەر بۆ خوا باشە.
٢٧٧ ـ نانی کەوتۆتە ڕۆنەوە.
٢٧٨ ـ دۆو دۆشاوی تێکەڵ کردووە.
٢٧٩ ـ ئەڵێی چێشتی مجەورە.
٢٨٠ ـ شا بە تا قەتت.
٢٨١ ـ زۆریان ووت و کەمی بیست.

٢٨٢ ـ مل له چه‌قو ئه‌سوێ.

٢٨٣ ـ مردن مردنه لنگه‌فرتێ چی‌یه.

٢٨٤ ـ سوارێك به‌ته‌نها تۆز ناكات.

٢٨٥ ـ لووتی به‌رز هه‌ر ئه‌نه‌وێ.

٢٨٦ ـ حه‌ق دار له حه‌قی خۆی وازدێنێ، شایه‌ت واز نایه‌نێ.

٢٨٧ ـ سه‌د جه‌رده لاتێك رووت ناكاته‌وه.

٢٨٨ ـ عیله‌تی بێ‌به‌رگی‌یه هه‌تیو مه‌بلی هه‌تاو ئه‌كات.[1]

٢٨٩ ـ زۆردار ئاوی سه‌ره‌و ژوور ئه‌ڕوات.

٢٩٠ ـ خۆڵی به‌ر گوانی خۆت بخۆی له پلاوی بێگانه باشتره.

٢٩١ ـ شوێنی شێره ڕێوێ لی‌ێ ئه‌كا گێره.

٢٩٢ ـ بیانووی تر نانی جۆیه.

٢٩٣ ـ كابه بروخێنه دڵێ مه‌ره‌نجێنه.

٢٩٤ ـ ئه‌و جێ‌یه خۆشه كه دڵ پێ‌ی خۆشه.

٢٩٥ ـ قسه له‌پاش حه‌وت كێو ئه‌گاته‌وه به خێو.

٢٩٦ ـ سه‌ر بۆ سه‌ربڕین نه‌ك بۆ سه‌رزه‌نشت.

٢٩٧ ـ زۆر ببیسته با له كه‌م بگه‌ی.

٢٩٨ ـ نان ئه‌و نانه ئه‌مڕۆ له خوانه.

٢٩٩ ـ ئه‌ڵێ‌ی خه‌نجه‌ری ده‌بانه خۆی له كێلانا ناگرێ.

٣٠٠ ـ هه‌موو شتێ به خۆی‌خوێش به‌مه‌عنا.

٣٠١ ـ به‌ڕیشی مه‌ردانه‌ت قه‌سته‌م.

٣٠٢ ـ نازانم ڕه‌حه‌تی گیانم.

٣٠٣ ـ له كه‌ری نه‌بوو ئاخوڕ هه‌ڵئه‌به‌ستێ.

٣٠٤ ـ له‌گه‌ڵ تری خۆیا شه‌ڕئه‌كات.

٣٠٥ ـ ئه‌ڵێ‌ی ڕێوی‌یه‌كه‌ی قه‌مچوغه‌یه.

٣٠٦ ـ له‌قه‌ی ماین نایه‌شێ.

٣٠٧ ـ سه‌ری له گوێ قه‌بر ئه‌له‌رزێ.

٣٠٨ ـ ئەڵێی میزی پشیلە لەبنی پێی دراوە.

٣٠٩ ـ ئەڵێی پەشتەماڵی حەمامە هەر رۆژە بە بەر یەکێکەوەیە.

٣١٠ ـ گوو ناکات نەك برسی بێت.

٣١١ ـ شێر لە بێشە دەرچێت، چ نێر بێ چ مێ.

٣١٢ ـ مەرگ لەگەڵ ئاوەڵانا جەژنە.

٣١٣ ـ بە دەرزی بیر هەڵناکەنرێ.

٣١٤ ـ سەری تاشیو ئاوێنەکەی دایە دەست.

٣١٥ ـ شێتە بۆ شێتیت، ئەڵێ بوم ئەلوێ.

٣١٦ ـ لە دز وایە هەموو کەس دزە.

٣١٧ ـ کاسە کە چەور بو ئاو ناگرێتە خۆی.

٣١٨ ـ زوڵم لە قەویەتیا ئەپچرێ.

٣١٩ ـ هەزار ساڵ بکەی بێگانە پەرستی ئاخری ئەهێنی نشوستی.

٣٢٠ ـ ئەو چاوە کوێر بێ دوژمنی خۆی نابینێ.

٣٢١ ـ هەمووکەس لە کراسی خۆیا پیاوە.

٣٢٢ ـ دەستی خۆی نییەو ماری پێ ئەگرێ.

٣٢٣ ـ بە دوو شت باوەڕ مەکە، پێکەنینی ئاغاو خۆشی زستان.

٣٢٤ ـ سکم عەماری کەس نییە.

٣٢٥ ـ ناوی بە کوڵەکەی ئاشا چێت.

٣٢٦ ـ نە ئاغای هەتیو، نە ژنی چەتیو، نە خانووی سەر شیو.

٣٢٧ ـ دنیا هەرەسێکە ، نەفەسێکە، هەردەم بەدەس کەسێکە.

٣٢٨ ـ حەرام بەتامە.

٣٢٩ ـ ئاڵتون بە مەحەك پیاو بەتەجروبە.

٣٣٠ ـ کێوێك ئەروخێو کەندەلانێك پر ئەبێتەوە.

٣٣١ ـ کەڵەشێر لە سەرە نوێلکی خۆیا ئازایە.

٣٣٢ ـ ئەسپێ لە باخەڵیا سەوزەڵە گیانم ئەڵێ.

٣٣٣ ـ لەگەورە گەورەی پشدەرێ، هۆمان کەوتە قونی کەرێ.[2]

٣٣٤ ـ سەگ لە کولێرە ڕاناکات.

٣٣٥ ـ ئەوەی زۆر بخوات زۆر ناژی.

٣٣٦ ـ هەر بازی بازی بە ڕیشی قازی.

٣٣٧ ـ ئەتەوێ نەمری؟ چاکە بکە.

٣٣٨ ـ زەڕینی کەر بانگی شەیتانە.

٣٣٩ ـ لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە.

٣٤٠ ـ نان بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم.

٣٤١ ـ داری بێبەر بۆ برین چاکە.

٣٤٢ ـ گا بەتەنها گێرە ناکات.

٣٤٣ ـ بۆ هەر دەردە مەردێك.

٣٤٤ ـ گلۆڵەی کەوتە لێژی کەس خاسی پێ نایەژی.

٣٤٥ ـ جۆگەلە دەریا لێڵ ناکات.

٣٤٦ ـ حەق ئاو ڕائەوەستێنێ.

٣٤٧ ـ سواری ئەسپی خەڵك بیت هەر پیادەیت.

٣٤٨ ـ کوێر کوێر نابا بەڕێوە.

٣٤٩ ـ ماسی لە سەرەوە بۆن ئەکات.

٣٥٠ ـ کێری ئەمرۆ بە قنگی سبەینێ.

٣٥١ ـ دۆست لە تەنگانەدا دەرئەکەوێ.

٣٥٢ ـ بە خوشەویستی ژن بڕوا مەکە.

٣٥٣ ـ بەڵێن بەسەربردن نیشانەی سەرکەوتنە.

٣٥٤ ـ خوویەك گرتت بە ژیری، تەرکی ناکەی بە پیری.

٣٥٥ ـ ترەکەی تر نی یە، جەواڵ درە.

٣٥٦ ـ وەك نیسك وایە، بەرو پشتی بۆ نی یە.

٣٥٧ ـ خۆت بۆ بۆرە پیاو بکوژە ئەڵێ بە دەردی خوا مرد.

٣٥٨ ـ بۆ پیاوی عاقڵ ئیشارەتێك بەسە.

٣٥٩ ـ خوا دەردیش ئەداو دەرمانیش ئەدا.

٣٦٠ ـ سەد حەكیم بەقەدەر دەردەداریك نازانی.
٣٦١ ـ شا بە سەپانی خۆی نازانێ.
٣٦٢ ـ میوانی درەنگ وەخت گلەیی لەسە خۆیەتی.
٣٦٣ ـ سەركزی دڵ ووریابە.
٣٦٤ ـ تێری خواردووە زەڕیوە.
٣٦٥ ـ ئەخۆم بۆ ئەوەی بژیم نەك بژیم بۆئەوەی بخۆم.
٣٦٦ ـ زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە باشترە.
٣٦٧ ـ هەزار گوناهو یەك تۆبە.
٣٦٨ ـ دڵ وەكو مێش وایە بە گویشەوە ئەنیشیتەوەو بە گولێشەوە.
٣٦٩ ـ قوزی گوێ ئاگردان قەدری نی‌یە.
٣٧٠ ـ لەو جێ‌یە ئاو هەیە زەوی نی‌یە لەو جێ‌یەی زەوی هەیە ئاو نی‌یە.
٣٧١ ـ بار لە باج ناناڵێنێ.
٣٧٢ ـ ماڵەكەی تۆ ئەخۆم بە بەلاش هێنەكەی خۆم ئەخەمە پاش.
٣٧٣ ـ گوریسی داخستووە، دنیای تێ‌خستووە.
٣٧٤ ـ برێشكەی جۆ ئەخوات، بە سابوون دەست ئەشوات.
٣٧٥ ـ گۆشتی بۆ تۆ ئێسقانی بۆ من.
٣٧٦ ـ تا گوێرەكە بە گا ئەكەیت خوێنی خوت بە ئاو ئەكەیت.
٣٧٧ ـ ژن بێ‌كەس بێ هار ئەبێ پیاو بێ‌كەس بێ هەژار ئەبێ.
٣٧٨ ـ كەس لەپرێ نابێ بە كوڕێ.
٣٧٩ ـ پیاو كە زۆری ووت چاكیش ئەڵێ‌و خراپیش.
٣٨٠ ـ چەپەرە شرە چ پیوەبێ چ لێوەبێ.
٣٨١ ـ تا ئەڵێ‌ی بەرسیلە ترێ پێ‌ئەگات.
٣٨٢ ـ حازر خۆری بەرسێبەرە.
٣٨٣ ـ بەدووعای سەگ بێت ئێسقان ئەبارێت.
٣٨٤ ـ تەمەڵ ئەڵێ هەمووی ئەخۆم دوایی ئەڵێ چیم كرد بە خۆم.
٣٨٥ ـ خنجەر كالانی خۆی نابڕێ.

٣٨٦ ـ زۆر جڵەو بۆ تورەیی شل مەکە.
٣٨٧ ـ هەتا خۆم بوم بە بانانەوە بەرتیلیان ئەداو ئەپاڕانەوە:
٣٨٨ ـ ئەوکەسەی گیان ئەدا گیانیش ئەسێنێ.
٣٨٩ ـ کەسی بێکەسان هەر خوایە.
٣٩٠ ـ بەرماڵی بەسەر ئاوەوە ئەگەڕێت.
٣٩١ ـ کەس کەس ناباتە بەهەشت.
٣٩٢ ـ تەور کلکی خۆی نابڕێتەوە.
٣٩٣ ـ دۆستی دۆستم دۆستمە، دوژمنی دوژمنم دۆستمە.
٣٩٤ ـ دوژمن بچوکیش بێت ئیشی زل ئەکات.
٣٩٥ ـ ناعیلاجی سەر بە ماڵی دوژمنا ئەکات.
٣٩٦ ـ ئەگەر زاڵ نەبی بەسزمان ئەبی.
٣٩٧ ـ دەوڵەمەندی هەموو عەیبێك دائەپۆشێ.
٣٩٨ ـ پیاوی نابووت قەرزی کۆن و خزمی دوور یاد ئەکات.
٣٩٩ ـ دار پوازی لە خۆی نەبێت ناقلیشێت.
٤٠٠ ـ کەر نوێ برد دەش ئەبا.
٤٠١ ـ بەرچاو تەنگ ریسوایی دێنێت.
٤٠٢ ـ کل لە چاو ئەفڕێنێ.
٤٠٣ ـ گووی کرد بە داری-فەلاقەکەدا.
٤٠٤ ـ نە بای دیوە نە باران.
٤٠٥ ـ کارێکی کرد با بە دەواری شڕی ناکات .
٤٠٦ ـ ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار.

(١) نالی ئەڵێ: بێ بەرگی‌یە عیللەت کەهەتیو مەیلی هەتاوە... جا ئەمەقسەی نالی‌یە بۆپەند، یا پەندەو نالی کردوویە بەشیعر.
(٢) یا «ڕێمان کەوتە قلفرەی کوڕی جافرێ» بەجۆری تریش ئەوترێ.

«ع.م»

## ووتەی جێگر لە گفتوگۆدا

- ١ -

خاوەن کتێب کۆمەڵێ ووتەی لەژێر ئەو ناوونیشانەی سەرەوەدا کۆکردۆتەوە، ئەمانە لەرووی فۆلکلۆرو دابەشکردنی زانستی‌یەوە زوربەیان بەر ئیدیۆم ئەکەون. لێرەدا جیاکردنەوەیان مەبەس نەبوو، تەنیا ئەوەندە مەبەسە کە ئەم ووتانە بەم چەشنە لێرەدا تۆمار کراون، لە ناوچەی سلیمانیدا باون، ڕەنگە هەندێکیان لەناو هەموو کورددا هاوبەش بن، تەنانەت بەشی گەلانی تریشیان پێوەبێ، ڕەنگە لەهەندێ کتێبیشدا هەندێکیان تۆمار کرابن. بەڵام مەبەسی نووسەر هەر داچەسپاندنی ئەو ڕاستی‌یەیە کە باسکرا، لە بەرئەوە وەك خۆی هێڵرایەوە.

«ع.م.ر»

## ووتەی جێگر لەنێوان گفتوگۆدا

١ - ئاوی ئاموون و توونی بابا چیت:
٢ - چرپو چلاغ ئەسووڕێتەوە.
٣ - زلی بێ‌هونەر.
٤ - دەمە چیت لێ کەمە.
٥ - دەمی ئەڵێ‌ی چیکەنەیە.
٦ - دەمی لە قنگی پیسترە.
٧ - تەپلی تۆپێن کرا.

٨ ـ پیس و چەپەڵ.
٩ ـ چەند زۆڵە ئەڵێی میچی قومارە.
١٠ ـ ئەڵێ گەنەی گونی گایە.
١١ ـ هەر ئەخواو ئەڕی.
١٢ ـ ئەمە قسەی گوێ ئاگردانە.
١٣ ـ حەواڵە بەگەواڵە.
١٤ ـ قسەی هەلەق و مەلەق ئەکات.
١٥ ـ خوێکەی ڕشت.
١٦ ـ کوڕی خواو کچی ئاسمان.
١٧ ـ چەند درێژە ئەڵێی حووچی بنی حەللەقە.
١٨ ـ ئاش بە تاڵ.
١٩ ـ حەپۆلی مێش خۆر.
٢٠ ـ شیرو تیر لە یەك ئەسوون.
٢١ ـ دووکانی بەکرو دوو قاڵب سابوون.
٢٢ ـ سێ جرتەکی هەڵ ئەپەڕێت.
٢٣ ـ هیچ نی‌یە پێچی مێزەرێکە.
٢٤ ـ ڵنگەو قووچ کەوت.
٢٥ ـ کەللە شەکی پاکراو.
٢٦ ـ ملی بە حەوت تەور نابڕێتەوە.
٢٧ ـ سەری قۆچکەتاشە.
٢٨ ـ سەری لە هێلکە نەجووقاوە.
٢٩ ـ دیزە بە دەرخۆنەی کە.
٣٠ ـ مڵچە مڵچ.
٣١ ـ بە پێوە هەڵ ئەمیزێ.
٣٢ ـ قیت ئەڕوا.
٣٣ ـ کابرایەکی کەللەشەقە.

٣٤ ـ ئا لەم حەیسو بەیسەدا.
٣٥ ـ فیقانی بە زۆڕناکەدا.
٣٦ ـ کەوڵە کۆن.
٣٧ ـ فلْقە کۆن.
٣٨ ـ کەف وکوڵی دائەمرێتەوە.
٣٩ ـ تیا گەوزی.
٤٠ ـ لووس و باریك.
٤١ ـ بە قاڵ و چەقاڵ.
٤٢ ـ خە یاڵی خاوە.
٤٣ ـ ئاگری بن کایە.
٤٤ ـ سمێڵێ ئەڵێ‌ی خەتی سەرشانی جاشەکەرە.
٤٥ ـ شڕەی بەرتۆپەکە.
٤٦ ـ لات و لەوار.
٤٧ ـ حەشەری .
٤٨ ـ پلاری خۆی هاویشت.
٤٩ ـ درێژ دادرە.
٥٠ ـ ئەڵێ‌ی پەپوولەی بەهەشتە.
٥١ ـ قیر سچمەیە.
٥٢ ـ بە ڕەچەڵەکیا ئەچمە خوارێ.
٥٣ ـ ئەڵێ‌ی کچی عەلە تڕ پاشایە.
٥٤ ـ هەزار فاکت بە فیکێکم.
٥٥ ـ چاوی ئەڵێ‌ی قوزە مریشکە.
٥٦ ـ حەپوولکی کەس نادات.
٥٧ ـ لە کەلی شەیتان وەرە خوارێ.
٥٨ ـ گەلە کۆمەکێ.
٥٩ ـ بۆی دەرچوو وەك بەرزەکی بانان.

٦٠ ـ خیشی کردووە.
٦١ ـ ئەڵێی زەرنەقووتەیە.
٦٢ ـ درێژ داهۆڵ.
٦٣ ـ پەڕپووت.
٦٤ ـ نقەنق.
٦٥ ـ تاس و لووس.
٦٦ ـ من کردم تۆ نەیکەیت.
٦٧ ـ ناماقوڵت کرد.
٦٨ ـ لە خشتەی برد.
٦٩ ـ شەوقی لە تەپاڵە بڕیوە.
٧٠ ـ کەینو بەین.
٧١ ـ لە ووزەی کەسا نی‌یە.
٧٢ ـ ئەنەك دۆوەنەك.
٧٣ ـ شڕو شیتاڵ.
٧٤ ـ خواو ڕاستان.
٧٥ ـ لە شەڕی شەیتان لە بەڵای ناگەهان.
٧٦ ـ سکم عەماری کەس نی‌یە.
٧٧ ـ چی‌بکەم ڕووی زەمانە ڕەش بێت.
٧٨ ـ ئەڵێی چۆلەکەی نەوتاوی‌یە.
٧٩ ـ ئەڵێی سەگی پێ‌سوتاوە ئەسووڕێتەوە.
٨٠ ـ ئەبێت من لە ژنە دۆمەکە بم.
٨١ ـ سەرفراز بیت.
٨٢ ـ خوێنی خۆی لەسەر خۆی.
٨٣ ـ بۆنی شیری خاو لە دەمی دێت.
٨٤ ـ ترو تفاق.
٨٥ ـ قایش و قرووش.

٨٦ ـ کەوتینە سەر ساجی عەلی.
٨٧ ـ هەیهۆ، هەیهۆ.
٨٨ ـ پەحا کە نووزە درێژە.
٨٩ ـ بەدەگمەن هەڵ ئەکەوێ.
٩٠ ـ بێ فیزە.
٩١ ـ ترزلە.
٩٢ ـ بۆتە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی.
٩٣ ـ لە پەلوپۆ کەوت.
٩٤ ـ تاسانی.
٩٥ ـ لە تاسەوە چوو.
٩٦ ـ با هەر بە دەردی خۆیەوە بتلێتەوە.
٩٧ ـ دووا براوەکە.
٩٨ ـ ئۆقرە ناگرێت.
٩٩ ـ سرەوتی نی‌یە.
١٠٠ ـ ئەڵێی کیسەو سەبیلە.
١٠١ ـ تازە ئەو باوکەی مرد.
١٠٢ ـ پڕ بە پێستی‌یەتی.
١٠٣ ـ چەرخی لە چەمەر ئەکێشم.
١٠٤ ـ کونەمشکی لێ بوو بە قەیسەری.
١٠٥ ـ ئەڵێی برەنۆکە.
١٠٦ ـ ئەڵێی بنەتووە.
١٠٧ ـ بووە بەکۆتەرە.
١٠٨ ـ دەمی ئەڵێی گاوەخانەیە.
١٠٩ ـ ئەو دەستە بنێرە ژوور سەرت.
١١٠ ـ برۆ پشتێنی لێ بکەرەوە.
١١١ ـ سەری دنیای لێ هاتۆتەوەیەك.

١١٢ ـ كارێکی پێ‌کرد با بە دەواری شڕی ناکات.
١١٣ ـ ئەڵێی من کرە ئەکەم و ئەو ئەیخوات.
١١٤ ـ سەری دنیا بە پووش نەگیراوە.
١١٥ ـ دارو دیوار گوێی هەیە.
١١٦ ـ کەروێشك بە گا ئەگرێت.
١١٧ ـ ئاسمان ئەستوونی ئەوێت.
١١٨ ـ وەکو نیسك وایە بەرو پشتی بۆ نی‌یە.
١١٩ ـ کار لە کار ترازا.
١٢٠ ـ حەوشەکەی خوارە.
١٢١ ـ نانی هاری گرتووە بەدەمەوە.
١٢٢ ـ دەمی بگرێت بە قنگ قسە ئەکات.
١٢٣ ـ عەیبە عەبایە ناموس حەیایە.
١٢٤ ـ لێی گەڕێ مەیورووژێنە.
١٢٥ ـ تیتیلەو بیبیلە.
١٢٦ ـ گەزی چی‌و جاوی چی.
١٢٧ ـ ئەگەر باوکی خۆی نەدیایە ئەی ووت کوڕی عەلە ترپاشام.
١٢٨ ـ سنگ شێری ماکەر پشت.
١٢٩ ـ کە خوا ناردی ناڵێ کوڕی کێیت.
١٣٠ ـ ئەگەر بە کەم نەزانی بە زۆریش نازانی.
١٣١ ـ لەخۆڕایی شانی خۆی ئارداوی ئەکات.
١٣٢ ـ یەك هەرایە سەگ ساحێبی خۆی ناناسێت.
١٣٣ ـ ئاگری جگەر هەڵی گرتووە.
١٣٤ ـ ڕێگای بۆ تەخت بووە.
١٣٥ ـ کرەش ئەکات.
١٣٦ ـ تێری خواردووەو زەڕیوە.
١٣٧ ـ گا بە پێوە قوت ئەدات.

١٣٨ ـ ئەڵێ‌ی لە گوێ‌ی گادا نووستووە.

١٣٩ ـ لە بێ‌خەبەران کەشکەك سڵاوات.

ـ ٢ ـ

بەشێك لە ئیستیلاحی ناوماڵ و خانەوبەرە، هەندێ ئیدیۆمی تریش لەم چەند لاپەڕەیەدا لەلایەن خاوەن کتێبەوە کۆکرابوونەوە. بایەخی ئەمانەش هەر لەوەدا بوو، کە لە ناوچەی سولەیمانیدا بەکاردێن، ئیتر بۆ لێکۆڵەرەوە هەیە، شتی کوردیی گشتیی هاوبەش و بەشی گەلانی تریشی تێدا بدۆزێتەوە لەبەرئەوە تۆمار کردنیان لەم کلاورۆژنەیەوە سوودمەندە.

«ع.م.ر»

١ ـ داڵان : خانووی جاران (قەیم) کە لە دەرگای دەرەوە ئەچویتە ژوورەوە بە چەند هەنگاوێك پێش ئەوەی بچیتە حەوشە ئەو ماوەیە سەری گیراوە.

٢ ـ هەیوان : لە حەوشەوە بە پێپیلکە سەرئەکەوتیت بۆ هەیوان، دوو سێ کۆڵەکەی لەژێردا بوو و هۆدەی بەدەوروپشتەوە بوو .

٣ ـ پشت هەیوان: هۆدەی پشتی هەیوان بۆ چێشت لێ‌نان و قاپ و قاچاخ .

٤ ـ گەنجینە: ژوورێکی بچووکە لەسەر پشت هەیوان بۆ زەخیرە.

٥ ـ کەلەگی : هۆدەی تەنیشت پشت هەیوان بۆ دانیشتن و نان خواردن.

٦ ـ ژێرخان: ئەوژوورانەی کەوتبوونە ژێر هەیوان و ژوورەکانی سەرەوە.

٧ ـ پێ پیلکە: قاڵدرمە.

٨ ـ باڵەخانە : پێشی دووەم نهۆمی خانووەکە لەسەر کۆڵان.

٩ ـ ڕاڕەو: پێشی دووەم نهۆمی خاتووەکە ئەکەوێتە سەر حەوشەکە، تارمە.

١٠ ـ عروسی : هەندێ خانوو پێشی ڕاڕەوەکەی کردبوو بە جامخانەی تەختە.

١١ ـ بن میچ: سەقف.

١٢ ـ هەورەبان : بە پێ‌پیلکە ئەچوویتە سەربان ئەو ماوەیە سەری گیرابوو.

١٣ ـ سەکــۆ: زۆر ماڵ سەکــۆی تیــا بوو بۆ هاویــنــان بۆ دانیشتن و نووستن لە ناوەڕاستی حەوشـەکـەدا دروست کرابـوو لە خشتی کاڵ وە سواغ درابـوو، مەتـری بەرزو چەند مە ترێك پان.

١٤ ـ گوێسوانە: قەراغی سەربانی دارەڕا.

١٥ ـ پلوسـك : پارچـەدارێکی ناو هەڵ کوڵـدراو یان پارچـە تەنـەکەیەك بەدرێژی مەترێك ئەبوو لەسەر گوێسوانەکە توندیان ئەکرد بۆ ئەوەی ئاوی سەربانی پیا بێتە خوارەوە.

١٦ ـ چۆڕاوگە : ئەو ئاوەی بە پلوسکەکەدا ئەهاتە خوارەوە.

١٧ ـ کەلاوە: پارچە ئەرزێکی زیادە لە کۆڵانێکدا یان خانووە کۆنێکی ڕووخاوە.

١٨ ـ سەرەنوێلك: دەشتایی بەردەمی ماڵەکان کە خۆڵ و پیسایان لێ فڕێئەدا.

١٩ ـ تەپۆڵکە : لە شێوەی گردە بەڵام بچکۆلەیە، زۆر جار لە بەردەمی هەندێ ماڵدا تەپۆڵکە بووە واتە بەرزایی بوو ئەیان ووت: خانووی سەرتەپۆڵکەکە.

٢٠ ـ کولانە: لە شێوەی ژوورێکی زۆر بچوك بۆ مریشك و کەڵەشێرو کۆترو سەگ . . هتد.

٢١ ـ شەبەقی: مەلا بانگ دان.

٢٢ ـ سبای صاڵحان: بەیانیان زوو.

٢٣ ـ بەرچایی : نانی بەیانیان.

٢٤ ـ چێشت هەنگاو: پێش نیوەڕۆ.

٢٥ ـ قاوەڵتی : نانی نیوەڕۆ.

٢٦ ـ بانگی شێوان: مەغریب، بانگی ئێوارەو کاتی نان خواردن.

٢٧ ـ قنج و قیت ئەڕوات: ڕێك ئەڕوات.

٢٨ ـ پەشۆکاوە: شڵەژاوە : شپرزەیە.

٢٩ ـ پێچی مێزەرێکە: مەبەستی ماوەیەکی دوورودرێژە لەخۆیەوە ئەبڕێتەوە.

٣٠ ـ بسکەی سمێڵی دێت: زەوق و کەیفی هەیە.

٣١ ـ گەڵاوگــەڵ ئەڕوات: یەکێـك لە کاتی ڕۆیشتنـدا بۆشـایی لەبـەینی هەردوو قاچیدا هەبێت.

٣٢ - پەیزەن : بەیەکێکیان ئەوت پاژنەی هەردوو پێ ی لە ڕۆیشتندا لە یەکی بدایە
٣٣ - پیسکە: چروکە : پولەکی یە : ڕەزیلە.
٣٤ - چەنەبازە : زۆر بلێ یە.
٣٥ - خوێ ی چێژ : پێش پێ گەیشتنی چێشت تۆزێك خواردنی بۆ تام و چێژ یان بۆ تاقی کردنەوەی سوێری و بێ خوێیی.
٣٦ - بەرکوڵ: تۆزێ لە خواردنی چێشت لە سەر مەنجەڵەکە پێش نان تێ کردن.
٣٧ - شەوچــەرە : لە شەوانی زستــانــدا خواردنی وەك مێــوژ و نۆك و باســوق و سنجوق و قەزوان و گوڵەبەڕۆژەو برێشکەو. . . هتد.
٣٨ - گزی وفزی : فروفێڵ.
٣٩ - قروقەپ : بێ دەنگی.
٤٠ - مێشومەگەز : مەگەز لە مێش گەورەترە لە شوێنی پیسایدا هەیە.
٤١ - تاساوە : بەتکاچوە : یەکێك کە هەناسەی بۆ نەدرێ بەباشی.
٤٢ - سەرفرازبیت : بەرخورداربیت: سەلامەت بیت.
٤٣ - گێژ و وێژە : حۆلەکەیە: گەمژەیە، گێلە.
٤٤ - واقی ورماوە : حەپەساوە.
٤٥ - پلارمان تێ ئەگرێت: توانجمان تێ ئەگرێت : قسەی ناخۆش و بەتوێکڵ تێ گرتن.
٤٦ - بە گاگۆڵکێ ئەڕوات : منالێك پێش پێ گرتن بە قاچ و دەست ئەڕوات.
٤٧ - خەریکی گڕوگاڵە: منالێك تازە فێری هەندێك قسە ئەبێت.
٤٨ - بووە بە سینـەمـەکی : چایـەك زۆر بکـولایـەو زۆر بمـایـەتـەوە، سینەمەکی دەرمانێکە لای عەتار بۆ منال کە دلی تێ کەل بهاتایە ئەیدرایە.
٤٩ - قاپ و قاچاخ : کەرەسەی چێشت لێ نان و نان خواردن.
٥٠ - چینی و فەخفووری: قاپ و دەوری لە کاشی و شووشە.
٥١ - بەسەرزارەکی : لەڕوودا، دامان و نابەدلی.
٥٢ - بەڕەچەڵەکتا، بە ناختا ئەچمە خوارێ: هەموو کەس وکارت لەناو ئەبەم لە کاتی شەڕا.

٥٣ ـ میزنه، دەڵەمیز : منالێك لەخەودا میزی بکردایە بەخۆیدا.
٥٤ ـ تیکەنان : پارویەك نان.
٥٥ ـ دەمەتەقێ : قسەکردن بۆ کات کوشتن.
٥٦ ـ خۆی تاس ولوس داوە: خۆی رێك خستووە، جوان کردووە.
٥٧ ـ ووردەوالا : دەست گێر ئەیگێرا، ووردە بابەتی ژنان.
٥٨ ـ کەینوبەین : جووڵانەوەی نهێنێ لەنێوان دوو کەسدا.
٥٩ ـ بە ترو فیز: لووت بەرزە : تری زلە.
٦٠ ـ بێ‌فیزە : بێ‌هەوایە.
٦١ ـ ترو منەت ئەکا بەسەرما : یەکێك ئیشێك بۆ یەکێکی تر ئەکات پاشان ئەیداتەوە بەسەریا.
٦٢ ـ ئەنێ‌ی میچە : ئەڵێ‌ی میچی قومارخانەیە: چەند زۆڵ و شەیتانە: بۆ یەکێك کە وریاو زیرەك بوایە.
٦٣ ـ خۆی شان ئاردآوی کردووە : بۆ یەکێك کە لە هەموو شتێکدا خۆی تێ‌هەڵقورتانایە.
٦٤ ـ ویرەویرکەرە : خوتەخوتکەرە : بۆ یەکێك لەسەر شت بڕۆیشتایە لە قسەکردنا.
٦٥ ـ مشتومریانە : دەمەقاڵێ‌یانە.
٦٦ ـ نقەنق : یەکێك شتێکی قورسی هەڵبگرتایە لەژێریا ئەی‌نقان.
٦٧ ـ نوکەنوك : منالێك کە نیوەی گریانەو نیوەی قسەیە.
٦٨ ـ رێچکەیان بەستووە : ریزیان بەستووە.
٦٩ ـ خەملیوە : پێگەیشتن بۆ هەموو شتێك.
٧٠ ـ جم وجوولیانە : هاتوچۆیانە بە شێنەیی : هاتووچۆیانە لەسەرخۆ.
٧١ ـ ماخۆلانیەتی : منالێك کە بزێوو عەجول بووایە.
٧٢ ـ ئۆقرە ناگرێ : سرەوتی نی‌یە : ئارامی لێ براوە: ئەڵێ‌ی جیوەی تیایە.
٧٣ ـ بوغس لە سکە : رق و کینە هەڵگرە.
٧٤ ـ تەڵەکەبازە : فێلبازە.

٧٥ ـ دوورەوپـەرێـز وەستـاوە : بەركـەنـارو لاتـریسكـە وەستـاوە : لەدوورەوە سەیرئەكات و تێكەڵ بە كۆڕو كۆمەڵ نابێت.

٧٦ ـ بەم زەوایە : بەم .نانە.

٧٧ ـ گۆتاوو ڕوەكە ئەهێنێتەوە ئێرە : شەڕو ئاژاوەكە ئەهێنێتەوە ئێرە.

٧٨ ـ سەرزەنشت : ئامۆژگاری : قسەی چاكەو ڕێگا پیشاندان.

٧٩ ـ بەربەڕۆچكە : بەرهەتاو لە زستاندا.

٨٠ ـ زەبروزەنگ : توندو تیژ.

٨١ ـ تاس بردی‌یـەوە : حەپـەسـاوە : واقی وڕمـاوە : یەكێـك كە هەواڵێكی ناخۆشیان بۆ بهێنایە نەی‌ئەتوانی وەڵام بداتەوەو بی‌دەنگ ئەبوو.

٨٢ ـ مڕبوو : بۆ یەكێك كە زیایە خۆری بكردایە وای لی‌ئەهات هەناسەی توند ئەبوو.

٨٣ ـ لە تافی لاویدا : لە هەرەتی گەنجێتیدا.

٨٤ ـ لاف لێ‌ئەدا : خۆی هەڵ ئەكێشێ.

٨٥ ـ تەزوو بەلەشی‌دا دێت : مچوركە بەلەشی‌دا دێت.

٨٦ ـ لەناكاو خۆی‌كرد بەژوورا : لەپڕ خۆی كرد بەژوورا.

٨٧ ـ گرفتار بوو : گیرۆدە بوو : ناڵین بەدەست شتێكەوە.

٨٩ ـ چەشەی ناكەیت : تامی ناكەیت.

٩٠ ـ ڕەنجەڕۆ : هەوڵ دانێكی بی‌سوود.

٩١ ـ زۆر حەشەری‌یە : بۆ ئافرەتی داوێن پیس.

٩٢ ـ بەئالۆشە : بۆ ئافرەتێ كە چاوی لەدەرەوە بووایە.

٩٣ ـ بێ‌ئابڕووە : بی‌شەرمە : ڕیایی ئەكات : حەیای لێ هەڵگیراوە.

٩٤ ـ هەنجن هەنجن كرێت : پارچە پارچە كرێت : دوعای ژنانە.

٩٥ ـ هەپروون بە هەپروون بوو : پارچە پارچە بوو : بۆ یەكێك كە لە شاخێك یان لە شوێنێكی زۆر بەرزەوە بكەوێتە خوارەوە.

٩٦ ـ گوێی خۆی لێ ئەخەفێنێ : خۆی گێل ئەكات.

٩٧ ـ سازندەیە : زۆربلێ‌یە (بۆمناڵ).

٩٨ ـ کەنەفت کەوتووە : یەکێك کە لە تەمەندا بێت و لە جێگادا بکەوێت.
٩٩ ـ خۆی گرمۆڵە کردووە : بۆ یەکێك کە لە سەرمادا خۆی پێچابێتەوە.
١٠٠ ـ بەیتەشە : بۆ ئافرەتێك کە هارو هاج بێت.
١٠١ ـ وەك مەحمووی بێ‌زەوا وایە: بۆ یەکێك کە هیچی نەبێت.
١٠٢ ـ هەناسە باردە : بۆ کەسێکی لێ‌قەوماو.
١٠٣ ـ پروو پوچە : **هیچ و پووچە**
١٠٤ ـ جەربەزەیە : بۆ یەکیکی ئازا بەکارئەهات.
١٠٥ ـ سڵ ناکات : لە هیچ ناترسێت.
١٠٦ ـ بێ‌هاوتایە : بێ‌وێنەیە.
١٠٧ ـ لەنگەری بگرە : بۆ بارکردنی وولاخ بەکارهاتووە.
١٠٨ ـ گلاراویەتی: دەست بزێوە : شەرەنگێزە (بۆ منال).
١٠٩ ـ سەرگەردان بوو : ماڵی لێ تێك چوو بێ‌کەس مایەوە.
١١٠ ـ داماوە : لێ‌قەوماوو بێ‌دەستەلاتە.
١١١ ـ هەڵی تیزان بە چوارناڵە : کەرێك کە بەرئەبێت و لەدەست خاوەنەکەی رائەکا.
١١٢ ـ بەرپەرچی‌دایەوە : دەم کوتی‌کرد.
١١٣ ـ گەوج : بێ‌مێشك.
١١٤ ـ ریسوا بوو : سووك بوو
١١٥ ـ توخنی نەکەوێ: نزیکی نەکەوێ.
١١٦ ـ توخمی خۆیەتی : رەگەزی خۆیەتی : ئەچێتەوە سەر خۆی.
١١٧ ـ نوخشە بێت لە تۆ : کچێك کە شووی بکردایەو کچێکی‌تر پێ‌ی بووتایە پیرۆزت بێ ئەویش ئەی‌ووت نوخشە بێت لە تۆ.
١١٨ ـ نۆخشەی میوەیە : نۆبەرەی‌میوە : سەرەتای میوە.
١١٩ ـ کەللە شەقە : کەللەرەقە.
١٢٠ ـ بەد خووە : بێ‌تەربیەتە : بێ‌رەوشتە.
١٢١ ـ دەمەقاڵێیانە : دوو کەس کە بە قسە شەریان بێت.

١٢٢ - پیا ڕاناپەرمووم : لیّ ی ڕانابینم : متمنانەی پیّ ناکەم : شویّنی باوەڕ نی یە.
١٢٣ - حەپوّلی میّش خوّرە : بوّ یەکیّکی گیّژ و ویّژ و پوّخڵ.
١٢٤ - دەمی ئەڵیّ ی چیکەنەیە : بوّ یەکیّك کە زوّر بەخیّرایی قسەی بکردایە.
١٢٥ - لەوزەما نەما : لە تاقەتما نەما : ورەی بەرداوە.
١٢٦ - نالەبارە : بوّ یەکیّك کە بە کرداریا چەوت بوایە.
١٢٧ - توّکمەیە : توندو توّڵە.
١٢٨ - سەپانی بەسەریا : بەزوّر دای بەسەریا.
١٢٩ - زاخاوی دڵم دایەوە : دڵم ئاوی خواردەوە.
١٣٠ - پەیتا پەیتا ئەکاتە سەری : یەك لەسەر یەك : دوابەدوای یەك ئەکاتە سەری.
١٣١ - دەنگی زوڵاڵە : دەنگی خوّشە.
١٣٢ - گوزەران ناکەن : بەوشیّوەیە ناژین : پیّکەوە ناگونجیّن.
١٣٣ - کوت ومت ئەڵیّ ی خوّیەتی : لەیەك ئەچن : دەقاودەق ئەڵیّ ی ئەوە.
١٣٤ - بنەچە : تایەفە : توّو و توخم : تیرەو ڕەگەز.
١٣٥ - ڕاپیّچیان کرد : یەخەیان گرت و بردیان.
١٣٦ - زوخاوی دنیای چەشت : خەفەتی دنیای خوارد.
١٣٧ - تاوو توو کرا : لیّك جیاکردنەوە بوّ فەردەو کەلوپەل.
١٣٨ - لە کونی هەتیتەشدا بیت ئەتدوّزمەوە : لە هەر شویّنیّك بیت ئەتدوّزمەوە.
١٣٩ - کەڵکەڵەی کەوتەسەر : خولیای کەوتەسەر : عەودال بوون بەدوای هەرشتیّکدا.
١٤٠ - ڕەسەنە : ئەسڵە.
١٤١ - لە پرمەی گریان : لە پرمەی پیّ کەنین : لەپرا گریان لەپر پیّ کەنین.
١٤٢ - دای پلّوسی : لەپر لیّ ی دا.
١٤٣ - شرو شیتاڵت فریّ ئەدەمە دەریّ : ناوماڵت فریّ ئەدەمە دەریّ.
١٤٤ - قاتوقر کران : لەناو چوون و فەوتان.

١٤٥ ـ بەسەڵتی ئەژی : بەتەنیایی، بۆ یەکێك کە ژنی نەبێت.
١٤٦ ـ شەتەك دراوە : توند پێچراوە.
١٤٧ ـ تروتفاق : شتی پێویستی بۆ سەفەرو بۆ ناوماڵ.
١٤٨ ـ چابوکە : بە چنگ و هەڵپەیە.
١٤٩ ـ لالەوێچ : گویلی : پرمشتێك.
١٥٠ ـ ئەموستیك : پڕ سەرپەنجەکان .
١٥١ ـ ئاهی تیا نەماوە : گیانی لەبەر براوە.
١٥٢ ـ بە تەڕن ڕۆیشت : بەخۆڕایی ڕۆیشت : بۆ یەکێك کە بە هەوانتە تیا بچێت.
١٥٣ ـ جمەی دێت : شوێنێکی قەڵەباڵغ و جێگا نی‌یە بۆ دانیشتن.
١٥٤ ـ عەلەمی تیا نەماوە : بۆ نەخۆشێك کە چاك ئەبووەوە.
١٥٥ ـ چی‌چکان : دانیشتن لەسەر هەردوو قاچ.
١٥٦ ـ چوارمەشقی : دانیشتن لەسەر قنگ و قاچ لەسەر قاچ لەژێر خۆیدا.
١٥٧ ـ بەچۆك : دانیشتن لەسەر ئەژنۆ.
١٥٨ ـ قیرسچمەیە : بەیەکێکیان ئەووت لەکاتی شەڕدا وازی نەئەهێنا لەوی‌تر.
١٥٩ ـ تامەزرۆیە : عەزرەتیە : بۆ خواردنێکی تاسوق کە لەخۆشیدا زۆری بخواردایە.
١٦٠ ـ تاسووقە : خواردنێکی خۆش کەم دەست بکەوتایە ، ئەیانگوت بیخۆ تاسووقە.
١٦١ ـ وەنەوزی ئەدا : خەوەنوتکێ‌یەتی : خەو پەرەی لێ سەندووە : بۆ کەسێك پێش نووستن بەدانیشتنەوە خەوی لێ ئەکەوت و خەبەری ئەبووەوە .
١٦٢ ـ بەکولەمەرگی ئەژی : بۆ یەکێك یان خێزانێك کە هەر ئیشی ئەکرد و پێویستی ژیانی دەر نەئەهێنا.
١٦٣ ـ شەوەکەی دەیجورە : شەوێکی نالەبارو ناخۆش و تاریکە.
١٦٤ ـ سیوایی بۆتەوە : خۆشە بووە : چەشە بووە : بۆ منالێك کە زۆریان لەگەڵ ئەووت و لێیان ئەدا بەڵام بە قسەی دایك و باوکی نەئەکرد.

١٦٥ - چەرختی بووە : چەقاوەسوو بووە : بۆ منالێك كە زۆر سەربەدەرەوە بوایە.
١٦٦ - چلێسە : زۆر نەوسنە.
١٦٧ - سوك و باریك وەك بەرزەكی بانان بۆی دەرچوو : یەكێك كەتنێكی بكردایە یان شتێكی لێ ڕووبدایە و خۆی دەرباز بكردایە.
١٦٨ - ئەلێی قالوری سووتاوە : ڕەش و لاوازە.
١٦٩ - تیتك : كە دوو ئافرەت شەڕیان ئەبوو قژی یەكیان ئەگرت بێیان ئەووتن ئەو دوو ئافرەتە تیتكی یەكیان لە بن دەرهێنا.
١٧٠ - لۆزەنگەر : گەلۆر : زەبەللاح : كەتە : زرتەبۆز : چەتەوڵ و ئەمانە بۆ زەلامی زل و هیچ لەبارا نەبوو بەكار ئەهات.
١٧١ - داری واوەیلایە : یەكێك درێژو خوارو خێچ و لاواز بوایە .
١٧٢ - لۆش لۆش ئەسووڕێتەوە : بۆ یەكێك كە بە خاوو خلیچكی بۆ شتێكی بگەڕێت.
١٧٣ - چرپوچلاخ ئەسووڕێتەوە : لات ولەوار ئەسوڕێتەوە : بۆ یەكێك كە تەمەڵ و تەوەزەل بێ ئیش ئەسووڕێتەوە.
١٧٤ - دۆش داماوە : بۆ یەكێك دەستەوسان و داماو بووایە.
١٧٥ - پووكاوەتەوە : بە شتێك ئەوترا كە بەرەو لاوازی بڕۆیشتایە.
١٧٦ - لەخشتەیان برد : هەڵیان خەڵەتان .
١٧٧ دەسكەنە : بۆ خەرمان هەڵگرتن ، ژنێك قژی منالەكەی ڕائەكێشا پێیان ئەووت قژی منالەكەی دەسكەنەكرد.
١٧٨ - **بەفەتارەتمان ئەدەی: بەفیرۆ بەقەڵبە یەكمانا ئەدەی دایكێك ئەگەر كوڕێكی** هارو هاجی هەبوایە پێی‌ئەووت سەرمان بە فەتارەت ئەدەی.
١٧٩ - فتوری‌نایەوە: شەڕی نایەوە.
١٨٠ - فیتی ئەوە : بەزمی ئەوە.
١٨١ - تەپڵی تۆپێنی پێ‌كرا : لێدانێكی باشی خوارد.
١٨٢ - نەفرەتی لێ كە : نەعلەتی كە.
١٨٣ - جانانەیە : سۆزانیە : مەكربازە : جادوگەرە: عەیارە، (بۆ ئافرەت و

منالْ).
١٨٤ ـ پسا : پچرا : زەلامێك لە شوێنێكی بەرزەوە بكەوتایە خوارەوە پێیان ئەووت پسا.
١٨٥ ـ ماڵی ئیفە : ماڵی موفتە ، ماڵی بەلاشە.
١٨٦ ـ ئەڵێی دەعەجانی‌یە : بۆ یەكێكی زۆر ناشرین بەكار ئەهات.
١٨٧ ـ ئەڵێی فیزە بەرخانەیە : بۆ شوێنێكی قەڵەباڵغ و غەڵبە غەڵبو ، چرە دووكەڵی لێوە ئەهات.
١٨٨ ـ چوو بە چەقی نەعلەتا : بۆ یەكێك بەرِقا بكەوتایەو بە هیچ شتێك رِازی نەبوایە.
١٨٩ ـ لێمان چووەتە كەشكەلانی فەلەك : یەكێك داوای شتێكیان لێ بكردایەو نەی‌دایە.
١٩٠ ـ خۆت مەدە لە قەرەی : دەرەقەتی ئەو نادەیت.
١٩١ ـ ئەڵێی كچی عەنەترِ پاشایە: بۆ كچێكی زۆر لوت بەرزو خوڵی‌بایی بوو.
١٩٢ ـ جەزرەبەم گەیاندێ : لێدانێكی باشم لێ‌دا.
١٩٣ ـ لوشكەلوشك ئەگری : بۆ یەكێكی بێ‌دەستەلاّت و گرینۆك كە بە هەمووشتێك ئەگریا.
١٩٤ ـ كەتنێكی پێ‌دا : بەپەنگی كرد ، تووشی بەزمی كرد.
١٩٥ ـ سەرەونگوم بوو : دیار نەما.
١٩٦ ـ ئاش بەتاڵی لێ‌كرا: بۆ ئیشێك پێش تەواوبوونی وازی لێ بهێنرێت.
١٩٧ ـ بەسە ملچەملچ : لەكاتی شت خواردندا ئەوكەسە دەنگی دەمی دێت.
١٩٨ ـ كەولەكۆن : ژنێ كە رِقی هەڵئەسێ لە پیاوەكە كە لە تەمەندا بێت پێی‌ئەڵێت برِۆ هەیەی كەولەكۆن.
١٩٩ ـ فلّقەكۆن : بەپێچەوانەوە ، پیاو بە ژن ئەڵێت بی‌برِەوە هەی فلّقەكۆن
٢٠٠ ـ تیاگەوزی : بۆ ئاژەڵ و بۆ مرۆڤ كە لە شوێنێكدا لەسەر زەوی خۆی ئەتلێنێتەوە.
٢٠١ ـ لات و لەوار ئەسوورِێتەوە : بێ‌ئیش ئەسوورِێتەوە.

٢٠٢ - درێژ دادەبە : زۆر بلێیە، زۆر لەسەر قسە ئەڕوات.

٢٠٣ - حەپۆلکی کەس نادات : ماوەی کەس نادات قسە بکات.

٢٠٤ - گەلەکۆمەکی ئەکەن : چەند کەسێك بەگژ یەکێکدا بچن.

٢٠٥ - خیشی کردووە : تورەیەو قسە ناکات.

٢٠٦ - درێژ داهۆڵ : بۆ ئینسانێکی زۆردرێژ.

٢٠٧ - پەڕپووتە : خانویەکی داڕووخاوە : زەلامێکی شرۆڵەو نەبووە.

٢٠٨ - خواو ڕاستان ناردی : هاتنی شتێکی چاوەڕوان نەکراو.

٢٠٩ - قایش و قروشی لە خۆی دا : بۆ زەلامێك خۆی ئامادە بکات بۆ جەنگ یان بۆ ڕاو.

٢١٠ - لە پەلوپۆ کەوت : بۆ یەکێك کە زۆر هیلاك بێت و نەتوانێ لەشوێنی خۆی بجولێ.

٢١١ - بەتاسەوە چوو : بەتاس و تکەوە چوو، بۆ منالێك کە بگریو هەناسەی سوار بێت.

٢١٢ - پیاچزی : پیا چەقی، جەزرەبەی گەیاندێ، زەرەری گەیاندێ.

٢١٣ - مارانگازە : دەستی چووە بە زاخا ، دەستی چزاوە بە ئاگردا، زەرەرەومەند بووە، توشی کارەساتێك بووە لە بیری ناچێتەوە.

٢١٤ - شاتەشات : بێدەنگ بە ، بۆ ئافرەتێك کە زۆر دەمەوەرو دەنگ دەرهاتوو بوایە.

٢١٥ - شار خامۆشە : شار بێدەنگە ، شار چۆڵە.

٢١٦ - شار بێئاشوبەیە : ئاسایش و بەرکەماڵە.

٢١٧ - شار خرۆشاوە : عەشام و مەخلوقات کەس لە ماڵ نەماوە هەموو لەدەرەوەن دەشت ودەر نایگرێتە خۆی.

٢١٨ - شایی و لۆغانە : لە ماڵێکدایالە شوێنێکدا هەموو خەریکی بەزم و ڕەزم و خۆشی بن.

٢١٩ - هەزارلۆغانەیە : ڕێگایەك پێچ و پەنای زۆر بێت.

٢٢٠ - خەریکی کنە تیاکردنە : خەریکی تێکدانی ئیشەکەیە.

٢٢١ ـ چاوچنۆکە : چاوبرسی‌یە ، چاوچلێسە ، بەرچاو تەنگ، نەوسنە.
٢٢٢ ـ وڕ کی گرت : رقی گرت ( بۆ منداڵ).
٢٢٣ ـ گرۆزە : زۆر گرینۆك و لاسارە (بۆ منداڵ).
٢٢٤ ـ توشی گێچەڵێکی ئەکات : تووشی شتێکی ناخۆشی ئەکات.
٢٢٥ ـ نمەك بەحەرامە: هیچی لە بەرچاو نی‌یە، سپڵەیە، بێوەفایە.
٢٢٦ ـ هەر جرت و فرتیەتی : هەر هاتوچۆیەتی، جاو ئەنێتەوە، میزە پشیلە لە بن پێی دراوە.
٢٢٧ ـ شا بە تاقەتت: بۆ ئینسانێکی زۆر هێمن و لەسەرخۆو بەتوانا.
٢٢٨ ـ بوارم بە: ماوەی قسەم بدە، بۆ تەنکایی ئاویش کە لێی ئەپەڕنەوە.
٢٢٩ ـ کەوتەگەڕ: کەوتە ئیش.
٢٣٠ ـ چەواشەی‌کرد: سەری لێ تێکدا .
٢٣١ ـ دەستی تەتەڵەی کرد: هەڵەیەك کە دەست ئەکرێت .
٢٣٢ ـ زۆر ترنە: زۆر قسە کەرە، قسەی ناپیاوانە ئەکا .
٢٣٣ ـ ئینتەلای کرد: ڕشایەوەلە خواردنی زۆر .
٢٣٤ ـ لەشی کرمەڕێز بێت: لەشی داوە شێ، بۆ یەکێکی تەمەڵ،پیس و پۆخڵ .
٢٣٥ ـ ئاگری قورەت: بەچەوازی‌گرتووە(بە منایکی زۆر بێحەیا ئەوترا)
٢٣٦ ـ ناماقوڵت کرد: قسە یەکی نابەجێ‌و نامەعقول .
٢٣٧ ـ چرپــو هوڕو فسکــەفسکیـانـە: دووکـەس کە سەریـان بنـایـە بەیـەکـەوە قسەیان لەژێر لێوەوە بکردایەو نەیا نویستایە کەس گوێی لە قسەیان بێت .
٢٣٨ ـ سەری کەچە: سەری حیزە، سەری شۆڕە.
٢٣٩ ـ مەلاشــوی بەوە هەڵـدراوە: لەگـەڵ شیـردا خواردویـەتی، بۆ کەسێـك کە خووی‌بە شتێکی خراپەوە بگرتایە.
٢٤٠ ـ سمکوڵ ئەکا: بۆ کەسێك بەپەلەو هەڵەشەو بێئارام بێت .
٢٤١ ـ فری بەسەرەوە نەماوە: مافی پێوە نەماوە.
٣٤٢ ـ لاڵغاوی شل نەبوو: بۆ یەکێکی چەنەبازو زۆر بڵێ .
٢٤٣ ـ خۆت نەی‌کـەی خوا بتــداتێ : بۆکـەسێـك بەڕێکـەوت خوا خێـر بڕژێنێ

بەسەریا .

٢٤٤ ـ خواداویه تی و لەقەی لیٚئەدا: دەست بە خیٚری خوٚیەوە ئەنیت.

٢٤٥ ـ ئەم تیٚکوتەو تیٚبڕەیە چیبوو : بوٚ کاریٚکی ناقولاو نالەبار.

٢٤٦ ـ گرفتار بووە پیٚوەی: گیروٚدەو دووچار بووە پیٚوەی.

٢٤٧ ـ بە هەڕەمەکیو گوٚترەکاری: بوٚ ئیشوکاری بیٚسەروبیٚ.

٢٤٨ ـ کە وتی تیٚـژ، تیٚـژ: ئیستـەرم : کە وتی دەی دەی ، پیٚی لیٚ کردە کەوش، هەر ئیٚستەکی.

٢٤٩ ـ ئەیدەلیٚنیٚ : ئاوی لیٚئەچیٚ، ئاو دائەدا.

٢٥٠ ـ سمی پیٚوە نا: موٚڕی پیٚوەنا .

٢٥١ ـ لە خوٚی بابی بووە : لە خوٚی گوٚڕاوە.

٢٥٢ ـ هاتەبار: ملینا .

٢٥٣ ـ با یەکالا بیٚتەوە : با بکەویٚ بە لایەکدا.

٢٥٤ ـ با دەرفەتیٚ بیٚت : با فرسەتیٚ بیٚت.

٢٥٥ ـ بە تیری عەشقی گرفتار بوو : بە بینینی حەزی لیٚکرد .

٢٥٦ ـ کەڵەنیٚرە : بوٚ کوڕیٚکی ئازا ئەوتریٚ .

٢٥٧ ـ موٚڵەتی بەریٚ : ماوەی بەریٚ.

٢٥٨ ـ تازە ئەوەڵی دوردگ و پیاڵەیەتی : تازە کەیف و زەوقی هەیەو لەم تەمەنەدا خوٚی منالٚ ئەکاتەوە.

٢٥٩ ـ گوٚزان گوٚزان : بوٚ پیٚکەنین و خوٚشی منالٚی ساوا .

٢٦٠ ـ دارە دارە : بوٚ منالٚیٚك تازە پیٚئەگریٚ.

٢٦١ ـ ڕیشو سمیٚلیٚ ماشو برنج بووە : ڕیش و سمیٚلیٚ موی سپی تیٚکەوتووە.

٢٦٢ ـ سەری بوٚز بووە : قژی سەری سپی تیٚکەوتووە.

٢٦٣ ـ زامار بووە : بریندار بووە.

٢٦٤ ـ حەواڵە بە گەواڵە ئەکات : لەمەوە ئەینیٚریٚت بوٚ ئەوو ئیشەکەی بوٚ ناکات.

٢٦٥ ـ ڕەش بگیر : خەتاو بیٚخەتا ، تەڕو ووشك پیٚکەوە ئەسووتیٚ.

٢٦٦ ـ بو بە خویٚنی سیاوەحش هەر نەبڕایەوە: بوٚ شتیٚك کە زوٚر دریٚژە بکیٚشیٚت و

ناخۆش بێت.

٢٦٧ ـ بو بە داسك و دەرزی : بۆ کەسێکی لەرو لاواز.

٢٦٨ ـ خوا رەخسانی : خوا رێکی خست ، خوا ناردی

٢٦٩ ـ قەتیس ماوە : رێگای لێ گیراوە ، پەنگی خواردۆتەوە

٢٧٠ ـ دەست و دەم و داوێن پیسە : زۆر جوێن فرۆش و بێ رەووشت و بەدکردارە.

٢٧١ ـ کار لە کار ترازا : تازە هیچ بە هیچ نابێت، تازە لە دەست چوو.

٢٧٢ ـ چڵکاوخۆرە : پیاوی خەڵکە.

٢٧٣ ـ نالە بارە : پنتیە، تورەهاتە ، هیچی تیا بەستە نی یە.

٢٧٤ ـ تا تەشەنەی نەکرۆدووە : تا شتەکە گەورە نەبووە بڵاونەبۆتەوە .

٢٧٥ ـ مرخی خۆی لێ خۆش کردووە : خۆی لێ مەڵاس داوە ، حەزی لێ کردووەو خۆی بۆ ناوەتەوە.

٢٧٦ ـ خەپەحەنەشی : چەقەچەق، لەوچەلەوچ، چەنەبازی، بەس بڵێ.

٢٧٧ ـ فاکوفیك : چەواشەکردن، زۆرزانی، سەر لێ تێکدان لەنێوان دوو کەسدا.

٢٧٨ ـ ئینسانێکی شومە : سەرخۆرەیە، نەگبەت و نالەبارە.

٢٧٩ ـ شمڵی شەرە : شەرەنگێزە، سەر بە ئاشوبە ، سەر بە گۆبەندە، ئاژاوەچی یە، گێرەشێوێنە.

٢٨٠ ـ هەمە چیزە: هەرچی و پەرچی، ناکەس بەچە، هیچ و پوچ.

٢٨١ ـ کوری گۆبەندە : قۆشمەیە، ئەربابە.

٢٨٢ ـ چۆقەچۆقی دانی دێت : هەڵ ئەلەرزێ لە سەرمادا.

٢٨٣ ـ گۆیندەیە : گۆرانی بێژە، دەنگ خۆشە.

٢٨٤ ـ یەقی کردۆتەوە : سلقاوی داوەتەوە، بۆ خواردنێ زۆر بمێنێتەوە.

٢٨٥ ـ جاسوسی لەسەر هەڵناگرێ : چاوی لێ ناتروکێنێ، لێی غافڵ نی یە.

٢٨٦ ـ دەمەزەردی کردەوە : زاخاوی دایەوە، پاك و پوخت کردنەوەی شتە لەکەدارو ژەنگاوی یەکانە .

٢٨٧ ـ خانومانە: بۆ ئافرەتێکی رێك وپێك.

٢٨٨ ـ ئەم تەنتەنەو مەنتەنەیە چی‌یە : ئەم ووردەواڵەو متورووە چی‌یە، بۆ ڕازاندنەوەیەکی بێ‌مەعنا.
٢٨٩ ـ جرپنە : جێ بە خۆی ناگرێ.
٢٩٠ ـ زۆر سەنگینە : بۆ کەسێکی گران بەهاو بەنرخ.
٢٩١ ـ ساویلکەیە : هەموو قسەیەك ئەچێت بەگوێیا.
٢٩٢ ـ گەمژەیە : حۆلەکەیە، گیلۆکەیە.
٢٩٣ ـ فیشال کەرە : فشەکەرە ، خۆهەڵکێشە.
٢٩٤ ـ حیلکەحیلکیەتی : بۆ پێکەنینی ناوەخت (بو ئافرەت).
٢٩٥ ـ لە تەهلوکەدایە : لەناخۆشی‌و نارەحەتیدایە.
٢٩٦ ـ مناڵێکی عال و سالە : مناڵێکی ژیرو سالارە.
٢٩٧ ـ تازە پیاکەوتووە : تازە دەوڵەمەند بووەو لە خۆی بایی بووە.
٢٩٨ ـ مڕوموشیەتی : بەدوای خوارندا ئەگەڕێ.
٢٩٩ ـ چووەتە بنج و بناوانی : چاك لە ئیشەکە کۆڵیوەتەوە.
٣٠٠ ـ بریق و باقی لێوەدێ : بریسکە بریسکی لێوەدێ، بۆ ڕاندنەوەو جوان کاری بەکاردێت.
٣٠١ ـ ماستاو ئەکا : مەرایی ئەکا.
٣٠٢ ـ دانویان ناکوڵێ پێکەوە : ناگونجێن پێکەوە.
٣٠٣ ـ خورپە چووە دڵی‌یەوە : بۆ هەواڵێکی ناخۆش دڵ ڕاچڵەکێن کە ئەیدەن بە یەکێك.
٣٠٤ ـ کارامەیە : ووریاو لێ‌هاتووە.
تێبینی : هەندێ ووشەی تورکیش تێکەڵ بە زمانەکەمان بووەوە لە زەمانی عوسمانلی تا ئەم دوایانەش بەکارئەهات و هەندێکی ئێستاش بەکاردێت، وەك :
١ ـ باشی بۆزغ : ئەهالی مولکی.
٢ ـ سویل : چاکەت و پانتۆڵ لەبەر، ئەفەنی ، منەوەر.
٣ ـ یاغنیش : تێ‌نەگەیشتوو.
٤ ـ یۆلاش : برادەر.

٥ ـ بو بە قەرەبروت : تەواو سووتاو ڕەش بوو.

٦ ـ ئەنەك دوەنەك : ئی دوایی، بو ئەنجامی شتیك ئەوترا.

٧ ـ داغان كرا : هەلوەشان ، ویران كاری.

٨ ـ قوشقنە قەوەت : هێز بەرە بەر خۆت بڕوین.

٩ ـ پاك لە میش : پاك و تەمیزی.

١٠ ـ حەمام لە میش كرا : خۆی شت لە حەمام.

١١ ـ حەمامی قۆرخ كردووە : حەمامی بەكری گرتووە بە تایبەت بۆ خۆی.

* * *

## (یاری جاران لە گەڕەکەکاندا)

لەناو کوردەواریدا گەلێك یاری هەبووە کە ئێستە لە گەلێك ناوچەی کوردستانا ناویان لە کوولەکەی تەڕیشا نەماوە.

ئەم یارییانە هەندێکیان هی منالان وە بەشی زۆری هی لاوانن . هوی نەمانی ئەم یارییان ئەمانەن:

١ ـ گۆڕانی ژیانی کۆمەلایەتیو خەریك بوونی خەلك زیاتر لە جاران بە نان پەیدا کردنەوە.

٢ ـ خەریك بوونی زۆربەی منالان بە خوێندنەوە.

٣ ـ پەیدا بوونی هەندێك یاری تازەتر وەکو تۆپێن (تۆپی پێ، تۆپی سەبەتە، یاری ڤالی بۆل) و تۆپی سەرمێزو بلیاردو . . . هتد.

٤ ـ پەیدا بوونی گەلێك شوێن بۆ کات بەسەربردن وەکو (یانە)و گازینۆو سینەماو نامەخانە.

٥ ـ کەمتەرخەمی بەرامبەر بە یادگاری پێشین ئەگەر کەمتەرخەمی نەبوایە ئەبوو هەندێك لەو یارییانە زیندوو بکرێتەوەو و چەشنە دەستکارییەك بکرێن لەگەل ئەمرۆدا بگونجێن.

ئەنجا پاش هەول و تەقەلایەکی زۆر توانیمان ئەو یارییان کۆبکەینەوە کە لە گەڕەك کراون، یاری گەورە بەجیاو یاریی منالانە بەجیا وە چۆینەتی ئەو یارییانە کە کراون پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویست ئەکەین کە هەول بدەن لە گەڕەکا وەیان لە یانەکانا یان لە کاتی سەیراندا ئەم یاری یانە بەسەربکەنەوە وەك گەلانی تر کە خەریکی زیندوو کردنەوەی یاریو خووڕەشتی کۆنن بۆئەوەی ئەم جۆرە یارییانە زیندوو بکرێنەوە وە وون نەبن لەناومانا وەك لە تەلەفزیۆنا! ئەیبینین.

## یاری منالان - کچ و کوڕ

### حەماموکی‌و خۆلە پەتانی :-

ئەم یاریە بەزۆری منداڵان کە تازە فێری یاری ئەبوون زۆر حەزیان لێ ئەکرد. ئەیان هێنا خۆڵی پاکیان کۆئەکردەوە خۆڵەکەیان کۆمەڵ ئەکرد لە شێوەی گومەزی حەمەم بەقەد قتبوونێك خڕیان ئەکردەوە وە ئەیان پەستەوە. دوایی ئاویان ئەکردە گورپیان گومەزەکەیان ئاوڕشێن ئەکرد. تا تەواو تەڕ ئەبوو. ئەوسا خۆڵی ووشکیان ئەکرد بەسەریا. وورده وورده پێیان ووشك ئەکردەوە. وە لەم کاتەدا کە دەستیان ئەهێنا بەسەر حەماموکەکەدا بۆ ووشك بوونەوەی‌و ساف بوونی بەدەم سوونەوەیەوە. ئەیان ووت (حەمەموکە موودەرکە) چەند جارێك ئەمەیان ئەووت. دوایی ئەوە ئەگەر موویەك ویان پووشێك دەربکەوتایە دەریان ئەهێنا بەهێوشی‌و مچیان ئەکرد پشان بە چیکەیەك لە سێ چوار لاوە کونیان تێ ئەکرد وە بۆشیان ئەکرد تا مستێکی منالەکە پیائەچوو پشان بەخۆشی‌و چەپەڕێزان بەدەوریا یاریان ئەکردو تێکیان ئەدایەوە.

### ماڵە باجێنە :-

ئەم یاریەش لەناو منداڵانی ووردا ئەکرا کوڕو کچ ئەیان هێنا ڕەخەرێکیان دائەخست وە هەندێ شتومەکیان کۆئەکردەوەو ئەو شوێنەیان ئەکرد بە ماڵی خۆیان. ئینجا چەند منداڵێکی تر ئەهاتن بەمیوانیان وە دائەنیشتن لەدوییە بە گاڵتەوە دەستیان ئەکرد بە چێشت لێنان و پێیان ئەووت (چێشتەقوونێ) وە بەم جۆرە وەختیان ئەبردەسەر.

## موور موورین :-

ئەم یاری‌یـــە بە موورووی ڕەنگـــاوڕەنـــگ یان ووردە شووشـــەی بازنی شکـــاوی ڕەنگـاوڕەنگ ئەیان کرد چانێکی بچووکیان ئەکرد، دووکەس پەنجەتووتەو پەنجەیەکی تریـان ئەگـرت بەیەکەوە موورووەکە یان پارچە بازنەکەیان بەدەستەوە بوو بەنۆرە بەریان ئەدایە خوارەوە کێ دەستی ڕاست بوایە ئەیخستە ناو چاڵەکەوە دەنکی ئەویتریان بۆ ئەم ئەبـوو وە هەر بەووردە بازن یاری خۆڵ خۆڵێنیشیـان ئەکـرد ووردەبـازنەکەیان ئەکردە ناو خۆڵەوە ئەیانشاردەوە دوایی بەدەست کۆمەڵ کۆمەڵ خوڵەکەیان جیائەکردەوە، وە لە خۆڵ پاکیان ئەکردەوە، وە ووردە بازنەکەیان ئەژمارد بۆئەوەی بزانن کامیان زیاترە، وە جگە لە ووردەبازن ئەم یاری‌یەیان بە مووررووش ئەکرد.

## سابوونی ڕەنی :-

دوو منـاڵ پشتیـان ئەل بەیـەکـەوە لەپشتـەوە دەستیـان ئەبـرد بۆدەستی یەکتری‌وبەنۆرە یەکتریان هەڵ ئەبڕی وە ئەیان ووت :-

سابوونی ڕەقی پشتم تەقی
سابوونی بەزی پشتم تەزی
سابوونی شەمماش پشتم تەلاّش
سابوونی لۆکس پشتم تۆپس

## گوزەلەشکێ یاخوا نەشکێ :-

دوو کەس ڕاست وچەپ دەستی یەکتـر ئەگـرن، منـالێـك ئەخەنەسەر دەستیان وە ئەیگـرن وئەڵێن گۆزەڵـەشکێ، یاخوانەشکێ، تا هیلاك ئەبن ئینجا مناڵە کە ئەکەوێتە خورەوە ئەڵێن (گۆزەڵەشکێ)

هەلوور بلوور تەکامە:ـ

چەنـد منـالێـك دائـەنیشتن و قاچیـان درێـژ ئەکـرد بەڕیز بەپاڵ یەکتری‌یەوە وە یەکێکیان ەدەست ئەدات بەقاچیانا وە ئەڵێت هەلوور بلوور تەکامە زەردو سوورو شەمامە، ئاوا بەرە دەنکە زەرە
مێخم کوتا مێخ هەڵبەزی تیکەی ڕاستم ئەوەی گەزی... دەستی بکەوتایە سەر قاچی هەر منالێك ئەو قاچەی لائەبردو بەم جۆرە یاری‌یەکە ئەکرا.

هەلەق مەلەق :ـ

دوو کەس گرەویان ئەکرد یەکێکیان شتێکی ئەخستە مشتیەوەو ئەیشاردەوە، بەلاَم هەردوو دەستی ئەقووچان بۆئەوەی ئەویتر نەزانێ لە کام مشتیایەتی ئەوتریش ئەیویست بەم جۆرە شتەکە بدوزێتەوە لە کام دەستیابێت ئەی‌ووت:

| | |
|---|---|
| هەلەق مەلەق | دەنکی لەق لەق |
| کیسەو کەمەر | یا سیس عومەر |
| هەرگەتا مەرگەتا | خوا فەرموویەتی هەر ئەمەتا |

هەر کە ئەگیشتە ئەوەی ئەی‌ووت ( خوا فە رموویەتی هەر ئەمەتا) دەستی لەسەر کام مشتی ئەوی‌تر دابنایە پێ‌ی‌ئەکردەوە ئەی‌ووت بیکەرەوە لێرەدایە.

مزراحێن:ـ

جۆری مزراح و کەرەسەی:
١ ـ مزراح
٢ ـ قۆڕ قۆڕە

٣ ـ ویژ ویژه

٤ ـ گد گده

٥ ـ کۆلکه مزراح

٦ ـ شیپ (پەتی مزراح)

٧ ـ شریتی میراتی

٨ ـ شەکر شکێنی

٩ ـ کاسەئارد

١٠ ـ ماچ

١١ ـ تەمتەمە

ئەم یاری‌یەش باوبووه له سلێمانی‌دا، لەلایەن منالآنەوه ئەکرا وه کاتی تایبەتی‌ی خۆی هەبووه پێش ئەوەی ئەم یاریه دەست پێ‌بکات هەموویان کۆئەبوونەوه (گەل گەلی) یان بۆ ئەکرد ئەمەش مزراحەکانیان پشتاویشت بەرزئەکردەوه بۆ ماوەی بستێك تۆزێك بەرزتر، یان نزم ترو بەریان ئەدایه خوارەوه ، وه ئەوکەسەی ئەم ئیشەی ئەکرد ئەی‌ووت : **(گەل گەلی تو عەشقی عەلی)** وه هەر مزراحێك لەسەربنەکەی ڕابووەستایه ئەوه دەرئەچوو تاوەکو یەك مزراح ئەمایەوەکه، لەسەر بنەکەی نەئەوەستا ئەوا ئەمەیان تێ‌ئەکەوت و مزراحەکەی لەسەر زەوی دائەناو باقی ئەوانی‌تر دەستیان ئەکرد به داکوتانی مزراحەکانیان بەسەر ئەوەی که دەرنەچووه، بەم جۆره یاری دەکرا تاوەکو یەکێك تێ‌ئەکەوت ئەوەش کاتێك که مزراحەکەی نەخولایەتەوەو یان فریای (ماچ) نەکەوتایه یان کاسه ئاردی نەهایشتایه وا تێ‌ئەکەوت و مزراحەکەی خۆی دائەنا سەر زەوی.

(ماچ کردن) کاتێك مزراحەکه دەخوولایەوه دەی‌خسته سەر دەستی ئەی‌برد بۆ لای مزراحەکەی لەسەر زەوی کەوتووه وه پیایا ئەکێشا بەخولاوەیی وه بەری‌بکەوتایه ئەوا یەعنی (ماچی کرد)وه ئەمه تێ‌ناکەوێت.

هەلووکێن :ـ

ئەم یاریــەش هەر باوبــووەو ووردو درشت لە شاری سلێمــانی‌دا زۆر خەریـك ئەبوون بەم یاریەوە.

بریتیە لە دوودار، درێژی هەریەکێکیان نزیکەی مەترێك بووەو پێ‌یان دەووت (داردەست) وە بە دارێکی بچووکتر یاری‌یەکەیان دەکرد کە درێژی نزیکەی بستێك تۆزێك کەمتر یا زیاتر وە هەردوو سەرەکەیان وەکو قەڵەم دائەداو وپێ‌یان ئەووت (هەلووك) وە یان سەرێکیان تێژئەکردو سەرەکەی تریان بەپانی ئەمەش جۆرێکی‌تر بوو.

دوو تاقم یاری‌یان ئەکرد شوێنێکییان ئەکرد بە شار هەلووکەکەیان دائەنا بە دارە درێـژە کە لەسـەری هەلـووکـەکـەیـان ئەداو هەلـووکـەکە بەرزئەبووەوە ئینجا بە دارە درێژەکە بە قایم لێ‌ی ئەداو هەلووکەکە دوور ئەڕۆیشت، تاقمەکەی تر بەرامبەری ئەوەستـان ئەگـەر هەلـووکـەکـەیـان بگـرتایەوە بەعاسمانەوە ئەمان ئەچوونە جێگای ئەوان، وە ئەگـەر هەلـووکـەکـە نەشگیـرایـەوە، پاشـان هەلووکەکەیان هەڵ ئەدا بۆ سەرشار بۆ دارە درێژەکە کە لەسەر زەوی بە پانی دائەنرا ئەگەر بەر دارەکە بکەوتایە ئەوا ئەمـان ئەچـوونـە جێگـای ئەوان خۆ ئەگـەر بەر دارە درێـژەکە نەکەوتایە ئەوسا وەستـای سەرشـار دارە درێـژەکـەی هەڵ ئەگـرت، سێ جار لە هەلووکەکەی ئەداو ئەی‌ووت: هەلی یەکەم، هەلی دووەم هەلی سێ‌یەم هەلووکەکەی دوور ئەخستەوە لەسـەر شار ئینجـا هەلـووکـەکـە لەکـوێـدا ئەکـەوتەوە ئەوی تریان لە هەلووکەکەوە سێ‌بـازی ئەدا بۆسـەر شار، ئەگـەر بگـەیشتـایـە ئەوا بە دارە درێـژەکـە ئەیان پێواو حسابیان ئەکرد بۆخۆیان چەند جارێك بەم جۆرە، ئنجا کە بیان ویستایە یاریەکە تەواو بکەن هەردوو لا دەستیان ئەکرد بە ڕاستەو چەپە کۆمەڵی یەکەم لەسەر شارەوە یەکی سێ ڕاستەو سێ چەپەیان لێ‌ئەداو هەتا ئەگەیشتنە شوێنێك، ئنجا تاقمی دووەم بەرەو شار دەستیان ئەکـردبە سێ ڕاستەو سێ چەپە وەکو تاقمی یەکەم ئنجا ئەگەر گەیشتنەوە سەر شار زیادی کرد ئەبێت ماوەی ئەو زیادەیە بیان کەنە کۆڵ بەرەو سەرشار خۆ ئەگەر نەگەیشتنە سەر شار ئەو ماوەیەی کە ماوە ئەوانی‌تر ئەبێ بکرێنە کۆڵ تاوەکو سەرشار.

## کۆلارە :-

هەروەکو ئێستاش کۆلارە ماوە بەڵام ئەو وەختە.بەجۆرێکی زۆر رێك وپێك کۆلارەی رەنگاورەنگ دروست ئەکراو هەڵ ئەدرا پلپلەی جوانی پێوەئەکرا زوربەی سەربانەکانی سلێمانی بەتایبەتی عەسران کۆلارەی لێ هەڵ ئەدرا هەندێکیان ئەیان بەست بە چیغەکانیانەوە لە پاش ئەوەی لەنگەری ئەگرت واتە کۆلارەکە لە شوێنی خۆی نە ئەکەوت بەم لاو ئەولادا، ئنجا کە شەو دائەهات هەندێ لە خاوەن کۆلارەکان (فەنەریان) ئەکرد بە پەتی کۆلارەکەوە وە مۆمێکیان تیادا دائەگیرسان وە بەهۆی پەتی کۆلارەکەوە ئەیانارد، وە بەهۆی هەواوە خۆی وورده وورده سەرئەکەوت، تا جووت ئەبوو بە کۆلارەکەوە، زوربەی خەڵکی سلێمانی بە هاوینان لە سەربان ئەنوستن وە لەناو چیغەکانیانە ئەم کۆلارانەیان ئەبینی وە دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو .

## چاڵ چالێن :-

ئەم یاری‌یە بریتی‌یە لە دەنکە قەیسی، هەر منالێك بەتایبەتی ئەگەرا بەسەر جادەو کۆلانەکانا بۆ کۆکردنەوەی دەنکە قەیسی. شێوەی کردنی ئەم یاری‌یە: ئەیان هێنا چالێکیان لە پەنا دیوارێکا هەڵ ئەکەند، بستێ قوول و بستێ پان لە دووری سێ هەنگاوەوە، لە چاڵەکەوە خەتێکیان ئەکێشا لەوخەتەوە دەست دەنکە قەیسی هەڵ ئەدرا بۆ ناو چاڵەکە، یەکێك ئەبوو بە وەستا لەسەر چاڵەکە کە دەنکە قەیسی یەکان هەڵ ئەدرا بەجووت هەڵیان ئەدا ١٠ یان ١٤ یان ١٦ بە ئارەزووی ئەوکەسە کە هەڵی ئەدا کە ئەکەوتە ناو چاڵاکەوە وەستاکە ئەیبژارد ئەگەر جووت بوایە وە هەرچەند بوایە ئەوەندە دەنکی بۆ تێ ئەکرد، خۆ ئەگەر تاك بوایە، هەرچەند بوایە هەڵی ئەگرت بۆ خۆی.

## قەڵا قەڵا یان چاوشارکێ:-

ئەم یاری‌یەش لە چەنـد کەسێك پێك دێت پاش (فینکانکۆ) یەکێك تێ‌ئەکەوێ ئەچێتە سەرشار رووئەکاتە دیوارەکەو چاوی ئەنووقێنێ ئەوانی تریش خۆیان ئەشارنەوە، ئینجا ئەڵێت:-

(قەڵا قەڵا قەڵا قەڵا قەڵا یەکی بێت) تا درێژایی هەناسەیەك هەر ئەڵێ قەڵا قەڵا . . . لەکـۆتـایی‌دا دەڵـێت یەکـی بێت دوایی قەڵای دووەم چەشنی یەکـەم بەدرێژایی هەناسەیەك ئنجا سێ‌یەم لەکۆتایی هەر سێ قەڵا قەڵادا دەڵێت: خۆتان بگرن وا هاتم دیارە لەم ماوەیەدا هەموو خۆیان دەشارنەوە ئنجا ئەم بە شوێنیان دا دەگەرێ هەتا یەکێك بەردەستی دەکـەوێت کە بیگـرێت ئەمانەی تریش بەدزی‌یەوە بەرەو شار ئەچنەوە وە دەست لە شوێنەکەوە ئەدەن ئەڵێن (شار گر) ئەوەی گەیشتە (سەر شار)و ووتی شار گر ئەوە تێ ناکەوێت بەڵام ئەوەی نەگەیشتە سەر شارو گیرا تێ‌ئەکەوێت.

## پشیلە سوورە کوێرراچوو، ئەرزی دری پیایا چوو:-

ئەم یاری‌یە بەزۆری مندالان دەیکەن، کورو کچ، ژمارەی یاری زانەکان لە ١٥ - ٣٠ بەشـداری تێدا دەکـەن، هیچ کەرەسەیەکی ناوێ لە شێوەی بازنەدا دەوەستن، دەستی یەکتری توند دەگرن وە یەکێك دەبێتە پشیلە لەدەرەوەی بازنەکە رادەوەستێت، یەکێکی تریشیان دەبوو بە مشك دەچووە ناوەوەی بازنەکە یاری‌کە دەستپێ‌دەکرا، کە پشیلەکە دەیەوێت بێتە ناو بازنەکەوە تاوەکو مشکەکە بگرێت بەڵام یاری‌زانەکان نایەڵن بێتـە ناوەوە، وە پەیتـا پەیتـا بەیەکجار دەڵێن (پشیلە سوورە کوێراچوو ئەرزی دری‌و پیایاچـوو) وە ئەگەر پشیلەکە چووە ناوەوە خێرا مشکەکە بۆی دەرئەچێتە دەرەوە یاری زانـەکـان رێی‌ئـەدەن، ئنجا لەناوەوە پشیلەکەدەیەوێ بچێت بۆ گرتنی مشکەکە وە هەموویان بەردەوامن لە ووتنی (پشیلە سوورە. . . تاوەکو هیلاك دەبن یان پشیلەکە مشکەکە دەگرێت ئینجا ئەگۆرێت پشیلەو مشك بە دوانی تر.

## پەنابێ دەنگە :

ئەم یاری‌یە لە ڕۆژی خۆشیانـدا لە بەردەرگـا یان شەوان دەکـرێت یاری‌یەکـە هیچ کەرەسەیەکی ناوێ وە لەشێوەی بازنەدا یاریکەرەکان دائەنیشن ، کە ژمارەیان لە ٥ ـ ١٥ کەس بەشـداری دەکـەن وە یەکێك دەبێت بەوەستـا ، لەپێشا ئەم لە ڕانی یەکێکیان دەدات و ئەوانی هەریەکەی لە هاوڕێکەی لەڕانی دەدات وەنابێت کەس وورتەی لێوە بێت یان قسـەبکات ئەگینا تێ‌ئەکەوێت و دوورئەخرێتەوە لە یاریەکە دوایی وەستا لە ڕوومـەت ئەدا ئنجـا ئەوانیش لە ڕوومەتەوە دەست پێ‌ئەکەن ئنجا شوێنێکی‌تر وەکو پشتی مل و پشت و هتـد تاوەکو زوربەیان تێ ئەکەون و بەپێکەنین یاریکە دەڕوات تاوەکو ماندوو ئەبن کۆتایی پێ دێت .

## خەڵکی خەلاجۆ ـ کێ هات و چۆ:ـ

ئەم یاری‌یە لەنێوان ١٠ ـ ٢٠ یاری‌زاندا دەکرێت وە بەشێوەی یەك ڕیز دائەنیشن یان بەشێوەی ناڵ یان بازنە وە یەکێك دەبێت بە وەستا وە بەنهێنی ناو هەریەکەیان ئەنێت بە ناوی قارەمـانـان یان گیانداریکەوە دوایی چاوی یەکێکیان بەهۆی دەستەسڕێکی پاکەوە دەبەستێتەوە وە بانگ ئەکا یەکێك لە یاری‌زانەکان بێت بە نازناوەکەیەوە بۆنموونە دەڵێت (ئـــا وەرە شێری شاخـان) یان دەڵێت (ئاوەرە ڕۆستەمی مازندەران) وە هەروەها دێت دەست ئەخشێنێت لە سەرو شان و گوێلاك و دەستی ئەویش دەستی خۆی دەکوتێ لە گیان و جل وبەرگی ، دوایی پێ‌دەڵێت دانیشە وەکەس سەیری ئەو شوێنـە ناکـات یان قسـە ناکـات دوایی چاو بەسـتراو چاوی دەکرێتەوە دەگەڕێ بۆ دۆزینەوەی ئەوکەسە ، ئەگەر زانی ئەوا دەچێتە شوێنی ئەو وە ئەویش دێتە شوێنی ئەم بۆ چاوبەستینەوەی تا وەکو ماوەیەك ئەم یاری دەکرێت تا ماندوو دەبن وە بە خۆشی کۆتایی بە یاریەکە دێت .

**مەلا تەق تەقێنە :ـ**

ئەم یاریيە لەنێوان ١٠ ـ ٢٠ ـ منداڵدا دەکرێت کەرەسەی تەنها (٢) بەردە یاریزانەکان لە شێوەی بازنەدا دادەنیشن یەکێك دەبێت بە وەستا وە یەکێك تێدەکەوێت و دێتە ناوەراستەوە شێوەی دانیشتنی یاریزانەکان ئەوەیەکە دائەنیشن وە هەردوو ئەژنۆیان نزیکی سنگیان دەکەنەوە وە هەردوو دەستیان دەخەنە ژێر رانیان وە دووبەردەکە دەدا بەیەکێکیان کەنێ کەوتووەو نازانێ ودوای وەستاکە دەڵێت (ئێستا مەلا تەقەتەق دەکات) ئەوەی بەردەکانی پێيە دەست ئەکات بە تەقەتەق یەکسەر یاریزانە تێکەوتووەکە بەرەو تەقەکە دەچێت، ئەگەر زانی ئەوا خاوەن بەردەکان دێتە شوێنی ئەم و ئەمیش دەچێتە شوێنی ئەو بەو شێوەیە یاریکە بەردەوام دەبێت .

**سنجووقێن :ـ**

لە زستاندا لە شوێنێکی قوڕ چەند کەسێك چەند پارچە دارێکی باریك بەقەد دوو بست سەرێکی تیژ ئەکرا وە یەکێك ئەیچەقاند بە قوڕا ئەوانی تریش ئەیان چەقاند بەوی ئەودا ئەگەر دارەکە بکەوتایە ئەوکەسە ئەو دارەی بۆ خۆی هەڵ ئەگەرتەوە، ئەگەر نەیخستایە ئەو دارەی ئەو بەبۆئەوەیتر ئەبوو، ئیتر بەنۆرە ئەم یارییەیان دەکرد وە دایان ئەکوتا بەسەر یەکتری یا پێیان ئەووت (سنجوقێن).

**گەنم گردو جۆ بڵاو :ـ**

کۆمەڵە کەسێك کۆئە ئەبوونەوە. یەکێك لەناویانادا ئەنیشت و هاواری ئەکرد (گەنم گرد) هەموویان لەوکەسە کۆئەبوونەوە، دوای ئەوەی هاوارەکەی ئەکرد ئەیووتەوە (جۆ بڵاو) کۆمەڵەکە بڵاوئەبوونەوە، هەریەکە لە قوژبنێکا خۆی ئەشاردەوە ئەوکەسەی کە ئەیووت (جـۆ بڵاو) بەدوای ئەوانەیتردا دەگەرا. . . هەرکەسێکی بدۆزیيایەتەوە ئەیووت :ـ (هي جۆ ـ هەی جۆ هەی جۆ هەی جۆ) ئەو ئەچووە شوێنی ئەویتر وە ئەم یارییە وەکو چاوشارکێ وایە .

**قورِقەپ :- کۆمەڵێك دائەنیشتن یەکێکیان ئەیووت :-**
(مـەلا مەلا نوێژ ئەکا ـ کێرە قەپە درێژ ئەکا بەقنگی ئەوکەسەی قسە ئەکا .) ئەوسا هەموو بەجاریك بێ‌دەنگ ئەبوون و وورتەیان لێ‌نە ئەهات وە منالاّن لەناو خۆیان دا هەنـدێ شتی سەیریان ئەکـرد بە لەش و دەست و چاو بۆ پێکـەنین بۆئەوەی یەکێك پێ‌کەنی بێت یان دەنگی لێوە بێت تاوەکو تێ‌بکەوێت .

**هەنگەشەلێ :-**

دوای ئەوەی فینکـانکـۆ دەکـرا یەکێك دەچـووە ناوەڕاستی هەنـدێ منالەوە ود بە هەنگەشەلێ دوای منالاّن دەکەوت و ئەی‌ووت (شەل و کوێرم ناپارێزم) بەدەم ووتنەوە شەقی ئەهاویشت .

**تۆپ تۆپێن :-**

بە تۆپی پەڕۆیان تۆپی هەوری یان مێزەڵـدانی حەیوان، میزەڵانـەکـەیان فوو تێ‌ئـەکرد، ئینجا بە بەن تۆپەلیان ئەکردو ئەیان پێچا ئەوسا وەکو تۆپی لاستیکی لێ ئەهات و یاری‌یان پێ ئەکرد .

**حیکایەتی مێش :-**

یەکێك ئەی‌ووت، بە یەکێکی‌تر حیکایەتی مێشت بۆ بکەم، ئەویش ئەیووت (ئا) ئەویش ئەیووت مەڵێ (ئـا) ئەی‌ووت (ئەی بڵێم چی؟) ئەویش ئەیووت مەڵێ (بڵێم چی) بەم جۆرە هەر قسەیەکی بکردایە ئەمیش ئەیووت مەڵێ ئەو قسەیەی کردوویەتی بەم شێویە دەوامی ئەکرد هەتاوەکو کەسی دووەم ئەیووت (خوام بەحەقە) ئینجا لێرەدا تەواو ئەبوو، ئیتر حیکایەت خوان نەی‌ئەتوانی بڵێ : مەڵێ خوام بەحەقە .

**یاری دەری ئەکەم، دەری ئەکەی :-**

ئەم یاری‌یەش بە سۆدەو سیفۆن دەکرا، دوو کەس ئەیان کرد ئەوساردی‌یەیان ڕائەوەشان یەکێکیان ئەیووت دەرئەکەم وە شوێنێکی دیاری ئەکرد و ئەیووت تا ئەوێ‌ی ئەبەم وە بەوجۆرە یاری ئەکرا کە ئاوی ساردی‌یەکە دەرچوایە ئەبوایە بگەیشتایە شوێنی دیاری کراو.

**گۆرانی کچان (یاری گوریس دیلمو دیلانێ) :-**

کچان منالێکیان ئەخستە کۆشیان وەئەم گۆرانیەیان **ئەووت**
لەوکاتەدا کە گوریسەکەیان دائەخست بە درەختێکەوە و دیلمو دیلانیان ئەکرد، ئەوت :
ئەوزد مەڕۆ سەوزەکە سەوزەکەی ماڵم نەخۆش نەکەوی سەوزە نەشکێنی باڵم
هەچ کەسێ ئەیکا مەنعی کچ و کوڕ
ئازیزی بمرێ سەر بنێ لە قوڕ

هەچ کەسێ ئەی‌کا مەنعی دڵداری
پەڕوپۆ دەرکا وێنەی پاساری
کەوکۆتە بەینمان کێوێ چون شاهۆ
مەگەر خوا بەڕەحم من بێنێ بۆ تۆ

### کۆڵ کەڵێن:-

دوو کەس بەنۆرە سواری کۆڵی یەکتری ئەبن بۆ ئەوشوێنەی کە خۆیان دیاریان کردووە.

- پەت پەتێن
- خەت خەتێن
- ساف سافێن
- گووپ گوپێن

### فڕی فڕی قەل فڕێ:-

چەند کەسێك دائەنیشن یەکێك ئەبێت بە وەستا ئەڵێت ( فڕی فڕی قەڵ فڕی) پێویستە هەموویان پەنجە بەرزبکەنەوە بەڵام ئەگەر ووتی (فڕی فڕی بۆق فڕی) هەرکەسێ دەست بەرزبکاتەوە ئەوا تێئەکەوێت چونکە (بۆق) نافڕێ یان ئەگەر ووتی (فڕی فڕی چۆلەکە فڕی) پێویستە هەموو دەست بەرزبکاتەوە چونکە (چۆلەکە) ئەفڕێت وە هەرچی بەرزی‌نەکاتەوە تێئەکەوێت.

### یاری شەڕەئاو بە فیچقە:-

ئەم یاری‌یە زۆر باوی بوو، بەتایبەتی لەناو منالانا ئەیانهێنا قامیشێك لەنێوانی دوو گرێدا ئەیانبری‌یەوە نێوانی هەردوو گرێ یەکە بۆشە، گرێی یەکەم بە چەقۆ هەڵیان ئەکۆڵی، گرێی ئەوسەری کونێکی بچووك بە بزمار تێی ئەکرا، پاشان چیلکەیەکی ڕەق تۆزێك پەڕۆیان پێوە ئەبەست ئەیانکرد بەناو قامیشەکەدا، ئەمە لە شێوەی (پەمپی پاسکیلدا) ئینجا سەری قامیشەکە کە کونەکەی تێدابوو ئەیانکرد بەناو سەتڵێ ئاودا یان تەنەکەدا و چیلکەکەیان ڕائەکێشا بۆدوواوە لەوکاتەدا ئاوی ڕائەکێشا بۆ ناو قامیشەکە، پاشان کە پاڵی پێوەئەنا بە چیلکەکە ئاوەکە لە کونەکەوە بە تیژی دەرئەچوو لە قامیشەکەوە بەم شێوەیە منداڵان بەرامبەر یەك ئەوەستان و شەڕە ئاویان پێئەکرد.

### شارە زەردەواڵە ووڕوژاندن :ـ

لە هەر گەڕەکێکا وە یان کۆڵانێکا شارە زەردەواڵەیەکی تیا هەبووایە منالانی ئەو گەڕەکە دوای ئەوەی هەریەکەیان پارچە تەختەیەك یان دارێك یان شتێکی ئەگرت بەدەستەوە، شارە زەردەواڵەکەیان ئەووروژاند بەهۆی مستێ خۆڵەوە کە ئەیان کرد بە کونی شارەکەدا یان چیلکەیان پیادا ئەکرد ئینجا چی زەردەواڵە هەبوایە ئەهاتە دەرەوە وە هەر یەك و دوویان دوای منالێك دەکەوت، دەبوو بە شەڕ لەنێوان منالەکەو زەردەواڵەدا، یان زەردەواڵە بەهۆی لێدانی منالەکەوە دەکوژرا، یان پێوەی ئەدا دووای ئەوەی کە پێوەی ئەدا یەکسەر منالەکە بە گریان ئەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، دایکیشی یەکسەر ئەچوو نەوتی بەشوێن پێوەدانەکەدا دەکرد، یان بەردی **گەرمی** بۆ ئەخستە سەری.
زۆر جار منالان شارەکەیان ئەووروژاندو چاوەڕێی کاروانی وولاخ یان ڕێبوارێکیان دەکرد، بۆئەوەی پێوەیان بدا وە هەر کە ئەگەیشتنە بەردەم شارەکە هەر زەلامەی ٣٠ ـ ٤٠ زەردەواڵەی بۆ دەچوو، تێ ی ئەئالان بۆ بەیانی سەروچاوی زەلامەکە ئەئاوسا.

### هێلانە چۆلەکە دەرهێنان :ـ

سالان هەموو سەربانەکان دارە ڕابوو گوێسوانەی هەبوو ئینجا چۆلەکە هێلانەیان لەو گویسوانانەدا دەکرد وە بێچوویان تیا هەڵئەهێنا پاش ماوەیەك کە گەورە ئەبوون، پێش ئەوەی کە بفرن منالان دەستیان ئەکرد بە دەرهانینیان بەهۆی پەیژەوە کە ئەیاننا بە دیوارەکەوە بەلام زوربەیان ئەچوونە سەر پشتی یان شانی یەکتر وە کاتێك کە بێچووەکان دەرئەهێنران دایکەو باوکەکەیان لەولاوە باوکە ڕۆیان بوو هیچیشیان بۆ نەئەکرا.

### بابەخولێ گیژم مەکە :ـ

ئەم یاریە بەدەوری خۆیاندا ئەسووڕانەوە تا گیژ ئەبوون ئنجا ئەکەوتن.

یاری ئێسقان و پشقل :-

ئێسقانەکە کونێکی بچووکیان تێ ئەکرد، ئینجا پشقلێکیان ئەهێنا ئەیانخستە سەر کونەکەو، دووای فووکردن بە ئیسقانەکەدا پشقلەکە بەرزئەبۆوە لەسەر کونە بچووکەکە لە ڕێکی خۆی بۆ سەرەوە وە ئەگەر فووەکە قایم بوایە پشقلەکە زیاتر بەرز ئەبۆوە، هێواش بووایە نزم تر بەرزئەبۆوە، بەڵام بە قایم و هیواش بەسەریەکەوە پشقلەکە هەڵ ئەپەری لەسەر کونەکە.

چۆلەکەو بەلەم :-

بە کاغەز چۆلەکەیان دروست ئەکرد وە هەڵیان ئەدا بەئاسمانا وەبۆربۆرێنی لەسەر بوو، کام لەو چۆلەکانە درەنگ تر بکەوتایەوە ئەوە باشترین چۆلەکە بوو دوایی لە کاغەز بەلەمیان دروست ئەکرد لە شێوەی پاپۆر وە زۆر جار مۆمیان بە داگیرساوی ئەخستە ناوی و ئەیان خستە ناو حەوزێکەوە یان تەشتێ ئاوەوە.

فرفرۆکە :-

ئەمەش بە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ دروست ئەکرا لە شێوەی ئەستێرە ئەکرا بە قامیشێکەوە وە بە دەست منالانەوە ڕایان ئەکرد و ئەخوولایەوە. وە فرفرۆکەش بە شێوەیەکی تریش دروست ئەکرا ئەوەش بە تەنەکە لە شێوەیەکی بچووك وە ئەم پەروانەیەیان ئەخستە تەلێکی بادراوەوە لەژێرەوە تەنەکەیەکی بچووك کە خرابووە ناو تەلەکەوە بەرز ئەکرایەوەبۆ سەرەوە وە پالی بەپەروانەکەوە ئەناو بەرز ئەبووەوە بۆ ئاسمان.

# خۆفڕیدان له شوێنی بەرزەوە :ـ

چەنـد منـاڵێـك خۆیان له سەربانێكی بەرزەوە فڕێئەدایه خوارەوە بۆسەر كۆمەڵه گڵێك یان سەر سەوزەگیا، وه پێش ئەوەی خۆیان فڕێ بدەن ئەیانووت (تف له شەیتان دوور له ڕەحمان ـ سەرم نەشكێنی به گوللەو دەرمان).

ئەم جۆره شتانەش لەناو مناڵانا ئەووترا:

١ ـ كه دوو تاقم منـاڵ یاری‌یـان ئەكـرد دەستـەیـەك له شوێنێكی بەرزتر بوون لەوانی تر ئەوانەی سەرەوه بەوانەی خوارەوەیان ئەووت ئێمه لەسەر قەڵاتین ئێوه لەسەر تەپەگوو.

٢ ـ هۆڕێوی ڕێوی :ـ

دەستـەیـەك منـاڵ ئەگـەڕان بەكۆڵانانا، یەكێك هاواری ئەكرد (هۆڕێوی ڕێوی) هەموو بەجـارێ به یەكـدەنـگ هاواریـان ئەكـرد (هـۆو) دیسان هەر ئەوكەسه ئەیووت (ڕێوی بێ‌ئیمان) هەموو بەجارێ ئەیانووت (هۆو) هەر یەكەم كەس:

(شـەریكی شەیتـان)هەمـوو: (هـۆو) یەكـەم كەس: (ئەلەكه سمۆره) هەموو: (هۆو) یەكـەم كەس (لـه دەشتی چۆڵـه) هەمـوو (هۆو) یەكەم كەس (كاغەز ئەنووسم) هەموو (هـۆو) یەكـەم كەسی: (لـەپـەڕی مێشێ) هەمـوو (هـۆو) یەكەم كەس: (بیبا بۆیارم) هەموو: (هۆو) یەكەم كەس: (دڵی نەیەشێ) هەموو: (هۆو).

له یاری مناڵانا:ـ

١ ـ منـاڵان كه شتێكیـان لێ وونئـەبـووكه بۆی ئەگـەڕان بیدۆزنەوه هەموو لەبەرخۆیانەوە ئەیانووت (دۆزه دۆزەبۆم هەڵقۆزه ـ هی من نی‌یەهی پیرۆزه).

٢ ـ خاڵ خاڵۆكه

مناڵان كه خاڵخاڵۆكه یان ئەبینی ئەیانوون:

(خاڵخاڵۆكه ماڵی خاڵم له كوێ‌یه؟)

كه دوو مناڵ شەڕیان ئەبوو یەكێكیان بەوی‌تری ئەووت:ـ

(چـەمـۆڵـه بۆتـۆـ ئاوێنه بۆمن) ئەویتریان وەڵامی ئەدایەوه ئەیووت (مەجه كەڕه ـ بۆم هەڵپەره ـ لەسەربەڕه).

دووای ئەو قسـانـەیـان (بـەعـز)یـان لەگـەڵ یەك[1] ئەكرد ئەیانووت: (ئاشوماش ـ كلكت بگـرم به مەقـاش ـ هەتـاكـو سەری مەعاش) پاش ماوەیەك كەئاشت ئەبووەنەوه

یەکێکیان پەنجە (تووتە)و پەنجەی شایەتمانی بەرز ئەکردەوە بەویتری ئەووت: کامیـانت ئەوێ! ئەوی تـریش ئەگەر نەی‌ویستایە ئاشت ببێتەوە پەنجە تووتەی ئەگرت، بەڵام ئەگەر ئاشت بوایەتەوە پەنجەی شایەتمانی ئەگرت ئەوسا هەردووکیان ئاشت ئەبوونەوە.

(١) واتە قسەیان لەگەڵ یەك ئەبڕی‌یەوە، کە (ئاشت وماشت) یشیان پێ ئەوت (ع.م).

## هەر کە بەهار ئەهات

منـالان هەریـەکـە دارێکی ئەگـرت سەرێکی ئاسنیان پێوە ئەکرد لە شێوەی گاسندا پێ‌یان ئەوت (بێڵەکان)وە ئەچوون بە کۆمەڵ بۆ قەراغ شار بۆ هەڵکەندنی:

١ ـ بنە گۆزروان

٢ ـ پیشۆك

٣ ـ هەڵەکۆك

ماوەیەکی زۆر لەو دەشتە دەستیان ئەکرد بە هەڵکەندنی ئەمانە وە ئەیان هێنایەوە بۆ ماڵەوە بۆ خواردنی، وە هەروەها لە کاتی فەریکەنۆکدا ئەچوون وە هەریەکە بە پارە ئەیانکڕی ئەهاتنەوە.

## یاری‌یەکی منالان (کوڕو کچ)

ئەم یاری‌یە لە چەند منالێك پێك ئەهات نزیکەی دە دوانزە منال، یەك کچ ئەووستاو ئەبـوو بە وەستـاو کچێکی تریش بەرامبەری ڕائەووستاو چەند منالێك لە پشتی‌یەوە بەڕیز ئەووستان ئەمجا دەست ئەکرا بەم یاری بەم شێوەی خوارەوە:

وەستاکە: عەلی بەکَ لام بەگ

وەستاکە: منالەکان چوون بۆکوێ

ئەوان: شاری میر

وەستاکە: چی‌یان برد

ئەوان: خورما

وەستاکە: چی تر

ئەوان: برمە

وەستاکە: بەچی ڕۆستن

ئەوان: بە عەرەبانە

وەستاکە: چەند تەلی پێوەبوو

ئەوان: سەد

وەستاکە: چەنی بۆ من و چەنی بۆ تۆ

ئەوان: پەنجای بۆ من و پەنجای بۆ تۆ

وەستاکە: بوکەکەتان ناوی چی بوو

ئەوان: تارا

وەستاکە: بە دم بیبەین یا بە زم

ئەوان: بە دم. . دم دم تارا خان

هەموو بەحارێك: دم دم تارا خان. . دم دم تارا خان

**لەم کاتەدا وەستا باڵی درێژ ئەکرد ئەمجا ئەوانی تر یەکە یەکە بەژێر باڵی وەستاد ئەرویشتن وە ئەچوونەوە شوێنی خۆیان ئەمجا تاراخان ئەبو بەوەستا** پاشان بەم جۆرە هەموویەکە یەکە ئەبون بە وەستا هەرکەس بە ناوی خۆیەوە دەوری بوکێنیەکەی ئەبینی و ئەبوو بە وەستا.



علي بەگ فیضالله بەگ عەرەبانچی

١٨٨٧ - ١٩٦٧

# مەتەڵ لە یەکتری داهێنان :

١ ـ ئەوە چی‌یە چی پێ ئەڵێن ـ پەپکە بەکونجی پێ ئەڵێن ـ عەبای نارنجی پێ ئەڵێن؟ ئەیان ووت (تەماتەیە).
٢ ـ سایەقەی سامالٚ هەوری فەڕەنی ـ دوو ئاو لە جامێ هەریەك لە ڕەنگی ئەیان ووت (هێلکەیە).
٣ ـ ئەو لام پەرژین ئەو لام پەرژین تیایەتی کۆترێکی نەخشین ئەیان ووت (چاوە).
٤ ـ ئەم لام دیوار ئەولام دیوار تیایەتی سەگێکی هار ئەیان ووت (زمان)ە.
٥ ـ قەیسەری لەسەر قەیسەری مەحموود پاشا لە تەوقی سەری (سەماوەر)ە.
٦ ـ چل ناڵ چل بزمار چل چلۆکەی چل هەزار (کرمەك)ە.
٧ ـ هەڵ ئەپەڕێ پێی نی‌یە سەری سپی‌یەو مووی نیە (تەرزە)یە.
٨ ـ سەری یەکەو بنی دوو بە قنگی باوو باپیرتا چوو (دەرپێ)یە.
٩ ـ سەری تەسکەو بنی بڵاوە کەرە کڵاوە، کەرە کڵاوە (کڵاو)ە.
١٠ ـ بە سەدو یەك برا ڕیخۆڵەیەکیان هەیە (تەزبیح)ە.
١١ ـ تەپ لەسەر تەپ دەستت بە ڕەپ (دەستار)ە.
١٢ ـ بە سێ برا کڵاوێکیان هەیە (سێپا)یە.
١٣ ـ سەربانێکەو بن بانێکەچوار بزن وشوانێکە(دەست)ە.
١٤ ـ سەری بە تۆو بنی بە دایکت (مەمك)ە.
١٥ ـ ئەم لام تات و ئەولام تات وەی بابە جیقم دەرهات (ئەسپێ)یە.
١٦ ـ هەر ئەڕوێت و ناگەیتێ (سێبەر)ە.
١٧ ـ دووی لە خۆر سێی لە سێبەر (نوێژە).
١٨ ـ شەش پاو دوو دەم ماڵی وا لە چەم (قرژاڵ)ە.
١٩ ـ کا چوو ما دانی (خەرمان)ە •

# لەناو منالانا لەگەڕەکەکانا ئەم قسانە باو بوو

هەندێك بۆرابواردن وهەندێك بۆسەر لێ تێك دان :ـ

١ ـ **بسم الله ناوی‌خوا حەسەنە گورگە پیاو ئەخوا .**

٢ ـ ئیشی قەشان دوو تری‌وەشان لە کرماشان .

٣ ـ هەڵپەڕە لە منت کەوێ دارو گۆچان لە قنگت کەوێ .

٤ ـ باران ئەبارێ تەرزە لە کێوی ، پیرێژن ئەگری بۆ کێری قەوی .

٥ ـ لەترسی بێوەژن ئەچمە سەرداری پلار ئەهاون ئەسنەنە خوارێ .

٦ ـ لەترسی بێوەژن ئەچمە کونەوە چرا هەڵ ئەکەن ئەمدۆزنەوە .

٧ ـ حاجی لەق لەق مار هات ـ ماری ژەنگ و ژار هات ـ کاکم بە قەتار هات .

٨ ـ بڵێ یەك و دوو و سێ قەلەکە بەسەرتا تسێ .

٩ ـ ئەورەحمانە گوو دەرمانە ـ ئاگر بێنە سەرمامانە .

١٠ ـ ترەکەت بە ترەکەم ـ گەنمەکەت بکە سەر بەرەکەم .

١١ ـ پانی وەپانی لە زەتی کوانێ ـ درێژ ی وەپانێ لەزەتی گیانێ .

١٢ ـ بڵێ مەسینە ـ دەوری قنگت برینە .

١٣ ـ بڵێ تەببەت یەدا ـ لە بناگوێت دا ئەبی لەهەبین ـ بیکا بە برین .

١٤ ـ پشتی ملت قاچ و قولت ، قنگی زلت .

١٥ ـ ئەلف وبێ تۆتەمەسەن ـ دوو شاخ و گوێ بۆ مەلا حەسەن .

١٦ ـ دومبگ دومبگ هەلاجی ـ بە کێری مامە حاجی .

١٧ ـ کەڵەشێرو بارۆکە ـ ماڵمان وا لەو گەڕەکە .

١٨ ـ هەمزە لە هەباسی چی ـ کلکە لە تەوارسی چی .

١٩ ـ قەزوانی سوێر بۆ بووکی کوێر .

٢٠ ـ گێزەر مەخۆ بائەکەیت ـ لەسەر ئەلە ڕائەکەیت .

٢١ ـ گێزەر مەخۆ شیرینە ـ دەوری قنگت برینە .

٢٢ ـ ئەلحەمدو کوللو کەوچك ـ مێوژە ڕەشەی بێ قنچك .

٢٣ ـ چواله بادەم ـ خۆت بگرە خۆمت پیا دەم .
٢٤ ـ بەردی حەمام شکاوە ـ هەیاسەی عاسە دزراوە .
٢٥ ـ بەرامبەرم دامەنیشە ـ ئەم قامیشە بەو تلیشە .
٢٦ ـ عەمرت نەمێنێ ـ چەقەڵ چاوت دەربێنێ ـ بولبول لەسەرت بخوێنێ کیسەڵ ئاوت بۆ بێنێ .
٢٧ ـ حل حللی بل بللی ـ چاوم ڕشتووە بە کللی ـ کللی نەبوو سۆفی بوو ـ سۆفی چوو ژن بێنێ ـ ژنی شەفەگول بێنێ ـ شەفەگولم کوتاوە لە مووسڵم بەرداوە ـ مووسڵ خشتاوخشتە ـ شیری کاکم لەپشتە،شیری کاکم دۆڕاندووە ـ ملی ئەسپم پەڕاندووە .
٢٨ ـ ئاخچی بووخچی ـ دایەو بابە سونجوق چی .
٢٩ ـ تەیارە هات بە گیزەگیز ـ دەرپێی خامەك پڕ بوو لە میز .
٣٠ ـ چوومە ماڵی جولەکە ـ قوڵپە قوڵپی کولەکە . .
چوومە ماڵی گاور ـ قوڵپە قوڵپی ساوەر . .
چوومە ماڵی ئەرمەنی ـ قوڵپە قوڵپی سەمەنی . .
چوومە ماڵی موسوڵمان ـ دەنگی ئایەتی قورئان .
٣١ ـ بڵێ تەشت ـ دایك و باوکت بچێتە بەهەشت .
٣٢ ـ بڵێ جاجم ـ لایەکی قنگت هەڵ پاچم .
٣٣ ـ ئەمشەو شەوی تاریکە هەمزە لە گوخەریکە . .
ئەمشەو شەوی ڕەشەبایە ـ هەمزە لە سینەمایە .
٣٤ ـ چڵمن چاوش ـ بتگرمە باوەش .
٣٥ ـ حاجی لە حەج هاتەوە ـ گەڵ وگونی خواتەوە .
٣٦ ـ باشە لەواشە، ئەمرۆ سەری مەعاشە .
٣٧ ـ ئەرێ بە دینم شکانی ـ ڕاکەن بۆ پارچەکانی .
٣٨ ـ پشی پشیو بوئەکەم ـ نانەپەتێ و بوئەکەم .
٣٩ ـ ئاخ ـ سەلکە پشیلەت بڕ بکەم بە یاپراخ .
٤٠ ـ بڵێ هەشتا ـ یاخوا بکەوی بەپشتا .
٤١ ـ منالی گەڕەك سەر بنەخەڕەك ـ وەرنەدەرێ بۆ شەڕەگەڕەك . . .
منالی گەڕەك وەرنەدەرێ مووسا کوڕ را بە خەنجەرێ . . .

ئەوەی نایە بۆیاری ـ دایکی ئەبەین بە دیاری ـ بۆ شێخەکەی جەباری .

٤٢ ـ کاکە حەمە ، گون تەمتەمە ـ ناخۆی لەمە .

٤٣ ـ عەلە مشکەی تەینالّی ـ چوار مشکی خوارد بەکالّی .

٤٤ ـ نوورە نوورە ، ئاگرە سوورە ، سەلکە توورە .

٤٥ ـ ئەختەرە دوختەرە ـ دەرمانی پشتی کەرە .

٤٦ ـ نیسك و نۆك و ترخێنە ـ حاجی قنگ هەڵ تەکێنە .

٤٧ ـ کلیل و قفلّ تەمتەمە ـ ئاغزو ماغز بۆگەنە . . .

لەم تسکەنە لەو ترکەنە ـ شەپلەقونەی بۆگەنە .

٤٨ ـ چوومە چەمی چەقان ، چەقەڵ چەلّتوکی ئەتەقان .

٤٩ ـ قەلە باچکەی سەر مێوێ ، جارجار کلکی ئەبزێوێ ، خشب کلکم قنگی ، بە کلکم .

٥٠ ـ سوارێ هات لەولاوە سێ توورەکـــە بەدواوە ، یەکـێ توویەکـی موو ، یەکـێ گوو چنگم دا لەموو ، قەپم دا لە توو ، لەقەم دا لە گوو .

٥١ ـ بلێ لولێنە ـ گووی دایك و باوکم هەڵ قورێنە

* منالاٰن پەنجەکانی دەستیان بەم جۆرە ناویان لێنابوو:

١ ـ تووتە

٢ ـ برای تووتە

٣ ـ بالاٰ بەرزە

٤ ـ دۆشاومژە

٥ ـ ئەسپی کوژە

جاران منالاٰن کە بە شەو نەنووستنایە لە سەردەمی بێ کارەبایی دا ، یان هاروهاجیان بکردایە بە هەندێ ناو ئەیان ترساندن بۆ ئەوەی بنوون :

١ ـ شەولەبان (واتە ، بان گردێن)

٢ ـ ئایشێ گوێدرێژ واتە (کەر)

٣ ـ جنۆگەو خێوو کەمتیار.

تیبینی :-

دوای بۆردومانی سلێمانی سالّی ١٩٢٤ ئەم دێرە شیعرە بەسەر **زمانی** منالانەوە بوو:

(تەیارە رەشەی بانەوبان ئەکا داوای مەلیکی کوردستان ئەکا) .

* * *

# چیرۆکی مەڕوبزن

ئەم چیرۆکـە لە چیرۆکـە هەرە بەنـاوبـانگـەکـانی کۆنە کە زۆربەی دایکەکان بۆ منالەکانیان ئەکرد بەتایبەتی لە شەوانی زستاندا کە دائەنیشتن لە گوێ ئاگردان و مەقەڵی دەستیان پێ ئەکرد بەم شێوەیە :-

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو کەس لە بەندەی خراپ ڕووڕەشتر نەبوو. ئەڵـێن مەڕووبـزنێك ئەبێت کە پێکەوە ئەبن ڕۆژێك بزنەکە بە مەڕەکە ئەڵێت برام وا زستان نزیك بووەوە با خانوویەك دروست بکەین بۆ خۆمان تاوەکو لە سەرمای زستان خۆمان ڕزگار بکەین، مەڕەکەش بەپێکەنینەوە وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێت من دووگی خۆم خۆش بێت خانووم بۆ چی‌یە؟

بزن دەست ئەکـات بە خانووەکەی، تەواوی ئەکات و تیادا ئەژی زستان دێت و سەرماو سۆڵە دەست پێ‌ئەکات، شەوێکی زۆر سەخت و تۆف مەڕەکە زۆر سەرمای دەبێت دەچێت بۆلای بزنەکەوە لە دەرگاکەی ئەدات بزنەکە دەڵێت کێ‌یە؟مەڕەکە وەڵام دەداتەوە ئەڵێت منم جیگام بکەرەوە وا لەسەرمادا ڕەق بوومەتەوە، بزنەکەش وەڵامی دەداتەوە: تۆ دووگی خۆت خۆش بێت جیگات بۆچی‌یە مەڕەکە زۆر ئەپارێتەوە ئەڵێت کەوا جێگام نا کەیتەوە قەیناکە بەڵام تەنها جێگای پشتم بکەرەوە، بزنەکە ئەڵێت جێم [illegible] دەجێگای قاچم بکەرەوە، ئەڵیت جێگام نیە مەڕەکە ئەڵێت دە جێگای دەستم بکەرەوە! ئەڵـێت جێگـام نی‌یە ئەڵـێت دەجێگـای سەرم بکـەرەوە

ئەڵێت باشە تەنها بەس سەرت بێنە ژ ووری. مەڕەکەش سەری دەباتە ژ وورەوە، لەنێوەشەودا گورگی برسی دێتە ئەو ناوە هەست بە مەڕەکە دەکات و ناکاتە نامەردی هەموو دوگەکەی دەخوات، بەیانی بزنەکە سەیر ئەکات، مەڕەکە مردووە، پاش ماوەیەك بزنەکە چەند بێچووی دەبێت (تیتلەو بیبلە) هەموو ڕۆژێك ئەڕوات خواردنیان بۆ پەیدا دەکات، ڕۆژێك ئەڵێت کە من ڕۆیشتمە دەرەوە هەرکەسێك لە دەرگای دا بە هیچ جۆریك لێی مەکەنەوە ئەگەر من نەبووم ووتیان: باشە.

ڕۆژێك بزنەکە دەچێتە دەرەوە، لەپاش ئەوە یەکسەر گورگێك هەست دەکات کەئەو بێچووانە لەوێن، لە دەرگا دەدا، ئەڵێن: کێیە؟ ئەڵێ منم دایکتانم ئەوانیش لە درزێکی دەرگاکەوە سەیر ئەکەن کە دایکیان نییە. ئەڵێن: تۆکەی دایکی ئێمەیت! دایکی ئێمە سوورە، گورگەکە خیرا ئەکات دەچێت خۆی لەقوری سوور هەڵئەکێشێ ودێتەوە. لەدەرگاکە دەدا دەڵێت بیکەنەوە من دایکتانم، ئەوانیش سەیرئەکەن ئەڵێن تۆ دایکی ئێمە نیت، دایکی ئێمە ڕەشە، خێرا گورکەبۆی دەردەچێت دەچێت خۆی لە قوری ڕەش هەڵئەکێشێت و دێتەوە، لە دەرگا دەدات دەڵێت لێم بکەنەوە من دایکتانم ئەمجارەش دەڵێت: دەرگا وەکەن لەدایە، شیرم لە گواندایە، گیای سەوزم لەژێر دانایە، دیسان دەڵێن تۆ دایکی ئێمە نیت گورگەکە ئیمان لە کەللەی دەردەچێت و هار دەبێت وە بە هەموو هێزی خۆی دەدات بە دەرگاکەدا چەند جارێك تاوەکو دەیشکێنێ ئەچێتە ژ وورەوەو پەلاماری تیتلەو بیبلە دەدات و ئەیانخوات یەکێکیان دەچێتە گولێنەی تەنوورەکەوە، خۆی ئەشارێتەوەو گورگەکە نایدۆزێتەوە ئەڕوات پاشان بزنەکە دەگەڕێتەوەو لە دوورەوە دەڵێت: تیتلەو بیبلەی دایە، دەرگا وەکەن لە دایە، شیرم لە گواندایە، گیای سەوزم لە بن دانایە کەسەیر دەکات دەرگاکە شکاوە یەکسەر هەست دەکات کە کارەساتێك ڕوویداوە، کە دەچێتە ژ وورەوە بانگیان ئەکات، کەس نابێت تەنها ئەوەی لەگولێنەی تەنوورەکەدا خۆی شاردبۆوە هاتە دەرەوە ووتی کوان؟ ئەویش بەگریانەوە ووتی گورگەکە هات و خواردنی ئەمیش یەکسەر خۆی ئامادە دەکات و ڕادەکات و دەچێتە سەربانی ماڵی (بەراز) و دەست دەکات بە تەپەتەپ بەراز دەڵێت: ئەوە کێیە تەپەتەپ دەکات، کاسەو کەوچکم پڕ لەخۆڵ ئەکات، میوانم لێ شەرمەزار دەکات، بزنەکە وەڵام دەدانەوە ئەڵێت:

ئەوە منم منمنۆکێ، دوو چاوم پێوەیە بزبزۆکێ، دوو شاخم پێوەیە تیژتیژۆکێ، کێ

خواردوویە تیتی من؟ کێ خواردوویە بیبی من، بێتە شەڕە جەنگی من، بەرازوەڵام دەداتـەوە دەڵێت: من نەمخـواردووە تیتی تۆ، من نەمخـواردووە بیبی تۆنایـەمـە شەڕە جەنگی تۆبزن لێ‌ی‌ئـەدا دەڕوات بۆسەربـانی ماڵی مام وورچ و دەست ئەکـات بە تەپەتەپ: مام وورچ دەڵێت: ئەوە کێ‌یە تەپەتەپ دەکات کاسەوکەوچکم پڕ لە خۆڵ دەکات میوانم لێ شەرمەزار دەکات، بزن دەڵێت: ئەوە منم منمنوکێ دووچاوم پێوەیە بزبزۆکێ دووشاخم پێوەیە تیژتیژۆکێ، کێ خواردوویە تیتی من؟ کێ خواردوویە بیبی من؟ بێتەشەڕە جەنگی من، مام وورچ وەڵام دەداتەوە دەڵێت من نەخواردووە تیتی تۆ، من نەمخـواردووە، بیبی تۆ، نایـەمـە شەڕە جەنگی تۆئینجا بزنەکە ئەوێش بەجێ‌دیڵێ دەچـەێتـە سەربانی ماڵی مام گورگ و دەست ئەکات بە تەپەتەپ، مام گورگ دەڵێت: ئەوە کێ‌یـە تەپـەتـەپ دەکـات؟ کاسـەوکەوچکم پڕ لە خۆڵ دەکـات؟ میـوانم لێ شەرمەزار دەکات؟ بزن ئەڵێت: ئەوە منم منۆکێ دووچاوم پێوەیە بزبزۆکێ، دووشاخم پێـوەیـە تیـژتیـژۆکێ، کێ خواردوویـە تیتی من؟ کێ خواردوویـە بیبی من، بێتە شەڕە جەنگی من.

مام گورگ وەڵام دەداتەوە دەڵێت من خواردوومە تیتی تۆ، من خوارد وومە بیبی تۆ، دێمـە شەڕە جەنگی تۆ. ئینجـا هەردووکیـان ئەم شەرعـە دەبـەنـە لای قازی‌وبزن بەدزی‌یەوە کاسەیەك ماستی جوان دەبات بۆلای قازی‌وگورگیش هەمانەیە پڕ ئەکات لە تس، دەیبـات بۆقازی کە دوودەنـك نۆکێشی خستـوتـە ناوهەمـانـەکـەوە تونـد بەستـوویـەتی، گورگ دەست پێشکـەری دەکـات و دەڵێت قوربان تووتنێکی باشم بۆ هێناوی قازی هەمانەکە لەخۆشیاندا دەکاتەوە، یەکسەر دوودەنکە نۆکەکە دەرئەپەڕێت و ئەیدا لە هەردوو چاوی قازی و قازی نیمچەکوێرێك دەبێت بەڵام یەکسەر بزنەکە کاسە **ماستـەکـە دێنێ‌وهەندێك دەدات لە چاوی قازی‌وچاك ئەبێتەوەوهەندێکیش دەخوات**

زۆر بەلایـەوە خۆش دەبێت ئینجـا دێت هەردووکیـان بەرامبـەری یەك دائەنێت دەچێت جووتێ شاخی ئاسنین دەبـەستێت لە سەری بزنـەکـەوجووتێ شاخی لباد بۆگورگە کە دەبـەستێت، دەڵێت پێـویستە ئێوە شەڕ بکەن تا مردن، چونکە ئەمە شەرعی منە دەست ئەکەن بە شەڕوە گورگەکە بە هەمووهێزی شوقێك دەدات لە بزنەکە بەقەسدی کوشتن، بەڵام شاخـەکـانی دەنـووشتێتەوە ئنجا بزنەکە خۆی گوڕئەداو بە هەمووهێزی شۆقێکی باش لە گورگـەکـە ئەدا لە وورگی گورگـەکـەووورگی ئەدڕێت و تیتلەوبیبلە دەکـەونـە

خوارێ، یەکسەر دەچنە باوەشی دایکیان وە پێیان ئەڵێت: ئەوە لەکوێ بوون؟ ئەڵێن لە ماڵی خاڵمـان بووین ئەڵێت: چیتـان خوارد؟ ئەڵێن (دانـوولە) دایکیشیان دەڵێت باشە بۆچی بەشی منتـانَ نەهێنـا؟ ئەوانیش دەڵێن: دانــوولــەکـە زۆر گەرم بوو کردمـانـە دەستمـانـەوە دەستمـان سووتا، کردمـانـە کۆشمان کۆشمان سووتا، کردمانە دەممان دەممـان سووتـا کردمـانە گوێچکەمان گوێچکەمان سووتا کردمانە گیرفانمان گیرفانمان سووتـا کردمـانە لووتمان لوتمان سووتا گورگەکە لەوێ دەمرێت هەموویان شادوشوکر دەبنەوەو ئیتر منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

❊ ❊ ❊

# یاری گەورانە

گەورەکان هەرچ کاتێك یاری‌یەکیان بکردایە کە لە دوو تاقم پێك بهاتایە بەم شێوەیە دەست پیٚ ئەکرا:

لەو کۆمەڵە دووان ئەبوون بە وەستا دوایی هەموو دوو دوو دەستیان ئەکردە ملی یەکتری، تۆزێك لە دوو وەستاکە دوور ئەکەوتنەوە بۆئەوەی قسەیان نەبیستن وە هەریەکەیان ناوێکی لەخۆی ئەنا بۆنموونە یەکێکیان ئەی‌ووت: من شێر ئەبم، ئەوی تریان ئەی‌ووت باشە منیش پڵنگ ئەبم دوایی ئەگەڕانەوە بەردەم دوو وەستاکە ئەیانووت (هەیە، هەیە) دوو وەستاکەش ئەیانووت لە خۆتان (هەیە) ئینجا دووانەکە ئەیانووت (کیٚ ئەیەویٚ شێروکیٚ ئەیەویٚ پڵنگ؟) بەنۆرە دوو وەستاکە یەکێکیان هەر لەخۆیەوە ئەیووت (پڵنگ) یەکسەر ئەوەی ناوی خۆی نابوو پڵنگ ئەچووە سەر ئەووەستایەی کە هەڵی بژاردووەو ئەویتر ئەچووە سەر وەستاکەی‌تر بەم جۆرە تا گشت لە (هەیە، هەیە) ئەبوونەوە ئەبوون بە دوو تاقم.

# جوری یاری یەکان

## ١ ـ مووشین و هەڵماتێن:

ئەم یاری‌یە چەند منداڵێك ئەیان کرد لەسەر پارە یان هەڵمات یان گوێز یان هیچ لەسەر هەچ کامێکیان بووایە ئەو مووشانە دائەکرا بەریز کە هەر مووشە نزیکەی هەنگاوێك لە یەك دوورئەبوون دوایی کۆمەڵ تیلیان ئەکرد بە هەڵماتێك کە پێیان ئەووت (دەست کەلا) هەڵماتی کامیان زۆر نزیك بووایە لە مووشی یەکەم، ئەوە ئەبوو بە (بەگ) واتە کەیاری دەست پیٚکرا لەپێش هەموویانەوە تیل ئەکات. دوایی ئەوەی دوای ئەم تیلیٚ ئەکرد پیٚیان ئەووت (پاش بەگ) ئەمەش بەگوێرەی دوورو نزیکی هەڵماتەکەوە دائەنرا کە تیلی یەکەم ئەیان کرد دوایی ئەوەی (پاش بەگ) تیلی ئەکرد پیٚیان ئەووت (پاشی پاش بەگ)، ئەوەی لەدوای هەموویانەوە تیلی ئەکرد پیاٚن ئەووت فرە.

ئەم شتانەش لە یاری مووشین یان هەڵماتێندا ڕووی ئەدا :ـ

١ ـ سەرشار: ئەو شوێنەیە کە هەموو یاریکەرەکان تیلی لێ ئەکەن.
٢ ـ قرچ: لە کاتی یەکەم تیل کردندا، ئەگەر دووان لە یاریکەرەکان هەڵماتەکانیان بەر یەك بکەوێت پێش ئەوەی کە کەس لە مووشی دابێ، یان خواردبێ ئەوا (قرچ) ئەبێت سەر لەنوێ یاری کەرەکان هەڵماتەکانیان هەڵ ئەگرنەوەو سەرلەنوێ تیل ئەکەنەوە.
٣ ـ حەپوولك کاتێك یەکێکیان کە تیل ئەکەن وە بەر قاچی یەکێکیان ئەکەوێت دەڵێت (حـەپـوولـك)وە ئەچێت هەڵمـاتـەکەی هەڵ ئەگرێت بەئارەزووی خۆی لە شوێنێکی دادەنێ پەنا بێت یان دوور خستنەوە بێت.
٤ ـ هەڵ گرتـەیی: ئەومیـە لە کاتی تیـل کردنـدا هەڵماتەکە بەرزئەکرێتەوە، بێ ئەوەی لە زەوی بدا، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە یەکسەر بەر موشێك یان سەرێك دەکەوێت، لێرەدا (سەر) واتە دەست کەلای هاورێکانی تری.
٥ ـ خشکەیی: بەپێچەوانەی هەڵ گرتەیی یەوەیە ئەم تیلەهەڵماتەکە تەنها بە خشکەیی بەسەر زەویدا دەڕوات.
٦ ـ پیلکــە: واتـە دەست و پەنجـە، پیلکـەی زۆر ڕاستە، بەڵام بەپێچـەوانـەوە بوایـە ئەیانووت پیلکەی زۆر خوارە.
٧ ـ مووش: ئەو شتـەی کە یاری لە سەر ئەکـراو دائـەکـرا لەسـەر زەوی پێ یـان ئەووت (مووش)، جا مووشەکە پارە، گوێز هەڵمات، میچ بووایە.
٨ ـ کایـە: واتـە نۆرە، ئەگـەر سەرەی یەکێـك بووایـە ئەیـووت: کایـەی منە، یان واتە جارێکی تـر یان کەرەتێکی تـر یەکێـك لە یاری کەرەکان نیازیوا بووایە کە یاریەکە تەواو بکات یەکێکی تریان ئەیووت با ئەم (کایە) یەش بیکەین.
٩ ـ کۆستـە: کۆستـە ئەگـەر یاری یەکە ناخۆش بووایە یان یەکێك لە یاریکەرەکان لات بووایەو بیانووی ئەگرت خێرا دەستی ئەدایە مووشی خۆیی و ئەیووت (کۆستە، کۆستە)و ئەوانی تریش هەریەکەیان مووشی خۆیان هەڵ ئەگرتەوە.
١٠ ـ دیشکـەم: یەکێـك لە یاریزانـەکان ئەگەر لە یاریدا لات بووایە، مووشێك یان چەنـد مووشێـك قەرزار بووایـەوپێ ی نەبـوو بیـداتەوە ئەیووت :ـ من (دیشکەم) وەیان پێیانئەووت دیشکەمی کردووە، ئیتر قەرزەکانیان لێ داوا نەئەکردەوە.

١١ ـ ناوكـۆیی : دووشەریـك یان زیـاتـر مووشێكیـان لەنیـوانـدا بووكە بەشی بكـەن لەبـەرئـەوەی بەش نەئـەكرا یەكێكیان ئەیووت تۆو ناوكۆیی یەك یان ئێوەو ناوكویی یەك ، جا بۆ ئەم ناوكـۆیی یـە تیلیـان لەسەر ئەكرد یان بە شێر و خەت چارەسەریان ئەكرد كە بۆ كامیان بێت .

١٢ ـ گزی: زۆر هەبوون كە لە كاتی یاریدا خەریكی فێڵبازی بوون، پێیان ئەووتن (گزیكەر) .

١٣ ـ فس : دوو كەس لە یاری یـەكـدا ئەمـانـەوە ، دووا تیلیـان ئەگرتە یەكتری بۆئەوەی حەجەكە بخۆن ، ئینجا لەم كاتەدا ئەوەی كە نۆبە تیلی نەبوو ئەوەستالە سەر ئەوەی كە تیلی بۆحەج ئەكـرد یان بۆسـەرەكـەی ئەكـرد ، دوو پەنجـەی لەژوور سەریەوە تۆزێك رائـەگـرت لە یەكی ئەخستن بەپێكـەنینـەوە ئەیووت (فس) تسی ئاتێ نەیگاتێ ئەمەش جۆرە كردەوەیەكی نەفسیە لەگەڵ یەك ئەكرا .

١٤ ـ سەر و حەج لەیـاریـدا : كە دووانیـان ئەمێنێتـەوەو سەرەكـەی لەنزیك حەجەكەوە دانـاوە ئەوتیـریـان كە تیـل ئەكـات ئەڵێ سەروحەج واتە ئەگەر حەجم كرد ئەوا كۆتایی یاریـەكـە دێت دوای ئەوەی دوا تیلی تێ ئـەكـرێت وە ئەگـەر سەرەكـەی ئەویشی گرت دیسان كۆتایی بە یاری یەكە دێت و حەجەكەش بۆ خۆی دەبات .

**تیلی بەرامبەرێن :**

**ئەم یاریـــە دوو كەس بەرامبـــەری یەكتـــری دائـــەنیشن لنـــگ رائـــەكێشن لە ماوەی**
(١)م تاوەكو (٢)م دائـەنیسشن یان یەكیـك دژ ی دووان یان دووكـەس بەرامبەر دووكەس بەشەریكی یاری ئەكەن ئەو كەسەی لەپێشاپڵێت : (پشتی ملت قاچ وقولت ، قنگی زلت) ئەوا یەكەم جار تیل ئەكات ئەگەر لێ یبدا دیسان هەر خۆی تیل دەكاتەوە .

یاری هەڵماتێن و مووشێن :ـ یاری یەكی زۆر باو بووە لە شاری سلێمانیدا وە لەكاتی تایبـەتی خۆیـدا ئەكـرا وە یاری یـەكی زۆر خۆش بووە بەتـایبەتی لەلایەن منالآنەوە ئەم یاری یـەش لەلایـەن زۆر كوری گەنجـەوە ئەكرا بەلآم لەباتی هەڵمات پارەیان دائەكردو بە **هەڵماتی بەرد تیلیان ئەكرد وە بە شووشە شتێكی ناشرین بوو. هەڵماتی بەرد :**
ئەوانـەی كە زۆر حەزیـان لەم یاری یـە ئەكـرد هەمیشە هەڵماتی بەردی جیاوازی جوان

جوانیـان پێ بـوو، لە یاری گەورەدا نەبـووایە دەریان نەئەهێنا وە یاری کەرە باشەکان کە دەستیـان ڕاست بوو، هەمیشـە هەڵمـاتیـان دەنـاسـرایـەوە هەر کە یاری کەرێکی تـر هەڵماتێکی ببینایە ئەیووت ئەوە هەڵماتەکەی (ئەحەشەلە)یان (عومەری بەهێ یە)وە هتد . . .

**چۆن هەڵمات دروست دەکرا :-**

وەکو ووتمان لەسەرەوە ئەوانەی کە زۆر حەزیان لەم یاری یە ئەکرد هەمیشە حەزیان ئەکـرد هەڵمـاتی جوان و بێ هاوتـایـان هەبێت، یان هەندێك تەنها کە دروستی ئەکرد تەنها بۆ فرۆشتنی بوو. ئەم لاوانە ئەچوون بۆئەوەی بەردی هەڵمات بدۆزنەوە بیکەن بە هەڵمـات دیـارە ئەم جۆرە بەردانـەزۆر جیـاوازی هەیـە لەگەڵ بەردی تردا، هەندێکیان سپی ی ڕووت لە بەردەسپی یان لە بەردی مەرمـەڕ وەیـان بەردی خاڵ خاڵاوی سووری خوێنی، یان ڕەش، یان بۆروشێن بەجـۆرەهـا نەخش و خاڵ خاڵ ئەهـاتن ئەیانهێنا بە چەکـوشی هەڵمـات کە بریتی بـوو لە وەلفی ئوتـومبێـل بەردەکەیان تۆزیك بەرەو خری ئەبرد، دووایی تۆزێك خریان ئەکردەوە، بەڵام هێشتا بۆپیلکە گەورە بوو، پێیان ئەووت گەلاڵـەی کردووە، ئینجـا هێـواش هێـواش لەناو لەپی دەستا یان لەسەر بەردێك ووردە ووردە لێ ئەدرا، پارچـەی زۆر ووردی لێ ئـەبـووەوە، تا بچـووك ئەبۆوە ناوبەناو ئەخرایە **دەمـەوەو تەڕ ئەکـرا، ئینجـا لێ ی دەدرایەوە تاوای لێ ئەهات بەتەواوی ڕێك ئەبوو، بە** ئارەزووی دلی ئەوکـەسـە ئینجـا سمـارتـە ئەکرا، لە کۆتایی سمارتە کرندا دەخرایە ناو کاکڵەی گوێـزەوە لەنـاو دەستـەسـڕێکـدا دووای ئەوەی گوێـزەکەی بۆووردئەکرا ئینجا خۆشترین کات ئەوکاتە بوو کە هەڵماتەکە لەناو گوێزەکە دەرئەهێنراو بریسکەی دەدایەوە کە ئازیزترین شت بوو لەلای.

دووجۆر هەڵمـاتی لێ دروست دەکـرا، جۆرێکیـان بەقـەدەر پیلکەی ئەوکەسە، بەڵام جۆری دووەمیـان زیـاتـر لەحەدی پیلکە گەورەتر بوو، قورس بوو بەکەڵکی هەڵگرتەیی ئەهات پێیان ئەووت (گلۆر).

ئەمـەی خوارەوە پارچـە هۆنـراوەیـەکـە لەلایـەن هۆنـەری ئەندازیار کاك (نووری کاکە حەمەی ئەمینی عەتتار)ەوە دانراوە :

کورگەل لەسەر شار کاتی مووشێنە
هـەڵمات و میـچت لە کیس دەربێنە

میچ بە میر دانێ نەك بە جەك و پشت
تـیل کەن بۆ بەگی کورِ گەلینە گشت

بـەگ کە تیلی کـرد پەناحەجی گرت
بە هەڵگرتەیی پاش بەگ قرچی کرد

خلەی پیلکە خوار خۆ مووشێکی خوارد
قـرەش خـشـکەیی تـیلـێکی بۆ نارد

مـن کـایەی خۆمە بـەس یـاری نـاکـەم
نەك کۆستە کۆستەو لێم بکەن دیشکەم

میچی ناوکۆیی بە شێر و خەتە
گـزی کەر مووشی کەم بەرەکەتە

حەپوولکە تیلی بە فێڵ و خوارە
لەسەری ناکە ین ئـیتـر ئەم جارە

فس کە بەسەریا بـــە تسـی ئاتـێ
پیلکەی خوار ئەبێ تیلی ناگاتێ

پیلکەی ڕاست وەستای ناو هەڵماتێنە
مووشێن و تیـلی بـــەرامبـە رێنە
هەڵماتی خاڵ خاڵ هێشتا گلۆرە
بـا بیسـووینـەوە هەردوو بە نۆرە

دەست کەلام هەڵگرت لام دا لە مووشێن
ویـستم کایەیەك گوێز کەم بە واغێن

کـه دیـم چاڵ چاڵێن کوڕی گیراوه
که تاق بۆی دۆڕا جووت بۆی داناوه
وهستا به حلێب بۆی کردم به ماڵ
دوو هەنگاو لەدوور جووتم خسته چاڵ

لەترسا رامکرد کوتام وەك شەماڵ
باوکم لە مزگەوت تا نەچۆتە ماڵ

* * *

**تێبینی : ـ میـچ ئەوپارچـە ئێسقـانـەیـەکـە جاران کولێرە بەرۆنیان پێ چاڵ ئەکرد بەڵام ئێسقانە درێژە کەیان لێ ئەکردەوە بەوەیاری‌یان پێ‌ئەکرد.**
**میرـ ماناى دانانى میچەکە لەبارى بەرزى**
**جەك ـ ماناى دانانى میچەکە بە تەنیشتا**
**پشت ـ ماناى دانانى میچەکە بەپشتا**

## «سەگ بازی»

سەگ بازی باوی بوو لە گەڕەکەکاندا زۆر لە دەستە کوڕەکان سەگ بازی‌یان ئەکرد وە سەگیان ڕائەگرت لە گەڕەکەکانا کولانەیان لە قوڕو بەرد بۆ ئەکردن وە سەرەکەیان چەند دارێکیان ئەخستە سەر ئینجا بەقوڕ هەموو کولانەکەیان سواغ ئەدا، تەنها کونێکی تیا ئەهێڵدرایەوە، وەکو دەرگا بە شەو ئەچوونە کولانەکەوە بە ڕۆژ ئەهاتنە دەرەوە، کوڕان ئەچوون بۆ بەردەم قەسابەکان ئێسقان و چەق و زۆر شتی‌تریان بۆ ئەهێنانەوە ئەیانخوارد، یان لە ماڵەکانەوە چی خواردن زیاد ببوایە بۆیان ئەبردن ئەم سەگانە لە گەڕەکەکەدا ڕائەهاتن وە دوورنەئەکەوتنەوە تەنها کوڕانی گەڕەك ئەیانبردن گەڕەکاوگەڕەك بۆ شەڕەسەگ ئەگەر بهاتایە سەگەکە بەزیایە ئیتر نەیان ئەهێشت بێتەوە گەڕەکەکە دەریان ئەکرد ئینجا هەر بەمناڵی ئەم سەگانە کە توولەن ئەیانهێنا گوێچکەیان ئەبرین بۆئەوەی کە گەورەبوو دڕوئازا دەرچێ وە هەر سەگە ناوێکی خۆی هەبووە.

زۆر جار لەم سە گانە وای‌لێ‌ئەهات پەلاماری خەڵکیان ئەدا وە بریندایان ئەکردن هەر کوڕانی گەڕەك بۆئەوەی لەناوی‌بەرن ئەچوون دەرزی‌یان بۆ ئەخستنە ناو گۆشت و نانەوە ئەیاندا بە سەگەکە کە ئەیخوارد دەرزی‌یەکە لە قورگی ئەگیرا وە ئەمرد.

لەتاو زۆری سەگ و هارو هاجی مندالان میری وای‌لێ‌هات پۆلیسی تەرخان کردبوو بۆ سەگ کوشتن یەکێ لەوانە بەناوبانگ بووە ناوی (یوحنا خەنانیشو) بوو، ئەمە تاپڕێکی دوولولەی هەڵئەگرت وە بەکۆڵانەکاندا ئەگەڕا بۆ سەگ کوشتن وە لەسەری هەچ کۆڵانێك دەربکەوتایە مندالان ڕایان ئەکردو خەبەریان ئەدا کەوا سەگ کوژەکە هاتووەو خەڵکیش سەگەکانیان ئەشاردەوە.

رئاستی بلدیه ی سلیمانی
زماره ١/ ٩٦٤
روز ٥/١٠/١٩٤٢.

بو ملاحظی انضباطی بلدیه

موضوع/ کوشتنی سه کی خویری

به بی تحریراتی وزارتی داخلیه که به تحریراتی زماره ٢٢١٠ وروزی ٢٧/٩/٩٤٢ متصرفی لواوه تبلیغمان کراوه له اعتباری ایمرووه بیویسته کناسیك تخصیص بکه ن که به ناوشاردا بگه ری هه رکه توشی سه کی خویری وبی صاحب هات بیگری وبیبات تسلیم به دائره ی بیطره ی بکات بواعدام کردنی .

رئیس بلدیه ی سلیمانی

صورتیکی بو :-

متصرفیتی سلیمانی — بومعلومات واشاره به بوتحریراتی بالایان .
مدیری شرطه ی لوا — بومعلومات .
طبیبی بیطری ملکی لوا — " " .

**قەلەمرداریٰ :-**

ئەم یاری‌یـــە بریتیـە لە هێلێکی بازنـەیی گەورە وە یاری‌کـەرەکـان ئەبن بە دوو تاقم تاقمێکیـان لەنـاو خەتـەکـەدا ئەوەستن وەتـاقمی دووەم لە دەرەوەی خەتـەکە ئەوستن بە تۆپێکی هەوری لاستیـك بەرامبـەر بەیـەك بۆیەکتر تۆپەکەیان هەڵ ئەدا وە ئەیان گرتەوە تاقمی ناوەوە هەوڵیان ئەدا کە ئەوتۆپە هەڵ ئەدەن بۆیەکتری ئەمان بیگرنەوە، ئەگەر بە ڕێکەوت تاقمی ناوەوە بەردەستیان بکەوتایە، بە کتوپڕ ئەیان گرتەوە تاقمی دەرەوە ئەگـەر بەریـەکێکیان بکەوتایە تاقمی دەرەوە ئەهاتنە ناوەوە خۆئەگەر بەریشیان نەکەوتایە یاری‌یەکە دەستی پیٰ ئەکردووە هەتا بەر یەکیٰ ئەکەوت .

**ئاشە بەتەنوورە :-**

ئەم یاری‌یـە لە دوو تاقم پێـك دێت تاقمێکیـان تیٰ ئەکـەوت (٤)یـان (٥) کەسیان دەست ئەکـەنـە ملی یەکتـری‌و سەرئـەکەن بەیەکا یەکێکیان ئەبێت بە وەستا، پشتێنێك دێنیٰ سەرێکی ئەگرێتەبەدەستەوەو سەرەکەی تریشی ئەوان ئەیگرن بەدەستەوە ئەوانەی دەستیان کردۆتە ملی یەك .

وە تاقمەکەی‌تر بەدەوریاندا ئەسووڕێنەوە بۆئەوەی سواری کۆڵی یەکێك لە دابووەکان بن، بەڵام وەستاکەیان کە پشتێنەکەی بەدەستەوەیە نایەڵێت سواری کۆڵی برادەرەکانی بن، وە پەیتا پەیتا بەدەوریاندا ئەسووڕێتەوە، بۆئەوەی ئاگای لە سوواربوون بێت ئەگەر یەکێك لەوان توانی سوار ببێت ئەوا بەکۆڵەوە ئەمێنێتەوە بەڵام جاری‌واهەیە پێش ئەوەی خۆی هەڵ بداتـە کۆڵی یەکێـك وەستـاکـە شەقێکی دەگەیەنێتیٰ، مانای‌وایە تێکەوت، بەڵام کە بەکۆڵەوە بوو ناتوانێت شەقیان تیٰ هەڵبدات هەتا نەکەوێتە خوارەوەو.

پیرەمێردی نەمر ئەڵێت :

ئاشە تەنوورەی‌زەمانە وایە

هەرچی کە سواربوو شەقی لەدووایە

**کەوشەکێن :**

ئەم یاری‌یە بەزۆری لە دەشت دا دەکرا لەنێوان فەقێ و مەلاکانا وە لە چەند کەسێك پێك ئەهات لەپێشا کوشێکییان دائەنا وەکو سەرشار ئنجا لەوێوە هەموو (٣) بازیان ئەدا کامیان لە هەموویان زیاتر برۆیشتایە ئەبوو بە وەستا وە کامیان کەمترین ماوە برۆیشتایە تێ ئەکەوت وپێویستە دابوایە، وە وەستاکە یەکێکی هەڵ ئەبژارد لەدووای خۆیەوە بازی‌ئەدا بەمەیان ئەووت (خەلفە).

ئەوەی دائەبوو پێویست بوو لەسەر کەوشەکەوە، یان ئەو خەتەی کێشراوە بنووشتێتەوە ئینجا وەستاکە بەسەریا بازێکی ئەدا دەستی دائەنا و هەردووقاچی ئەکردەوە خۆی هەڵئەدایە ئەردیوە ماوەیەك لە خەتەکە دوورئەکەوتەوە دابووە کە ئەچووە ئەو شوێنەی وەستابازی گەیشتوەتێ ئینجابە دووایا هەموو بازیان بەسەریا ئەدا، ئینجا سەر لەنوێ وەستا بازی‌تری ئەداو دوورئەکەوتەوە لە خەتەکە، بەرەبەرە وای‌لێ ئەهات کە کەمیان ئەیانتوانی بیگەنێ، باز بدەن بەلام بۆیاری زانەکان ئەبوو کە تەنها لەکاتی بازداندا تەنها هەر سنگ بدەن لە دابووەکە، ئەگەر بازیش نەدەن بەسەریا هەر ئەبێت بەلام بۆ وەستاو خەلفە نابێت سنگ بدەن لە دابووەکە، پێویستە هەر باز بدەن بەسەریا بەم یاری‌یەیان ئەووت (سنگەوباز).

**فەقێ و کەوشەك :-**

لەم جۆرە یاری‌یانە لە هەموویان باوتر کەوشەك بوو (کەوشەکێن) بەتایبەتی لەنێوان فەقێ و مەلاکانداوە بەگیانێکی پاکی برایانەوە ئەم یاری‌یە دەکرا، بەبێ جیاوازی چی

گەنج چی پیر کە تێ بکەوتایە پێویست بوو دابوویە، چەند دیمەنێکی جوان بوو کە ئەو یاری‌یە دەست پێ ئەکراو کۆتایی پێ ئەهات بە پێکەنین و قسەی خۆش و برایانەو بێ جیاوازی.

فەرموودەی [سەید ئەحمەدی نەقیب] لەلایەن یاری
- کەوشەکەوە -

لەمەیدانی عیبادەتدا بەجیٚما هەرکەسیٚ بیٚشك
هەمیشە چاو بەرەو ژیٚرە ئەبیٚ مەهتوك و ریسوا بیٚ
بەجیٚمان باعیسی مەهتووکی‌یە حەتتا لە یاریدا
کەسیٚ مەقبوول و مەعقوولە کە چاپووك دەستو ئازابیٚ
قەدی ئەلفی دەبیٚتە دال لەبەر سستی لە یاریدا
بەجیٚماو هەر ئەبیٚ دابیٚ بە زیللەت گەرچی وەستا بیٚ

## وەرامی مەلا ئەحمەدی مەشهوور بە «خاکی»

ئەگەر دەرویٚش ئەگەر، سۆفی لە تەکیەو خانەقادابیٚ
گەدا بیٚ یاخو پاشا بیٚ خەلیفە یاخو وەستا بیٚ
لە عەرصەی کەوشەکا جیٚماو وەکو دابە ئەبیٚ دابیٚ
ئەبیٚ سەرحیزو مل کەچ بیٚ ئەبیٚ دماوو ریسوا بیٚ
قبووڵ نابیٚ بە هیچ بابیٚ کە کور دابیٚ لەجیٚی بابیٚ
ئەگەر سوختە مەلای جیٚهیٚشت مەلا مل کەچ نەبیٚ نابیٚ .

## فریوە ـ ئاگرە

ئەم یاری‌یە لە چەند کەسیٚك پیٚك دیٚت پاش (فنکانکۆ) یەکیٚك تیٚ ئەکەویٚ وە شویٚنیٚك ئەکەن بە شار ئەوەی تیٚ ئەکەویٚ لەسەر قاچیٚك بە هەنگە شەلیٚ رائەکاو هاوار ئەکات (فریوە) یان ئەلیٚ (ئاگری سوورم هیٚناوە) و دەست ئەکات بە راونانی یاری‌زانەکانی کە، ئەگەر توانی شەقیٚك لە یەکیٚك لە یاری‌زانەکان بدات ئەوا ئەو تیٚ ئەکەویٚ و دیٚتە شویٚنی ئەم بەلاّم خۆ ئەگەر نەیتوانی و هیلاك بیٚ و قاچ دابنیٚ بە هەموویان پرشەقی ئەکەن لە هەمولایەکەوە . تاوەکو ئەیگەیننەوە سەر شار .

کڵاوکڵاوێنەو گۆرەوی بازیو فنجانێن :

ئەم یاری‌یــە بەوری لە شەوی زستــانــانـدا ئەکـرا، بەتـایبـەتی لە ماڵان دووتاقم کۆئەبوونەوە چەند کڵاوێك یان گورەوی بەن یان فنجان دائەنرا، یەکێك لەوتاقمەی کە لەپێشەوە دەست ئەکەن بە شاردنەوەی ئەمووستیلەیەك دەخاتە دەستیەوە دەست ئەکات بەژێـر کڵاوەکـانـدا یان گۆرەوی‌یـەکاندا یان فنجانەکاندا وە بە هەوەسی خۆی تیایاندا دەشـارێتـەوە بێ ئەوەی کەس بزانێت لەکـوێ‌دایـە وە تاقمەکەی‌تر بۆیان هەیە (٣) جار سەری ئەو شتانە هەڵدەنەوە، بۆدۆزینەوەی ئەمووستیلەکە، ئەگەر دوزی‌یانەوە ئەوا ئیتر نۆرەی ئەوانـە بۆشاردنـەوە وە ئەگـەر نەدۆزرایـەتـەوە ئەوا هەرئەمـان لەسـەر شاردنەوەی بەردەوام ئەبوون و بەم جۆرە شەویان بەسەر ئەبرد.

## گەنم گەنم

ئەم یاری‌یـە جووڵانی تیـا نی‌یـەهـەر بە قسـە ئەکـرێت لە چەند کەسێك پێك دێت یەکێك ئەبێت بە وەستا ئەوانی تریش هەریەکە ژمارەیەك دائەنێ وە پێویستە ئەوژمارانە تاك بێت وەکــو: وەستــا ژمــارە (١) پاش ئەوژمـارە (٣) وە (٥) و(٧) و(٩) و(١١) بەگوێرەی زۆری یاری‌کەرەکان ئینجا وەستا بەم شێوەیە دەست پێ‌ئەکات: گەنم گەنم لە حەوتـەی بێت ئەوەی کە ژمـارە (٧)ە ئەبێت گورج بێ‌د وکـەوتن وەڵام بداتەوە بڵێت نابێت لە حەوتـەی بێت. . ئینجـا وەستـا ئەڵێت ئەی ئەبێت لە چەندەی بێت؟ دووبارە ژمارە (٧) ئەڵێت بۆنمونە ئەڵێت ئەبێ لە پێنجەی بێت، دیسان ژمارە (٧) ئەڵێت ئەی ئەبێ لە چەندەی بێت؟ دیسان ژمارە (٥) :- ئەبێت لە سێ‌یەی بێت دیسان ژمارە (٣) ئەویش وەکو وەڵامی ئەوانەی پێشەوە وەڵام ئەداتەوە وە ئەگەر یەکێك هۆشی لای خۆی نەبێت یان درەنگ وەڵام بداتەوە ئەوا تێ‌ئەکەوێت و ناوێکی ناشیرینی لەلایەن وەستاوە لێ ئەنرێت ئیتر ژمارەکەی نامێنێت تەنها بەو ناوە ناتۆرەوە بانگ دەکرێت تاوەکو یاریەکە تەواو ئەبێت.



گۆرانی ئەمر ساڵی ١٩٥٤ هەڵبـژاردنی پێنـج ئەندامی ئەنجومەنی شارەرانی و کێشەی نێوان گەل و میری‌و پاڵێوراوانی هەردوولایانی خستۆتە ناو قاڵبی ئەم یاری‌یەوەو ووتوویەتی :

ـ گەنم گەنم لە پێنجەی بێ
دەستی دز لە خۆی پەنجەی بێ
ـ گەنم نابێ لە پێنجەی بێ
میللەت بەری لەم ڕەنجەی بێ
(ع٠م٠ر)

* * *

## پشکۆ بە فوو

کۆمەڵێك کۆئەبوونەوە یەکێك دارێکی ئەگرت بەدەستەوە تەلێکی پیا شۆڕئەکردەوە وە کلۆیەك خەڵـووزی گەورەیـان ئەهێنـا ئەیـان خستە سەری تەلەکەوە ئەیان پێچا ئەمجا ئاگـریـان تێ‌بەرئەدا هەتا ئەگەشایەوە ئەمجا بە هەموویان دەوریان ئەدا وە بەرامبەر یەك فوویـان لێ ئەکـرد بۆئـەوەی دەم وچـاوی یەکتر بسووتێنن ، بەم جۆرە کاتیان ئەبردەسەر بەدەم پێکەنینەوە ؛ ئەم یاری‌یە لە زستانا ئەکرا .

## شاردنەوەی ئەمووستیلە

ئەم یاری‌یەش بریتی‌یە لە شاردنەوەی ئەمووستیلەیەك لەناو دەوری‌یەك ئارددا ئینجا یەکێـك هەردوو دەستیـان لەپشتەوە ئەبەستەوەو لەسەر ئەژنۆ دائەنیشت و ئەبووایە بەدەم ئەمـــووستیلەکـــەی لەنـــاو ئاردەکـەدا بدۆزیـایـەوە وە دەم وپلی خۆی ئارداوی ئەکـردو دیمەنێکی سەیرو پێکەنیناوی هەبوو.

## تەقیلە لەسەر تەقیلە

ئەم یاری‌یە یەکێك بە چیچکانەوە یان بە چوارمەشقی دائەنیشت سەری دائەنەواند بۆئەوەی چاوی لە کەس نەبێت. چوار پێنج کەسیش هەردوو دەستیان ئەخستە سەر یەکتری و سەرپشتی ئەو کەسەی پشتی دانەواندووە پێ‌یان ئەووت (دەستی کێ، لە بانی کێ) ناوی ئەوکەسەی بزانیایە کە دەستی لەسەرو هەموویانەوەیە هەر کە بیدۆزیایەوە یەکسەر ئەچووە جیگای ئەویتر، هەروەها بەم شێوەیە کاتیان بەسەرئەبرد، ئینجا کە ئەرۆیشتنەوە بەرەو ماڵەوە هەموو بەجارێك بە چەپڵەلێدان ئەیانووت :ـ
تەقیلە لەسەر تەقیلە پشکۆ لەسەر سەبیلە
هەرچی نەی‌بێت زەلیلە.

## میر و گزیر

ئەم یاری‌یە لەنێوان دوو کۆمەڵدا ئەکرا، ئەموستیلەیەك هەڵ ئەدەنە پشتی دەستیان ئینجا هەوڵ ئەدەن کە ئەموستیلەکە بخەنە پەنجەی گەورەوە، کە بچوایە پەنجە گەورەوە واتە (پەنجە درێژەکە) ئەوە میرە ئەگەر بچوایەتە سەر پەنجەی شایەتمان ئەوە گزیرە.

## بوخچە بەگەردانێ

ئەم یاری‌یە لە پێنج کەس تا (١٠) کەس توانیویانە بەشداری تێدا بکەن، بەشێوەیەکی بازنەیی دائەنیشن بەڵام یەکێك لە بەشدارەکان لەدەرەوەی کۆمەڵەکە بووە ئینجا لەناو کۆمەڵە بازنەکەدا بوخچە بەگەردانەیەکیان پێ‌بووە کە بریتی بووە لە پەڕۆ، یان پشتێن، یان دەستەسریان چەندپارچە قوماشێك خریان کردۆتەوە وە گرێ‌یان داوە وەك (بوخچە) ئینجا کۆمەڵەکە بەخێرایی بوخچەکەیان هەڵداوە بۆیەکتری ئەوەی دەرەوە ئەگەر بیتوانیایە لە دەستی یەکێکیانی بسەندایە ئەوە ئەو کەسە تێ‌ئەکەوت و ئەچووە جێگای ئەو، بەم جۆرە یاری‌یەکە دەوامی ئەکردو بەخۆشی ئەچووە سەر.

## گوریس کێشەکی

ئەم یاری‌یە لە دوو کۆمەڵ پێك ئەهات کە ژمارەیان ئەگەیشتە نزیك بیست، دووای ئەوەی ئەبوون بە دوو تاتم هەرلایەك ١٠ کەس ئینجا گوریسێکیان ئەهێنا هەر کۆمەڵەی ئەچووە سەری گوریسەکەوە وە سەری گوزیسەکەیان ئەگرت بەرامبەر بەیەکتری و لە ناوەراستدا دەستەسرێکیان دائەنا. **خەتیان** ئەکێشا، ئینجا هەردوو کۆمەڵەکە بەهۆی ١، ٢، ٣ وە دەستیان ئەکرد بە راکێشانی گوریسەکە هەر کۆمەڵە بۆلای خۆی وە هەرلایەکیان بەهێز بوونایە کۆمەڵەکەی‌تری رابکێشیایە بۆلای خەتەکە یان تێپەری بکردایە ئەوا ئەیان بردەوە ئینجا بۆجاری دووەم شوێنیان ئەگۆریەوە، بەم شێوەیە ئەم یاری‌یە ئەکرا بردنەوەی ئەم یاری‌یە ئەبو هەرلایەك دوو جار لاکەی‌تری رابکێشیایە، جاری‌وا هەبوو کە لایەك لاکەی‌تری رائەکێشا جاری دووهەم لاکەی دژ بەوان ئەمانیان رائەکێشایەوە ئەبوون بە یەك پاشان بۆ جاری سێ‌هەم چی لایەك ئەویتری رابکێشایە ئەیبردەوە.

## گورزە کوێرە:-

ئەم یاری‌یە لەنێوان چەند کەسێکدا دەکرا هەموو جامانەکانیان یان پشتێنەکانیان ئەکرد بە گورزی یەکێك لە کۆمەڵەکەدا تێ‌ئەکەوێت و چاوی ئەبەستنەوە، ئەویش گورزی خۆی پێ‌یە وەبەچوار دەوری خۆیدا هەڵ ئەسووری‌و گورزەکەی ئەهاوێژێ ئەوانیش لە هەموو لایەکەوە بەر گورزی ئەدەن، خۆ ئەگەر گورزی چاو بەستراوەکە بەر هەر یەکێك بکەوێت، وا تێ‌دەکەوێت و دێتە شوێنی ئەم و چاوی دەبەستنەوە.

## یاریی وورچە قورینە

ئەم یاری‌یە کورێك ئەیکرد ئەوەش دەرپێ‌یەکی سپی‌ی درێژی کوردی لەپێدابوو، وە پزووی دەرپێ‌یەکەی سەرئەخست بۆلای ملی وە لەسەر ملی ئەیبەست، واتە هەردوو دەستیشی ئەچووە ناو دەرپێ‌یەکەوە ئینجا جامانەیەکی بە دیوە سپی‌یەکەیا لەسەری ئەکرد

وەکو مێزەری مەلا ، دوایی دوو تاکە کلاشی بەند ئەکرد تاکی بەلای گوێچکەیەکیا وەکو گوێ ، ئینجا خۆی خوڵاوی ئەکردو لەگەڵ چەند منالێکی تردا بە چەپڵەو گۆرانی ووتن ئەچوونە بەرماڵان و هەندێ ماڵ مێووژ و نۆك و باسووقیان ئەدانێ ، بەڵام هەندێ لەماڵەکان ئاویان پیادا ئەکردن هەندێ جاریش بۆ ترساندنی خەڵکی بوو کە ئەهاتنەدەرێ .

**یاری جوغزێن :**

ئەم یاری‌یە لەنیوان (٢) تیپدا دەکرێت بەتایبەتی لەنێوان فەقێ‌یاندا وە لە وەرزی بەهاردا. **بەهۆی** شێرو خەتەوە یان تەڕو ووشکەوە تیپێکیان دەدۆڕاو یەکێکیان براوە ئەبوو، دوایی شێوەی بازنەیەکیان دەکێشا کە دۆڕاو دەچووە ناوی‌یەوە وە براوە بەدەوریا ، وە کەرەسەی یاری‌یەکە تۆپێکی پەڕۆیان چەرمین یان هەوری بوو، کە دەست دەکرا بە یاری کۆمەڵێ براوە تۆپەکەیان ئەهاویشتە دۆڕاوەکان کە لە ناوەوە بەرهەرکامیان بکەوتایە ئەوا دەهاتە دەرەوە ناو دەنرا ئەسیر وە (جوغز) دەکرا واتە فت دەکرا وە لە شوێنێکی تایبەتی دائەنران وە لەپاشدا کام لایان ئەسیری زۆر بووایە ئەو تیپە براوە بوو.

**واغێن :-**

ئەم یاری‌یە بە گوێز ئەکرا ، دووکەس دووکەس ئەیانکرد، بە هەردووکیان چنگێ گوێز، یەکی چوار، یان پێنج ، یا زیاتر یەکێکیان بەنۆرە چنگە گوێزەکەی بە هێواشی بڵاو ئەکردەوە ، ئەوەی بڵاوی ئەکردەوە گوێزێکی ئەکرد بە دەست کەلا تیلی پێ‌ئەکرد، ئەگەر لە دووانی بدایە یان سیان زیاتر گوێزەکانی ئەخوارد، ئەگەر لە یەکێکی بدایە یان لە هیچ ئەوا ئەو بەجێ‌ی ئەهێشت بۆئەوەی ئەوی‌تر تیل بکات ئیتر بەم شێوەیە یاری ئەکرا .

## یاری‌کەرانە :-

چەنـد کەسێـك ئەم یاری‌یـەیـان ئەکـرد، بەمـەرجێك هیچ کامیان بەزەیی بەویتردا نەیـەتـەوە. ئەم چەنـد کەسە دەستیان ئەکرد بە بۆکس و کەللەوشەق و وورگ هاویشتن بۆیەکتری هەتا تەواو شل و کوت ئەبوون ئەوسا وازیان لە یەك ئەهێنا.

## گۆبازی :-

ئەم یاری‌یە ئەکرا بە دوو گۆڵی، بەڵام تۆپەکە بە دار دروستیان ئەکرد وە هویەکەیان دارێکی بەدەستـەوە بوو بەوە لێیـان ئەدا سەری دارەکـەیان چەماوە بوو وەکو گۆچان بەمە یاری‌یـان دەکـرد وە بە دارەکـەیـان ووتـووە (چـەوگـان) و دیسـان ئەم یاری‌یە بەسواری ئەسپیشـەوە کراوە وە دارەکـە درێژتر ئەبوو، خۆیان بەسەر ئەسپەکانیاندا شۆڕ ئەکردەوە، بۆ لێدانی تۆپەکە بۆ گۆڵ کردن.
کوردیی شاعیر باسی (گۆبازی) دەکات :-
گۆی سەرم چەوگـانی میحنـەت دێـە بەرشەق رای‌فـرانـد ئەل عەجـەب بۆشاسواری خانەیی زینم نەهات.

## یاری شقارتە :-

ئەم یاری‌یە بە شقارتە ئەکرا تیایا (وەزیر و گزیر و مەلیك) هەبوو. بەنۆرە شقارتەکەیان هەڵ ئەدا ئەگـەر بەسـەر باری درێـژ ی بووەستـایەتەوە پیٚ‌یان ئەووت (مەلیك) وە ئەگەر بەسـەر باری پانیـدا بکـەوتـایـەتـەوە ئەوە ئەیـان ووت (گـزیـر) بەڵام ئەگەر بەسەرشانا بکەوتایەتەوە ئەوا پیٚ‌یان ئەووت (وەزیر).
یان دەنکـــە شقـــارتـەکـەیـان ڕۆ ئەکـرد وە دەنکـە دەنکـە کۆیـان ئەکـردەوە بیٚ ئەوەی دەنکەکانی تر بجوولێت.

### چەڵە مشکێنە :[1]

ئەم یاریـەی زۆر باوی بوو لەنـاو گەورەو بچـووکـدا ، بەتـایبەتی کاتێك ئەم یاری‌یە دەکرا ، کە ماڵێك ئەو ئێوارەیە مریشکیان سەر ببڕیایە وە لەکاتی نان خواردندا ئێسقانێك کە گۆشتـەکـەی لێ ئەکـرایەوەو ئەخوورا ، یەکێك ئەیگرت بەدەستیەوە ئەی‌ووت کێ گرەوم لەگەڵ ئەکات دووای ئەوەی گرەوەکەیان لەسەر شتێك ئەکرد ، ئینجا هەریەکەیان پەلێکی ئیسقانەکەیان ئەگرت و پێکەوە ئەیانووت (لەبیرم بێت لەبیرت چێت - بیرت بە قورە ڕەشـا چێت) هەر کە تەواو ئەبـوو ئیسقـانـەکـەیـان دەشکـاند ئیتر گرەوەکە دەستی پێ ئەکرد ، وە ئەم دووانە لە هەر شوێنێك یەکتریان بدیایە بەناوی شتێکەوە شتێکیان ئەدا بە یەکتـری پێـویست بوو هەر کە وەری‌گرت خێرا بڵێت : (لەبیرمە)وە ئەگەر وانەڵێ ئەوا گرەوەکەی دوڕاندووە دووای ئەوەی کە ئەڵێت (نەمان بردەوە؟) .

(١) تەڵەمشکێنەشی پێ ئەڵێن . (ع)

### یاری دان دەرنەکەوتن :

ئەم یاری‌یـە لەسـەر خواردنی مەسکـەت و ڕەحـەتەلقوم و شەکرلەمەو لەبزینە دەکرا ئەوکـەسـەی کە ئەیخـوارد پێویست بوو تا قووتی دەدا نەهێڵێ دانی دەربەکەوێت ئەگەر توانی دانی دەر نـەخـات وا دەیبـاتـەوەو ئەوی‌تـر پارەی ئەو خواردنـانـە دەدات وە بەپێچەوانەوە بێت خۆی دەدۆڕێت و پارەکە دەدات .

### (هەڵمەقۆ)

ئەم یاری‌یە بەزۆری لەناو کچانا باو بوە .

دووکـەس یان چوارکـەس کە دوو دوو شەریـك بوون یاری‌یـان کردوە ، یاری‌یـەکـەش بریتی بوە ، لە بەکـارهێنـانی (٥) بەردی خری ساف ، هەردوولا ڕیـك کەوتـوون کە یاری‌یـەکـە لە چەنـد تەغـارێك بێت بابڵێن لەسەر (١٠٠٠) هەزار تەغار ڕێك ئەکەون

ئینجا یاری‌یەکە بەم شێوەیە دەس پێ ئەکا.

ئەوەی لەپێشا یاری‌یەکە دەس پێ‌ئەکا، هەر پێنج بەردەکە فرێ ئەداتە سەرزەوی، یەکێك لە بەردەکان بەئارەزووی خۆی هەڵئەگرێت و ئەیکا بە دەس کەلا، ئینجا چوار جار ئەم دەس کەلایە هەڵ ئەداو کاتێ کە بەرزئەبێتەوە لە هەوادا ئەبێ دەس بەرێ یەکێك لە بەردەکانی تر هەڵگریت و بیباتە ژوورەوەی خانەکەو دەس کەلاکەش بگرێتەوە تا هەرچوار بەردەکەی‌تر والێ ئەکات و ئەمە پێی ئەڵێن یەك یەك ئینجا سەرلەنوێ دەس پێ‌کات و بەردەکان دوو دوو هەڵ ئەگرێ‌و ئینجا سێ سێ تا پێنچ بەردەکە تەواو ئەکا.

دوایی پێنج پێنج کە دەستی چەپی وەکو پردێك دائەنێ‌و ئەگەر ئەوکەسە راستە بێ دەستی چەپەی وادائەنێ‌و ئەگەر چەپە بێ بەپێچەوانەوە ئەمەش بەم جۆرەیە پەنجە گەورەو پەنجە درێژەکەی ناوەراستی دەستی بلاو ئەکاتەوە وەکوو دەرگایە، و پەنجەی شایەتمان سوواری پەنجەی ناوەراست ئەکات و وەکو تاقێ دای‌ئەنێ‌و هەرپێنج بەردەکە دوای ئەوەی بەردی دەسکەلاکە هەڵئەدا، جاری بەردێ لەناو ئەو تاقەوەوە فرێ ئەداتە دەورەوەی تاقەکە ئینجا کامیان نزیك بوو لە دەرگای**تاقمی**ئەوە تاقی دووهەم ئەڵێ دەری ئەهێنمەوەو دەسکەلاکە هەڵئەداو دەست ئەکا بە ژێر تاقەکەی دەسی ئەبا بۆ دەرهینا ئەوەی بەمەرجێ ئەوەندەی ماوەی هەیە تا دەسکەلاکە ئەگەرێتەوە کە بەردەکەشی دەرهێنابێ‌و دەسکەلاکەی گرتبێتەوە خۆ ئەگەر نەی‌توانی ئەوا ئەم دۆرانی‌و ئەگەر تو اینشی ئەوا ئیتر نۆرەی ئەمانە کە یاری‌یەکە بکەن و ئەوان تێ‌ئەکەون ئنجا خۆ ئەگەر تاقمی دووەم سەرکەوت، ئینجا ئەوان دەست ئەکەن بە یاری‌یەکەو هەرلایەك تەغاری‌کرد ئەولایە بردوویەتی‌یەوە خۆ ئەگەر لە هەر پلەیەکی‌یاری‌یەکەدا هاتەوە سەری ئەبێ سەرلەنوێ دەس پێ‌بکاتەوە تا تەغار تەواو ئەکات بەم جۆرە خۆیان بەمەوە خەریك ئەکرد بۆ کات بردنەسەر.

**لە گەرەکدا کۆئەبوونەوەو ئەم جۆرە یاری‌یانەش ئەکرا:**

١ ـ زۆران گرتن لەنێوان دوو کەسدا.

٢ ـ نیشانە گرتنەوە بە دەست و بە دار لاستیك.

٣ ـ شەرە تۆپەڵ و شێرە بەفرینە لە زستاندا.

٤ ـ شەڕەکەڵلە لەنێوان دوو کەسدا.
٥ ـ شەڕە کەڵەشێر.
٦ ـ شەڕە کەو.
٧ ـ شەڕە سەگ.
٨ ـ شەڕە بەران.
٩ ـ شەڕە گەڕەك: بە بەرد، بەقوچەقانی، بەکوتەك، بەدار، بە شەق و بۆکس و بە جنێو.
١٠ ـ یاریی تۆپی پێ لەنێوان گەڕەکەکاندا ئەکرا.
١١ ـ یەك باز.
١٢ ـ سێ باز.
١٣ ـ سێ ڕێزکێن.
١٤ ـ دامە.
١٥ ـ تاوڵە.

تاهیربەگ لەسەر تاوڵە وتویەتی:

یەك نەفەس چاکی نەهێنا تالع و هەم بەختەکەم
شەش دەرم گیراوە داماوم بەدەستی نەردەوە

**لە ناو دەستەی کوڕانا لە گەڕەکا ئەم جۆرە قسانە ئەووترا:**

١ ـ کاکە سەعات چەندە؟ سەعات شەش و فشێکە.
٢ ـ ساڵح دۆمانی دۆمانی ئیمشەو لە ماڵی خۆمانی.
٣ ـ یا شێخ: بە شاڵت قەستەم ئاگرێ بەربووە لە جەستەم.
٤ ـ شەشی بە تەشپیەکە هەشتی بە ڕبەیەکە.
٥ ـ وەستا.. ئەمەت لێ هەستا.
٦ ـ ئەگەر یەکێك جرتێکی لێبدایە پێیان ئەووت دایگرەوە گووم بە جێگاکەی.
٧ ـ یەکێك ئەیووت: سێ پێنج پانزە دووحەڤدە سێ بیست. چەند دەکات؟ دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر دیارە (٢٠) ئەکات.

٨ ـ یەکێـك گوێچکـەی یەکێکی تری ئەگرت و رای ئەکێشا ئەی‌ووت: کێچ یان مێش؟ ئەوی‌تریش ئەی‌ووت گوێچکەی فەقێ رامەکێش.

٩ ـ لەپاش ترێ خەمشەی برێ.

١٠ ـ مەرمەما، مەرگەمووش، پووش.

١١ ـ زلە حەسیر لە گەڕاج.

١٢ ـ پارەم داوە تا گەڕاج سوار ئەبم.

١٣ ـ بەخوا پانە.

١٤ ـ پیاوێك ناوی مامەحەمە بوو پێیان ئەووت:
مامە حەمەی عەقراوی هێلکە ئەکا بە مراوی.

١٥ ـ مامەحەمە گون تەمتەمە
وە زۆر شتی‌تر کە ناشێ بنووسرێ.
«لاوی ئەوکاتە هەموو لەبیریانە».

## کەوبازو کۆتربازەکان

هەروەکو لەوەپێش باسمان کرد هەر لەزووەوە و تائێستاکەش لە ناو کوردەواری‌دا بەتـایبـەتی لە سلێمـانی‌دا ئاژەڵ و باڵنـدە ڕاگـرتن باوی بووە بەڵام ئێستـا لەجاران کەمتر بەهۆی تەنگ و چەڵەمەی ناوچەکەوە، ئەوکەسانەی کە کەویان ڕائەگرت بۆ خوێندن و زۆرجار ئەیان بردن بۆ کۆڕی شەڕەکەو بۆ کات بردنەسەر، ڕاوچیش بۆ ڕاوەکەو ئەیان بردن بۆ ڕاو ئەمانەش نموونەی چەند کەسێکن لەو زاتانە:ـ
کەوبازەکان:ـ

| | |
|---|---|
| ١ ـ شێخ قادری حەفید زادە | مەڵلاك |
| ٢ ـ شێخ جەلالی شێخ ئەحمەدی حەفید زادە | مەڵلاك |
| ٣ ـ مەجیدی قالەی حەمامچی | توتنچنی |
| ٤ ـ شێخ لەتیفی شێخ مەحموود | مەڵلاك |
| ٥ ـ عیزەت بەگی وەسمان پاشا | مەڵلاك |
| ٦ ـ مام ڕەحیم کوڵەبی | باخەوان |

| | |
|---|---|
| ٧ ـ حاجی عەلی ماستاو | ماستاوفرۆش |
| ٨ ـ جەمیلی سەعید بەگ | کاسب |
| ٩ ـ حاجی باقی بەنگینە | نانەواو چایچی |
| ١٠ ـ حاجی ئەحە بچکۆل | |
| ١١ ـ حاجی عەلی کوتەك | بەقاڵی ووشکە |
| ١٢ ـ حاجی ئەمینی سەڕاج | |
| ١٣ ـ حەمەی ئەحمەد ئاغای چەخماخساز | |
| ١٤ ـ حەمە سەعید | بەقاڵ |
| ١٥ ـ ئەوڕەحمانە کوێر | |
| ١٦ ـ عەلی گۆڵەیی | |
| ١٧ ـ کەریمی دەروێش مەجید | نانەوا |
| ١٨ ـ حەسەنی هادی | |
| ١٩ ـ ئاغای حاجیساڵحی قاسم | |
| ٢٠ ـ مەلاعەلی حەمەغەریبی شامحەمەد | |
| ٢١ ـ مەلای خەیاڵ | |
| ٢٢ ـ حاجی عەلی لۆری | |
| ٢٣ ـ ساڵحی حەمە ڕەحیم | |
| ٢٤ ـ ئەمینی سەعەی سەمون | |
| ٢٥ ـ وەستا مەحمودی بەنا | |
| ٢٦ ـ میرزا حسـەین | ئوتێلچی |
| ٢٧ ـ سالەی یونس بەگ | |
| ٢٨ ـ عەلی زەردی پینەچی | |
| ٢٩ ـ عەبدوڵڵای شاپەسەند | |
| ٣٠ ـ مەحمودی عەبەی شاپەسەند | |
| ٣١ ـ مامۆستا عومەر عەبدول ڕەحیم | |
| ٣٢ ـ خەلیفە کەریم | خەڵوزفرۆش |

| | |
|---|---|
| ٣٣ ـ تۆفیقی عەلی چایچی | |
| ٣٤ ـ عەلی نایلۆن | سەڕاج |
| ٣٥ ـ سابیری حەسەنی پیرۆز | |
| ٣٦ ـ عومەری مامەلی | |
| ٣٧ ـ وەستا ساڵحی خەیات | |
| ٣٨ ـ کەمال مەولود | |
| ٣٩ ـ سابیری مسگەر | |
| ٤٠ ـ مام فەرەج | |
| ٤١ ـ عەلی غەریب | |
| ٤٢ ـ حەسەن ئاغا | چاپی لە جادەی کاوە |
| ٤٣ ـ مچەی ئەلە گوڵان | چایچی لەمەیانی ماستەکە |
| ٤٤ ـ سەی محەمەدی سەی ڕەشید | چایچی لای مەزات خانەکە |
| ٤٥ ـ ڕەئوفی چایچی | بەرامبەر حەمامی سورەت کەوبازەکان لەوێ دائەنیشتن |

## جێگای (دارا) جێگای شەڕەکەو

١ ـ مزگەوتە ڕووخاو

٢ ـ پشت حەمامی شێخ مارف

٣ ـ دەشتی ئەحمەدی ساغا (بەر ئەصحابەسپی)

٤ ـ قاوەخانەی سەرچیمەن

٥ ـ مەیانی دارو خەڵوزە کۆنەکە، شوێنی دەبۆکە

٦ ـ بەرئاشی قادرغا

٧ ـ باخی فەرەجی حەمەمراد لە سەرکارێز

٨ ـ خانووی عەباسەفەنی لای سینەمای دڵشاد

تێبینی: (دارا) بەوجێگایە ئەڵێن کە شەڕەکەوی لێ ئەکرێ بە تایبەتی لە وەرزی بەهار ڕۆژانی هەینی پاش نیوەڕوان، هەروەها ئەڵێن شێخ مەحموودی نەمر لە هەموو کەس

زیاتر حەزی لە کەو ڕاگرتن کردوە.

## کۆتر بازەکان

ئەمانە بۆ کات بردنەسەر بەدوای کۆتری چاکدا ئەگەران بۆ ڕاگرتنی، لەماڵەوە کولانەی تایبەتیان بۆ ئەکردن و جێگایی دان و ئاویان بۆ دروست ئەکردن زۆر جار ئەچونە سەربان دووان هەڵیان ئەدان چاوەڕێیان ئەکردن تا ئەهاتنەوە شوینی خۆیان یان ئەیان نارد بە یەکێکدا بۆ شوێنێکی دوور لە گەرەکی خۆیان دوایی پەیدا ئەبو نەوە ئەهاتنەوە، چەند جۆر کۆتر هەبوون کە ڕایان ئەگرتن لە ماڵاندا جارجاریش لە هەندێ دوکان و حوجرەش ڕایان ئەگرتن.

ئەمەش ناوی جۆرەکانی کۆترەکان:
١ ـ تەقلەباز
٢ ـ حاقوو
٣ ـ حەمامی
٤ ـ شاملی
٥ ـ پەری
٦ ـ لەب لەب
ئەم دووانەش کێوی بون بۆ ڕاگرتن نەبوو:
١ ـ باریکە
٢ ـ شینکە
ئەم ناوانەی خوارەو هەندێ لەو کۆتربازانەی کاتی خۆی هەندێ کاتیان بردۆتەسەرو خۆیان بەوەوە خەریك کردوە:ـ
١ ـ عیزەت بەگی وەسمان پاشا ـ مەلاك و سەرۆکی شارەوانی
٢ ـ حەمە گاسوار ـ قەبر هەڵکەن
٣ ـ ئەمینی خولەی بوك ـ باخەوان
٤ ـ تۆفیقی حەمە خێل ـ بەردکێشی مەڵکەندی

٥ ـ تۆفیقی حەسەنە قوچ ـ نۆبەچی (مرور)
٦ ـ نوری بەگ ـ حەمامچی
٧ ـ فەتاحە گۆج
٨ ـ نوری کەرکوکی
٩ ـ ساڵح میراو ـ موختاری کانی ئاسکان
١٠ ـ حاجی عومەر ـ دارتاش
١١ ـ عومەری سالەگاکوژ
١٢ ـ ساڵحی مام ئەمین
١٣ ـ ئەورەحمانە کوێر
١٤ ـ ئەحەڕەشی حەمەی ئەمین مەلێ
١٥ ـ عومەر مەجید نادر ناتر
١٦ ـ ئەحەی فەحۆل
١٧ ـ سەعەی ڕێحان
١٨ ـ حسەی کافرۆش
١٩ ـ نوری سالەی فەقێ
٢٠ ـ حەمەسوری دارتاش
٢١ ـ حەمەی سانیە
٢٢ ـ پۆڵس عەزیز شینە
٢٣ ـ ڕەحیمی حاجی مەحمودی دارتاش
٢٤ ـ برایمی حەمەی مێشولە
٢٥ ـ سابیری حەمەگاسوار
٢٦ ـ ئاغای حاجی ساڵحی قاسم
٢٧ ـ عەلی موراد
٢٨ ـ جەلالی خولەی گوڵناز
٢٩ ـ عومەری گوڵچین
٣٠ ـ نون عیزەت بەگی وەسمان پاشا
٣١ ـ شەوکەتی حاجی کەریم

٣٢ ـ حەمەفەرەجی ئەحەسنەیی
٣٣ ـ عەلی مێ قەلی
٣٤ ـ مەلا نوری کەریم چاوەش
٣٥ ـ سەردار مستەفا مەزهەر
٣٦ ـ ئەحمەد بەگی کانی ئاسکان
**٣٧ ـ عەلی قادر ـ برین پێچ**

سەرچاوە :ـ
١ ـ ئاغای حاجی ساڵحی قاسم
٢ ـ عەلی غەریب
٣ ـ ساڵحی حەمە ڕەحیم

تێبینی :ـ

کاتێك من خەریکی کۆکردنەوەی ئەم یاری‌یە کۆنانە بووم کە پرسم بە پیاوی کۆن و شارەزای ئەو یاری‌یانە کردبوو، پێش چاپ کردنی بیستم کە مامۆستا صاڵح عەلی سەرپەرشتیاری وەرزش و دیدەوانی لە پەروەردەی سلێمانی کە ئێستا خانەنشینە کتێبێکی وای دەرکردووە بە دوو بەرگ بە ناوی فۆلکلۆری یاری‌و وەرزشی نەتەوەی کورد بەرگی یەکەم و بەرگی دووەم لە ساڵی ١٩٧٤دا کە باسی یاری‌یە کۆنە فۆلکلۆری‌یەکانی گەلی کوردمان دەکات، دوای ئەوەی کە مامۆستا صاڵح عەلیم دی وە هەردوو بەرگەکەی دامێ کە بەڕاستی زۆر جوان و ڕێك وپێکە کە زۆربەی یاری‌یەکانی تێدایە وە کۆی کردۆتەوە، لە زووربەی ناوچەکانی کوردستانی عێراق، بەڕاستی زۆر سوودم لێ وەرگرت، لە ڕاستی زانینی هەندێ لە یاری‌یەکانی، بەڵام ئەم باسانە تەنها تایبەتی‌یە بەو یاری یانەی کە لە شاری سلێمانی‌دا کراوە. ئەوەی مامۆستای بەڕێز باسی یاری زۆر ناوچەی‌تری کردووە، وە سەرچاوەیەکی زۆر بەنرخە وە زۆر سوپاسی بێ‌پایانی ئەکەم هیوادارم نموونەی مامۆستای بەڕێز هەر زۆر بێت بۆ خزمەتی کەلەپووری نەتەوەکەمان.



● بووکە بە بارانێ



● ئاشە بە تەنوورە



● زۆرانبازیی ساڵی ١٩٤٩



● چۆلەکە دەرهێنانی گوێ سەبانە

## «چەند دیمەنێ لە ڕابواردنی کۆنی سلیمانی»

### ١ ـ سەیران

هەر کە بەهار سەرەتای دەرئەکەوت بەتایبەتی دنیا خۆشی و هەتاو بووایە لە ڕۆژانی هەینی‌دا دەستە دەستە و گەڕەك گەڕەك ئەوشەوەی بۆبەیانی کە ئەچوون بۆ سەیران هەموو شتێکیان ئامادە دەکرد بەتایبەتی یاپراخ ئەخرایە مەنجەڵەوە بۆبەیانی، لە سەیرانەکە دەیان کولاند، خواردنی تریش وەکو خورما و ڕۆن و پەنیر، یان هێلکەی کولاو، لەگەڵ چا لێیان دەنا، بەیانی کە ڕۆژ دەبووەوە هەریەکە بەپێی توانای خۆی شتێکی دەخستە بن دەستی وەیان سەرشانی‌وملی ڕێگەیان دەگرت، بۆشوێنی سەیرانەکە، هەندێ ماڵیش عەرەبانەی دوو ئەسپیان دەگرت و پێی دەچوون بۆسەیرانەکە. ئەم عەرەبانانە عەرەبانەی (یایلی)یان پێ‌دەگوت.

شوێنە بەناوبانگەکانی سەیرانگای ئەوکاتانە ئەمانە بوون:ـ

١ ـ شێخەباس: گردێکی پان و فراوان و نزیك دێی وولوبەیە کە دەکەوێتە باشووری سولەیمانی‌یەوە، ماوەی «٤٥» دەقیقەیە بە پێ.

لەکاتی خۆیدا لەسەر ئەم گردە درەختێك هەبووە ئەوەندە گەورە بووە کە بەئاسانی ژمارەیەکی زۆر گوریسی دیلانێی لێ داخراوە وە هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە سەیران کەری لەژێردا دانیشتووە، بەلام کە سولەیمانی کەوتە ژێر ئەشکەنجەی عوسمانی‌یەکانەوە زوڵم وزۆرێکی زۆریان لەم شارە کرد تەنانەت دارەکەی شێخەباسیشیان بری‌یەوە وە سوتاندیان بەم شێوەیە وردە وردە ئەو سەیرانگا بەناوبانگە لەبیر چووەوە کە ئێستا بە هیچ جورێك ناوی‌نابرێ.

دارەکەی شێخەباس ئەوەندە بەناوبانگ بووە وەختێ کە شاعیری نەمری کورد نالی لە شامەوە نامەی بە شیعر بۆشاعیری نەمری کورد سالم ناردووە ناوی ئەودارەی تیاهێناوەو دەڵێت:

**ئیستەش بە بەرگ و بارە عەلەمدارە شێخەباس**
**یان بێ‌نەواو بەرگە کراوە بە شەخسی عوور**



● پیرەمێرد لە ئاهەنگی نەورۆزی کارێزی وەستا شەریف



● بازرگانەکانی قەیسەری وەسمان پاشا لە سەیرانێکی سەرچناردا



● سەیرانێکی نەورۆزی ١٩٣٨
● بەردەم گردی مامەیارە



● سەیرانی قەسابەکان، سەرچنار ۱۹۲۸



● سەیرانی دارتاشەکان، قەڵاچوالان ۱۹٤٦

سالم لە وەڵاما دەڵێت:

زستانی ئەوەڵین بوو بەرگی دڕی داری شیخەباس
ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش ئەدا زەرەر
ئەو بەردەکانی ناوینرا قسنی شەخسەکەی
دایان بە شاخ و دارەکەیا نووکی بێهونەر

مامۆستا کامەرانیش دەڵێت:

ئەی دارەکەی شیخەباس ئاخ
لە دڵی منا تۆ بووی بە داخ
هاتن سەربازی عوسمانی
نامەردانە سووتانیانی

٢ ـ مامەیارە :ـ

ئەوگردە قووچەیە کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری سولەیمانییەوە ئەم گردە لەپێشا ناوی گردی گوڵان بووە ناوبانگی نەبووە، بەڵام بەرە بەر بوو بە شوێنێکی زۆر بەناوبانگ لە شاری سولەیمانیدا ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ شاعیری نەمری کورد پیرەمێرد (حاجی توفیق) کە هەموو ساڵێك ئاگری نەورۆزی لەوێ ئەکردەوە، لەو سەردەمەدا گردی مامەیارە ڕووتەنی بوو، داری تیانەبوو، سێبەر نەبوو بۆ سەیران کەران لەگەڵ ئەوەشدا هەتاوەکوئێوارە لە بەرهەتاو دادەنیشتن بێ ئەوەی هەست بەگەرما بکەن، بەڵام لەم دواییەدا، میری درەختی تیا ناشت.

ئەم شوێنە سەیرانگای شاری سولەیمانی بوو، بەتایبەتی لە ڕۆژانی بەهاردا کە هەر چوار دەوری بە گوڵاڵە سورەو هەمەجۆری گوڵی ڕەنگاورەنگ ئەرازایەوە ئەبوو بە شوێنی دڵداری لاوان لە کچ و کوڕ خۆیان ئەرازاندەوە پۆل پۆل لەگەڵ کەس وکاریان ئەهاتن بۆ سەیران پاش ئەوەی چایان لێ ئەنا هەر تاقمە لەلایەکەوە، دەست ئەگیرا، بۆ هەڵپەڕکێ، لەلایەکی ترەوە دەست ئەکرا، بە غارغارێن و ڕمبازی، چەند کەسێك سواری ئەسپ ئەبوون وە لەوکاتەدا پۆلیسی سوارە هەبوون کە ئەکران بە دەورییە بۆ

سەیرانەکە، ئەوانیش دەستیان ئەکرد بە غارغارێن هەتا وەکو دُمەدەمی ئێوارە، بەم شێوەیە بە هەڵپەرکێ و گۆرانی ڕایان ئەبوارد پاشان وردە وردە بەرەو شار ئەگەڕانەوە ئەوانە کە بە پێ هاتبوون، ئەوانی تریش عەرەبانەکان ئەهاتن بە شوێنیانا.

بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیربچێت کە لە بەردەمی گردی مامەیارە کارێزێك هەیە پێی ئەڵێن کارێزی وەستاشەریف سەیران کەرەکان ئەو ئاوەیان ئەخواردەوە تا ئیستاش هەر ماوە ئەمەش پارچە شیعرێکە کە بەسەر مامەیارەو کارێزی وەستا شەریف دا هەڵ دراوە :ـ

| | |
|---|---|
| ئۆخەی گردەکەی یارە | چەند شیرینە نازدارە |
| ئەو کارێزەی لە بەربێت | ئاوی شیرینی شارە |
| بۆیە هێندە جووانی | جێی نەوروزی کوردانی |
| سەیرانگایی بەهاران | جێی ئومێدی لاوانی |

٣ ـ تووی مەلیك ٤ ـ قۆریەشکاو «عقاری ئیستا» ٥ ـ دەباشان ٦ ـ وەیس «ڕۆژانی چوارشەممە سەیرانگایەکی گەرم بووە، شوێنی مقری فرقە» ٧ ـ کانی با ڕۆژانی چوارشەممە ڕێگە کۆنەکەی هەڵەبجە ٨ ـ کارێزی مەجی بەگ ٩ ـ کۆستەی چەم «خوار قلیاسان» ١٠ ـ سەرچنار ١١ ـ کارێزی عەزیز ئاغا «دوو لوولەکە» .

٢ ـ شەوانی هاوینان :

لاوەکان گەرەکاو گەرەك ئەگەڕان بە گۆرانی ووتن و چەپلە لێدان، بە کۆڵانەکاندا ئەسووڕانەوەو تا شەوێکی درەنگ گۆرانی خۆشی کۆنی وەك «دەی‌دەی بارانە» وە «ئامێنێ»و زۆر گۆرانی تریان ئەووت بە شمشاڵ لێدان لەگەڵیا، هەروەها ژنانیش کۆمەڵیان ئەبەست، بەدەم قسەکردنەوە لە بەرماڵەکانیانا وە منداڵانیش خەریکی یاری‌کردن بوون، پیاوەکانیش ئەچوون بۆ چایخانە وە یان مزگەوت وەختیان ڕائەبوارد، تا کاتی نووستن، پاشان ئەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، زۆربەی ماڵەکان لە سەربان ئەنوستن، لەناو چیغدا، زوربەی ماڵەکان سەربانیان بەیەکەوە بوو، نزیك بوون لە یەکتری، هەر لە سەربان میوانداری یەکتریان ئەکردو وەختیان ئەبردەسەر تا کاتی نوستن، هەر لەناو

چیغـدا لەلایـەکـەوە گۆزە یان شەربـە پڕئـەکـرا لە ئاو بۆشەو سارد ئەبـوو بۆ خواردنـەوە لەلایـەکی تـرەوە میـوە لە شووتی یا کاڵەك یان ترێ حازر ئەکرا ئەیانخوارد، لەژێر پارچە پەڕۆیـەکی پاکـدا بەفـر دائـەنـرا، جار جار ئەخـرایـە ناو جامێکەوە، وە هەندێ ماڵ نە ئەچوونە سەربان کورسی گەورەیان هەبوو جێگای خێزانەکەی لەسەر ئەبوووە لەسەری ئەنووستن، پەیژەیەکی بچووکی هەبوو پیا سەر ئەکەوتن.

٣ ـ شەوانی زستانان :ـ

هەر شەوە ئەچـوونـە ماڵێـك دائـەنیشتن تا نیـوەشـەو بەهـەنـدێ یاری وەختیـان ئەبردەسەر، وەکو کلاّو کلاّوێن و گۆرەوی بازی و گەنم گەنم وەیان مەتەڵ لە یەك داهێنـان یان یەکێـك چیرۆکێکی بۆ ئەگێڕانەوە، گەورەو بچووك گوێیان لی ڕائەگرت، تا لە لە چیرۆکەکە ئەبۆوە، لەم ماوەیەدا چایان لێ ئەناو چەرەسیان ئەخواردو زۆر ماڵیش باسووق و گوێزو مێوژ و نۆکیان دائەنا ئەوشەوەیان ئەبردەسەر بۆ سبەی شەو ئەچوونە ماڵێکی تر.

٤ ـ ڕەمەزانان :

هەر کە ڕەمـەزان نزیـك ئەبـۆوە هەمـوو ماڵێـك دەستیـان ئەکـرد بە ئامـادەکـردنی شتوومەك وەك نان کردن جل شتن و ئەوشتانەی کە بۆ ڕۆژووەوان زەحمەت بوو. ئینجا کە ڕەمـەزان ئەهـات یەکـەم شەو چەنـد تۆپێـك ئاگـر ئەدراو ئەکرا بە ڕەمەزان، بەیانی هەرکـەس ئەچـوو بۆسـەر ئیشی خۆی وە لە هەموو شارەکەدا سێ چوار شوێن ئیجازەی ئەدرا بۆ نان تیا خواردن، دوای دەمەدەمی عەسر دوکانەکانی سەر جادەکان کە ڕەمەزان بکـەوتـایـە گەرمـای هاوینـەوە مەرکانە دۆیان ئەهێنایە سەر شۆستەکان وە لەسەر مێزێك بەفـریـان دائـەنـا بە مشار ئەیانبری‌یەوە، بۆ فرۆشتن. هەرکەس بچوایە دۆی بکڕیایە، پارچەیەك بەفریان بۆ تێ‌ئەخست، لە لایەکی ترەوە شەربەتی مێوژ ی ساغ لە سوراحی گەورەدا دائـەنـرا پەرداخی بە چوار فلس «عانەیەك» بە بەفری مەڵکەندی‌یەوە شەربەت فروش ئەیان فرۆشت. لە لایەکی تریشەوە بەقاڵەکان میوەیان دائەنا وەکو شووتی و ترێ و کاڵەك و خەیار کە ئەیانکڕی هەندێ ئەکرایە دەسەسر یان فەقیانەکانیانەوە ئەیان هێنایەوە بۆ ماڵـەوە، تا نزیـك بەربـانـگ هەمـوو شتێـك ئامادە ئەکرا، ئینجا پێش ئەوەی تۆپەکە بتەقێت، لە هەمـوو گەڕەکەکانا منداڵان خۆیان تۆپیان دروست ئەکرد لەقاوغی فیشەك یان لە بۆری‌یەکی باریك سەریکی گیرابوو، ئینجاکونێکیان ئەکردە بۆری‌یەکە، پاشان

نیـوەی پرئـەکـرا لە بارووت دوای ئەوە پەڕۆیـان بە شیشێـك ئەئاخنی یە ناو بۆری یەکە، لەدواییـدا چاوەڕێی ئەوەیـان ئەکـرد کە مەلا بانـگ بدات، لەگەڵ تۆپەکەدا، ئەمانیش ئاگـریـان ئەنـا بە تۆپـەکەی خۆیانەوە، هەندێکیان دەنگی باش ئەهات. کە تۆپەکە ئە تەقی وە مەلاش بانگی ئـەدا نوێژیان ئەکـرد پاشان بەربانگیان ئەکردەوە، دوای ئەوەی کە بەربـانگیـان ئەکـردەوە ئینجـا دەستیـان ئەکـرد بەگـەڕان بۆ مالاْن وە زۆربـەی پیاوەکان ئەچـوون بۆ مزگـەوت بۆ «تـەراویـح» پاش ئەوە ڕوویـان ئەکردە چایخانەکان لەوکاتەدا هەندێ لە چایخانەکان وەکو چایخانەی حەمە شەشە لە صابونکەران و چایخانەی شێخ محـەمـەدی کاکـەلاو بەرامبـەر حەوشی سەرا وە چایخـانـەی عوسمـانی قالـەڕەش لە سەرشـەقـام چیـرۆك «حیکـایەت»ی تیا ئەخوێندرایەوە وەك حیکایەتی ڕۆستەمی زاڵ و خورشیـدو خاوەرو شیـرین و فەرهاد تا پاڵی ئەدا بە پارشێوەوە، ئینجا حکایەت خوانەکە ئەیووت باقیەکەی‌تری بۆ سبەی شەو، بەم جۆرە هەرکەسە بۆ ماڵی خۆی ئەڕۆیشتەوە، لە لایـەکی تـریشەوە هەر کە ئە گەیشتە ١٢ی ڕەمەزان ڕۆژە تاکەکانی ١٣، ١٧، ١٩، ٢١، ٢٩، ناوساجیان ئەبەشیەوە.

٥ ـ جەژنان :ـ

کۆن کە جەژنیـان ئەکـرد چەنـد ڕۆژێـك پێش جەژن هەموشتێکیان ئامادە ئەکرد، هەنـدێـك جلی تازەیان ئەکرد، هەندێ جلی کۆنیان ئەشت ئەیاننارد بۆئوتوو. پێلاْوی تازەش ئەکرا. هەندێك پێلاوەکانیان ئەنارد بۆلای پینەچی چاك ئەکرایەوە لەپاشدا ئەبرا بۆبۆیاخ کردن لەلای بۆیاخ کەرەکانی بەردەرکی سەرا کە بەڕیز دائەنیشتن. کە ئەکرا بە جەژن بەیانی زۆر ماڵ سینی‌یەك چێشتی ئەنارد بۆمزگەوت پاش نان خواردنی جەژن دەست ئەکرا بە گەڕان بۆماڵە دراوسێ وخزم ئینجا منداڵەکان پارەی جەژنیان وەرئەگرت ئەچوون بۆپیرمەسوور یان هۆمەرمەندان یان بەردەکی سەرا لەوشوێنانەدا چەرخوفەلەکو کورسی کورسی وزۆر یاری‌تر دانرابوو بۆمنداڵان لە لایەی‌تریشەوە ئوتومبیل ڕاوەستابوو سوار ئەبـوون بەسـەعـات وئەگـەڕان بە ناوشـاردا بە گۆرانی‌وچەپڵەڕێـزان ئەم جۆرە گۆرانیانەیان ئەووت وەك هەی بەلار، سەوزەڵێ، شیرینی لەیلانێ، ئەرێ هۆلەیلێ.
لە لایـەکی تـرەوە عارەبـانـەی دوو ئەسپی لە بەردەرکی سەراوە بۆپیرمەسوور یان بۆماڵی موتـەسـەڕیف ئەچـوونـوئەهـاتنـەوە، هەر لەم شوێنانەدا ئوتومبیل بۆقلیاسان ئەمسەرو ئەوسـەر بە ٢٠ فلس منـاڵ سوار ئە بوون مێزدانرابوو سینی یە پاقلاوەو برمەو لوقمەقازی

وشتی تـر ئەفـرۆشراو هەندێ سەرەکۆڵان لگاوچی لگاوی ئەکرد، لەلایەکی تریشەوە لە پیـرمـەسـوورو هۆمەرمەندان بەزۆری پۆلیسی سوارەو هەندێکەس کە ئەسپیان پێ بوو دەستیـان ئەکـرد بە ڕمبـازی، هەروەهـا لەو شوێنـانـە ئەدرا لە دەهـۆڵـو زوڕنـاو ئەکرا بە هەڵپەڕکێ تا دەمەدەمی ئێوارە.

٦ ـ ئاهـەنـگ: جاران وا باوبـوو هەرماڵێك منالیان ببوایە کوڕ بوایە، وەیا ژنیان بهێنایە یان بەبـۆنـەی شتێکی خۆشـەوە شەوێکیـان تەرخـان ئەکرد پێیان ئەووت ئاهەنگ.
خاوەن ماڵەکـە چەنـد ڕۆژێـك لەوەپێش خۆیـان ئامـادە ئەکـرد وە ماڵیـان ئەرازاندەوە، شوێنی ژنـان بەجیـا، پیـاوانیش بەجیا، کە ئێوارە ئەهات خواردن ئامادە ئەکرا، چایان لی ئـەنـا، میوەیان ئامادەئەکرد، پاش نانخواردن وردە وردەدەست ئەکرا بەقسەی خۆشو پێکـەنین، ئینجـا دەست ئەکـرا بە گۆرانی ووتن بەتـایبەتی هەندێ دەنگخۆش هەبوون هەرلـە ئاهەنگەکەدا، گۆرانیان ئەووت، یان دەنگخۆشێکی برادەری خۆیان ببوایە، ئەوە ئەوشەوە گۆرانی بۆ ئەووتن وە هەموو بەدەم گۆرانی یەکەوە چەپڵەیان لێ ئەدا یەکێك هەڵئـەسـا لەگـەڵیا سووڕی ئەدا جارجارێك دەهۆڵ و زوڕناشیان ئەهێنا بەدەم گۆرانی و هەڵپـەڕکێ وەو قسـەی خۆشـەوە ئەوشـەوەیـان ئەبردەسەر، سالان بەم شێوەیە خەڵك ڕایئەبوارد بە بێئەوەی هیچ غەمێکیان بووبی.

٧ ـ شوێنی مەلەکردن :ـ

بەزۆری مەلـەکـردن لەنـاو شارا ئوسـڵ خانـەی مزگەوتەکان بوو کە ئەچوون مەلـەیـان تیـا ئەکـرد بەدزی مجـەورەکەوە بەڵام زۆر جار کە مجەورەکە پێی ئەزانین، یەکسـەر، جلەکـانی ئەخستنـە ناو حەوزەکـەوە پاشـان بەشـوڵـك ئەچـووە گیـانیان لە لایـەکی تـریشـەوە لە دەرەوەی شار بۆ زەرعـات (ئـەستێـرك) دروست ئەکرا لە بەردەمی جۆگـەیـەکـا ئاوەکـە پەنگی ئەخـواردەوە زۆر ئەبوو ئینجا منالی گەورە دەستیان ئەکرد بە مەلـەکـردن ئەوسـا دەرلێی درێـژ باوی بوو، فویـان تێ ئەکردو دەرەڵنگەکانی ئەبەسترا پڕئـەبـوو لە هەواو سەر ئاو ئەکـەوتن وە مەلـەیـان ئەکـرد، ئینجا ئەچوون بۆ فەریکەنۆك خواردن، یا بیستانی ترۆزیو خەیار، یان کاڵەك یان شسووتی، تێریان ئەخواردو وردە وردە بەرەو شار ئەبوونەوە.

باخچەی گشتی و سینەما :ـ

لەو سەردەمەدا لە شاری سولەیمانی دا ژنان کەم ئەچوونە دەرەوە هیچ شوێنێك نەبوو کە ڕووی تێ بکەن تەنها دوو شوێن نەبێ .

یەکەم : باغچەی گشتی : لە هەفتەیەکدا ڕۆژانی یەك شەممەو چوارشەممە ئەچوون بۆ باغچەی گشتی هەرگەڕەکە چەند کۆمەڵێك پێکەوە ئەڕۆیشتن لە عەسردا خۆیان ئەرازاندەوە بەس ژنان ماکیاجیان ئەکرد، کە پێیان ئەووت سوراوو سپیاو، کچانیش بێ مکیاج، بەڵام جلی جوانیان لەبەرئەکرد، خواردن و چەرەسیان ئەبرد، لەوێ وەختیان ئەبردەسەر، تا نزیك ئێوارە ینجا ئەگەڕانەوە، هەروەها کوڕانیش خۆیان ئەگۆڕی هەندێکیان گوڵیان ئەکرد بەیەخەیانا ئەگەڕان بە دەوروپشتی باغچەکەدا .

دووەم : سینەما ئەمیش بەوجۆرە ڕۆژانی دوشەممە تەرخان کرابو بۆ ئافرەت وە لەم ڕۆژەدا ئافرەتان خۆیان بۆ ئامادەئەکرد وئەچوون بۆ سینەما .





● پیاوانی گەڕەك لە یەکەم ڕۆژی جەژندا، مزگەوتی حاجی‌حان



● بەردەکەی شێخ حەسەنی گلەزەردە



● بەرامبەر دەشتی شێخ جافەر لە جەژندا



● کورسی کورسی



● چەرخ و فەلەك



● شەربەتی مێوژ لە جەژنا



● منداڵان بەسواری
عەرەبانەوە بە پارەی جەژنانە

## بەهاران

کوڵە کنگر و نێرگسی بەهار
فرۆ شیرێژو قەیماغ بەرەوشار
لە کۆزەرەقەو بازیان خەراجیان
ماستی مەرەگێژ لەگەڵ هی ترجیان
کەرەو مەشکەدۆ تا پەنیری تەر
پر بازار ئەبوو پیت و فەری مەر
کوزەڵەو بەنگۆکە بنارو شاخێ
سەوزو شین ئەبوو گوێچەم و باخێ
گوڵاڵە سوورە زەل و گیاکەڵە
هەڵەکۆك لووشە پونگەو خەرتەلە
چوالە [illegible]اسی ژێر بەفری زستان
هی پیرەمەگرون پێنجوێن و کوێستان
نۆبەرەی بەهار کاروان ئەیهانی
بۆناو بازاری شاری سلێمانی

وا بەسەرئەبرا وەرزو مانگ و کات
تەمەن ساڵ بەساڵ بەرەوپێش ئەهات
بۆ ئەو زەمان و کات و سەردەمە
دواییم پێهێنا بەم شتە کەمە
گەر کەم و کورت بێ یاخود ناتەواو
ئەوەی زانیومە خستومە بەرچاو
داوام ئەوەیە بەتام و پێز بێت
جێی رەزامەندیی ئێوەی بەرێز بێت

(قادر برسی)

« هاوینان »

بەیانیان کاروان ئەهات بەرەوشار
بەفرو خەڵووزو میوەو سپیدار

کەلە گوێژەوە ئەهاتنە خوارێ
ئاشکرا دیاربوو کە خێر ئەبارێ

لە دەنگی زەنگوڵەو تەقەو خشەی دار
سازو سەمتور بوو بۆ هۆرەو قەتار

ئەستێرەی ئاسمان ئەیان جریوان
ئیمەش لە چیغا لە بەربای بەیان

ئەمان ڕوانییە ڕەزی وێڵەدەر
بۆ بارە کەوی وێل و دەربەدەر

بۆ قاسپەی نایەو تیی ناچریکێنێ
خەڵکی بێئاگا لە خەو هەڵسێنێ
سەربانان چیغ و فانۆس چەرپایە
لانکەو بێشکەی جوان دەنگی لایلایە

پەردەو کولەی بووك یا تازە زاوا
پەناهەندە بوون لە ترس و تاوا

بۆ ئەوەی هەتاو هەڵیان نەسێنێ
ڤیروسیا خەسوو با ببوڵێنێ

« پایزان »

دو ا مانگی هاوین نەمانی گەرما

نۆرەی پایز بوو خەزان و سەرما

گەڵاڕێزان و کزەی بای وشك
عاشقەو ماشقەی مار خشپەی کلاشك

زەردەواڵەی زۆر بن میچ و مشك
کلاش کلاش و شڵپەی دوپشك

هاوار هاوارو گریەو باوکەڕۆ
لەتاو لەرزوتاو دەردی سێبەڕۆ

باخ هەڵپاچین و پەل و پۆ بڕین
تەماتە گوشین ئازووقە کڕین

لەسەر ڕێگاوبان تروسکەی ئاگر
ئەبینرا دیاربوو قوڵغی باجگر

لەگەڵ ئەویش دا میوەی هەمەڕەنگ
بە ترازووی چەرمین کێش و هۆقەی سەنگ

سەوی بەرچنە بازاڕ دەرماڵان
هەڵیان ئەڕێژا هەرزان و تاڵان

هەموو ساڵ پایز تا دوایی ئەدات
ژنان خەریکی ترخینەو ترشیات
پیاوان پەلەپەل ئەکەوتنەخۆیان
زەل و ڕەشکەکا سواغ و گڵەبان

« زستانان »

زستانیش بەفرو چۆڕ راوگەو باران
سەربان ماڵینەو کوتان و گێڕان

هەورو چەخماخەو بارانی بەحوڕ
ڕەشەبای گۆیژەو قوڵچی فیك وهووڕ

بن گوێیسەبانەو چوخم و پاڵ دیوار
تونی حەمام و قەیسەری‌و بازاڕ

خۆ مەلاس کردن تاوتاویش گەڕان
ساقۆڵ و حسکە پانزەتیر لە شان

حەمام چی ناتر قەساب نانەوا
جارجار ئەگیران لە نیوە شەوا

میلی تفەنگ و دەنگی تێ‌خوڕین
بۆ نەهێشتنی دزی‌و ماڵ بڕین

کەلاوەو قوژبن دەوروبەری شار
تاك تاکە فانۆس هەڵواسراوی دار

لوورەی چەقەڵ و ڕەشەمێ سەگ وەڕ
تا ئاگری نەورۆز ساڵ وا ئەچووەسەر

## « ڕەمەزانان »

بە ڕەمەزانان بەربانگ و پارشێو
تۆپی پەڕۆ کۆن وەکو بۆڵەی دێو
پڕئەبوو لە خەڵك قشڵەو دەبۆکە
گوێیان ئەئاخنی بە پەنجەو لۆکە
لەدوای تەقاندن بانگ و تەپڵ و دەف
تۆبەو پەشیمان لە کفرو لە ڕەف
پاش نوێژی شێوان ڕۆژو شکاندن
سەرفترەو زەکات یا سەر قەبڵاندن
بەرەو ماڵی خواو نوێژی تەراویح
بۆ خەتمەو خەڵوەت درودو تەسبیح
هەندیکیش بە ڕۆژ لە گوشەی مزگەوت
ڕۆژگار بە بێکار خەویان لێ ئەکەوت
کتێب گرتنەوەو باسی خەونامە
لە برەوا بوون وەك تاوڵەو دامە
شەڕە کەڵەشێر، کۆتر کەوبازی
باس و تەماشای سواری‌و ڕمبازی
بەردەرکی سەرا شەوان چایخانە
پاڵەوان بازی‌و میل و زۆرخانە
دەست و مەچەکی مامە عەبوودی
لە پاڵوانا کەم کەسی وام دی
نێرگەلەو مارپێچ چاو قاوەو فنجان
برنوتی سەبیل مژین و کێشان
کوڕە کوڕەی کۆن بە کۆڕو کۆمەڵ

ڕەفیقی گلۀحەمکوڵ، سەعەشەل
ڕانك و چوغەی شاڵ، پەستەکی بانە
خەنجەری دەبان، مشکیو جامانە
کڵاو گرێچن، کلاش، فەقیانە
پشتوێنی شاڵ و پێو پووزەوانە

بە یاری قلیچ ئەسکەمل مۆرە
یا بەستەی سەفەر نۆرە بەنۆرە

یاخود بیلاردو مێزو تۆپ و دار
بە دوو کەس ئەکرا قۆزو هەرزەکار

دەنگ خۆشی ئەوسا قالە گۆج، ڕەشۆل
دەنگیان ئەگەیشتە چوارباخ و سەرگۆل

بانگ و سەڵای خۆش ئایایو سەبا
بەیانیان شەماڵ بۆلای خوای ئەبا

وا بەسەرئەبرا مانگی ڕەمەزان
هەردوو جەژنەکەیش ڕەمەزان، قوربان

« جەژنەکان »

جەژنانِ دڵپاکیو گەردن ئازادی
ئاشتیو لێبوردن بە خۆشیو شادی
برنجی گلەو بازیان و سەنگاو
پڕ لەتکەی عەجەم بۆ پەردە پلاو
بە ڕۆنی کوردی هیزەو کووپەی شین

دەست خۆش کەیبانوو هەزار ئافەرین
تەقەی کەوگیرو بنکری برنج
مری ئەکردین وەك فیلی شەترنج
مستەقای سلق و شلە قاورمە
تاسکەبابی چەور بە گۆشتی نەرمە
بۆن و بەرامەی زیرەو دارچینی
زرنگەی مۆسیقای فەخفوری‌و چینی
لەدوای نان خواردن دراوسیٚ‌و ناسیاو
ماڵ بەماڵ ئەچوون پۆل پۆل ژن و پیاو
پۆشتەو پەرداخ و جل وبەرگی جوان
شیرینی‌و نوقوڵ شادو کامەران
بەوبۆنەیەوە باشترین هەڵکەوت
بۆ ئاشت بوونەوە ئاسان دەست ئەکەوت
لەدوای بەخشین و تکای لێبوردن
پێتی ئەسەلماند کە کورد چەن مەردن
برای هەرکەسیٚ گەر بشکوژ رایە
ئەبوو لە چەژنا هەر ببەخشرایە
خۆ ئەگەر کەسیٚ بچوایە بۆ حەج
لەوەپێش زیاتر ئامادەو مل کەچ
حەج ئەوسا وابوو زۆرتر بە کاروان
ئاوابوو پیشەو دەستووری جاران
قۆچی قوربانی پارێن دابەستە
ئەبەخشرایەوە بۆ ئەو مەبەستە

(قادر برسی)

* * *



● مەحمود بەگی حاجی ئەمین بەگ ـ جەڕاح



● فەرەج ئاغای دارۆغایی
١٩٠٦ ـ ١٩٨٦



● حاجی ئەمینی کاکە حەمە ١٨٤٥ ـ ١٩٤١



● فایەقی کاکەمین ١٨٩٧ ـ ١٩٥٥ یەکەم فرۆکەچی سلێمانی لە سوپای عوسمانلیدا



● واحید ئەفەندیی مەلا ئەحمەدی قوربانی ١٩١٢ ـ ١٩٨٢



● کامیلی کاکەمین ١٩١٢ ـ ١٩٨٧



● به بۆنەی شووکردنی حەپسەخانی نەقیبەوە ١٩٢٠



● هەندێ لە ناودارەکانی سلێمانی



● هەیئەتی مەشوٚرەتی کورد لە سلێمانی ساڵانی ١٩١٥ - ١٩٢٢



● مەلا سەعیدی کابان

١٨٩٨ - ١٩٦١



● ئەحمەد بەگی تاپۆ

١٨٦٠ - ١٩٣٣



● کوتر بازیکی کون توفیقی حەسەنە قوچ



● جل و بەرگی جاران



● قادر ئاغای عەتتار

١٨٨٢ - ١٩٧١



● کەوباز مام رەحیم کوڵەیی

# باشكۆ

## تاجیری توتن قەڵەمچی

کاتی خۆی ئەو توجارانە ئەچون بۆ دێهاتەکانی ناوچەی دەورو پشتی سلێمانی بۆ توتن کرین و داگرتن ئەمانە زۆریان ئاشنای خۆیان هەبووە لە دێهاتەکان یاخود جوتیارەکان خۆیان توتنەکانیان بە وولاخ ئەهێنا بۆ ناوشار لەناو خەرار یان گونیەدا، لێرە توجارەکان لێیان ئەکرین، ئەم توجارانە بە هۆی کۆمەڵێك حەماڵی ئەمینی شارەزاو ناسیاوی خۆیان ئەو توتنە جوان و رێك و پێك ئەخرایە گونیەوەو دائەگیرایەوە جوان دەمیان ئەدوری وەچەند (حەماڵ باشی)یەك سەرپەرشتی ئیش و توتنەکەیان ئەکردن وە لەو خانەدا کە شوێنێکی گەورە بوو بریتی بو لە سێ حەوشەی گەورە بەچوار دەوریا هەموی حوجرە، حوجرە بو هەر حوجرەی (عەمار)ی تاجیرێك بووە کە توتنە کانیان تێکردوە، ئەو سێ حەوشەیە بەم ناوانە ناو براون یەکەم حەوشی گومرگ دووەم حەوشی حەوزەکە لەگەڵ حەوشی سێیەم ئەم توتنانە جاروبار ئەو حەماڵانە لە حوجرەکان ئەیان هێنایە ئەم حەوشانە بۆ سەیرکردنی توتنەکە لە نەخۆشیو خراپ بونی، گونیەکانیان ئەکردەوەو تاوتو میان ئەکرد واتە (سەرەشکێنە) ئەکرا، ئەو فەردە گونیانەش هەر خاوەنەی جۆرە حەرف و ژمارەیەکی تایبەتی خۆی هەبو کە لەسەر فەردەکانیان ئەنوسرا واتە نیشانە ئەکرا. هەر لەم خانەدا دائیرەی (گومرگ)ی تیا بو کە رەسمی خۆی لە خاوەن توتنەکان ئەسند ئەو زەمانەش مودیری گومرگ ئەمین بەگ بو کە پێیان ئەووت

مودیری (ڕێژی) کە لە زمانی فەرەنسییەوە هاتوە. دوایی ئەو توتنانەیان ئەنارد بۆ بەغا هەر لە زووەوە بە کاروانی وولاخ لەڕێگای قەراغەوە، تالۆری کەوتە ناو شارەکەمانەوە لەوێش دوو تاجیری گەورەی خەڵکی سلێمانی هەبون یەکەمیان میرزا فەرەجی حاجی شەریف دووەمیان ئەحمەد ئاغای کەرکوکلی زادە کە لە زووەوە لە بەغا دائەنیشتن لەوێ خانیان هەبو خانەکانیش هەر وەکو ئەوەی ئێرە حوجرەی تیا بوو ئەمان لێرەوە توتنەکانیان ئەنارد بۆ ئەوان لەو خانەدا لە حوجرەکان دایان ئەناو توتنەکانیان بە تاجیرەکانی ئەوێ ئەفرۆشت، پاش مەسرەف و حەق و ساعی واتە (قومسیون)ی خۆیانیان لێ دەرئەکردو باقی پارەکانیان ئەدانێ تاجیرەکانی ئەوێ بە گوێرەی ڕۆژ بەئارەزوی خۆیان نرخیان لەسەر ئەو توتنانە دائەنا تا ساڵی ١٩٣٨ بۆ یەکەم جار دائیرەی (إنحصار) لە سلێمانیو شارەکانی تری کوردستان دانرا.

ئیتر لەو کاتەوە ئەو توجارانەو جوتیارەکان خۆیان توتنەکانیان ئەدا بە (إنحصار) وە ئەم دائیرەیە چەند لیژنەیەکی شارەزای لە توتن دامەزران بۆ فەحصی توتن وە بە گوێرەی چاك و خراپی توتنەکە دەرەجەیان لەسەر دائەنا پێنج دەرەجە بۆ مومتازو یەك و دوو و سێو چوار لەسەر ئەم دەرەجانە پارەی خۆیان لە میری وەرئەگرت .. ئەم إنحصارە سودێکی گەورەی هەبوو، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی ئەمین زەکی بەگ کە لەو کاتەدا وەزیری (إقتصاد) بو.

ناوی تاجیرەکان

١ - عەلی ئاغای مەولودی سام ئاغا ١٨١٠ - ١٩٠٥

٢ - حاجی محمەدی عەلی ئاغای مەولودی سام ئاغا ١٨٦٠ - ١٩٦٠

٣ - حاجی فەتاحی قادر

٤ - حاجی سەعید ئاغا

٥ - حاجی مەلا محی‌الدین:برایون

٦ - حاجی ئیبراهیم ئاغای خەفاف

٧ ـ میرزا فەتاحی حاجی شەریف
٨ ـ میرزا کەریمی حاجی شەریف : برابون
٩ ـ ئەحمەدی حاجی صاڵحی خەفاف
١٠ـ میرزا غەفوری حاجی مەعروف: برابون
١١ـ مەلا حسەینی حاجی مەعروف
١٢ـ میرزا غەفوری حاجی مەلا سەعیدی شاڵی
١٣ـ میرزا مستەفای حاجی مەلا سەعیدی شاڵی : برابون
١٤ـ حەمە نەجم وەسمان
١٥ـ اسماعیل ئاغای شاڵی
١٦ـ حاجی محەمەدی لاوە
١٧ـ ئەحمەدی تەها
١٨ـ میرزا ئەوڕەحمانی حاجی فەتاح
١٩ـ حاجی ئەمینی حاجی فەتاح : برابوون
٢٠ـ حاجی مەحموود دارتاش
٢١ـ حاجی کاکە حەمە
٢٢ـ میرزا تۆفیق : برابون
٢٣ـ حاجی عبدالواحد
٢٤ـ عەلی ئەفەندی حاجی ئەمین
٢٥ـ میرزا ئەوڕەحمانی شاڵی
٢٦ـ غەنی حاجی عەبدوڵڵا شاڵی
٢٧ـ میرزا سەعیدی مەلا عەباس
٢٨ـ کاکە حەمەی مەلا عارف
٢٩ـ مستەفاغای حاجی حەمە سەعید
٣٠ـ میرزا سەعیدی مەلا ئەحمەد بەقاڵ
٣١ـ میرزا عەویزی مەلا ئەمینی ئەحمەد بەقال : برابوون
٣٢ـ حاجی صاڵح قاسم

٣٣- حاجی ڕەشیدی حاجی سەعید

٣٤- حاجی مەلا خالید مەلا عەلی

٣٥- فەقێ ڕەشیدی حاجی صاڵحی قەشانی

٣٦- حاجی محەمەدی ڕەشان

٣٧- حاجی فەرەجی ڕەشان : برابون

٣٨- خواجە عەبدە خدرە

٣٩- عومەری حاجی محەمەدی سام ئاغا

تێبینی :-

ئەو خانەی کە توتنیان لێ دائەنا دائیرەی گومرگی تیا بو لەبەر خانەقا بو ئێستاکە شوێنی گەڕاجی بەغـایـە بەرامبـەر گەڕاجی شەعب (خـانـە سووتاو)ی کۆن، ئەو خانـە لە مانگی مایس ساڵی ١٩٣٤ لەپێش نیـوەڕۆ توتنـەکـان گڕی تێبـەربـووو سووتا خاوەن توتنەکان هەندێ لەو فەردە توتنانەیان بە پەلە پروزکێ ڕزگار کرد، لەو ساوە پێیان ئەووت گومرگە سووتاو بەڵام لە پێش ئەم سووتانەدا جارێکی تی لەزەمانی عوسمانیدا کەرەتێکی تر سووتاوە، خاوەن موڵکی ئەم گومرگە سووتاوە هی حاجی سەعیـاغـاو حاجی مەلا محیالـدین و حاجی عە لیئـاغـا بوکـە برابـون، هەروەها لەو گومرگە سووتاوە چەند تاجیرێکی تر هەبون کە جاروبار توتنەکانیان لەو تاجیرانە ئەکریەوە ئەوان خۆیان ئەیان نارد بۆ بەغا ئەمانە پێیان ئەوتن دەڵاڵی توتن وەك نەجیم ئاغـــای حاجی مەحمـــوودو ڕەشیـدی حەسـەنی گورون وەئـەو حەمـاڵ باشییـانـەی کە سەرپـەرشتی توتنـەکـانیـان ئەکرد بۆ تاجیرەکان دەروێش ئەحمـەد کەریمـو ئەحمـەد ئەمینـو فەقێ لەو کەرەبـون هەروەها پێش ئەوەیتوتن بنێرن بۆ بەغاچەند کەسێك خاوەنی کاروانی وولاخ بون لەسەر شەقام ئەمان بەکـاروانی وولاخ توتنـەکـانیـان ئەبـرد بۆ بەغا وە لەو سەریشەوە ماڵی توجارەتیان ئەهێنا بۆ سلێمانی یەکێ لەوانە کەریمی تازەمین بو.

سەرچاوە : عومەری حاجی محەمەدی ساماغا کەخۆیو باوو باپیری ئەمە پیشەیان بوو.

# تاجیری ڕەشە وولاخ جەڵەبچی

هەنـــدێ کەس هەبـــون لەم شارەدا کە ئیشیـــان هەر تیجـارەتی ڕەشـە وولاخ بوە بەجەڵەب واتە بە کۆمەڵ گاو مانگایان کڕی‌وە یان لە دێهاتەکانەوە بۆیان هاتوە یان لەمەیانی گاکە کە ئەکەوێتە خوار مەیانی ماستەکە لەوێ لە جامبازیان ئەکڕی‌یەوە کە لە دەرەوەی شار ئەیان هێنا بۆ فرۆشتن لەو مەیانە، ئەمانیش شوێنی تایبەتی خۆیـان هەبـوو بۆ بەخێـو کردنی، هەنـدێکیـان لێ ئەفرۆشتەوە بەقەسابەکانی ئێرە باقیـەکـەی تر بە جەڵـەب ئەیـان برد بۆ موسـڵ بۆ توجـارەکـانی ئەوێ کە ئاشنای خۆیان بون و مەعامەلەیان هەبو لە گەڵیاندا.

لەپێش ئەوەی لۆری بکەوێتە شارەکەمانەوە لێرەوە بە پێ شوانی تایبەتی خۆیان هەبـو کە لە ڕێگـەی دوکـان و کۆیـەو هەولێـرەوە ئەچـون بۆ موسـڵ، جاروبـار لەوێشەوە لێیان ئەنارد بۆ حەڵەب لە سوریا یەکێکی خۆیان ئەچوو لە گەڵیاندا تا ئەوێ، ئەم توجارانە هەموو براو خزم و کەس و کاری یەك بون و هەموو ماڵیان لەسەر شەقام بوو وەکو لە خوارەوە دیاری کراوە:-

١ - حاجی عەزیزی مەلا ڕەحیمی مەلا حسەین

٢ - حاجی محەمەدی مەلا ڕەحیمی مەلا حسەین

٣ - کەریمی مەلا ڕەحیمی مەلا حسەین

٤ - حاجی عەبدوڵڵای مەلا ڕەحیمی مەلا حەسین: هەرچواریان برابون

٥ - حاجی عەلی ئەحمەد خوشکەزایان بووە

٦ - حاجی تۆفیقی خدری ئەستێر

٧ - حاجی ڕەفیقی کوری حاجی توفیقی خدری ئەستێر.

ئەمانیش خزمیان بون لە ژن و ژن خوازی‌یەوە.
سەرچاوە:- حاجی عەبدوڵلا مەلا ڕەحیمی مەلا حسەین
تێبینی:-
چەند کەسێکی تر هەبون تیجارەتی جەیوانی وردە (مەڕو بزن) یان ئەکرد بەجەلەب بە زۆری ئەیان نارد بۆبەغا لەڕێگای قەراغەوە زوربەی مەڕیان ئەنارد ئەمانیش شوانی تایبەتی خۆیان هەبو لەگەڵیاندا ئەچون تاخان بەنی سەعدو بەغا تا لۆری زۆر بو لە شارەکەمانا، ئەم توجارانەش ئەمانەی خوارەوە بون.
١ - حاجی تۆفیقی گورگەوان
٢ - حاجی عەلی کۆڵەك
٣ - حاجی محەمەدی کۆڵەك: برابون وشەریك بون

## دانسازەکان

ئەمیش هونەرێکە کە چەند کەسێك لە شارەکەماندا ئەمە پیشەیان بووە:-
١ - شێخ لەتیفی دانساز:- لە کاتی بۆردومانی سلێمانی‌دا شێخ لەتیف ئەچێت بۆ هەڵبجە لەوێوە ئەچێت بۆ (بیارە) لەوکاتەدا کابرایە لە کوردستانی ئێرانەوە دێت بۆ بیارە بۆ ئەوەی تاقمی دان دروست بکات بۆ (شێخ عەلادین) و (جەعفەر سوڵتان)ی سەرۆکی هەورامی‌یەکانی (بیارە) بە پارەیەکی زۆر (شێخ مەولانا خالید)ی کوڕی (شێخ عەلادین) فێر ئەکات، شێخ لەتیف ئەمەی لێ ئەبێت بە مەراق و خولیاو ئەچێتە سەری‌یەوە تا لە ئەنجامدا نهێنی‌یەکەی فێر ئەبێ، یەکسەر دەست ئەکا بە دروست کردنی تاقمی دان لەوێوە فێری ئەم هونەرە ئەبێت دوایی کە دێتەوە سلێمانی ئەمە ئەبێ بە پیشەی سەرەکی لەماڵی خۆیدا لەسەر کارێز.
٢ - مەحموود شەوکەت سەعید زەنگەنە:- لە بەڵگەنامەیەکی کۆنی شارەوانی وە کە دەستمان کەوتوە دوای ئەوەی کە دەورەی بینیوە لە صحەی بەغا لە ١٦/٥/١٩٣٣ ئیجازەی ئیش کردنی وەرگرتوە لە (ئەمانەی عاصمە)ی بەغا دوای ئەوە شوێنی دانسازی کردەوە لە کۆڵانی تەنیشت مزگەوتی موفتی بەرامبەر مەکتەبی

فەیصەڵیە دوای ئەوە گواستیەوە بۆ شوێنی گوزەری دارتاش خانەو کۆپان دروەکان نزیك ئەصحابە سپی ئیتر هەر لەوێ بەردەوام بو تا کۆچی دوایی کرد.

٣ ـ سەعید سلۆن :ـ ئەم کابرایە گاور بو شوێنەکەی ژێر حەمامی قشلە بو لە جادەی تازە (مەولەوی).

٤ ـ محەمەد مەمەند :ـ ئەم زاتە کاتێ تەمەنی عەسکەری دێت لەشەڕی جیهانی دووەمدا لە بەغا لە ساڵی ١٩٤٢ لە خەستەخانەی ڕەشیدی عەسکەری جێگر ئەبێت لە پێشا دەورەی مضمدی ئەبینێ هەر لەو خەستەخانەیەدا لە ساڵی ١٩٤٥ تا ١٩٤٧ داخلی دەورەی دانسازی ئەبێ لەو دەورە یەدا شەش کەس ئەبن ئەم بە یەکەمی دەورەکە دەرئەچێو شەهادەی دانسازی وەرئەگرێت لە مانگی تەموزی ساڵی ١٩٤٧ لە عەسکەری دەرئەچێو دێتەوە بۆ سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٨ ئەچێت بۆ پێنجوین لەوێ ساڵێك ئەو کارە ئەکات چونکە لەو کاتەدا ماڵی باوکی لەوێ ئەبێت لە ساڵی ١٩٤٩ دێتەوە سلێمانی دەست ئەکاتەوە بە دانسازییەکەی خۆی لای بەنزینخانە کۆنەکە، ئێستا نزیك بەریدە تازەکەیەو هەر لە شوێنی خۆیدا بەردەوامە.

تێبینی :ـ

ئەم دانسازانە یەکەم جار ڕوخسەتیان (ئیجازە) یان لە (ئەمانەی عاصمە)ی بەغاوە دەرئەچو ئەهات بۆ (ڕئاسەی صحە)ی سلێمانی، ئەبوایە هەموو ساڵێك بەهۆی ئەوانەوە ئیجازەی ئیش کردنیان تازە بکردایەوە.

ئەجزاخانەکان (صەیدەلیەکان)

١ ـ ئەجزاخانەی (سیروان) جادەی تازە (مەولەوی) تەنیشت قاپی چلی سینەمای گۆیژە بو خاوەنەکەی نیکوغوس الکسندریان (ئەسکەندەری ئەجزاچی) بو

٢ ـ ئەجزاخانەی (نوری عەلی) جادەی تازە (مەولەوی) خاوەنەکەی نوری عەلی لەپێشدا لە شوێنی کتێبخانەی گەولاوێژ بو ساڵی ١٩٤٩ تا ١٩٥٠، لەساڵی ١٩٥١ گواستیەوە شوێنی ئەسکەندەری ئەجزاچی چونکە ئەسکەندەر سلێمانی

بەجێ هێشت چووە بەغـا دانیشت، ئەویش تیـا مایـەوە تا ساڵی ١٩٥٤ ئەمجـا گواستیـەوە بۆ هەمـان جادە لە ژێـر حەمـامی قشڵە تا ساڵی ١٩٥٦ کە بینـا کەی خۆی تەواو بوو لەبەر دەرکی سەرا گواستیەوە ئەوێ.

نوری عەلی لە ١٩٢١/١٢/١تـا ١٩٢٢/٣/٣١ لە خەستـەخـانـەی (لیڤی) لای ئینگلیـزەکـان و خەستـەخـانـەی سلێمـانی ئیشی کردوە لە

دوای ئەوە لە ئەجـزاخـانـەی خەستـەخـانـەکـانی هەڵـەبجـە،توز، چوارتـا، سلێمـانی، پێنجـوین، تا ١٩٣٨/٩/٢٠ لە خەستـەخـانەی رەشیدی عەسکەری لەبـەغـا دوای دەورە دەرچـووەو لەوێ بوە بە ملازم ثانـی تا ١٩٤٠/٣/١١ لەو خەستـەخـانـەیـە ئیستیقـالـەی کردوە دوای ئەوە هاتـەوە خەستـەخـانـەی سلێمـانی، شەقـلاوە، هەولێـر دوای ئەوە هاتـەوە بۆ خەستـەخـانـەی سلێمانی تا ١٩٤٥/٩/١٠ ئیستیقالەی کرد دوای ئەوە لە ١٩٤٩ بۆ یەکەم جار ئەجزاخانەی خۆی دانا.

٣ ـ ئەجزاخانەی (سلێمانی) خاوەنەکەی ذەنون قاسم الصباغ ئەم پیاوە خەڵکی موصل بوە و موسوڵمانیش بو،سەرەتای پەنجاکانەوەتا مارتی ساڵی ١٩٥٩ مایەوە شوێنـەکـەی جادەی تازە (مـەولـەوی) تەنیشت بەهجەتی سەعاتچی بەرامبەر قاپی چلی سینەمای گۆیژە بو.

٤ ـ ئەجزاخانەیەك کرایەوە سەر بە موتەسەریفییەت بو لەشوێنی نوری عەلیدا کە چۆڵی کرد یەك ساڵ دەوامی کرد لەساڵی ١٩٥٤ تا ١٩٥٥وە حەمە وەفای برین پێچی شاعیری لە سەربوو ٥ ـ ئەجزاخانەی رەوووف: خاوەنەکەی رەووف نەجیب ئەفەنی فەتتاح ئەفەنی بوو. کاتی خۆی لە مەدرەسەی

(صـەیـدەلیـە) دەرچـو لە بەغـا دوای ئەوە لە سوپـادا بو بە (ضابط احتیاط) دوای ماوەی خزمەتەکەی مایەوە لە عەسکەری تا ساڵی ١٩٥٨ روتبەی گەیشتـە (رەئیس ئەوەل) لە کەرکـوك وە عەسـرانیش هەر لەوێ ئەجـزاخـانـەی هەبوو، هەر بە ناوی خۆیەوە هەر لەو ساڵەدا خانەنشین کراو هاتەوە بۆ سلێمانی هەر لە ساڵی ١٩٥٨دا چووە شوێنـەکـەی نوری عەلی کە پێشـا ئەسکـەنـدەری ئەجزاچی تیابو.

٦ ـ ئەجزاخانەی (کاوە) خاوەنەکەی ئیسماعیل محی‌الدین شەریف لە مارتی ساڵی ١٩٥٩ دەنون سلێمانی بە جێ هێشت ئەم چووە شوێنەکەی پاش ئەوەی لە کولیەی صەیدەلەی بەغا دەرچو.

تێبینی :ـ

ئەم خاوەن ئەجزاخانانە ئەبوایە هەموو ساڵێك ڕوخستەتیان (ئیجازە) لە سەرکردایەتی تەندروستی سلێمانی تازە بکردایەوە.

## قەپانچی‌یەکان

ئەم پیشەیەش هەروەك کارو پیشەکانی تر هەر لە کۆنەوە ئەم ئیشە هەبووە کە لە زووەوە ڕزق و ماڵی تیجاری هاتووە لەدەرەوە بۆ ناو وشار بۆ تاجیرەکان لە خانەکاندا وەك گومرگە سووتاوو خانی خورماو مێوژەکە ، لەم دوایی‌یەدا کە ئەو شوێنانە کۆن بون و باوی نەما هاتنە مەیانی بەر بەلەدیەکە بۆ کێشانی ڕزق بە حسابی ڕبەوباتمان بەقەپان ئەیان کێشا، وێنەی قەپانەکەش هەر لەم بەرگەدا ئەبینین . ناوی هەندێ لەو قەپانچی‌یانە:ـ

| | |
|---|---|
| ١ ـ سەعەی مەنیج | لەخانی خورماو مێوژەکە |
| ٢ ـ حەمەی قەبانچی | کوڕی سەعەی مەنیج لەمەیانی بەر بەلەدیەکە |
| ٣ ـ حسەین ئاغا | شەریکی حەمەی قەپانچی لەمەیانی بەر بەلەدیەکە |
| ٤ ـ مەلا فەرەج | لای قاڵدرمەکان بەرامبەر مزگەوتی شێخ محەمەدی ئاڵەکی |
| ٥ ـ نوری بەگی عەبدول ڕەحمان بەگ | قەپانچی دائیرەی تەموین و ئینحصار بوە |

٦ ـ مەحمودی سەی عەلی — لەمەیانی برنجەکە
٧ ـ حەمەی حاجی ئبراهیم — بەر گومرگە سووتاو
٨ ـ شێخ حسەین — لەمەیانی برنجەکە
٩ ـ عەبدوڵلای شەرافەت — لە خانی غەفور ئاغا
١٠ ـ حەمە عەلی قەپانچی — لەمەیانی برنجەکە
١١ ـ عەلی قەپانچی — لەمەیانی بەر بەلەدیەکە

سەرچاوە :ـ عەلی قەپانچی

* * *

## ناوی ئەو کەسانەی کە لە بەرگی یەکەمدا ناویان تۆمار نەکراون و بەرچاپ نەکەوتوە بە پێی ناوەرۆکی (فهرست)ی کتێبەکە :

(کارێزکەند)

١ ـ حاجی محەمەدی دیلات

(ئیمام و مودەریسی مزگەوتەکان)

١ ـ مەلا محەمەدی ئاڵتون ئیمامی مزگەوتی هەمزاغا

٢ ـ مەلا سەعیە شەلە دوای باوکی ئەو چوە شوێنی

٣ ـ خەلیفە حەمەومین یەکەم ئیمام و مودەریسی مزگەوتی کانیئاسکان لە زەمانی بابانەکاندا .

(نانەواکان)

١ ـ عومەرە شەل و حەمەکۆڵ — شەریك بون لە گوزەری سەراجەکان

٢ ـ سەی ڕەشیدی سەمونچی — بەر خانەقا سەمون و پاقلاوەو برمەو شەکرلەمەی

دروست ئەکرد.

(قەسابەکان)

١ ـ ئەحەی حەمە گوێچکە

٢ ـ عەبەی وەسمان برای حەمەی وەسمان

(کەبابچی یەکان)

| | |
|---|---|
| ١ ـ حاجی قادری کەبابچی | لە بازارە بچکۆلە باپیری وەستا واحیدی کەبابچی |
| ٢ ـ وەستا محەمەدی کەبابچی | لای حەمامی مەیان باپیری خەلفە فەرەجی کەبابچی |
| ٣ ـ حەسەنی بن دەوری | بەرحەوزەکە |
| ٤ ـ وەستا عەبدوڵڵای کەبابچی | تەنیشت حاجی دەروێش قەساب. |
| ٥ ـ بلەی رەحیمی کەبابچی | لای مزگەوتی گەورە |
| ٦ ـ وەستا واحیدی کەبابچی | شەقامی مەولەوی |

(کەوش درووەکان): بابەدەروێش لە مەیانی ماستەکە.

(چایچیەکان)

| | |
|---|---|
| ١ ـ چایخانەی سۆفی عەلی | کولانی خوار ئەحمەدی. |
| ٢ ـ چایخانەی رەحمان ئاغا | مەیانی برنجەکە |
| ٣ ـ چایخانەی عەلی حەمەومین | تەنیشت حەمەومین قجولی کەبابچی |
| ٤ ـ چایخانەی حاجی قادرە شەلە | بەرامبەر خەلفە فەرەجی کەبابچی |
| ٥ ـ چایخانەی رەشە عەگال | بەردەم مەیانی داروخەڵۆزەکە |
| ٦ ـ چایخانەی مام یونس | مەیانی ماستەکە |
| ٧ ـ چایخانەی مچە حەبێ | نزیك مەیانی دارو خەڵوزەکە |
| ٨ ـ چایخانەی مەلا کەریم | گوزەری سەراجەکان |
| ٩ ـ چایخانەی حەمە سەعید | گوزەری سەراجەکان |
| ١٠ ـ چایخانەی صالحە سوور | جادەی تازە (مەولەوی) تەنیشت قاپی چلی سینەمای گوێژە |

١١ ـ چایخانەی عەلی عەبدوڵڵا حەمەخان ناوخانی تازە تەنیشت قەیسەری نەقیب

١٢ ـ شێخ سمایل دەستگێر

(سەوزە فرۆشەکان)

١ ـ حاجی صاڵحی کـەوەر بەر حەوزەکە سەوزەی کەوەرو کەرەوز

٢ ـ حەسەن قرگەیی بەر ئەصحابەسپی سەوزەی بامیەو تەماتە

٣ ـ صاڵحی رەشەی هەینو بەرامبەر وەستا عەبۆلی دەلاك سەوزەی بامیەو تەماتە

٤ ـ عەلی مەلا عەبدوڵڵا تەنیشت حاجی دەروێشی قەساب سەوزەفرۆشی بامیەو تەماتە

(بەقاڵی میوە)

١ ـ فەرەج کوردی بەرامبەر وەستا عەبۆلی دەلاك

٢ ـ ئەحمەدی سۆفی ئەمین بەقاڵ باشی

٣ ـ سەعید ئاغای سلێمان ئاغا بەرامبەر حەمەی شازەمان

٤ ـ عەبەی حەمە خەیات بەر بەلەدیەکە

٥ ـ حاجی عەلی خولەسەرشین بەرامبەر بەلەدیەکە

٦ ـ رەسوڵ شەریف تەنیشت وەستا حەمەومین قجولی کەبابچی

٧ ـ شێخ رەئوف بەر بەلەدیەکە

٨ ـ صاڵح چاوشین بەرامبەر بەلەدیەکە

٩ ـ ئەورەحمانی قوربانی ژێر بەلەدیەکە

١٠ ـ بەکری سۆفی ئەمین ژێر بەلەدیەکە

١١ ـ عەلی گوڵێ بەر حەوزەکە

١٢ ـ شێخ محی الدین بەرامبەر حەمەی شازەمان

١٣ ـ مەلا عەبدوڵڵا لای حاجی دەروێشی قەساب

١٤ ـ سۆفی حەبیب خوار حاجی عەلی ماستاو

١٥ ـ رەحیم چەنەباز بەردەرکی سەرا

١٦ ـ مەلا نوری سابونکەران سەرو جەرجیس

١٧ ـ شێخەولا سابون کەران

١٨ ـ مەجید سۆفی صاڵح سابونکەران

(بەقاڵی وشکە)

١ ـ سەعەلەری مەیانی ماستەکە

٢ ـ مەلا ڕەشیە کوێرە مەیانی ماستەکە

(موتاپ چی‌یەکان)

١ ـ پولص استیفان لە گەڕەکی گاوران لەماڵی خۆیدا

(عەلافەکان)

١ ـ ئەحمەد نەمەڵی لای قاڵدرمەکان بەرامبەر مزگەوتی شێخ محەمەدی ئاڵەکی

(چەخماخسازەکان)

١ ـ حەمەو بەگی چەخماخساز کۆڵانی خوار ئەحمەدی

٢ ـ سەعەی خلە لەسەر شەقام لە ماڵی خۆیدا فیشەکی‌دا ئەگرتەوە

٣ ـ حەمە کەریمی چەرخچی لە گوزەری پانی بەرز درووەکان ئەم کابرایە بە تەنیا دوکانی هەبو چەقۆو مەقەستو شتی تیژ ئەکردەوە ئەوانەی تر بەکۆڵاناندا ئەگەڕان.

(مزگەرەکان)

١ ـ وەستا عەلی کۆڵانی لای پانی بەرز درووەکان
ئەم کابرایە لە پاییزدا لەگەڵ شاگردێکی ئەچون بۆ لادێکان بۆ حاجەت سپی کردنەوە

(بەناکان)

١ ـ وەستا حەمە عەلی مەحمود وەستای خشت و بەردو گەچ کاری

٢ ـ وەستا سەعە کەڕ وەستای دیواری خشتی کاڵ و سواغی دیوارو سەربان

٣ ـ وەستا جەلالی ئەجێ وەستای خشت و بەردکاری

٤ ـ وەستا قالە مۆریاسی وەستای خشت و بەردکاری

٥ ـ وەستا عەبدول ڕەحمان فەتاح وەستای خشتی کاڵ و بەردکاری

(خەیاتەکان)

١ ـ وەستا ڕەحیم عەلی     لە قەیسەری نەقیب کەواو سوخمەی ژنانی ئەدوری ئەحمەدی کوڕی ئیشی بۆ ئەکرد

٢ ـ وەستا عەلی مەنیج     لای مەزاد خانەکە شەڕواڵ و مراخانیو ڕانکوچۆغەی ئەدوری

٣ ـ وەستا کەریم قەشانی     لە خوار حەوەکە شەڕواڵ و مراخانی ئەدوری

٤ ـ حاجی فەرەجە کەرە     خەیاتی کەواو سەڵتە مەلا عەزیزی مەلا خالیدی مەحوی ئیشی لەگەڵدا کردوە.

٥ ـ وەستا ڕەئوفی مەلا عەبدوڵلا لە قەیسەری وەسمان پاشا کەواو سەڵتەی ئەدوری حەمە ڕەشییدی زاوای خەلفەی بو.

٦ ـ وەستا ڕەئوف ئیبراهیم لە سابونکەران چاکەت و پانتۆڵی ئەدوری

لەجادەی کاوە تەنیشت ئۆتێل سلێمانی

٧ ـ ئەحەی قالەی شاسوار کەوای ژنانی ئەدوری

٨ ـ وەستا محەی قازی، قەیسەری نەقیب.

٩ ـ وەستا عەبدولی حاجی حەمەومین، قەیسەری وەسمان پاشا.

١٠ ـ وەستا عارفی دەروێش ئەحمەد، خوارحەوزەکە.

١١ ـ وەستا کەریم ساڵح «مامی» قەیسەری نەقیب.

کوتاڵ فرۆشەکان (بازرگان)

١ ـ حاجی شەریف گەڵەیی     بەرحەوزەکە

٢ ـ سەلیم بەگی میران     لە قەیسەری نەقیب

٣ ـ حاجی حەمە بچکۆل     لە قەیسەری وەسمان پاشا

٤ ـ حاجی عارفی ئەمینە بچکۆل     لە قەیسەری وەسمان پاشا

٥ ـ حاجی شێخ قادری شێخ عەلی بەرزنجی لە قەیسەری نەقیب

٦ ـ شێخ ئەحمەدی حاجی شێخ قادری بەرزنجی، لەشەقافی مەولەوی.

(دەستگێرەکان)

١ ـ حاجی ئەورەحمانی هێلکە     هاوینان دۆی ساردو زستانان هێلکەو نان بەهاران دەڵەمەی ئەفرۆشت

٢ ـ رەشـــەی حـەمـەسیس     قاورمەی نۆکی ئەفرۆشت

٣ ـ مەلا فەرەجی لفکەولیرە     ئەیووت ئەوە لفکەئەوە لیرە

٤ ـ دەروێـش بـچـکـۆلـە     ئەی ووت کفتەی چەورو نەرم

٥ ـ کەریمە رەش     گەرمە شامی ئەفرۆشت

٦ ـ حـــەمـــەقـا     گەرمـەشـامی ئەفرۆشت وە لە پاییزدا گۆیژ ی ئەفرۆشت

ئەیووت حەمەقا بایی ٢٠ فلس تەرەقا

٧ ـ مام فەرەج گۆیژ ی ئە فرۆشت ئەی ووت :

ئەوە کەس بەخەبەر نی‌یە ئەوە هەمووخەوتان لێ‌کەوتووە

دوایش ئەیووت :

باوەر ئەکەیت دەم و چاوت بوە بە دەزیلە

ئەمەش کورەکە عەبەخەمیلە

ملە شیلان ملە شیلان

گۆیژ ی دارە قیتەڵە

هەر ئەوە ماوە گۆیژ

٨ ـ سەعەی ناوتاوە ناو ساجی ئەفرۆشت لەناو بازار: ئەی ووت :ـ

ناو تاوەی کوردی

بەدەست و بردی

بەخوا باش بو نەمردی

پاشان ئەیووت: بژ ی گەل و رۆڵەی گەل

حەمە رەق و مینەشەل

چێشتی بامێ و قوبلێ و قەل

ناوساجی ، ناوساجی

توتن چی‌یەکان: حاجی فەتاحی حاجی رشید بەرامبەر گومرگە سوتاو.

ماستاو فرۆشەکان

١ ـ حاجی حەمە سووری قوربانی تەنیشت مەلا محی الدین ماستاو

٢ ـ مەلا تۆفیق برای حاجی حەمە سوور تەنیشت وەستا حەمەومینی قجولی کەبابچی

٣ ـ عـەبـە کـۆڵ بەر بەلەدیەکە

٤ ـ ڕەشەی مامەلی بەر گومرگە سووتاو

(بازرگانیەتی و بازرگانەکان)

١ ـ ئەوڕەحمـانی مەحمـوودی قەفتـان بەکـاروانی وولاّخ لێرەوە ماڵی ئەبرد بۆئێران لەوێشەوە ماڵی ئەهینا بۆ سلێمانی .

٢ ـ کـەریـمـی تـازەمـیـن بەکـاروانی وولاّخ لێـرەوە ماڵی ئەبـرد بۆبەغـا لەوێشەوە ماڵی ئەهینا بۆ سلێمانی .

٣ ـ حاجی عـەبـدوڵـلا عـەزیـز لێرەوە ماڵی ئەبرد بۆئێران ، وەلەمۆسکۆوئێرانەوە ماڵی ئەهێنا بۆ سلێمانی .

(مەلاکانمان)

١ ـ مەلا مەحموودی نۆڕەبانی کە قوتابی کاك ئەحمەدی شێخ بووە .

(قوتابخانەکان)

١ ـ حەمە ڕەشید ئەفەنی مەلا عەلی سەرکارێز بەڕیوەبەری قوتابخانەی ئەیوبیە ساڵی ١٩٥٨ .

٢ ـ فەرەجی حەمە سێو بەڕێوەبەری قوتابخانەی گوێژە ساڵی ١٩٥٨ .

(ئەفسەرەکانی سوپای عوسمانی)

١ ـ شێـخ مەعـروف شێـخ ئەحـمـەد قەرەداغی یوزباشی ئامیر مەوقعی سلێمانی ساڵی ١٩١٤ دوایـی کرا بە ضابـط تەجـنـیـد لە ساڵی ١٩١٧ کۆچی دوایی کردوە لە دێی (نەوتی) لە قەرەداغ نێژ راوە .

٢ ـ عبدالرزاق شێخ مەعروف قەرەداغی ملازم دوای نەمانی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی مستەفا کەمال (أتاتورك) لەسەر کوردایەتی بەندکراو لە ئەستەمبوڵ لە سێ داره درا.

٣ ـ عبدالعزیز شێخ مەعروف قەرەداغی ملازم لە هێزی دەریایی لەهاتنی مستەفا کەمال (أتاتورك) لە (دێنز) لەدەریا خنکا.

٤ ـ صاڵح ئاغای حەمەومین ئاغا بینباشی خەوری مەلا حەمدون زەکی شاعیر.

٥ ـ قادر ئەفەندی ئەحمەد بەقاڵ بینباشی قائد فرقة بووە لە کەرکوك خاڵی وەستا حەمەی حاجی قادری کەبابچی.

٦ ـ تۆفیق عەزیز یوزباشی لە دەوڵەتی عێراقدا رەئیس بوە لە سوپادا

٧ ـ حەمەومین بەگی مستەفا بەگ قائمقام عەسکەری، لە سلێمانی کۆچی دوایی کردوە

٨ ـ عەزیز بەگی فەتح الله بەگ بینباشی برای عەلی بەگی فەتح الله بەگ لە تورکیا نەهاتوە

٩ ـ نوری بەگی فەتح الله بەگ یوزباشی برای عەزیز بەگ لە تورکیاو نەهاتەوە.

١٠ ـ حەمەو بەگی فەتح الله بەگ یوزباشی برای نوری بەگ لە تورکیاو نەهاتەوە

١١ ـ فایەق بەگی مارف بەگ ملازم ثانی نائیبی سلێمانی لە دەوڵەتی عیراقدا

١٢ ـ یونس عبدالقادر ملازم ثانی ئەندازیار لە دەوڵەتی عێراق

١٣ ـ فوئاد مەستی ملازم ثانی مودیری ئیشغال لە دەوڵەتی عێراق

١٤ ـ حیکمەت ئەمین ملازم ثانی، شاعیر، ئەندازیار لە ئیشغال لە دەوڵەتی عێراق

١٥ ـ کاکە عەلی نازانین رتبەی چی بوە برادەری نوری سەعید بوە بە مامۆستا لە زوربەی مەکتەبەکاندا کابرایەکی دەنگ خۆش و قسە خۆش بوە

١٦ ـ عەبدولقادر عەبدول رەحمان قەرەداغی

١٧ ـ عەزیز حیکمەت ملازم ثانی فەرمانبەر لە بەلەدیە

١٨ ـ عەبدوڵڵا عەونی مەلا رەشید بەگی بابان ئەفسەری دەریا

١٩ ـ نوری محەمەد ملازم ثانی، عەقید لە سوپای عیراق دوایی بوبە مودیری ئاوو کارەبا لەسلێمانی ساڵی ١٩٤٥

٢٠ ـ عبدالحمید بەگی عوسمان بەگی صاحبقران یوزباشی وە لە دەوڵەتی عیراق بوبە

قائمقام برای شەوکەت بەگی عوسمان بەگی صاحبقران
٢١ ـ خورشید بەگی ڕەشید بەگی عەلی بەگ ملازم اول سکرتێری قائدی عەسکەری عیسمـەت ئینـونـۆ بو هەر لەوکاتەدا لەسەر جولاّنەوەی کوردایەتی ڕای کرد بۆ (باکۆ) تا مستـەفـا کەمـال (أتـاتـورك) هاتـە سەر حوکم بوبە جمهـوری، عەفوی بۆ دەرچو، لە ئەستەمبۆل بوبەئامیری قەسری جمهوری دوای ئەوەش لە لێدانی کوردەکانی تورکیا ڕای کرد هات بۆ سلێمانی، لە دەوڵەتی عێراق لـە سلێمانی لە (اشغال) بوبە (ملاحظ فەنی) ئەم پیاوە لەگەڵ سمایل خانی شوکاك (سمکۆ)دا پورزان.
٢٢ ـ حەمدی بەگی سەعید بەگی سلێماز بەگ یوزباشی برای کەریم بەگی زانستی
**٢٣ ـ تۆفیق بەگی یایەمان طابور آغای باوکی ئەحمە بەگی موتە سەریف لە سەفەربەر لە بۆکان لە کوردستانی ئێران شەهید کراوە.**

(هەندێ لە ئەندازیارە کۆنەکان)
١ ـ عبـدالقـادر حیشمـەت: لە ساڵی ١٩٠٨ لە دێـك بوە لە ساڵی ١٩٣٤ لە کولیـەی هەندەسە لە جامیعەی ئەمریکی لە بێروت دەرچووە.

**[عەرەبانچی یەکان]**
**١ ـ مورادی عەرەبانچی**
(ئوتومبیل چی یەکان)

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ ـ عەلی حەسەن صاڵح | لـە بەلەدیە | لەسەر ئوتومبیلی ئاوڕشێنەکەبو | |
| ٢ ـ حسەین مەلا عـەبدوڵلاّ | ڕێگای | کەرکوك | بە پاص قەمەرە |
| ٣ ـ مسـتەفـای صـدیق تەها | ڕێگای | مـاوەت | بەلۆری |
| ٤ ـ یاسین کەریم ڕۆستەم | ڕێگای | مـاوەت | بەلۆری. |
| ٥ ـ عـەزیـز پـەتـرۆس | ڕێگای | بـەغدا | بە قەمەرە |



● سالح زەکی ساحێب قڕان
١٨٨٦ - ١٩٤٤



● عەبدو لحەمید بەگی عوسمان بەگی
ساحێب قڕان - یوزباشی



● ئەحمەد کەمال دەمرکانی - میرئالاێ



● کاکە عەلی ئەفسەری عوسمانیو
ماموّستاو قسەو دەنگ خوّش



● عبدالرزاق شێخ مەعروف قەرەداغی

لە حوکمی «ئەتاتورك»دا

لە ئەستەمبوڵ لە سێدارە درا



● مەحمود شەوکەت دانساز ۱۹۰۷ - ۱۹۸٦



● کەریمی حور قەساب ۱۸۸۸ - ۱۹٦٢



● فەقێ مەحموود توتنچی
١٩٠٠ ـ ١٩٧٣



● دەروێش ئەحمەد کەریم ـ
حەماڵ باشی گومرگ ـ
١٨٩٠ ـ ١٩٨٢



● عومەری حاجی محەمەدی
ساماغا «قەڵەمچی»



● حاجی حەمە بچکۆل ـ
بازرگان ١٩٠٢ ـ ١٩٨٥



● وەستا حەمەی حاجی قادر ـ
کەبابچی ١٨٩٠ ـ ١٩٤٤



● وەستا قادر ڕەسوڵ ـ
پانیبەرز دروو



● حاجی محەمەدی مەلا ڕەحیم
١٨٩٧ ـ ١٩٨٦
«ناجیری ڕەشە وڵاخ»



● حاجی تۆفیقی ئەستێر
١٨٧٣ ـ ١٩٦٣



● کەریمی مەلا ڕەحیم
١٨٩٤ - ١٩٥٨



● وەستا حەمە کەریمی
چەرخچی



● سۆفی عەلی چایچی
١٨٨٨ - ١٩٦٣



● حاجی ڕەفیقی حاجی تۆفیقی
ئەستێر ١٩٠٤ - ١٩٨٧



● ڕەشەی هەینو - چایچی
١٨٩٧ - ١٩٧١



● کێشانی جاران بە تەرازووی
چەرم



● دوکانی عارف برنووتی - بەرحەوزەکە



● دوکانی حاجی مەجید



● دوکانی حەمەکەی مام ساڵح
«کوڕەزای ئەحەی کڕنوو»



● دوکانی وەستا عومەری ئاسنگەر



● دوکانی حاجی برایمی عەتار،
قەیسەری نەقیب



● دوکانی حاجی کەریم عەبـ ڵڵای
سەوزەفرۆش «بەرامبەر گومرگە ـوتاو»



● دوکانی عەباس ئەبو شەوارب



● دوكانی ئەحمەدی بەرامبەر خانی ئاغافەتحوڵلا



● كورەی خشتی عەبدوڵلای
حاجی ساڵح لە قلیاسان/ ٩٥٤



● چایخانەی سەعەی تەها كۆیی ـ دەشتی تەیارەخانەكە




● مەیانی کاکە



● قاپی ماڵانی قەیم

«ماڵی خەلفە فەرەجی کەبابچی لە سابونکەران»



● مەلا ئەسعەدی مەحوی
لە خانەقای مەحوی‌دا
١٨٩٨ - ١٩٧٦



● پەنجەرەی کۆن
«فەرەنگی سازی»



● سنوقی بۆراق



● ٢ خەنجەر دەستكردی وەستا قادری مچیل



● بنمیچی خانووی كۆن



● زینی ئەسپ دەستکردی
وەستا عەباسی سەڕاج



● قەپانی کێشان



● زۆپای دار، دەستکردی تەنەکەچی



● ڕەوڕەوەی منداڵ

کەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبە- بۆجاری دووەم چاپکرایەوە، هەندێ شت لەچاپی دووەمی ئەوبەرگەزیادکرا. بۆئەوەی ئەوانەی چاپی یەکەمیان لایە - ئاگاداری ئەوزیادی یەبن. والەم بەرگەداچاپی ئەکەینەوە.

## «روون کردنەوەو سوپاس نامەیەك بۆچاپی دووەم»

پێش هەموو شتێك ناوی هەر کەسێك هاتبێ لە کتێبی (شاری سلێمانی)دا هەرچ کاروپیشەیەکیان هەبووە کەتیایدا ناویان تۆمارکراوەو ناویان براوە هەموو براوکەس وباووباپیرمانن، هەرهەموو جێگای رێزو شانازیە بۆکەس وکاریان وبۆکوڕو کچیان وبۆنەوەکانیان، وەناویان چووەتە مێژووی شارە دلێرەکەمانەوە، شاری هەڵمەت وقوربانی، شاری برایم پاشای بابان ومەولانا خالیدو کاك ئەحمەدی شێخ وشاری شێخ مەحمودی نەمرو شەشی ئەیلول وشاری ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٤٨ - ١٩٥٢ ١٩٥٤

-١٩٥٦ زپرلە خەبات و شەهیدان، ئەم شارە هەرچەندە تەمەنی دووسەد ساڵە، بەڵام بەقەد شارێکی ٢ هەزار ساڵە قارەمانیەتیو مەردایەتیو کارەساتی هەمەجۆرەی بەخۆیەوە دیوە.

دیارە خەڵکی ئەم شارەڕێی باووباپیریان ون نە کردووەو هەر لەسەر هەمان رێبازئەرۆن، ووریان، زیرەکن، نیشتمان پەروەرن ، وەجاخ زادەن ولە خۆیان نەگۆراون، هەرخەڵکی شارەکەی جارانن، بەڵگەشس ئەوەیە کە کتێبی (شاری سلێمانی)کەوتە کتێبخانەی کوردی وبازارەوە خەڵکی بەپەرۆش بەدڵێکی فراوان وخۆشی یەوەهاتن بەپیر کتێبەکەوە کە لە چەند رۆژێك دا لەبازارانەما چونکە ئەزانن ئەو کتێبە لە خۆیانەو بۆخۆیانەو بۆنەوەی داهاتویانە، هەرچ کەسێك لەم شارەدا ئەگەر خۆی بە نووسەرو رۆشنبیرو دڵسۆزی ئەم شارە ئەزانێ داوای لێ ئەکەم ئەم کتێبە کەمێژووی شارەکەمانە ئەوانیش هەتا زووە هەڵیکەتا لەدەست نەچووە تا چە ندپیاوێکی بەتەمەن وشارەزا ماوە کە سەردەمی تورك وئینگلیزیان بینیوە سەرچاوەن بۆزۆر زانیاری کە تا ئێستا تۆمار نەکراون و سودێکی گەورەی هەیە بۆ ئێستاو دوا رۆژ ئەوانیش

دەست بدەنـە کۆکـردنـەوەی ئەم بابەتەو قۆڵی لێ هەڵکەن و بێنە مەیدانەوەو هەر کاغەز و قەڵـەم زۆرە، کە ئەمـە دڵسـۆزیو خۆشـەویستی بەرامبەر شارەکەو هیلاك بونی ئەوێ، ئەوەی بەکەم وکوڕی ئەزانن چاکی بکەنەوەو لێی زیاد کەن و باسەکە فراوانترو بەتام و چێژتری بکەن منیش یارمەتیان ئەدەم و پێخۆشحاڵ ئەبم نەك لەبەر ئەوەی خۆیان توانای ئەوەیان نی‌یە هەرچ کەسێك بەرهەمێکی چاك بنوسێ ئەمان وەکو کوتەك بیدەن بەسەرو گوێ‌لاکیا وەك پێشینان ئەڵێن (ئەگەر گوڵ نیت، درکیش مەبە) خۆ ئەگەر دەنگ خۆش و شاعیـرو نوسـەریش نەبن کە ئەمـە بەهـرەیـە ئەگـەر بیـانـەوێت بەرهـەمێك لەم لایەنە پێشکـەش بەشـارەکـەیـان بکـەن ئەبێت خۆیان هیلاك بکەن وە واز لەسوودی خۆی بێنێت ئێمـەش شانـازی پێـوە ئەکەین، وەکو ئەڵێن بە ڕیش نی‌یە بە ئیشە، یان هەندێ کەس ئەگەر بڵێن ئەم ناوانەی کە لەناو کتێبەکەدا هاتووە ئەبوایە بەناوی سیانی واتە ناوی خۆیو باوو باپیـری بەبێ شوهـرەت (نـازناو) بوایە، ئەم جۆرە ناوانە کە بوونە شوهرەتی ئەو کەسە لەناو شارەکەمانا، ئەوە لەناو هەموو میلەتێکا هەیەو بووە، ئەگەر ئەو کەسانەی کە ناومـان هێنـاون لەنـاو ئەم کتێبـەدا، ناوی خۆیو باوك و باپیری وەك لە هەویەکەیدا نووسـراوە ناو بهێـنـرێن ئایـا کەس ئەزانێ کێن وە مەبـەستمان کێ‌یە هەتا ئەو کەسەش نازانێ کە مەبـەست خۆیـەتی. بۆنمـونـە سەیری (دەلیلی تەلەفۆن) بکە ئەو ناوانە کە نووسراوە ئەگەر خزمی خۆت نەبن وژمارەی تەلەفۆنەکەت لا نەبێ و بتەوێت تەلەفۆن بۆ یەکێ بکەی نازانی ئەو ناوانە کێن و کێ نین.

کەوابێ هەرکەسێك لەمەودوا بیەوێت بەرهەمێك بێنێتە بەرهەم ئەو ناوانەی کە ناویان ئەبـات لەو کتێبـەدا وەك عالِم و مەلا و شاعیـرو ناودارانی ئەم شارە هی وای تیـایە زیاد لە سەدیان سەدو پەنجا ساڵ لەمەوپێش کۆچی دوایی کردوە، ئەبێ بنێرین هەویەکانیان لە گورا دەربێنین کە گۆڕیشیـان نەمـاوە، مانـای لەمەودوا هیچ کەسێك نابێ دەست بداتە قەڵـــەم نەك یەکێکی تر ئەمـەی لە توانـا دا نی‌یـەو پێی ناخـۆش بێت ئیتـر ئەبێت ئاش بەتـاڵی لێ بکـرێت. ئایـا لەشـارەکەماندا عالِم و زانای ناودارە وەك موفتیی سلێمانی مەلا ئەحمـەدی چاومـارو مەلا ئەحمـەدی چاوهـار کە ناوبانگیان هەبووە لە زۆر کتێبدا ناویـان هاتـووە، یان وەك شاعیـری بەنـاوبانگ حەسەن کەنۆش یان فایەق بێکەس خۆ بێکـەس نەبـووە یان شاعیـرو بلیمـەتی بەنـاوبـانگ مەلا حەمدونە کوێر یان پیاوی وەك

قالـەی ئایشـەخـان کە بەنـاوی دایکیـەوە ناوبـانگی دەرکردوە کە ئەو پیاوە ئەفسەرێکی سوپـای عوسمـانی بولە جولانـەوەی شێخ مەحمودی نەمردا ئەفسەرێکی ئەولەشکرە بووە لەگـەڵ شێخـدا لە ساڵی ١٩١٩ز بەدیـل گیراولە دەوڵەتی عێراقدا بوبەئەندازیارو بەڕێـوەبـەری (ئیشغـال) لە سلێمـانی و هەولێـر لەوکاتـەدا زۆر یارمەتی هەژارانی داوە بەتایبەتی خەڵکی سلێمانی کە ڕووی تێ کردوەو چون بۆلای هەمووی دامەزراندون و پارەی ئەرکی ڕێگاشی لە گیرفانی خۆی داو نەتێ ئەم پیاوە ئەوەندە خۆشەویست بولای خەڵـك، کە بەگـەنجی ئەمـری خوای کرد کە تەرمـەکـەیان هێنایەوە ئەوڕۆژە ئەوشارە ژن وپیـاوخرۆشـابـون بە گریـانـەوە قوڕیـان بۆ ئەپێوا. ئەمانە نمونەی چەند کەسێکی ناودارن لەناومێژ وی ٢ سەد ساڵەی شارەکەماندا ئەگەر (نازناو)یان لابە رن کەس نایان ناسێت کێن وکێ نین وناویـان وون ئەبێت، یان ئەوتام چێـژەی نامێنی، بۆنمـونـە سەیـری بەرگـەکـانی ڕشتـەی مرواری ئەدیب وزانـاوڕۆژنـامـەگـەری کورد مامـۆستا علاءالـدین سجـادی بکـەن کە لایـەنێکی فۆلکلۆری گەورەی لەناوکوردەواریدا تۆمار کردوە. سەدەهـا ڕووداوی خۆش خۆش وناوی سەیـر سەیـری تیا ناوبراوە کە بونەتە هۆی بەتـام وچێـژ ی ئەوبەرگانە. تارادەیەك ئەوەی ئەدەب دۆستیش نەبویان بڵێن هەر خوێندەوار نەبووە زیاتر بە پەرۆشتر بون لە خوێنەوارەکان بۆی، تا ئێستاکەش بە تایبەتی شەو لەزستـانـدا بوە بە شەوچـەرەی خەڵکی چونکـە ئەم بابـەتە کتێبانە زۆر کەمن لەناو کوردەواریدا. خەڵك تێر بون لە شیعروچیرۆك بە تایبەتی لەم کاتە ناسکەدا خەڵکی ئەو ڕۆژگـارە خەریکـە ڕابوردویان لەبیر ئەچێتەوە، وەك دەرمان پێویستیان بەم جۆرە کتێبانە هەیـە کە یادگـاری جارانـەووەك شریتێکی سینەما وایە کە جارانی دێتەوە یادوخۆشیەك ئەدات بەدڵ ومێشکی، وە زانیاریەکیشە بۆنەوەکانیان ومێژ ویەك وسامانێکە بۆنەوەی داهاتومان.

هەروەهـا هەرچ کەسێـك ناوی لەم کتێبـەدا هەرچ کاروکاسبی وپیشەیەکیان هەبوە جێ ی شانازی نەوەکانیانە کە بەئارەقی ناوچەوان ماڵ ومناڵی خۆیان بەخێوکردوە، هەر لە کرێکـارێـك وحەمـاڵێـك هەتـا تاجیـرێـك وخاوەن موڵکێك هەموبەشەرن وهیچ جیـاوزازی یەکیـان نی یـە، جیـاوازی یـەکـەیـان بەس کرداری جوانە، ئەگەر کەسێك کرداری ناشرینی هەبێت لەناوخەڵکیدا بە پارە ناشارێتەوە، بەتایبەتی لەناوخەڵکی ئەم

شارەدا کە بە زیرەکیو ووریایی ناوبانگیان دەرکردوە وەك پیرەمێردی شاعیر ئەفەرموێت :-

**نەپایەو پارەنەریشەو رەگەز**

نەجوانی رووکەش، نەبەرگ و مەرەز

یەك تۆز لە نرخی هیچ کەس زیاد ناکات

کە مرۆڤ نەبێ خۆی نرخێکی بەرز

نموونەیەکی خۆشی تر: جارێکیان دەعوەت ئەکەن، کارتێ ئەنێرن بۆحاجی توفیق (پیرەمێرد) ئەوەی کارتی دەعوەتەکە ئەبات بۆخاوەنەکەی، بەس لەسەر کارتەکە نوسرابو حاجی تۆفیق ئەویش ئەیبات بۆ حاجی تۆفیقی تازە دەوڵەمەند پاش ماوەیەك گلەیی لێ ئەکەن کە نەهاتووە بۆئەم زیافەتە پیرە مێرد پێ ئەزانێ، ئەڵێ ئەگەر ئیزرائیل هات ڕۆحم بکێشێت ئەینێرم ڕۆحی حاجی تۆفیقی تازە دەوڵەمەند بکێشێت.

ئیتر وەك پێشینان ئەڵێن زۆر ووتن قورئان خۆشە یان ئەڵێن بۆمرۆڤی ئاقڵ ئیشارەتێك بەسە. لەگەڵ ڕێزو سلاومدا بۆخوێنەران و خەڵکی شارەخۆشەویستەکەمان کە یارمەتیان داوین کە خۆیان بوبونە سەرچاوەی باسەکانمان بە تایبەتی ئەوانەی ناومان بردون لە کتێبەکەدا کە ناوەکانیان بۆبەراورد کردوین پاش کۆکردنەوەی، هەروەها ئەو بەرێزانەی کە داوای وێنەی باوکمانمان لێ کردون بۆ ڕازاندنەوەو یادگاری ئەو پیاوە بەرێزو خۆشەویستانە لەناو شارەکەماندا کە دڵسۆزیی خۆیان پیشان داوە بەرامبەر باوو باپیرو شارە خۆشەویستەکەیان، هەروەها ڕێزو سلاوم بۆئەو کەسە ڕۆشنبیر نەیە کە بە تەلەفۆن یان هاتنە لامان یان بەنامە پیرۆزباییان لەمن وخۆیان کرد بەبۆنەی دەرچونی بەرگی یەکەمی کتێبەکەوە هەر لێرەشا سوپاسی هونەرمەند مامۆستا عەلی نەتیف ئەکەم، وە بەرێز خاڵە حەمە فەرەج کە پاش پاك نوس بەخەتێکی خۆش بەرگی دووەمی کتێبەکەی بۆنوسینەوە منیش ئەڵێم دەستەکانیان خۆش بێت، هەروەها سوپاسی مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف ئەکەم بۆیارمەتی زانیاریو ڕێنومیی هەروەها بەناوی خۆم و خەڵکی شارە خۆشەویستەکەمان زۆر سوپاسی بەرێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ئەکەم کە بوتە هۆی هاتنە بەرهەمی **ئەم** کتێبە **کە بەبۆنەی بیرەوەری دووسەد ساڵەی شاری سلێمانی لەچاپ درا. لە کۆتاییدا داوا لە**

خەڵکی شارەکە ئەکەم هەرچ کەم وکوڕیو هەڵە هەیە لە ناو کتێبەکە دا یان ناویان لەبیر چووەو تۆمار نەکراوە پشت بەخوا چاپی دووەم ڕاستی ئەکەینەوەو ئەوانەی ناویان بۆ هێناوین کە باوو باپیریان ناویان نەهاتووە لەکارو پیشەکانیمدا ناومان نوسیون بۆچاپی دووەم دوا ووتە بەرهەمیپاش ئەوەیە کە جەماوەر لێی ڕازی بێت و پێیان خۆش بێت.
وەك خوالێخۆشبو نەجمەدین مەلا ئەیفەرموو.
(عەتر ئەوەیە کە خۆی بۆنی بێت نەك خاوەنەکەی مەدحی بکات) ....

## ئەکرەم صالح ڕەشە

٢ - هەڵەی چاپی بەرگی یەکەم

١ - شیعرەکەی کاك قادر برسی (ناوداراني سلیماني) ل٢٥ نوسراوە

| | |
|---|---|
| قادر زەکی بۆبەزم | غوربەتی خۆی هەڵ ئەسان |
| فرمیسکی دزۆی ئەڕست | موختاری صابونکەران |
| یەك لەیەکتر خۆشتر بوون | ڕەشەو صدیق و عوسمان |

ڕاستیەکەی

| | |
|---|---|
| قادر زەکی بۆبەزم | غوربەتی خۆی هەڵ ئەسان |
| فرمێسکی دزۆی ئەڕشت | هەروەکو تاوی باران |
| کوڕانی حاجی شەریف | موختاری صابونکەران |
| یەك لەیەك خۆشتر بوون | ڕەشەو صدیق و عوسمان |

٢ - ل - ٧٧ - لەوێنەی سەرەوە نوسراوە، شەقامی کاوەو قوتابخانەی فەیسەلیە وێنەی

ژێرەوە نوسراوە شەقامی سابونکەران،
ڕاستیەکەی بە پێچەوانەیە .
٣ ـ ل ـ ٧٨ ـ ئەودوو وێنـەیـە لێی نەنـوسـراون کوێن ، وێنـە سەرەوە بەردەرکی سەراو قوتابخانەی فەیسەڵیەو جادەی تازە (هەولەوی)یە وێنەی ژێرەوە بەردەم قوتابخانەی فەیسەڵیەیە .
٤ ـ ل ـ ١٢٤ ـ مزگـەوتی خانـەقـای مەحـوی :ـ ئیمـام و مودەریسـەکـانی خاڵی (٣) نوسـراوە مەلا خالیـدی مەلا عومـەر کوڕی مەلا محـەمەدی مەحوی ڕاستیەکەی ، مەلا خایـدی کوڕی مەلا محـەمـەدی مەحـوی‌یە ، هەروەك ناوی مەلا ئەسعـەدی مەلا خالیدیش پەڕیوە کە ئیمام و مودەریسی ئەوخانەقایە بووە .
٥ ـ ل ـ ١٣٢ ـ لەژێـر وێنـەی مەلا محـەمـەدی چروستـانی‌دا نووسـراوە ساڵی ١٩٨٣ کۆچی دوایی کردوە ڕاستیەکەی ساڵی ١٩٦٣ کۆچی دوایی کردوە .
٦ ـ ل ـ ١٤٢ ـ لە ناترەکانا حەمەی زەینەب جیاوازە لەگەڵ حەمەی زێنەبی چایچی کە لە ل٢٠٦ ناوی هاتووە .
٧ـ ل ـ ١٨٨ ـ بەرچاپ نەکەوتووە .
٨ ـ ل ـ ١٩٩ ـ خاڵی (٢٠) چایخـانـەی مەجۆلی خامە : نوسراوە هەرلەم چایخانەیەدا ساڵێکیان لە سەردەمی عوسمانلی‌دا بۆماوەی ساڵێك تیا ترۆش ئیشی تێدادەکرد . .
ڕاستیەکەی :..
لەزەمـانی عوسمـانلی‌دا تیا ترۆنەبووەو لەو چایخانەیەدا نەبوە زەمانی ئینگلیز تیاترۆ هاتۆتە سلێمانی لەبەردەم دەشتی ئەحمەدی ساغا (ئەصحابەسپی) نزیك ئەو چایخانەیە بەڵام خەڵکی سلێمـانی بەوەڕازی نەبـوون وبەزۆر پێیـان داخستن لەبـەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا لە باسی جوڵانەوەی هونەری لەشارە کە مانا بەدرێژی باس کراوە ، منیش داوای لێ بوردن ئەکەم .
من نوسیبـووم کە مەجـۆلی خـامـە پیاوێکی سوعبەت چی بو هەموڕۆژێك یەکێکی خەڵـکـی دەردەوەی شار ئەهـاتـن بۆئیش کردن ئەمـیش هەر ڕۆژە نارۆژیـك یەکێکی ڕائـەگـرت بەشەرتی ئەوەی مەرکانەیەت ناوی دان بولەگەڵ قامیشێك هەریەکێ بهاتایە بۆشـاگـردی پێی ئـەووت ئەمـرۆ تەجـربەت ئەکەم ئەو قەمیشەی ئەدایە دەستی پێی ت

ئەووت تۆئەمـرۆئیشت ئەوە بێ ئاوی ئەم مەرکـانـەیە بەم قامیشەتێکی هەڵدە تاخەست ئەبێتەوە منیش ڕات ئەگرم بەشاگرد ئەوبەسەزمانەش هەرلەبەیانیەوە تائێوارە بەقامیشە کە ئاوی تێـك هەڵئـەدا خەست نەئەبووەوە ئێوارە پێ‌ی ئەووت تۆبەکەڵکی شاگردی نایەیت بۆبەیانی یەکێکی کەی ڕائەگرت.

٩ ـ ل ـ ٢٦١ ـ ەوە چەواشەبووە واتەپاش وپێش کەوتووەتا ل ـ ٢٦٧ ـ

١٠ ـ ل ـ ٣١٧ ـ خاڵی هەشت نەقارِ عەلی بۆسکانی نووسراوە خۆی لە ئەصڵدا برای کەریمی عبـدوڵـلابـۆکـانی‌یـە کە ئەویش لەخـاڵی شەشـەم دا ناوی براوە بەڵام ئەم لەجنسیـەکـەیـدا بەنـاوی عەلی بۆسکـانی نووسـراوە هەرلەناو نەقارەکاندا هەربەعەلی بۆسکانی ناوبراوە.

١١ ـ ل ـ ٤٤٦ ـ مەکتـەبی ئەعـدادی موڵکی ئەبـوایـە لەپێش ڕوشدی عەسکەری‌یەوە بنوسرایە هەروەها پێش دروست بونی ڕوشدیەی عەسکەری لە سلێمانی

لە ڕوشـدیـەی عەسکـەری بەغدا

**ئەستەموڵ خوێندویانە هەر لەهەمان لاپەڕەدا زۆربەی ڕستەکـــــان بە نیوەچل چاپ کراوە**

١٢ ـ ل ـ ٤٩٧ ـ وێنـەگـرەکان یەهودا لەشوێنی نوری نوسراوەو نوری لەشوێنی یەهودا نوسراوە واتەیەهودا کوژراوە.

٣ ـ (زیادەی چاپی دووەم ـ ئەوانەی بەداخەوە لەبیر چوون) : لەنووسەرو شاعیران :

مەلا ئەسعـەدی مەحـوی شاعیـر ١٨٩٨ ـ ٢٥ / ٤ / ١٩٧٦، شێخ ئەحمەد ئەمین شاعیر بەڕیوەبەری قوتابخانانەی لەتیفیە ١٨٩٠ ـ ١٩٥٥،

مەلا حامیـدی حەمـدوون (زەکی) شاعیر ١٨٩٦ ـ ٣ / ١ / ١٩٧٦، شێـخ ئەحمـەدی شێـخ عەلی (فـەوزی)، مەلا کاکە حەمەی حاجی سەیفوڵلا ١٨٨٤ ـ ١٠ / ٥ / ١٩٦١، جەمیـل سائیب، شێـخ لەتیفی حەفیـد ١٩١٧ ـ ٢ / ٥ / ١٩٧٢، ئیسمـاعیـل شاوەیس، محەمەد ڕەسووڵ هاوار، حەمەبۆ (هۆشەنگ)، حسێن عارف، ساجیـد ئاوارە، محـەمـەد کەریم فەتحوڵلا، د. ئیحسان فوئاد، حەسەنی شێخ حەمە عارف، عەلی عیـرفـان، فازیـل عیـرفان، مەحموود زێوەر، حەمە سەعید بەگ

(هەژار)، عەبدولرەحمان موفتی(شێرۆ)، عەبدولقادر حیشمەت، عەبدولقادر قەزاز، عەبدولقادر خەفاف، کاکەمین، جەمال خەفاف، مەحموود فەهمیی هەمەوەند، عوسمان عوزێری، ماجید عەبدوڵا، مستەفا قەرەداخی (سالار)، عەبدولکەریم ڕەباتی، جیهان عومەر، کەمال محەمەد تاهیر، تاهیر ساڵح سەعید، عەلی ناجی عەتتار، د. کاوس قەفتان، د. کەمال مەزهەر، جەلال مەحموود عەلی، عەبدولکەریم باراوی، ڕەئوف شێخ عارف.

سەرچاوە:- مێژووی ئەدەبی کوردیی عەلائەدین سوجادی، ڕۆژنامەکانی ژین ١٩٥٣/ ١٩٦٣، کاکەی فەللاح، کۆکراوەکانی ئومێد کاکە ڕەش.

٤ ـ لاپەڕەی (١٨٨)یش لەچاپی یەکەمدا بەرچاپ نەکەوتوو کە ئەمەیە:

١ ـ حەمەی ئایشێ
٢ ـ حەمەی عەتیە
٣ ـ خالیدی عەلی شاملی
٤ ـ کەریمی محەی شیر
٥ ـ سەعەی بابم
٦ ـ کەریمی حاجی عەلی
٧ ـ عەبەی خورشە
٨ ـ ڕەفیقی خورشە
٩ ـ شێخ حسین
١٠ ـ شێخە
١١ ـ خولە لاڵ
١٢ ـ **حەمەی عزیز**

**تێبینی:**

لە بابەت بازرگانی ریخۆڵەو پێستەوە:

ڕێخۆڵە بەکار دەهات بۆ باسترمەو تەلی عەمەلیات و تەلی عودو کەمانچەو ژێی هەلاج. ئەم ڕیخۆڵەیە لێرە چاك دەکراو پاك دەکراو خوێ دەکراو دەخرایە ناو پێستی مەڕ

دەردەهات وەك هەمانەوپێستی پەنیر دەیان خستە ناوی دەیان نارد لە پێشدا بۆشاری موصل دوایی بۆبەغداد، دوایی ئەوەش دەنێررا بۆبێروت. بەلاّم لە شەڕی دووەمی جیهانی یەوە یەکسەر دەیان نارد بۆشەریکەی (ئۆپن هایمەر) لە وولاّتی ئەمەریکا بە پاپۆڕ لە بێروتەوە. هەروەها پێستەشیان دەنارد بۆشارانی موصل و بەغداد.

* * *

## سلێمانی کە دارولمولکی بابان بو

لە بیرم دێ سولەیمانی کە دار الملکی بابان بو
نەمەحکومی عەجەم، نەسوخرەکێشی ئالی عوسمان بو

لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلاو زاهد:
مەتافی کەعبە؛ بۆ ئەرباپی حاجەت گردی سەیوان بو

لەبەر تابوری عەسکەر رێ نەبو بۆ مجلسی پاشا
سەدای موزیقەو نەقارە تا ئەیوانی کەیوان بو

دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە، ئەو رۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەوری کانی ئاسکان بو

بە زەربی حەملەی بەغدای تەسخیر کردوتێ هەلّدا
سلیمانی زەمان، راستت ئەوێ باوکی سلیمان بو (١)

عەرەب ئینکاری فضلی ئێوە ناکەم ئەفضلن ئەما
صلاح‌الدین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بو

قیوری پڕ لە نوری ئالی بابان پڕ لە رەحمەت بێ
کە بارانی کەفی احسانیان وەك هەوری نیسان بو

کە عبدالله پاشا لەشکری والی سنەی شرر کرد
«رەزا» ئەو وەختە عومری پێنج و شەش، تفلی دەبستان بو

(شێخ رەزای تالّەبانی)

(١) باوکی سلێمانی لێرەدا مەبەست (عبدالرحمن پاشایە کە باوکی سلێمان پاشایە) کە بەغدای لە تورك سەندەوە.

## فەهرەستی بەرگی دووەمی کتێبی «شاری سلێمانی»

رقم الایداع ٢٣١ ١٩٨٩

نەخشەی بەرگ: هونەرمەند علی لطیف

* * *